

# ئەو ڕۆژانەی
# نیشتمان هی هەمووان بوو

هەڤاڵ کوێستانی

ناوی کتێب: ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو
بابەت: بیرەوەری
نووسینی: هەڤاڵ کوێستانی
تایپ و مونتاژی ناوەوە: بەختیار ئەورەحمان
بەرگ: ڕێبوار سەعید
شوێنی چاپ: چاپخانەی کارۆ
ساڵی چاپ: ٢٠١٧
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
تیراژ: ٣٠٠٠ دانە
نرخ: ٨٠٠٠ دینار
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠١٧
کوردستان-سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٨٨٣) ساڵی ٢٠١٧ ی پێدراوە.

# ١

ژاوە ژاوی ناوبــازاڕ، گوێــی مرۆڤ کەڕ دەکات. خۆر خەریکە ســەری ماندووی دەخاتە ســەر سنگی چیاو پێڵوی تاڵە تیشکەکانی لێکدەنێ. دەنگی تەقینەوەیەک ژاوەژاوەکە دەکاتە جمین.

- قڵیشایەوە .. قڵیشایەوە!!

هەر بابایەو ڕوەو کۆڵانێک غاردەدات، تا خۆی تێدا ون بکات.

گەنجێک، هەوای عیشقی نیشتمان لێیداوەو دوو رۆژ لەوەوبەر، پەیوەندی بــە مەفرەزەیەکی پێشــمەرگەوە کردوە.. پەیوەندی کــردوە بەڵام نە نامەی رێکخستنی پێیەو نە کەسێکی واش دەناسێت ببێتە کەفیلی.

پێشــمەرگەکان، بــۆ تاقیکردنەوە و بۆ دڵنیابوون لــە پاکێتی ئەو گەنجە، هــەر ئەو رۆژە، نارنجۆکێکی دەدەنێ و بۆ ئەنجامدانی چالاکییەک رەوانەی شاری دەکەنەوە.

چ تاقیکردنەوەیەکی نادروستو ناڕەوایە.. تۆ بتەوێ ببیتە پێشمەرگەو رێی پێشمەرگایەتیشیت، بەناو کێڵگەی مینڕێژکراوی ئەزمونێکی وا مەترسیدار و کوشندەدا بڕوات.

ئەو کە بڕیاری پێشمەرگەبوونی خۆی داوە، حسابێک بۆ ترس و مردن ناکات... ئەوەی حسابی بۆ دەکات، کات و شوێنی ئەنجامدانی چالاکیەکەیەو هیچی تر نا. کات: خۆر لە ئاوابوون و بازاڕ بەرەو چۆڵبوون بڕوات. شوێن: ئەگەری ســەرکەوتنی چالاکیەکــەی تێدا زۆر و، خەڵکی تێدا ســەلامەت و، دەرفەتی دەربازبوونی خۆیشی زەحمەت نەبێ.

دوو ئەمن لەبەردەم قەیســەری نەقیبدا گەنجێکیــان بەگیروگاز هێناوەو دەیانەوێــت لەگەڵ خۆیاندا بیبەن. ئەم چەند هەنگاوێکی ماوە بگاتە ئاســتی ئەمنەکان، بەهەناســەبڕکێو بەدەســتی لەرزۆکەوە نارنجۆکی بەر پشتێنی دەردێنێ... هێند دەشــڵەژێ، لەگەڵ ئەڵقە راکێشــانی نارنجۆکدا، بازاڕ لە ناو پەشۆکان و قڵیشانەوەدا جێدەهێڵێ.

چەند کاژێرێک دواتر، باوکو دایکی ئەو گەنجە، بۆ ناسـینەوەی تەرمی کوڕەکەیان، لەبەردەمی مەیتخانەی سلێمانیدا وەستاون.

دوو رۆژ دوای ئـەو ڕووداوە، لە هەیوانی ماڵەکەی خۆماندا، لەبەرامبەر باوکو دایکمدا وەسـتاوم. کاتو شـوێنی ئەنجامدانی بڕیارەکە بڕاوەتەوە. کاژێر ئەوەندەی سبەینێ، دەبێت لەوێ ئامادە بم.

من کاتم بەدەستەوە نەماوەو نابێ لەوە زیاتر ماتڵ بم.

من سـازو ئامادەم، هـەر ماوە ئەڵقـەی نارنجۆکـی هەواڵەکە بەڕووی ئەواندا راکێشم... رایدەکێشمو دەشبینم، لەگەڵ تەقینەوەیدا، تۆوی چ زامێکی ئەبەدیو بەسوێ، لە کێڵگەی ناخی ئەماندا دەوەشێنم.

مـن نیگاکانم لـە زەوی بەردەمم گیـر دەکەمو ئەوانیش بـە نیگەرانیو دڵەڕاوکێیەکـی زۆرەوە تێمدەڕوانن.. شـەپۆلی شـڵەژانێکی گـەورە، وەک ئاماژەی روودانی بومەلەرزەیەکی کارەساتبار، لە روخسارمدا دەبینن.

– چ بووە رۆڵە؟! خۆ ئیشەڵا شتێکی ناخۆش رووینەداوە؟

بۆ ئەوەی شڵەژانەکەی سەر روخسارم وەشارم، دەبێ کەمێک ئازایەتی بخەمە سەر دەموچاوم.

ـ نا نا هیچ شتێکی خراپ رووینەداوە،

– ئەدی بۆچی ئەوەندە نیگەران و دوودڵ دیاری؟

ـ نا بابە گیان، هیچ دوودڵ نیم، بەڵام دەمەوێ بڕیارێکی خۆمتان پێبڵێم.

– دەی ئیشـەڵا ئـەو بڕیارەیـە من و دایکیشـت چاوەڕێین بیبیسـتین... سوپاس بۆ خوا ئەوە زانکۆشت تەواوکرد، ئیدیی تۆغیانی[1] ژنهێنانتە. چەند خۆشـدەبوو هەتا هەردووکمان زیندووین، ئـەو رۆژەمان بەچاوی خۆمان دیتبا.

ـ دەیبینن بەڵام جارێ نا.

---

١- تۆغیانی ژنهێنانتە: وەختی ژنهێنانتە.

هەمووی سێ ڕۆژێک نابێ، سەبارەت بەو بڕیارەی خۆم، لەگەڵ ئەویشدا دواوم.

مــن دەمــەوێ قەناعەتی پێبێنم ئــەو بڕیارەی کە من داومە، ڕەشــەباش بــێ، گەڵایەک لە درەختی خۆشەویســتی من بۆ ئــەو ناوەڕێنێ.. بەڵام ئەو پێیوایە، ئەو ڕەشــەبایە نەک هەر گەڵاو لقو پۆپ، درەختەکەش لە ڕەگەوە دەردێنێ. قەت هێندە توڕەو شڵەژاو نەمدیوە، بەتۆنێکی کە پێشتر گوێم پێی ڕانەهاتووە:

– ئێســتا دەزانم، تۆ نە لە ڕابردودا منت خۆشویســتوە، نە لە ئێستاو نە لە ئایندەشدا خۆشتدەوێم.

- چۆن وادەڵێیت!

– چــۆن واناڵێم.. ئەگەر وانەبا، بەو ئاســانییە بڕیــاری دوورکەوتنەوەت نەدەدا!

- بەڵام من هەر بەجەســتە دوور دەکەومەوە، دەنا بە هەستو ڕۆح هەر لەگەڵ تۆدا دەبم.

– هەســتو ڕۆح؟! بۆتۆ پێتوایە ئەو شــێوەی دوورکەوتنەوە درووستی دەکات، بە ڕووخانی هیچ کێویک پڕدەبێتەوە؟

کەمێک لەو قسەیە ڕادەمێنم، پشتی سەرم دەخورێنمو بە دەنگێکی کەمێک نزم پێیدەڵێم:

- من حەزمدەکرد، زۆریش حەزمدەکرد کە تۆش لەگەڵمدا هاتبای..

– بــۆ کــوێ بێــم؟! دەتــەوێ بۆکــوێ لەگەڵتا بێــم؟! دەتــەوێ بەدوای کەوانەڕەنگینــەی خەیاڵەکانــی تــۆدا بێم.. مــن بە منداڵیش بــەدوای کەوانە ڕانگینەدا ڕامنەکردوە، چونکە دەمزانی چەندیش ڕاکەم نایگەمێ.

- باشە ڕامەکە، بەڵام خۆ دەتوانی چاوەڕێمکەی.

– چاوەڕێــی چــی؟! بۆ تــۆ وادەزانی من عومری نوحــم هەیە تا تەمەنم بەشی ئەو چاوەڕوانییە سەرابیەی تۆ بکا!

- بەڵام خۆ خۆشەویستی هەر بەیەکەوەبوونی جەستەیی نییە..

- رەنگــە لای تــۆ وابــێ، بەڵام لای مــن، بەڵێ لای مــن بەیەکەوەبوونی جەستەییە.

کەمێک دەوەستێو هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێ. بۆ یەکەمجار لەماوەی ئەو گفتوگۆ ئاگرینەماندا، چاوەکانی دەبڕێتە ناو چاوم:

- وەک تۆ چۆن هەموو شتێکی خۆت بە راشکاوی پێگوتم، منیش دەمەوێ هەموو شتێکت وەک ئەوەی لە ناخمدایە پێبڵێم.. من سواری شەمەندەفەری خۆشەویستیەک نابم نەزانم بۆ کوێم دەبا...

ئەگەر هەنســکی یەک لەدوای یەک رێیان بە قســەکانی نەگرتبا، دەمزانی دەیەوێ بڵێ:

«ســواری شــەمەندەفەری ئەوینێــک نابــم، نەمگەیەنێتــە وێســتگەی هاوســەرگیریی..» هەقیشــیەتی، وەک هــەر کچێکــی تر هەقیەتــی، خەون بــەماڵێکــی جێگیرو بــە مێردێکی باش بۆخــۆی و بە باوکێکی دڵســۆز بۆ مناڵەکانیەوە ببینێ.

ئــەو هەقیەتی خــەون بەوانەوە ببینێ، منیش کە دەزانــم بەو حاڵو بەو قەناعــەتو بیروباوەڕەی من هەمــە، ناتوانم ئەو خەونانــەی بۆ بێنمە دی، داوای لێبوردنی لێدەکەم... ئەو لەبەر لێزمەی بارانی گریانو خۆشــم لەناو سوتانی دارستانی روحمدا جێدێڵم.

بــاوکو دایکــم چیتــر توانای چاوەڕوانی ئــەو بێ دەنگیــەی منیان نیە.. پەلەیانە خۆشترین هەواڵی ژیانیان لە دەمی منەوە ببیستن.. ئەوان چاوەڕێن و منیش لەگەڵ خۆمدا خەریکم ئازایەتی لەخۆمدا خڕکەمەوەو پێیان بڵێم:

- لــە راســتیدا مــن دەمــەوێ پێتانبڵێم، هەر ئەم ســەعاتە لێــرەمو دەبێ برۆم.

- بۆ کوێ دەڕۆی؟

- بۆ دەرەوە[1].

ئەوە دەڵێمو هەردووکیان، وەک دوو منداڵ دەدەنە پرمەی گریان.

---

١ـ ئەو کاتە بە چوونە شاخ و پیشمەرگایەتیان دەوت دەرەوە.

دەگریـەن‌و دەیانبینم وەک دوو داربەڕووی بەسـالاچووی گرتێبەربوو خەریکە لەبەردەممدا بەلادا دێن... دەیانبینم‌و گوێم لە هاوارو ناڵەی روحیانە ... دەیانەوێ شـتێک بڵێن بەڵام هەرچەند دەکەن قۆزاخەی لێوەکانیان بایی ئەوە لێکنابێتەوە، پەموی چەند وشەیەکی پچڕ پچڕی تیا بپشکوێ.

بێدەنگـی بـۆ چەنـد خولەکێـک وەگ گێژەنگـی رووبارێکـی کەفچڕیو لوولماندەدا. دایکم بە هەوریەکەی سـەری‌و باوکم بە لچکی[٣] کەشـیدەکەی پشتی، فرمێسکی وەریوی چاویان دەسڕن...

– ئاخر بۆ؟! رۆڵە بۆ وامان لێدەکەی!! ئەو هەموو ساڵانە خوێندت هەر بۆ ئەوەی ببی بە پێشـمەرگە؟! ئاخر پێمان ناڵێی خوا غەزەبی لێگرتووی ئەمە دەکەی!! ئاخر ئەتۆو پێشمەرگایەتی؟! پێشمەرگایەتی ئەوەندە ئاسانبا، ئێستا لەم شارەی ئێمەدا هەر هیچ نەبێ چوار پێنج کەسێک دەبوونە پێشمەرگە.

ـ دەزانـم زەحمەتـە بـەڵام بۆمدەکـرێ.. مـرۆڤ ئیـرادەی هەبێ کاری نەکردەشی پێدەکرێ.

– ئەدی حسابێک بۆ ئێمە ناکەی؟!

ئـەوان ناهەقیـان نیە، هەم لە ژیانـی من‌و لە جەرگسـووتانی خۆیان و هەمیـش لەو مەنجەنیقە بترسـن کە لە رۆیشـتنی مندا بۆ سـوتانی ئەوان دادەخرێ.

چۆن نەترسـن ... ئینجا توخوا ناهەقیانە بترسـن! تەنها پێرێ، لە گوندی (قـوڕە بـەرازە)ی دەشـتی کۆیەدا، لە شـەڕێکی نـا بەرامبەری گـەورەدا، چواردە پێشـمەرگە شـەهیدو پێنجی دیکەش بە دیل گیراون. رۆژیش نییە هەواڵی شـەهیدبوونی پێشمەرگەیەک یان پەلامارێکی سوپاو جاش‌و فرۆکە نەبیسـتن. هـەر ئەوەندەش رژێم بە پێشـمەرگەبوونی منـی زانی هەرچی موڵک‌وماڵیان هەیە، دەسـتی بەسـەردا دەگیرێ‌و خۆشـیان بەرەو یەک لە زیندانەکانـی خـواروی عیراق، دەخرێنە پشـتی زیلێکـەوە، خوا نەبێ کەس نازانێ لەدوای ئەوەش چیان بەسەر دێت.

بـە بەرچاوی منـی منداڵەوە، باوکم و چوار کەسـیتر لـە دوکانەکانیان رادەکێشنە دەرەوە، هەرهەموویان لەسەر چەقی جادەو لەبەردەمی تانکێکدا

---

٣- لچک: دامێن.

پاڵدەخــەن ... مــن بە هەموو هێزی خــۆم دەگریم و ئەفســەرەکەش، وەک هەورەتریشقەی نیوەشەو بەسەریاندا دەگرمێنێ:

«ئەگــەر پێمــان نەڵێــن ئــەو موخەڕیبانــەی دوێنــێ شــەو تەقەیان لە پۆلیســخانەکە کردوە، چوونەتە کوێ، هــەر هەمووتان لە ژێر زنجیری ئەم تانکە، ئەنجن ئەنجن دەکەم.»

ئەدی ئێســتا و دوای شانزە ساڵ، دەبێ باوکم لەسەر ئەوەی کوڕەکەی خۆی دەبێتە (موخەڕیب)[٤]، چی لێبکەن!

من لە خەمی ئەواندام و گوێم لە قرچوهوڕی سووتانی ناخیانە ... بەڵام چیبکــەم، هاواری نیشــتمان هێنــد بڵندە، ناهێڵــێ گوێ لە تــکاو پاڕانەوەی ئەزیزترین کەسەکانی خۆم بگرم.

مــن ئەوە بــە ئازایەتیو بــە جێبەجێکردنی ئەرکی ئەخلاقیو نیشــتمانی خۆم دەزانم، باوکیشــم بەجۆرێک لە شێتیو دڵڕەقی... ماڵی بیروباوەڕم بە قوڕ گرت، هەر ئەوەندە تەسلیمی بووی، ئیدی ئەو دەبێتە ئەو بایەی بڕیار لەسەر ئاراســتەی کەشتی چارۆکەداری چارەنووسی تۆ دەداتو بۆ کوێی بوێ بۆ وێت دەبا. گیرۆدەبوونی ئایدۆلۆژیاش جۆرێکە لە عەشق ... هەموو ئەوانەی لەو ڕۆژگارەدا، عەشقی ئایدۆلۆژیا بە باڵەفڕێی دەخستن، بیریان لە نیشتنەوە نەدەکردەوە. ئەوەندە بە قووڵی لەو عەشقەدا ڕۆدەچوون غەیری ئەوەی عەشقی دەبوون، شتەکانی دیکەیان بەهەند وەرنەدەگرت. ئاخر ئەو عەشــقە قووڵەش نەبوایە، کوا کاری ڕێکخســتنی نهێنیو پێشمەرگایەتی بە خەڵکی وەک ئێمە دەکرا!

لەو ڕۆژگارەدا، ڕۆژگاری دوای ئاشــبەتاڵو هەڵگیرســانەوەی شۆڕشی نــوێ، ئایدۆلۆژیــاش چەشــنی دیــن، سروشــتێکی ڕۆحــی وەرگرتبــوو... مارکســیەتی کۆمەڵەش(کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردســتان)، مارکسیەتێکی ڕۆمانسیو سیحرێکی غەریبی بۆ کێشکردنی گەنجان هەبوو... لەو ڕۆژگارەدا ئەگەرچی پێشمەرگایەتی زۆر سەخت وڕیسککردن بە ژیان و بە گژ مەحاڵدا چــوون بوو، بەڵام لە خانەی کارە هەرە پیرۆزەکاندا بوو... یەکێک توانیبای لەو زەمەنە دژوار و پڕ مەترسییەدا ببێتە پێشمەرگە، دەبوایە دەستبەرداری هەموو شتێکی ژیانی خۆی ببا... دەبوایە کونێک چییە لە جەرگیدا نەبا.

---

٤ - موخەڕیب: تێکدەر، ڕژێم لەبری ووشەی پێشمەرگە ئەم ووشەیەی بەکاردەهێنا.

هەرسـێکمان، وەک سێ بەردی لەپاڵ یەکدا لە لیتە چەقیوی رۆخ دەریا، ناوبەناو شەپۆلی بێدەنگی داماندەپۆشیو، جاربەجاریش بۆ چەند وشەیەکی پچڕ پچڕ بە دەر دەکەوینەوە. باوکم بە ریتمێکی باوەڕبەخۆ، پێمدەڵێ:

«مـن رێـی کوردایەتیت لێناگـرم ... قەتیش هەوڵمنـەداوە لێتبگرم ... بۆ چەند ساڵە نازانم خەریکی چیت!! بەڵێ دەزانم ... بەڵێ باشیش دەزانم، بەڵام کەنگـێ پێمگوتوی کوڕی من وا برۆ و وا مەڕۆ؟! باشـە چەند سـاڵە چۆن کوردایەتیـت کردوە، ئێسـتاش هەروای بکە ... کوڕی خـۆم، عیبادەت هەر عیبادەتە، جا لە ماڵی خۆتا بیکەی یان لە ماڵی خوادا.»

باوکم بەدوای چارەسـەری مامناوەندیدا دەگـەڕێو گەنجێتی منیش کە سـێخنانە لە هەڵچوونو حەماسـەت، لێناگەڕێ بە چارەسەری مامناوەندی رازی بـم ... گەنجێتـی، ئەوکاتـەی گێژەڵووکەی ئایدۆلۆژیـا لەگەڵ خۆیدا لوولیدەدا، شتێک لەبەردەمی خۆیدا نابینێ پێی بوترێ مەحاڵ.

ئەگەر ئەوکاتە حەماسـەتی شۆڕشـگێڕێتیم ئەوەندە بـاڵا نەبوایە، چۆن دەمتوانـی پێ لە جەرگو پێ لە هەسـتە مرۆییەکانی خۆم بنێمو لەو دۆخە ناخ هەژێنەدا، ئازیزترین کەسانی خۆم جێبێڵم.

ماڵئاواییـان لێدەکەمو دەشـزانم ئەو ئاگرەی من بەرمداوەتە دارسـتانی هیواو خەونەکانی ئەوان، لە زەویەکی سـووتەمەرۆ[٥] بەولاوە، شتێکی دیکە لەدوای خۆیەوە جێناهێڵێ.

---

٥ـ سووتەمەرۆ: سووتماک، زەوییەک کە بەتەواوەتی سوتابێت.

## ٢

ماڵئاوایی دەکەمو جێی خۆم لە پشتی شۆفێری تاکسیەکەوە دەگرم. خاڵی پشکنینی هیزۆپ نەبا، رەنگە دواین دیمەنی زۆر خەمناکی باوک و دایکم، تا مودەتیکی زۆر، سۆمای خەیاڵیان بەرنەدابام.

چ باوکو دایکێکی میهرەبانو لێوان لێو لە خۆشەویستین... تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە دەزانن بەهۆی رەفتارو هەڵوێستی منەوەو چەندیش ئازاریان چەشتووە، بەڵام قەت ئەو هەستەیان نەداوەتێ کە خۆیان لە من خۆشتر بوێ... ئیمڕۆش لەگەڵ ئەو هەڵوێستە دڵڕەقیو ئازاراویەشمدا، لەگوڵ کاڵتریان پێنەگوتم. ئەوان سوور دەزانن لە سۆنگەی هەڵوێستی منەوە، چ چارەنووسێکی سامناک و نادیار خۆی بۆ مەلاس داون، کەچی خەم هەر خەمی منە و ئەوەی بیری لێناکەنەوە خەمی خۆیان و مڵک و ماڵیانە.

خودایە ئەو جیاوازیە گەورەیە چیە تۆ خستووتە نێوان بەرخوردی[٦] باوکی سەمیر و بەرخوردی باوکی منەوە!!

سەمیر، چەند جارێک دەیەوێ لە سەربازی رابکات ... هەموو جارێک باوکو دایکی رێی لێدەگرن. دواجار، ئەوکاتەی سەمیر بۆ بەرەکانی پێشەوەی شەڕ دەگوازرێتەوە، بەهەر شێوازێک بێت خۆی دەگەیەنێتەوە خانەقین.

ئەم رەفتارەی سەمیر، باوکی تەواو دەهەری[٧] دەکات، هێندە هەڵدەچێ خەریکە لە پێستی خۆی بێتە دەرێ.

- هەر ئیسە، هەر ئیسەو یە سەعاتی تر نا، جانتاگەت خەیتە کۆڵتو، چیدەو ئەرا وەحدەکەی خۆت.

- ئاخر باوە، دڵنیاوە گەر بچمەو کوشریەم[٨].

---

٦. بەرخورد: مامەڵە.

٧. دەهری دەکات: تووڕەی دەکات.

٨ـ کوشریەم: دەکوژریم

- تو توای[9] لەوەر خاتر خۆت، خەرگ[10] کەیتە سەر ئێمە.

ـ ئاخر باوە ...

- باوە و ماوەی نەگەرەکە. هەر ئیسە گەر نەچیدەو ئەرا وەحدەکەی خۆت، من وەدەس خۆم تەسلیمەت کەمە حکومەت.

تێخوڕینی ئەفسەری خاڵی پشکنینەکە نەبا، گفتوگۆی نێوان سەمیر و باوکی ئەوەندەی تر درێژەی دەکێشا.

- دابەزن.. هەرهەمووتان دابەزن.

هەموومان دادەبەزین، لە تەوقی سەرەوە تا بنی پێڵاوەکانمان دەپشکنن. هەتا سەرو بنو دەروژووری ئۆتۆمبیلەکەش تەفتیش نەکەن، ناهێڵن سواربینەوە. لەوەدایە ئۆتۆمبیلەکە بجووڵێت، ئەفسەرەکە دارەکەی دەستی بۆلای ریشم درێژ دەکا، بەزمانە عەرەبیە زبرەکەی خۆی پێم دەڵێ:

- ئەگەر لەو سەرەوە بەو ریشەوە بێیتەوە، هەر بە سووتان دەیسوتێنم.

ئەو دەشیرڕێنێو من هیچ ناڵێم ... هەرچیەک بڵێم، قوڕی دۆخەکە لەخۆم خەستتر دەکەم.

ئەوان لە هیچو خۆڕایی پەڵپ بە خەڵکی دەگرن. هەر گەنجێکیش ڕیشی هەبێ[11]، بە هاوسۆزی پێشمەرگەی دەزانن... ئنجا وەرە قسەش لە قسەیاندا بکەی... بە کێشەی نازانن هەر لەسەر ئەو جادەیە، بە تۆمەتی هاوسۆزی لەگەڵ پێشمەرگەدا گوللەبارانم کەن.

تا لە پێچی دوای پردەکەی هیزۆپیش ئاوا نەبووین، هەر ترسی ئەوەمان هەبوو، بۆ خۆشیش بێ، لەدواوە چەند دەسرێژێکمان لێبکەن.

سەربازگەکە لە چاوانمان وندەبێو ئاهێکمان پێدا دێتەوە.

---

٩ـ توای : ئەتەوێ.

١٠ـ خەرگ: قوڕ

١١ـ لەو ڕۆژگارەدا، لەبەرئەوەی زۆربەی پێشمەرگە ڕیشیان هەبوو، هەربۆیە هەرگەنجێک ڕیشی هێشتبایەوە بە هاوسۆزی پێشمەگەیان دەزانی.

سـەربازگە، چـون کوانێک[12] کەوتۆتە سـەر تەوێڵی ئەو دەشـتە پان و بەرینەی لە هێزۆپەوە دەست پێدەکاو تا نەگاتە ناو باوەشی چیاکانی دەوری دۆڵی ئەسـحابان تەواو نابێت. ئەودەشـتە لەو کاتەوەی قەعقاع کردوویەتە شوێنی مۆڵدانی سوپاکەی خۆی، بەدەشتی قاقا ناسراوە.

ئەگەر ئێسـتاش شـوێنێ هەڵگرێکی شـارەزا بێنی، هیـچ دوور نییە، لە ژێر توێژاڵی ئەو زەبەندەی دەشـتەکەی داپۆشیوە، شوێن سمی ئەسپەکەی قەعقاعت بۆ بدۆزێتەوە.

قەعقاعـی کوڕی عەمرۆی تەمیمی، لە سـاڵی هەژدەیەمی کۆچیدا، دوای پشوویەکی چەند ڕۆژە، لەو دەشتەداو هەر لەو شوێنەی ئەم سەربازگەیەی ئێسـتای لێیە، پەلاماری دێهاتەکانی ناو ئەو دۆڵەی داوە کە دواتر بە دۆڵی ئەسحابان ناویدەرکرد.

قەعقـاع بـەو ناوبانگە زۆرەی لە کوشـتاری شـەڕەکانی جەلـەولادا لە (١٦ی کۆچـی) پەیـدای کردبـوو، ڕووی لە هـەر جێیەک کردبێ، سـەدای تـرس و تۆقاندنەکـەی بەرلەخۆی گەیشـتونەتە ئەوێ. هەر ئـەو دلڕەقیو زەبروزەنگەشـی بـووە، پێگـەو مەقامی لەنـاو عەرەبە مسـوڵمانەکاندا تا کەشکەڵانی فەلەک بردووە.

وەک دەڵێـن ئەو دۆڵـە، دۆڵی ئەسـحابان، خوێناویترین شـەڕی نێوان عەرەبە مسـوڵمانەکان و کوردانـی بەرگریکاری بەخۆیەوە بینیوە. ئەوانەی لێدەرکەی پەنایان بۆ شـوێنە عاسـیو قایمەکانی نێو چیاکانی ئەو دەڤەرە بردوە، ئەوانی دی، شـتاقیان[13] لە شمشـێری سوپای عەرەبە مسوڵمانەکان قوتاریان نەبووە... ئەوانەشی بە دیل گیراون، هەر لە ڕۆخی ئەو ڕووبارەدا کە بە بن پردی هێزۆپدا ڕەتدەبێت، ملیان پەڕاندون.

مەڕوماڵات و سـامانیان، هەرهەمووی بەتاڵان براوە، ژنو کچانیشـیان، کراونەتـە سـەبایا[14] و ڕەوانەی لای خەلیفەی مسـوڵمانان کـراون... وەک سـەرچاوەکانی (فتوحاتی ئیسـلام)ی دەڵێن، بۆ چەنـد ڕۆژێک بازاڕەکانی مەککەو حیجاز بە کڕینو فرۆشتنی ئەو سەبایانە گەرموگوڕتر بووە.

سوپاکەی قەعقاع، هەموو شتێکیان لەو ناوچەیەدا کردۆتە وێرانە... ئەوەی

---

١٢-کوان: دوومەڵ.

١٣- شتاقیان: هیچیان.

١٤ـ سەبایا: ئەو ئافرەتە غەیرە عەرەبانە بوون کە دەکەوتنە بەردەستی موسوڵمانە عەرەبەکان و وەکو موڵکی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدەکردن.

له پاشـماوەی ئەو پەلامارانە جێماوە، تەنها چەند گۆڕێکن، لە ڕاستیدا دوو جـۆر گۆڕن، گۆڕی ئەسـحابانو گۆڕی کافران. تا ئێسـتاش هەموو چوار شەممان، لەگەڵ تاریک و روونی بەیانیدا خەڵکی ئەو ناوچانەی دەوروبەرو شوێنی تریش بەسەر ئەو گۆڕانە وەردەبن.

چوارشەممەیە، خۆشـترین چوارشەمەی ئەو کاتانەی تەمەنم، هەمووی چەنـد رۆژێکی کەمە لـە تاقیکردنەوەکانـی پۆلی شەشـی ئامادەیی تەواو بـووم. چەنـد تراکتۆرێک، ئێمەیان، بە ڕێیەکی خۆڵاویدا گەیاندە سـەر ئەو گۆڕانە. ئەگەر لەبەر خاتری ئەو نەبا کوا من تاقەتی ئەو هەموو تۆزو خۆڵ هەڵمژینەی رێگاو، ئەو هەموو هەڵتەک و داتەکی ناو عەرەبانەی تراکتۆرو، کوا تاقەتی سەردانی ئەو (پیاوچاکان)ەشم دەبوو.

چەند مەرقەدێک کە ڕەنگە گۆڕی عەبدوڵای جەندەلی و قەعقاعی کوڕی عەمرو عەبدوڵای کوڕی عومەر بن، بە ئاغەڵە بەرد دەورە دراون... لەسەر هــەر گۆڕێــک، کۆمەڵێک پەڕۆی سـپی و سـەوز، بە لقی داربـەڕووە قەد ئەسـتورەکاندا شـۆڕبوونەتەوە... من و ئەو چەند کەسێکی تر، لەبەردەمی گۆڕێکـدا وەسـتاوین ... هەریەکەو چاوەڕێی سـەرەی چوونە ژوورەوەی خۆیەتـی ... پیرێژنێـک کێلی گۆڕەکەی لــە ئامێز گرتوەو، هێنـدە بەتوندی ڕایدەموسێ[15]، دەتوانی شوێنی یەکبەیەکی ماچەکانی بەسەر کێلەکەوە ببینی ... بەدەم گریانو لاڵانەوەوە، نزاکانی لە ڕێی ئەسحابەی ناو گۆڕەکەوە، بۆ بەردەمی قاپی خوا دەنێرێ ... هەڵدەسـتێتە سـەرپێو تیلمەیەک[16] لە یەکێک پەڕۆ سـەوزەکان دادەدڕێو بە دەرزیەکی سـنجاق لـە یەخەی خۆی قایم دەکات ... بەرلەوەی پاشەوپاش لە قسنە[17]کە بێتە دەرێ، تا جێ بۆ یەکێکی دی چۆڵکا، جارێکی کەش دەستە چرچ و دەماراویەکانی هەڵدەبڕێ و چەند توکو نزایەکی تر ڕەوانەی لای خوا دەکا.

ئەو، دەچێتە ناو مەرقەدەوەو یەکسـەر بەرەو کێلی لای سەری گۆڕەکە دەڕوا ... پانـە بەردێکـی چکۆلـە هەڵدەگـرێو چەنـد جارێک لـە کێلەکەی دەخشێنێ ... هەر جارێک کێلەکە بەردەکە بەخۆیەوە ناگرێ، من دڵم خورپە دەکات... ئاخر ئەگەر کێلەکە بەردەکە نەگرێ، ئەو مرازەی ئەم خسـتویەتیە دڵی خۆیەوە حاسـڵ نابێ... وەک ئەوەی ئەوە بڕابێتەوە کە من مرازی دڵی ئەوم.

---

١٥ـ ڕایدەموسێ: ماچیدەکات

١٦- تیلمە: پارچە، تۆزێک.

١٧ـ قسن: مەرقەد، مەزار

چەنـد ژنێکی ترو نـۆرەی من دێ ... هەر لەگەڵ یەکـەم هەوڵمدا، بەرد، وەک ئەوەی کەتیرەی پێوەبێ، بە کێلەکەوە دەنوسـێ. من کە نەزرەکەم بۆ راکێشانی دڵی ئەوە، هەر ئەوەتا لە خۆشیاندا باڵناگرم...

ئێسـتا من خۆم بـە بەختەوەرترین گەنجی دنیا دەزانم ... ئێسـتا من لە رێـی هیمەتـی ئەو پیاوچاکەو رەزای خوداوە بە ویسـاڵی ئەو شـاد دەبم. نازانـم خەڵکـی تر ئـەم چۆن دەبینن، بـەڵام لای من ئـەو جوانترین کیژی دنیایە ... خودایە، ئەو کاتە لای من، ئەو چەندە جوان بوو!! وامدەزانی خودا بەدەستەکانی خۆی هەرچی جوانیی ئافرەتی دنیایە، لەودا کۆیکردۆتەوە.

ئای ئەو هاورێیەم چەند ئازاری دام کە ئەوجارە پێی ووتم:

"من هیچ شـتێکی تایبەتی لەو کچەدا نابینم، لاشـم سـەیرە لای تۆ ببێتە هەوێنی شیعر."

هەر لەسەر ئەو قسەیەی، بۆ چەند مانگێک نەمدواند.

زیارەتـی گۆڕی ئەسـحابان تـەواو دەبێ و ئیدی نۆرەی چوونە سـەر گـۆڕی کافرانـە ... گۆڕی کافـران، چەند گردۆڵکەیەکی بەردینـن ... لە ژێر قورسـایی ئەو بەردانەدا، ئەو جەنگاوەرە کوردانە راکشـاون کە لە شەڕی بەرگریکردن لە سەروماڵو لە نیشتمانی خۆیان کوژراون.

هەریەکـەو چەند خڕکە بەردێک هەڵدەگرینو لەگەڵ هاواری (بە نەعلەت بن) دا رەجمی گۆڕەکانیان پێدەکەین.

چ میلەتێکـی بەسـتەزمان و نەگبەتیـن، ڕەجمـی گـۆڕی جەنگاوەرانی خۆمان و لسـتنەوەی کێلی گۆڕی داگیرکەرانیش بە تاعەتی خوا دەزانین!

وا بەقووڵی لەدەریای ئەو رابردووەدا رۆچووبووم، ئەگەر نەڕەو جوێنی سەربازانی خاڵی پشکنینەکەی دەروازەی سلێمانی نەبا، وا بە ئاسانی بەئاگا نەدەهاتمەوە.

ئـەو وەختەش لـە بازگەکە دەربازبووین، هەتـاو خەریکبوو جێی خۆی ڕادەستی سێبەری ئێوارە دەکرد.

# ٣

کاتێکی وام بەدەستەوە نەماوە، هەر ئەمشەوەو تەواو.. هەر ئەمشەو دوای دڵنیابوونەوەم لە کاتو شوێنی دیدارەکەی سبەینێ، دەبێ هەموو ئەو هاوڕێیانەشم بەسەرکەمەوە کە حەز دەکەم بۆ دوایین جار بیانبینمەوە.

یەکە یەکە، سەردانی هەموویان دەکەم پشتیوانیو هاندانی هەر یەکێکیان دیواری باڵەخانەی شانازی بەخۆوەکردنم بەرزتر دەکاتەوە ... لە ئاوێنەی چاوی هەریەکێکیاندا، وێنەی خۆم وەک پاڵەوانێکی ئەفسانەیی دەبینم. هەر ئەمشەوەو تەواو ... ئیدی لە سبەینێوە من پێشمەرگەم:

کاسکێتێکی ئەستێرەداری جیڤاراییو، تفەنگێک و شەش مەخزەنی بە فیشەک ئاخنراو!

هەندێ کتێب و کوڵەباڵێک و کۆڵەپشتێک و پوزەوانەی تا خوار ئەژنۆ هەڵکێشراو!

لە سبەینێوە، کە پێدەنێم بە زەویدا، زەوی کە شوێن پێکانی من بەسەر روخساری خۆیەوە دەبینێ، شانازی بەخۆیەوە دەکات!

کە مل بە هەورازی چیاوە دەنێم، لووتکەکان چەندیش بەرز بن، ئێرەیی بە بەرزی باڵای من دەبەن! کە وێنەی سبەینێی خۆم ئاوا دەبینم، هەستێکی قووڵی رەزامەندی هەموو دەمارەکانی جەستەم تەیدەکات.. هەستێکی سەیر دامدەگرێت .. هەستێک کە ئاوێتەیە بە درەوشانەوەیەکی ناوەکیو شاراوە ... هەر ئەو درەوشانەوەیەشە کە بڕوابوونێکی ناوازەو هێزێکی لە ڕادەبەدەری لە مندا خوڵقاندوە... رەنگە کەم کەس هەبێ، لە یەکێک لە چرکەساتەکانی ژیانیدا هەستی بەو درەوشانەوە ناوەکییە نەکردبێ... رەنگە لای هەندێ، ئەو درەوشانەوەیەو ئەڤینێکی زۆر بەتین بێ... لای هەندێکی تر حەزی دەسەڵات و سامان و، لای هی دیکەش شتی تر بێ.. بەڵام لەم ساتەوەختەدا، ئەو هەستە لای من ویستی گرتنەبەری رێگای تفەنگە... منێک کە قەت خۆشیم لە چارەی تفەنگ نەهاتووە، ئەوەتا ئێستا بەشەوق و ویستی خۆمەوە، ملی رێگای لەشانکردنی دەگرمەبەر... دەشێ ئەو خۆشی لە تفەنگ نەهاتنەشم هەر لە باوکمەوە بۆ مابێتەوە. زۆر شت بۆماوەیین، لە

دایکو باوکو باپیرانەوە، پشتاوپشت دەگوازرێنەوە... سیفاتە فیزیکیەکانو شـتە خولوقـی و دەروونـی و حـەز و نەخۆشـی و تەنانـەت دیانەتیش... ئەوەتا، حەز لە تفەنگ نەکردنی منیش هەر وایە. ئەو سـەردەمەی باوکم لە تەمەنی ئێسـتای مندا بوو، کەسـێک نەبوو، خەڵکی شتێکی پێ شک بەرنو، بۆ خۆپاراسـتن یان بۆ خۆ دەرخسـتن بـا، چەکێکی بەدیـواری ماڵەکەیدا هەڵنەواسـیبا. بیرم دێ و چەند جارێک ئاگام لێبووە، خزمەکانمان زۆریان لەگەڵ باوکمدا هەوڵدا تفەنگێک بکڕێ... کەچی باوکم هەر ملی نەداو نەدا:

«من تفەنگم بۆچییە ... خۆ دزیش بێتە سەرم تەقەی لێناکەم.»

باوکم ئەوسـا نەیهێشـت تفەنگ ڕوو لە ماڵەکەمان بکات، کەچی ئەوەتا من، بەرەو کردنەشانی تفەنگ دەڵێی، لەسەر ئاوو ئاگرم...

ئەوەتـا مـن، بەپێـی خۆم و بە تاسـە و بـە ئیرادەیەکی تـەواوەوە، بۆ لـە ئامێزگرتنی تفەنـگ، بەرلەوەی خۆر لـە خەو ڕابـێ، لەبەردەمی بانکی ڕافیدەیندا وەسـتاوم... تەنها منو چەند کرێکارێک... کرێکارەکان چاوەڕێی وەستاکەیانن، تا بەخۆیو پیکابەیەکەیەوە بێت و بیانباتە سەر ئیش... منیش چاوەڕێی دەلیل و ئەو نامەیەم کە ڕێکخستنەکانی ناوشار، سەبارەت بە من، بۆ ڕێکخستنی دەرەوەیان نووسیوە.

نامەکـەم خسـتۆتە دووتوێی دەفتەرێکی شەسـت پەڕیەوەو، ئەویشـم خستۆتە بن هەنگڵم... وشـەکانی لە کۆمەڵێک پەپولەی ڕەنگاورەنگی زیندو دەچن... هەسـت بە لێدانو ترپەی دڵیان دەکەم، ئاخر چۆن هەسـت ناکەم، هەرچی خەیاڵو هەسـتو سـۆزو هەڵچوونی تەمەنی حەڤدە سـاڵیم هەیە، وەک پرتەقاڵێکـی ئاودار گوشـیومەو، دڵۆپ دڵـۆپ تکاندومەتە ناو پیت بە پیتی ڕسـتەکانیەوە "ئەو خۆشەویسـتیەی من بۆتۆ هەمە، سنوور بەخۆوە ناگرێ... خۆشەویسـتیەکی پاکو بێگەرد... خۆشەویستیەک بۆ ڕۆژێکو بۆ دوو ڕۆژو بۆ سیان نا، بەڵکو تا کۆتای تەمەنم...." دە دەقیقەیەکی تر ناباو ئەو لێرەیە... ئەو، لە ئەو و لە باڵاو ڕوخساری بەوڵاوە، شتێکی دیکەی دەربارە نازانم، تەنانەت ناوەکەشـی... هەموو بەیانیـەک، ڕۆژانی هەینی لێدەرکەی، لـە ڕێی چوونە قوتابخانەی هەردووکماندا، تووشـی یەکدی دەبین... لەگەڵ نیگایـەک و زەردەخەنەیەکدا، یەکتر دەبڕیـن... نیگا و زەردەخەنەکانی ئەو، بەسـن بۆ ئەوەی پردێک لە هەسـت و حەز بەیەکمانەوە ببەسـتێ... نازانم ئەوە هەستە یان ئەوینە... یان هەر حاڵەتێکی ناسروشتی و ڕاگوزەرە... من ئەمانـە نازانم، بەڵام دەزانم کە شـتێک لەودا هەیـەو، من بەرەوخۆی کێش

دەکا... شتێک لەودا هەیەو نازانم چییە... لە راستیدا ناشمەوێ بزانم چییە... دۆزینەوەی ئەو شتە نە کاری منەو نە بە گرنگیشی دەزانم... ئەوەی بۆ من گرنگە، شتێکی نادیار لەودا، منی شەیدای ئەو کردوە...

ئەو شــتە نادیاریانەی لە کەســێکدا، توانای کێشکردنی هەستو سۆزی کەســێکی دیکەیــان هەیە، ســیحرێکیان تێدایە... ســیحرەکەش لەوەدایە، تۆ نازانی ئەو شــتەی کێشــت دەکا چیەو چۆنە... رێک وەک هێزی کێشکردنی زەوی کــە هەموو تەنێک بەرەو خۆی کێشــدەکات... کەســیش نازانێت ئەو هێزە سیحرییەی پێی دەڵێن هێزی کێشکردنی زەوی چییەو چۆنە.

تا دێ وێستگەی پاسەکە قەرەباڵغتر و بێ ئۆقرەییش لە چاوەڕوانی مندا زۆرتر دەبێ... لەپاڵ دیواری بانکەکەدا وەســتاوم... وەستاوم و سێرەم لەو ئاقــارە گرتــووە کە بە هیوام مانگی ڕووخســاری ئەوی لێــوە هەڵبێت. ئەو لێیــەوە دەردەکــەوێ... لــەم چاوەڕوانەیەمدا، خۆم وەک ئــەو ڕاوچیە دێتە بەرچــاو کە بەخۆیو تاپڕێکەوە، لەناو ســیپەی[18] نزیک کانیاوێک یان گۆلە ئاوێکدا، خۆی مات داوەو سێرەی لە شوێنی نیشتنەوەی ئەو باڵندە تینووانە گرتــووە کە بۆ خواردنەوەی قومە ئاوێک لە بەردەمیا دەنیشــنەوە... ئەوەتا خەیاڵــی هاتنی ئەویش کەوتۆتە ناو ســێرەی روانینی منــەوە... دڵم خێراتر لێدەداو، هەست بە شڵەژانێکی نا سروشتی دەکەم، شڵەژانێک کە لە ژیانمدا بەخۆممەوە نەبینیوە... ئەو دەگاو پاسەکەش لەگەڵ ئەودا. دەچمە نزیکیەوەو بە زەحمەتێکی زۆرەوە، وەک ئەوەی سەتڵە ئاوێک، لە بیرێکی قوڵی تەڕایی تێدا نەماوادا هەڵهێنجم، چەند وشەیەک لە قوڕگی وشکهەڵاتووم دەردێنم:

- ئەم کاتەت باش..

چاوەڕێی وەڵام ناکەمو دەفتەرەکەی بۆ ڕادەدێرم:

- زەحمەت نەبێ ئەم دەفتەرەم لێ وەرناگری؟

ئەو لە من زیاتر دەشڵەژێ و بە حەپەسانێکی زۆریشەوە:

– دەفتەری چی؟!

- تۆ وەریگرە و دواتر دەزانی.

---

١٨- سیپە: ئەو سەنگەرەیە کە ڕاوچی لە نزیک کانی و ئاو لە پوشوپەڵاش درووستیدەکات. هەروا بە سندوقی چاش دەوتریت سیپە.

من هەست بە وجودی کەس ناکەم... ناشزانم کەس سەیرمان دەکات یان نا، بەڵام لە روخسارو کاردانەوەی ئەودا تێدەگەم، هەرهەموویان بە فزوڵیەتێکی زۆرەوە، سەیری ئەم رەفتارە هەرزەکارانەی من دەکەن.

پاس دەجوڵێ و وێستگەکە لەمن بەولاوە کەسی دیکەی لێنامێنێ. خۆم وەک سەربازێکی بەجێماوی ناو شەڕگەی نەبەردیکی دۆڕاو دێتە بەرچاو... بە دڵێکی پڕ لە غەمو بە ڕوویەکی تەریقبارەوە، ئەو ناوە جێدێڵم... جێیدێڵمو ئەو دەفتەرو نامەیەش وەک تاکە شاهید دەدڕێنم... تاکە شاهیدی لەبارچوونی یەکەمین هەوڵی دڵداری من... تاکە شاهیدی خۆ فڕێدانی من بۆ ناو جۆلانەی دڵی کچێک... خۆفڕێدانێک کە مەترسیدارترە لە خۆهەڵدانی کەسێک، لەسەر کەندەلانێکی زۆر زۆر بەرزەوە بۆناو ئەو چەمەی لە قولەپێیەک زیاتر ئاوی پێدا ناڕوا.

ئەوێ جێدێڵمو، ئیدی لەوێ بەدواوە قەت نەمتوانیەوە بە دیقەتەوە تەماشای روخساری هیچ ئافرەتێکی نەناسیاو کەم، نەوا بەو نیگاکردنەم، شتێک لە ئیحراجی بۆ دروستکەم.

ئەو رۆژە، شتەکان بە پێچەوانەی چاوەڕوانیو حەزو ویستی منەوە رووویاندا... ئنجا نازانم هەڵەی من بوو یان هەڵبژاردنی کات و شوێن، یان هەر لە بنچینەدا هەڵەی هەڵبژاردنی ئەو.

پێدەچێ ئەمڕۆش هەڵەیەک روویدابێ، جا نازانم هەڵەی کات و شوێنە یان شتی تر.

خەریکە کاتژمێر تێدەپەڕێو دەلیل نەهات، دەبێ هەر ئێستا ئێرە جێبێڵم، ڕێنمایی ڕێکخستن وا دەڵێ، دەبێ هەموو ئەگەرەکان لەبەرچاو بگرم... کێ دەڵێ دەلیلەکەم نەگیراوە... خۆ ئەگەر بە نامەکەی منەوە گیرابێ، ئەوا من بەرلەوەی ببمە پێشمەرگە تێداچووم... کێ دەڵێ حکومەت، خەتمایلێکی نییەو لە ڕێی ئەوەوە بەو دیدارەی نەزانیوە... ناچار دڵی خۆم بەوە دەدەمەوە، ئەگەر یەکێک لەو ئەگەرانە راست بوونایە، ئێستا دەبوو دەمێک بوایە، ئەم ناوە، بە ئەمنو هێزی تایبەت تەنرابایە.

بەدەم ئەم غایلانەوە[١٩]، شوێنەکە جێدێڵم... دواتر لەگەڵ رێکخستندا، کاتو شوێنێکی دیکە، بۆ دیداری ڕۆژی دوایی هەڵدەبژێرین.

---

١٩- غایلە: خەیاڵ.

# ٤

بــە دەســتوری دوێنێ، لە ماڵێ (ماڵی مریەمی پــورم) دێمە دەرێ. خۆر، خەریکــە بە دەســت وپەنجەی تاڵە تیشــکە هاوینیەکانی، تەنکە ســوراوێک دەخاتــە ســەر گۆنــای زنجیرە چیاکانی دەوری شــار. چارەکە ســەعاتێک زووتر دەگەمە شــوێنی دیاری کراو. هێشتا جادەی ئەسحابەسپی ئاوەدانی تێنەکەوتوە. دوو کارمەندی شارەوانی، بە دوو گسکی درێژەوە شۆستەکانی ئەمبەرو ئەوبەر دەماڵن. بەرامەی گەڵا ڕەونەقدارەکانی ڕیزە دارتووی سەر شۆســتەکان، ئەوناوە بۆنپرژێن دەکات. چەنــد خولەکێک لەنێوان ئەو دوو دارتووەدا دەوەســتم کە ڕێک بەرامبەر بە مزگەوتی (دوو دەرگا)ن. خۆمو عەلاگەیەکی سووری نایلۆن... عەلاگەیەک تەنها چەند کتێبێکو دەستێک جلی ژێرەوەو کاسکێتێکو هیچی تر نا. دوکانەکان خەریکە تاک و تەرا دەکرێنەوە. نەبادا بەو شێوە وەستانەم، دووکاندارەکان لە خۆم خانە گومانکەم. بۆ ئەو هەشت نۆ خولەکەی ماوە، خۆم بە دەرگای حەوشەی مزگەوتەکەدا دەکەم... هەر بــۆ دڵنیاکردنەوەی خۆشــم، لە دەرگاکەی ئەودیویشــەوە، چاوێک بە کۆڵانە هێشتا چۆڵ و هۆڵەکەدا دەگێڕم... بەدەم پیاسەی هێواشەوە، لەسەر پیــادەڕۆی نێــوان هــەردوو دەرگای مزگەوتەکەدا دێم و دەچــم. لە من و مەلاو جار جارە هاتنی کەســێک بەولاوە، مزگەوت کەسی دیکەی تێدا نییە. کەســەکان دێن تا لە حەوزی شلەتێنی مزگەوتا، وسڵی جووتبوونی شەوی پێشــویان لەخۆیان دەرکەن. من، خەریکــی خۆخافڵاندنو چاوەڕوانی کاتی دیاریکراوم. مەلاش، لە هەیوانی مزگەوتدا خەریکی نوسینی شتێکە... ڕەنگە وتاری هەینی بێ، یان هەر شــتێکی تر. ئەمن لەماوەی ئەو دە ســاڵەی نوێژ کردنمدا، لە پۆلی چواری ســەرەتاییمەوە تا یەکەم ســاڵی زانکۆ، بیرم نایە نوێژێکــی هەینیم لــە مزگەوتدا نەکردبێ... چەندیش دوور بووبم، بۆ نوێژی هەینی هەر بە مزگەوت ڕاگەیشتووم... هەڵهێنانەوەی هەر هەنگاوێک بەرەو نوێژی هەینی، گوناهێکم هەڵوەرێنێ، چۆن ئەو نوێژە لە کیسی خۆم دەدەم... ســەرم چووبێ، نوێژی هەینیم نەچووە. لەماوەی ئەو دە ســاڵەدا، گوێم لە سەروی پێنجسەد وتاری مەلای جیا جیا بووە... وتارەکان، زۆرینەی هەرە زۆریان، بە وتاری ئەم مەلایەی بەر هەیوانی مزگەوتیشەوە، لەیەک دەچن... وێــڕای ئــەوەی خاڵیی نین لە هاندانــی خەڵک بەرەو چاکــەو خۆ لە خراپە بەدوورگرتن، بەڵام تێکڕاش پڕن لەو هەڕەشانەی خوا لە عەبدەکانی خۆی دەکا... هەڕەشەی غەزەب گرتنی خوا، هەڕەشەی ئەشکەنجەدانو سووتانی

هەتا هەتایە لە ناو ئاگری دۆزەخدا... وتارەکان هەموو پڕن لە هەڕەشە، بەڵام خاڵین لە دیمەنی ئەو هەڕەشـانەی داگیرکەران لەم وڵاتەی ئێمەدا، لەسـەر عەبدەکانی خوا هەیانە... پڕن لە دیمەنی سووتاندنی مرۆڤەکان، بەڵام خاڵین لە دیمەنی سووتانی رەزو باخ. خاڵین لە دیمەنی لەگەڵ زەوی تەخت کراوی هەزاران گوندی نیشـتمان... خاڵین لە دیمەنی کوشتنی رۆژانەی خەڵکو لە دیمەنی دەرگای هەمیشە ئاوەڵەی زیندان... خاڵین لە دیمەنی قەدەغەکردنی زمـان و ناوهێنانی کوردسـتان... خاڵین، خاڵین لـە دیمەنی ئەو دۆزەخەی، لەسـەر ئەم زەویەی خـودادا، داگیرکەران بۆ میللەتی ئێمەیان جۆشـداوە. نازانـم بۆ ئەو مەلایانەی ئێمە، لەوەتەی هەن، دین بۆ ملکەچپێکردنی ئێمەو رانەسان لە بەرامبەر خەلیفەدا بەکاردێنن، کەچی مەلاکانی ئەوان، مەلاکانی تورک و عەرەب و عەجەم، هەر لەسـەردەمی پێغەمبەرەوە تا ئێسـتاش لە پێنـاوی باڵادەسـتبوونی نەتەوەکانی خۆیاندا، هەر خەریکی لە هەسـاندانی شمشێری ئاینن.

سـەیری کاژێرەکەی دەسـتم دەکـەم، دوو خولەکی تر دەبێتە شەشـی تـەواو. لە حەوشـەی مزگەوت دێمە دەرێ... ئەوەتـا بەخۆیو عەلاگەیەکی سـوورەوە وەستاوە... وەستان لەنێوان ئەو دوو دارتووە قەد ئەستوورەی بەرامبەر دەرگای مزگەوتو عەلاگەی سـوور بەدەسـتەوە، هەر ماوە ناوە نهێنیەکەشی (سیروان) بێ. بەرەولای ئەو لە جادەکە دەپەڕمەوە.

- بەیانیت باش کاک هیوا.

- ژیانت باش کاک سیروان.

سـیروان[٢٠]، گەنجێکـی باریکەلە و سـوورکەلەی لە من بـاڵا بەرزترە... گەنجێک، ئەوەی نیشانەی ترسو دوودڵییبێ، لە روخساری ئەودا نابینرێ... گەنجێک، هەر لەگەڵ یەکەم نیگادا، بڕواو متمانەت بەلای خۆیا دەبا.

---

٢٠ـ خالیدی سەید مەحمودی باخچەیی. لە ساڵی ١٩٧٤دا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە دەکات. یەک لە ئەندامە زۆر چالاک و چاونەترسەکانی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شاری سلێمانی بوو. سەرباری ئەوەی لە هێنان و بردنی نامەو پێداویستی ڕێکخستنداو لە بردنە دەرەوەی ئەو ئەندامانەی ڕێکخستن کە دەیانویست پەیوەندی بە ڕیزەکانی پێشمەرگەوە بکەن، ماڵەکەی خۆیشی سەردەمانێک کردبووە شوێنی چاپخانەی نهێنی شۆڕش و شوێنی حەوانەوەی ئەو ئەندامانەش کە لە ترسی گرتن و ڕاوەدوونان پێویستیان بە پەناگەیەک هەبوو.

سیروان بە هەنگاوی گورج، چەند مەترێک لە پێش منەوە رێدەکا... منیش وەک سێبەری ئەو بەدوای دەکەوم. چەند سەد مەترێک بەولاوە، سیروان دەرگای پێشەوەی ئەو تەکسیە دەکاتەوە کە پێدەچێ لە چاوەڕوانی ئێمەدا، لەبەردەمی دوکانێکی هێشتا نەکراوەی رۆنگۆڕیدا وەستاوە. ئەو سوار دەبێ‌و منیش بەدوایدا. تاکسی دەکەوێتە جووڵە. دوای ئەوەی سیروان شوفێرەکە بە(جەبار) بە من دەناسێنێ، لە بەینی خۆیاندا دەکەونە قسان... بە قسەکانیاندا پێدەچێ هاوڕێ بن یان باش یەکتری بناسن. منیش لە بەشی دواوەی تەکسیەکەدا، خۆم بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە سەرقاڵ دەکەم... بە جەستە لەناو تاکسیەکەدام‌و بە خەیاڵ‌و فکریش لە دواین خاڵی پشکنین.

ئێمە لە تاکسیەکە دادەبەزین... سەرو بنی ئۆتۆمبێلەکە دەگەڕێن... هەموو شتێک قاچاخە، نامەیەک، وێنەیەک، لاپەڕەیەکی بڵاوکراوەیەکی نهێنی، تەنانەت پاکەتە حەب‌و شووشە دەرمانێکیش... من‌و سیروان‌و شوفێرەکەش، دوای ئەوەش نوقسانیەک لە ناسنامەکانماندا نابینەوە، یەک بەدوای یەکدا دەبرێینە ژووری پشکنین. سەرەتا لە منەوە دەستپێدەکەن... جلەکانم پێدادەنێن‌و گیرفان‌و تەنانەت جلی ژێرەوەو پشتی یەخەی کراس و ناوو پزوی شەرواڵەکەشم دەدۆزن... بەدوای چیدا دەگەڕێن با بگەڕێن، من شتێکم پێ نیە تا لە دۆزینەوەیدا توشم کا... ترسی گەورەی من سیروانە... هەر ئەوەندە ئەو نامەیەی کە دواتر تەسلیمی منی دەکا، دۆزرایەوە، ئیدی هەرسێکمان بە شەق‌و زللەو قۆناغە تفەنگ تا دائیرەی ئەمن ناوەستێنن.

خودایا، من چەند لە گرتن‌و بەرگەنەگرتنی ئەشکەنجەدان دەترسم، دەترسم بەرگەی بە پانکەوە هەڵواسین‌و نینۆک هەڵکێشان‌و ئاگر بەجەستەوە نان‌و شێوازی دیکەی هاوچەرخی ئەو دڕندانە نەگرم... خودایە، دەبێت چەند ڕۆحت خستبێتە ناو جەستەی ئەوانەوە کە بەرگەی ئەو هەموو ئازاردانەی بەعس دەگرن، لەوەش زیاتر، ترسی هەرە گەورەی من ئەوەیە، بەر لەوەی ببمە پێشمەرگە تێدا بچم.

"یەک سەعاتیش پێشمەرگە باو ئنجا دوایی شەهید ببا، ئەوەندە خەفەتم بۆ نەدەخوارد." ئەوە قسەی وەستا عومەری دارتاش بوو.

سەلامی وەستا عومەری دارتاش، چەند هەفتەیەک دوای تەواوکردنی زانکۆ، بەرلەوەی بگاتە ناوزەنگ و نامەی پشتگیریەکەی ڕێکخستن رادەستی ناوەندی کۆمەڵە کا، لەسەر ڕێگای نێوان قەڵاتوکان و نێوزەنگدا، بە گوللە هاوەنی رەبیەکانی سەر بەرزاییەکانی بەردەم رەزگە و مارەدوو شەهید کرا.

ســـەرهەڵدەبڕم، خەریکــە لە ئارەقــەدا نوقم ببم... جەبار، لــە ئاوێنەکەی بەردەمییــەوە ســـەرنجمدەدات... دەڵێــی دکتۆری دەروونناســـییە... جوڵەی نائارامی دەموچاوم دەخوێنێتەوە:

- نارەحەت مەبە، هیچ باس نیە... هەرئەو خاڵی پشــکنینەی پێشـــوەمان مــاوە، ئەوانیش هەموو من ئەناســـن.. وەک ســـایەقی خەتــم لێهاتووە، زوو زوو لێرەوە دێم و دەچم، سوپاس بۆ خوا، تائێستا تووشی هیچ کێشەیەک نەهاتوین.

"نا...نا... نارەحەت نیم... هەر لەخەیاڵی ناخۆشەوە ڕۆچونە و هیچیتر نا"

هەر بۆ زیاتر دڵنیایی کردنەوەی منیش، دەڵێ:

- خەمی نامەکەشــت نەبێت، لەشـــوێنێکی وادا شـــاردومەتەوە، خوانەبێت بەکەس نادۆزرێتەوە.

لەو قسانەداین و دەگەینە ئەو خاڵی پشکنینەی چەند خولەکێک لەوەوبەر، خەیاڵمی داگیرکردبوو.

- خەمت نەبێ، ئەو سەربازەیان کوڕێکی زۆر باشەو لەترسی فەرماندەکەی نەبێت، هەر داوای هەویە و شتیواشـــمان لێناکات، بەر لەوەی ســـەربازەکە بگاتە لامان، جەبار وا دەڵێ.

وەک ئــەم ووتــی هەروابــوو... داواکردنی پێناســـەو پشــکنینی گیرفانی دەرگاکان و چەکمەجەی داشبول و هەڵدانەوەی سندوقی دواوەش، هەر بۆ ڕازیکردنی فەرماندەکەی خۆیبوو.

هەر ئەوەنــدە چەند مەترێک دووردەکەوینەوە، جەبــار، دەنگی ڕادیۆکە بەرزدەکاتەوە... ســـەیدعەتاوولای سیامەنســـوری، بە گۆرانی(هەی لەدوور لەدوور) ترس و لەرزی خاڵی پشکنینمان بیردەباتەوە.

- ئیتــر تەواو، مەترســـی حکومەت نەمــا... (١٠) دەقیقەی تر نابا، دەگەینە سەر جادەی خۆڵ... چارەکێک بۆ ئەویش دانێ، ئیتر لەوێ بەدواوە، هەوای ئازادی هەڵئەمژی، جەبار، لەڕێی ئاوێنەکەی بەردەمیەوە، هەموو ئەوقسانەم بۆ دەکات.

ڕەنگــە لەو ئاوێنەیــەدا ڕووخســـاریم نەدیبا، دیمەنــی دوای دابەزینمان ئەوەندە بۆ من شۆک نەبا.

دوو دار شــەق، قورســایی نیوەی جەســتەی مرۆڤێکیــان هەڵگرتووە... بەدوای نیوەکەی دیکەیدا دەگەڕێم و نایدۆزمەوە... وەک سیروان دواتر پێی ووتــم، ئــەو نیوەیەی لە بۆردوومانی ســاڵی ١٩٧٤ی هەڵەبجەدا، بۆمبایەک پەڕاندوویەتی.

باوەڕ بە چاوەکانی خۆم ناکەم... هەرچەند دەکەم ئەو سەروڕیش و ئەو ڕووخسارە جوانەی کە لە بەشی سەرەوەیدا دەبینم، لەگەڵ ئەو بەشەدا کە نایبینم، بۆم ناخرێنەوە سەریەک.

ئەو کە من بەو شڵەژاویی و حاڵینەبوونەوە دەبینێ، بەتۆنێکی پڕ لە بڕوا بەخۆبوونەوە، پێم دەڵێ:

- بەزەیــت بەمنــدا نەیەتــەوە... ئــەم نوقســانییە بەچاکە بۆخــۆم و بۆ ڕێکخســتنی کۆمەڵــەش گەڕاوەتەوە... ســیروان دەزانێــت، هەرچی نامەو بەیانی نهێنییە لەو ســلێمانیەدا، من بەم تاکســییە ئەیانگوازمەوە... هەموو ئەوانــەش بەدزییــەوە دێنە ناوشــار، یان لە ناوشــارن و ترســی گرتنیان لەســەرە، هــەر مــن ئەیانهێنم و ئەیان بــەم. ڕەنگە لات ســەیربێت ئەگەر بڵێــم، مولازم موحســین نەبا، قەت ئــەو کارانەم بەم ئاســانییە بۆ ئەنجام نەئــەدران:

«ڕۆژێک کەوتمە ناو مەفرەزەی ملازم موحسینەوە، هەر کە بەم سەرو ڕیشــەوە بینیمی، شــێت و هاربوو... تا دەم و قوڕگی تف وجوێنی تیابوو، بەدەمووچاویا کردم، دواتر دەرگاکەی کردەوەو بەهەردوو دەســت نوسایە یەخەم و ڕایکێشــامە دەرەوە... کــە منی بەم وەزعەوە بینی، بەودڕندەییەی خۆیەوە، چاوی پڕبوو لە ئاو... باوەشی پیاکردم و ماچی کردم... هەرخۆشی بەباوەش هەڵیگرتم و خستمیەوە سەر کوشنەکەی خۆم... بەرلەوەی جێشم بێڵێــت، ژمــارەی تەلەفونێکی دامــێ، "ئەمە ژمارەی شەخســی خۆمە.. لێرە بەدواوە هەرکەسێک، لەهەرکات و شوێنێکدا ڕایگرتی، یەکسەر تەلەفونم بۆ بکە."»

گێڕانــەوەی ئەو چیرۆکە ئەوەندەیتر دڵم پڕدەکات. باوەشــێکی گەرم و توندی پێدادەکەم و لەگەڵ سوپاسێکی زۆردا، ماڵئاوایی لێدەکەم.

کــە بۆ دوایینجار ئاوڕی لێدەدەمەوە، ڕوومەتەکانی وەک گەڵای درەختی شــەونم لەســەر نیشــتووی بەیانیانــی بەهــاران، هێشــووی فرمێســکیان گرتووە.

مــن نازانم ئەو فرمێســکانە بــۆ دەربڕینی ناڕەحەتین لــەوەی کە من لە هەڕەتی لاوێتیمدا پشت دەکەمە خۆشیەکانی ژیان و بەگژ مەرگا دەچم، یان فرمێسکی خۆشین بۆ ئەوەی کە توانی ئیمڕۆکەش بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی، پێشمەرگەیەکی دیکەش ڕەوانەی چیا بکات.

من کە قەت بۆ هیچ شــتێک ئێرەییم بەکەس نەبردووە، لەوچرکە ساتەدا ئێرەیی بەگەورەیی و ئازایەتی و بەخۆنەویستی جەباردەبەم و لەدڵی خۆمدا دەڵێم:

"ئەگەر شــۆرش ســـەرکەویت، دوو قاچی ئالتونیشــت بۆ درووستکەن، هێشتا هەر هیچیان بۆ نەکردویت."

# ٥

جەبار لەناو تەپوتۆزی ڕێگا خۆڵەکەدا ووندەبێ و... ئێمەش ملمان بە بەر ملی چیای گڵەزەردەوە ناوە و ورد وردە پیا هەڵدەزنێین...

جارجارە سووکە ئاوڕێک لە سلێمانی دەدەمەوە... خەریکە ئەویش دەبێتە پارچەیەک لە تارمایی...

پێـری، ماڵئاوییـم لـە باب و داکم کـرد... چ دڵێکی بەردینـم هەبوو، ئەو هەموو بارانی فرمێسـکەی ئەوان هەڵیانڕشت، بەردێکی دیواری هەڵوێستی منیان پێتەڕ نەبوو...

شـەوی پێشـتر، ئەوەندەی کاتم هەبوو، ئەو هاوڕێیانەم بەسەرکردەوە کـە وێنـەی پێشـمەرگە خەیاڵیەکەی خۆمیـان، لە ئاوێنـەی چاوەکانیانەوە نیشاندام.

دوێنێـش ئـەم کاتانە، دوای بـێ ئومیدبوونـم لە هاتنی دەلیـل و دوای شکستهێنانیشـم، لـە رادەسـتکردنی نامەکـەم، بـە جـادەی پیرەمێـردا سەرکەوتم...

ئێمڕۆ، ڕۆژی بەڕێکردنی دەرچووانی زانکۆی سلێمانیە، بۆ سەربازگەکانی مەشـق و ڕاهینان... لەبەردەم و لە بەرامبەر فەرمانگەی تەجنیدا، پاسـەکان یـەک بەدوای یەکدا وەسـتاون.. بەدەوری پاسـەکاندا دەخولێمـەوە... هەر بەدەمـو چاویـش بێ، زۆربەیان دەناسـمەوە... ئەوەتا هاوڕێکانی خۆشـم دەبینم... ئەوە ڕزگار و، ئەوە ڕێبوارو، ئەوە نەژادو... ئەوە... ئەوە هەموویان، هەموو ئەوانەی وامدەزانی لەگەڵ تەواو بوونی زانکۆدا، وەک من، پشت لە سەربازیو ڕوو لە چیا دەکەن.

دەسـت بۆ یەکتری ڕادەوەشـێنین و لە ناخیشـدا، گێژەنگی هەسـتێکی ناخـۆش لوولـم دەدا... هەسـتێکی خەمئامێز، وەک ئەو هەسـتەی لە دوای ئاوابوونی مانگەوە دامدەگرێ...

چ دیمەنێکی پەسـتکەرە، سـەنگەرەکانی بەرەنگاریی بانگت کەن و تۆش بە هەموو هۆشیارییەکی خۆتەوە، ببیە سەرباز... چ دیمەنێکی غەمگینە... لە شـوێنێکدا خزمەت بکەی، شوێنی خزمەتی تۆ نەبێ... لە شوێنێکدا تێدابچی، شوێنی مردنی تۆ نەبێ.

چەند هەنگاوێکی دیکەو لە تەپڵەسەری شاخین...

دووکەڵـی چالێنانـی شـوانێک، بەرەو خۆیمان ڕادەکێشـێ... سـێبەری گابەردێکـی پـاڵ ئاگری شـوانەکە، دەکەینـە جێی پشـوودانمان و خۆمان دەدەینە بەر ئەو پشـووە بایە فێنکەی لە قۆپی قەرەداغەوە دێ. شـوانەکە، بەو تاکە پیاڵەی پێیەتی، بە نۆرە چامان بۆ تێدەکا.

سیروان، هەواڵی مەفرەزەی پێشمەرگەی لێدەپرسێ و ئەویش دەڵێ:

ـ قـەرەداغ پێشـمەرگەی لێنابـڕێ... بـەڵام بـە ئاسـانی نادۆزرێنەوە... بەمەفـرەزەی بچووک بچـووک جەولەدەکەن، هەر ڕۆژەی لە شـوێنێکن... ئەمشـەو لێرەن بۆ سـبەینێ، چەند سـەعاتە ڕێیەک دوورکەوتوونەتەوە... بـە ڕۆژ بـەو شـاخ و داخانـەوەن و ئێوارانیش بەر لە نانخـواردن، لە ناو دێیەکاندا پەیدا ئەبن، نان ئەخۆن و پشوویەک ئەدەن، کۆبوونەوە بە خەڵکی ئاوایـی ئەکـەن و ئیتر وون ئەبن... ناهەقیان نیە وائەکـەن... ئەگەر وانەکەن حکومەت ئاسان زەفەریان پێدەبات... لەگەڵ ئەوەشا، هێندە زەختی جەیش و جاش و تەیارەیان لەسەرە، هەفتە نیە یەک ـ دوانێک شەهیدنەبن... بڕواناکەم پێشمەرگەی هەموو کوردستان بەقەد پێشمەرگەی ئەم قەرەداغە، حکومەتیان بـە خۆیانەوە مەشـغوڵکردبێ... پێشـم وانیە هیچ جێگایەک بۆ پێشـمەرگە، ئەوەندەی قەرەداغ خەتەرناک بێت.

ڕوودەکاتە ئێمە:

ـ خۆ ئێوەش بەتەمانین ببنە پێشمەرگە؟!

سیروان، بە ئاماژەی سەری، ڕووی پێدەکاتە من.

لـە تەوقەسـەرمەوە تا بنی پێـم کێومالّی دەکات... بە تۆنێـک کە پڕە لە دڕدۆنگی[٢١] و بڕوانەکردن و گاڵتەپێهاتن، بە گۆچانەکەی ئاماژە بۆ لای من دەکات، بە جۆرێک لە تەوسەوە، دەڵێ:

---

٢١ـ دڕدۆنگی: گومان

ـ ئەم برادەرە ئەبێتە پێشمەرگە؟!

ـ بەڵــێ مــن دەمــەوێ ببــم بــە پێشــمەرگە، بــە جۆرێــک لە شــانازی بەخۆوەکردنەوە، وادەڵێم.

ـ بەقسەی برای خۆت ئەکەی هەتا حکومەت و کەسیش پێی نەزانیوی، لە ئێستا زووترنیە، هەر بەو ڕێیەی پیاهاتووی، بەوێدا بگەڕێرەوە...

ـ بۆ... بۆ.. وا دەڵێی؟! بەسەرسووڕمانەوە پێی دەڵێم.

ـ کاکە پێشــمەرگایەتی پیاوی خۆی ئەوێ... کوا بە ناســکە شاری وەکو تۆ دەکرێ...

ـ مرۆڤ ئیرادەی هەبێ هەموو شتێکی پێدەکرێ...

ـ ئیرادەشــت هەبێ بەرگەی ئەو ژیانە قورسەی پێشمەرگایەتی ناگری... کوا بەرگەی ئەو هەموو پەلامار و هێرشەی حکومەت ئەگری... کوا بەرگەی برسیەتی و ئەو هەموو هەورازونشێو بڕینە ئەگری...

سیروان قسە بە شوانەکە دەبڕێ و ڕوودەکاتە من و بە گاڵتەوە دەڵێ:

"هەستە تا پەشیمانی نەکردوینەتەوە، بابڕۆین..."

هەڵدەســتین و تەســکەرە و ڕەگەزنامەکەم لە گیرفانم دەردەهێنم و هەر بەپێوە دەیانخەمە سەر ئاگرەکە... بەگاڵتەشەوە، دەڵێم:

ـ بۆ ئەوەی پەشیمانمان نەکەیتەوە، ئەوەتا هەر دووکیان دەسووتێنم..

مــن کە لــە ناخمدا ئینتمای عیراقــی بوونم نەبێ، بۆ لەســەر ڕەگەزنامە هەمبــێ... ئــای خودایە، وەختی خــۆی، لە هاوینی ١٩٧٠دا چەند بەدەســت دەرکردنی ئەو ڕەگەزنامە نەفرەتیەوە هیلاک بووم...

"ـ ئەوراقەکانت ئیفادەی سەرۆک عەشیرەتیان کەمە...

ـ ئاخر من عەشیرەتم نیە...

ـ بۆتۆ قەرەج و دۆمی؟!

ـ نا هیچیان نیم، بەڵام عەشیرەت و سەرۆک عەشیرەتیشم نیە.

ئەگەر ویرابام، پێم دەووت، ئەوەی تۆ بەشوورەیی دەزانی من شانازی پێوەدەکەم.

- بچیە بەغدایەش، دەتگێرنەوە ئێرە.

ئەوە گفتوگۆی نێوان سەلیمی نوری بەگ ومن بوو... سەلیم فەرمانبەری نفوسی ڕانیە بوو...

سەلیم ڕاستیکرد، لە بەغداوە، بۆ ئیفادەی سەرۆک عەشیرەت ناردیانمەوە ڕانیـە. هاتمەوە ڕانیـەو وەک ئەفسـەری فەرمانگەی ڕەگەزنامـەی بەغدا، ئامۆژگاریـی کردبـووم، موختـاری ڕانیەم لەگـەڵ خۆمدا بـردە بەردەمی فەرمانبەری نفوس... موختار ئیفادەی بۆ دام کە من عەشیرەتم نیە...

ئیدی سـەفەرێکی دیکەی بەغـدا، کردمیە خاوەنی ئـەو ڕەگەز نامەیەی کەوا ئێسـتا، بۆ کۆتایـی هێنان بە عێراقی بوونی خۆم، ئاگری شـوانەکەی پێخۆشتر دەکەم.

دوای ئەوەی هەریەکەو چەنـد قومە ئاوێک لە کورنەکەی[٢٢] ئەولامانەوە دەخۆینـەوە، ماڵئاوایی لە کاکی شـوان دەکەین و بەرەو قامیشـان، سـەر بەرەوخوار ملی بزنە ڕێیەک دەگرین... قامیشان دەبێتە شوێنی ژووانی من و یەکەم مەفرەزەی پێشمەرگە... سێ ساڵ بەسەر هەڵگیرسانەوەی شۆڕشدا تێپەڕیوەو من تا ئێسـتاش پێشمەرگەی (شۆڕشی نوێ)م نەبینیوە... وێنەی پێشـمەرگەم تەنها لە ناوبڵاوکراوەکانی شـۆڕش و لەناو قسەوباسـی ئەو خەڵکانەدا دیوە کە پێشـمەرگە بە پاڵەوانێکی ئەفسـانەیی وەسـف دەکەن... پێشـمەرگەکانی شۆڕشی نوێ، پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، لە مەخلوقاتی سەر ئەم هەسـارەیە ناچن... ئەوان لە هەسارەیەکی ترەوە هاتوون... یەک پارچە قودرەت و ئیرادەو ئازایەتین... لە دەست ودەم وداوێن پاکیدا، لە فریشتەکانی خوا دەچن... لە سیما و لە هەڵمەت و لە چالاکیدا، جیڤارا یەکن بۆ خۆیان.

خەریکـە وردە وردە لـە قامیشـان و لـە دیـداری پێشـمەرگەش نزیکتردەبینـەوە. خەریکە تەحەمولی چاوەڕوانیـی دیداریانم نامێنێ...دەڵێی زەوییەکی لە تینوانا ووشـکەڵاتووی شەقار شـەقارم و چاوەڕێی داکردنی یەکەمین ڕێژنەی بارانم...

دەگەینە ناو دێ و ماڵی شێخ حەسەن مەنزڵمانە... ماڵێکی قوڕینی چکۆلە، بەڵام خاوەن دڵێکی گەورەو فراوان... دەڵێی میوانێکی زۆر ئازیزین، ئەوەی

٢٢- کورن، قوڕپاو، ماقوڕ: ئەو بەردەقووڵەیە کە لەچیادا ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە.

هەیانە، بۆ نانی ئەم بەیانیە بۆیان خستوینەتە سەرسفرەکەیان.

سیروان بەماڵی شێخ حەسەنم دەسپێرێ، نامە چوکلێتیەکەی[٢٣] ڕێکخستنم دەداتێ و بەهەمان ڕێدا دەگەڕێتەوە کە تاوێ لەوەبەر پێیدا هاتین...

لێـرە بـەدواوە، بەرپرسـیارێتی ژیانـی مـن و دۆزینـەوەی مەفرەزەی پێشمەرگە، دەکەوێتە ئەستۆی شێخ حەسەن...

شێخ حەسەن، دەفتەرێکی بەرباخەڵ دەردێنێ و ناوی منیش دەخاتە پاڵ ئـەو ناوانـەی، بەر لە من لە ڕێی ماڵی ئەمانەوە پەیوەندیان بە شۆڕشـەوە کـردووە... هەیانـە بەرگەی سـەختیی ژیانی پێشـمەرگایەتیان نەگرتووە... ئەوانی دیش، بەوانەی شەهیدبوون و بەوانەشەوە کە هێشتا ماون، بوونەتە ئەو پێشمەرگە ئەفسانەییانەی لەناو خەیاڵی مندا دەژین.

---

٢٣- نامەی چوکلێتی، بەو نامانە دەوترا کە لە سەردەمی پێشمەرگایەتی و ڕێکخستنی نهێنیدا، بۆ ئاسان شاردنەوە و گواستنەوەیان بچووک بچووک دەکرانەوەو لەشێوەی چوکلێتدا بە تیپ (سارغی) دەپێچرانەوە.

## ٦

ئــەوان دەردەکــەون و ئێوارە هێشــتا لە ســڕینەوەی پەڵــە هەتاوەکانی سەرتەوێڵی چیاکەی پشتی دێ نەبۆتەوە.

ئەوە یەک.... ئەوە دوو... ئەوە سێ، هەریەکەو چل پەنجا مەترێک لەویتر دوور، یەک بەدوای یەکدا بەرەو ئاوایی مەسافەیان وەرگرتووە.

وای خودایە، هاتنی ئەمان چ هەســتێکی خۆشــم دەداتێ.... هەســتی ئەو کەســە کەســیرەبووە دەســت و قــاچ تەزیــوەی، دوای شــەوێکی درێژ و سەهۆڵبەندان، یەکەمین تاڵە تیشکی خۆر دەبینێ...

"خۆیانن... ئەو مەفرەزەیەن کە چەند ڕۆژە چاوەڕێیانین... ئەوە مامۆستا ئەنوەر، کارگێڕی لق و بەرپرســی ڕێکخســتنی کۆمەڵــە... ئەوە کاک فوئاد، بەرپرسی لیژنەی ناوچەو کادری ڕێکخستن... ئەوەش سەرحەد، پێشمەرگەی هەردووکیان."

شــێخ حەســـەن ئاوا ئەوانی پێناساندم. وێڕای ئەوەش کۆمەڵێک زانیاری دیکەشی پێدام:

"ئەمان، هەرچەندە لە ژێر چەتری یەکێتیدا کاردەکەن، بەڵام هەر هەموویان کۆمەڵەن... هەرێمی پێنجی قەرەداغ، هەر هەموویان بە پێشــمەرگە و کادر و فەرماندە و بەرپرسەوە کۆمەڵەن..."

لەدڵــی خۆمدا ووتم، ڕەنگە هــەر لەبەرئەوەش بێــت، ناوچەی قەرەداغ، بەبنکەی سووری شۆڕش ناودەبرێ.

مــن کۆمەڵــەم و، ئەوانــەش یەکەمیــن مەفــرەزەی کۆمەڵەن کــە من بە دیداریان شاد دەبم... من سێ ساڵە کۆمەڵەم و، تا ئێستا نە پێشمەرگەیەک و نەبەرپرسێکی کۆمەڵەشم نەبینیوە... ئەو کاتەش کە بووم بە کۆمەڵە، جگە لە ناوی ئارام و لە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکان، ناوی هیچ کام لەسەرکردەکانی کۆمەڵەم نەبیستبوو... ئەوەی منی پەلکێشی ناو کۆمەڵەکرد، ناو و ناوبانگی سەرکردەکانی نەبوو، بیروباوەڕو ڕێبازو بەرنامە نەتەوەیی و چینایەتیەکەی کۆمەڵە بوو.

چەنـد سـەد قوتابیەک، بـۆ گوێگرتن لە شـیعر، لە ئێـوارەی نەورۆزی ١٩٧٦دا، لە هۆڵێکی گەورە زانکۆی سـلێمانی کۆبوینەتەوە. هەرکە بەهێماو بەئامـاژەش نـاوی نیشـتمان و ئـازادی دێـت، هەمووومـان بـۆ هاندان و چەپڵەلێـدان، دێینە سـەرنووکی پەنجەی پێمان. لەگـەڵ تەواوبوونی کۆڕدا، بێ ئەوەی کەس هیچ بەکەس بڵێت، ١٠٠ کەسـێکمان زیاتر، بەدەم سـروود خوێنـدن و هوتافکێشـانەوە، لـەدەرگای خـوارەوەی زانکۆ دێینـە دەرێ، بـە یەکدەنـگ وتنی سـروودی ئەی ڕەقیـب و دەمی ڕاپەڕیـن و وتنەوەی درووشـمی شۆڕشـگێڕانە، خەڵکی ئەو ناوە دێنینە سـەربان و بەردەرگای ماڵەکانیان... کە هاوسـۆزیی خەڵکدەبینین و گوێمان لە دەنگداناوەی دەنگی بڵندی خۆمان دەبێت، ئەوەندەی تر دێینە جۆش... لەوجۆش و خرۆشەماندا، ئەوەی حسـابی بۆ ناکەین، ئەو جەوی تۆقاندنەیە کە لەدوای ئاشـبەتاڵەوە، بەعس چاوی خەڵکی پێتراساندوە.

ڕوەو ناوجەرگـەی بازاڕ، جادەی قەنات دەبڕیـن و خەریکە لە دادگاش تێپەڕیـن، پیاوەکانـی بەعس بە ناومان وەردەبن. وەک شـارە زەردەواڵەی چیلکە تێوەردراو، هوروژممان بۆ دێنن... کەممان هەن، قامچیەک، بۆکسێک، شـەقێک یـان قۆناغە تفەنگێکـی بەرنەکەوێت. ئەوەی بۆیـان گیرا دەیگرن، ئەوانی دیش، کۆلانە تەنگ و تاریکەکانی گەڕەکی شێخان لە چاوانی پیاوانی بەعسی وندەکەن، سەلام و من، دوای چەند خولەکێک ڕاکردن بەم کۆلان ئەو کۆلاندا بەهانکە هانک و دڵەکوتێوە، خۆمان بەدەرگای کراوەی حەوەشـەی ماڵی خزمێکی ئەودا دەکەین.

ئەو خۆپیشاندان و ئەو خۆشاردنەوەیەی ناو حەوشەی ئەو ماڵە، من و سەلامیان بەیەکتری ناساند. هەر ئەو ناسین و هاوڕێیەتیەش، سێ مانگێک دواتر، منیان بردە ناو ماڵە ژێرزەمینیەکەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە.

لە سـەرەتای ١٩٧٧دا، بەهۆی گیرانی هاوڕێیەکەوە، سەلام، بەر لەوەی فریاکـەوێ من بەکەسـێکی دیکەی ناو ڕێکخسـتن بناسـێنێ ڕایکرد. ئیدی لەوێـوە لـە کۆمەڵـە پچـڕام... هەتا جارێکی کـەو دوای پتر لە سـاڵێک، لە ڕێی هاوڕێیانم (حەمدیە ڕەسـوڵ و وەسفیە بەنی وەیس)وە، سەرم بەماڵی ڕێکخستندا کردەوە.

مـن، حەمدیە و وەسفیەشـم هـەر لەو ئێوارەیـەی خۆپیشـاندانەکەدا ناسـی و بووینە هـاوڕێ. ئەوەندەی مـن ئاگاداربـووم، هەردووکیان، لە ژنە هەرێ چالاک و چاونەترسـەکانی ناو ڕێکخسـتنە نهێنیەکانی کۆمەڵە بوون. ئەوانیش وەک من و سـەدان گەنجـی دیکەش، لەدوای ئەو هەموو

بێ ئومێدی و تاریکیەی ئاشــبەتاڵ بەدوای خۆیدا هێنای، کۆمەڵەمان وەک تاکە پەنجەرەی کراوە بەســەر ڕۆشــنایی ئازادیدا دەبینی... بۆیە بووین بە کۆمەڵە....

بووم بە کۆمەڵە و هێشتا لە ئەدەبیاتی کۆمەڵە و لە ژمارەیەک کتێبی مارکسی بەولاوە، شــتێکی دیکەی وام لەسەر مارکسیزم نەخوێندبۆوە... لە ڕاستیدا، سەرچاوەی ئەوەندە زۆریش، لەسەر ئەو بابەتە، لەبەردەستدانەبوون.

ئەدەبیاتــی کۆمەڵەش زۆر کەم بوون و کەمتریش بەلای بابەتی فکریو فەلســەفی و ئابوریی و مارکســیزمدا دەچــوون، زیاتر بابەتی سیاســی و پێشــمەرگەیی و شــتی لەو جۆرەبوون... ئەوەش وایدەکرد، ئێمەی کۆمەڵە، بە قووڵی بە مارکســزمدا ڕۆنەچین و هەر حاڵی بوونێکی سەر چێخیمان[٢٤] لەسەری هەبێ.

مەفــرەزە دەگاتــە ناو ئاوایی و ســەربانی ماڵی شــێخ حەســەن، دەبێتە ژوانگەی یەکەمین دیدارمان..

نامەکــە ڕادەســتی مامۆســتا ئەنــوەر دەکــەم... بــەو قەڵەمبــڕەی لــە کۆڵەپشــتەکەی دەریدێنێ، نامە چکۆلێتیە بەســارغی پێچراوەکە دەکاتەوە... شــەوقی فانۆســەکە، بایی ئەوە ڕۆشنایی دەخاتە سەر کاغەزەکە، مامۆستا ئەنوەر ووشەکانی ببینێ....

مامۆستا ئەنوەر، بەر لەوەی نامەکە بخاتە ناو هەگبەکەیەوە، هەڵدەستێتە ســەر پێ و باوەشــێکی گەرمم پیا دەکات و، دوای ئەوەی خۆشحاڵی خۆی لە هاتنەدەرەوەم دەردەبڕێ، لەبری ناوەکەی خۆم پێشــنیاری ناوێکی نوێم بۆ دەکات.

ئیــدی لەوێــوە، "زمناکۆ" کرایە ناوی پێشــمەرگایەتیم و خۆشــم کرامە کادێری ڕێکخستنی کۆمەڵە لەو ناوچەیەدا.

تێشــووی بەیانیمــان وەردەگریــن و ماڵئاوایــی لە ماڵــی زۆر ئاوەدانی شــێخ حەســەن دەکەین. مەسافە وەردەگرین و بە هەورازی دەستە ڕاستی ماڵەکانــدا هەڵدەگەڕێیــن... نیو کاژێرێک دواتر، بۆ شــوێنەونی، بەرە و لای چەپ دەسووڕێین و ئاقاری ڕۆشتنەکەمان دەگۆڕین:

"نابــێ کەس بزانێ بۆ کــوێ دەچین و لە کوێ دەمێنینەوە..." مامۆســتا

---

٢٤ـ سەرچێخ: سەتحی، ڕووکار

ئەنوەر، ئەوەم وەک یەکەمین وانەی شەڕی پارتیزانی پێدەڵێ.

سێ کاتژمێر دواتر، ناوچڕایی قەدپاڵی شاخێک دەبێتە مەنزڵی هەر چوارمان... هەریەکەو، چەند مەترێک دوورلە ویتر، شوێنێک بۆ خەوتنی ئەو شەوەی، لە پووش و پەڵاش و ووردەبەرد پاکدەکاتەوە.

نهێنی شەو و سەعاتی ئێشکگرتنی هەریەکێکیان دابەش دەکرێ و هەریەکە و دەچێتە سەر جێگای خەوتنی خۆی.

لەیەکەم شەوی پێشمەرگایەتیمدا، زەوی ڕادەخەم... بەردێکی نەرم دەکەمە سەرین و ئاسمانیش بەخۆما دەدەم... ئاسمان بەو هەموو ئەستێرە درەوشاوەو جوانانەیەوە، هەر لەو جاجمە گوڵ گوڵیە دەچێ کە جاران، لە خەوتنی شەوانی هاویندا، هەموو جارێ دایکم دەهاتە سەربان و ئەگەرلەسەرم لاچووبا پێیدا دەدامەوە.

تا خەو دەیبردمەوە، هەر سەیری ئەستێرانم دەکرد... هێندە لە تەماشاکردنیاندا ڕۆدەچووم، دەتووت دڵداریان لەگەڵدا دەکەم... لەناو هەموویاندا یەکێکیانم کردبووە ئەستێرەی خۆم... بۆ هەر کوێیەکیش چووبام، لەگەڵمدا دەهات... هەموو شەوێک تا چاوەکانم پڕ لە تریفەو گوێیەکانم پڕ لە جریوەی ئەو ئەستێرەیەی خۆم نەکردبان، جاجمەکەم بەسەرسەری خۆمدا هەڵنەدەکێشا.

خەریکە بەیاندەداو هێشتا نەخەوتووم...

"هەر یەکدوو شەوی ترەو ڕادێی... ڕاهاتن لەگەڵ هەر ژیان و ژینگەیەکی تازەدا وەختی ئەوێ... بۆ ئەوەش زوو ڕابێی، باشترە بەراووردی بەینی ژیانی ئێرەو ئەوێت نەکەی... ئەبێ ئەو ژیانەی ئەوێت لەبیری خۆت بەریتەوە." مامۆستا ئەنوەر لە نۆرە ئێشکگریەکەی خۆیدا وامپێدەڵێ.

ئەو جارەش، ئاسۆی هاوڕێم کە تازە لە زیندان بەرببوو، هەرشتێکی لەو جۆرەی ووت:

"بۆ ئەوەی بەرگەی ئەشکەنجەدانی ناو زیندان بگری، سەرباری ئیرادەیەکی بەهێز، ئەبێ توانستی لەبیرچوونەوەش لە خۆتا بەهێزبکەی. ئەبێ ئەوە لە بیرخۆت بەریتەوە کە لەو دیوی شیشەکانی زیندانەوە، ژیانێکی دیکە هەیە."

ڕۆژ دەبێتەوە، بەڵام تا عەسرێکی درەنگ، هەر لێرە دەمێنینەوە.

ئێمڕۆ یەکەم ڕۆژی مەشــق و ڕاهێنانی منە... ســەرەتا دەبێ لە مەشقی بەکارهێنانی چەکەوە دەســت پێبکەم... دواتریش مامۆســتا ئەنوەر، هەموو ئەو زانیاریانەم دەداتێ کە خۆی بە پێویستی دەزانێ من لەسەر هەرێمەکە هەمبێ.

* ســنوری چالاکیەکانــی هەرێمــی پێنجی قــەرەداغ، هەتابڵێی فراوان و بەربڵاوە... لەسەرەوە، لە سلێمانیەوە دەستپێدەکات و پانەوپان تا ناوچەکانی کفری و خانەقین و واوەتریش دەڕوا...

لە ڕۆژهەڵاتەوە، لە ناوەڕاســتی شــارەزوورەوە دەستپێدەکات، تا سەر ڕێگای نێوان کەرکوک و ســلێمانی دەچێ و لە کەرکوکیشەوە بەرەو خوار، تا دەگاتە زنجیرە چیای حەمرین...

* ژمارەی پێشــمەرگەش، لە حاڵی حازردا، هەشــتا بۆ نەوەد پێشمەرگە دەبێ... هەفتەش نیە چەند چالاکیەک دژی ڕژێم ئەنجامنەدەین.

* ســاڵێک و چەند مانگێک لەمەوبەر، ئارام شــەهیدبووە و بۆشــاییەکی زۆریی لە دوای خۆیەوە و لە ناو کۆمەڵە و لەناو پێشمەرگەدا جێهێشتوە.

* مانــگ و شــتێک نابێ، ســیروان تاڵەبانی، فەرمانــدەی هەرێمی پێنج، بەخۆی و پۆلێک پێشــمەرگەوە شــەهیدبووە...ئەوەش بۆشاییەکی گەورەی پێشــمەرگەیی بــۆ هەرێمەکە درووســتکردووە... هێشــتا هــەر چاوەڕێین، کەسێکی تر بە فەرماندەی هەرێم دیاریبکرێ.

* بەرپرســی لقی یەکێتیی نیشتمانیی کوردســتان، ئیبراهیم جەلال، هەر لــە دوای شــەهیدبوونی ســیروان تاڵەبانیــەوە، ناوچەکەی جێهێشــتووەو گەڕاوەتــەوە ســەرکردایەتی... ســەرکردایەتیش، لەســەر جێهێشــتنی ناوچەکەو و هەروا سووربوونیشــی لەســەر نەگەڕانەوە بۆ ئێرە، هەموو بەرپرسیاریەتیەکیان لێسەندۆتەوە و هێشتا کەسیکی تریان بۆ پڕکردنەوەی شوێنەکەی نەناردووە.

* هــەر لەو ماوەیەی پێشــوودا، کادرێک شــەهیدبووە، یەکێک گیراوەو یەکێکی کەش، تەســلیم بە ڕژێم بۆتەوە... لە ئەنجامی ئەوەشدا، بێ کادریی بەناوچەکەمانەوە دیارە...

* لەهەر جێیەک، حکومەت سووســەی هەبوونی مەفرەزەیەکی بچووکی پێشــمەرگە بــکات، یــان کۆپتەری جەنگی دەخاتە ئاســمان یــان بەجاش و

جەیش یان بەهەردووکیان هێرش دێنێ.

* حکومەت هەوڵی کڕینی خەڵک و درووستکردنی جاسوس دەدات... جاریش هەیە خەڵک بەناوی ئەوەوە کە دەبنە پێشمەرگە، دەنێرێتە دەرەوە... بۆیە دەبێ لە جموجووڵماندا، لەوپەڕی ووریایی و ئاگاییدابین و لەوەرگرتنی پێشمەرگەشدا پێوەری زۆر ووردمان هەبێ. ئەو پێوەرانەش تا ئێستا ڕەچاوکراون، دەبێت تەزکیەی ڕێکخستنی هەبێ، یان کەسێکی ناسیاو ببێتە کەفیلی... ئەگەر ئەمانەشی نەبوو چالاکیەکی ناوشاری پێ ئەنجام ئەدرێ.

لێرەدا من هەڵدەدەمێ:

- من پێداچوونەوە بەو پێوەرەی دواییان بە پێویست دەزانم.

- ڕاستە لەمەدا هەندێ هەڵەکراوە، بەڵام لەمەودوا، شێوازی وردتر و درووستتر ڕەچاو دەکرێن.

ئەوەندە زانیاریە، بۆ ئەمڕۆ بەسن.

عەسرێکی درەنگ، شوێنی چالێنان و پاشماوەی وجوودی خۆمان لەو جێیەدا دەسڕینەوەو بەرەو گوندێکی دیکە، بۆ نانخواردن و کۆبوونەوە پێکردنی خەڵکەکەی دەکەوینە ڕێ.

ئیمڕۆ، لەڕووی زانیاری وەرگرتن و مەشق لەسەر تفەنگ کردن و، لەسەر خۆڕاهێنان لەگەڵ ئەم ژیانە تازەیەمدا، بۆ من گرنگ و بەسوودبوو، بەڵام ئەوەی سەختە، مەسەلەی خواردنە... بەیانی نان و چا.... نیوەڕۆ چا و نان... ئەگەر شەویش لێرەباین، هەردووکیان دەبوونە ژەمی ئێوارەمان.

٩ ساڵە چام نەخواردۆتەوە... پێشتر حەزم لە چابوو... دایکم دەبوایە هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو هەستێ و نان وچا بۆ من ئامادەکات... هەموو ڕۆژێ لەگەڵ ژمارەیەک خوێندکاری تردا، بەفربا یان باران، دەبوایە لە چوارقورنەوە، بۆ خوێندن بەپێ بچینە ڕانیە... منیش بۆ ئەوەی چیتر دایکم ئاوا زوو لە خەو هەڵنەستێنم، چام تەرک کرد...ئیتر لەوساوە چام نەخواردۆتەوە، کەچی ئەوەتا ئەمڕۆ بەناچاریی دەستم بەچاخواردنەوە کردەوە.... ئاخر کوا نانە ڕەقە، بەبێ چا ڕۆدەچێ.

# ٧

لە دوێنێ شەوەوە، ناو لێرەوارەکەی قەدپاڵی چیای (زەردە)مان کردۆتە مەنزڵی ئیمرۆمان. زەردە، لەو ڕۆژەوەی بورکانێکی گەورە، کردوویەتە ئەم چیا بەرز و عاسی و بەدارستان چڕە، سەدان و داستانی بەرەنگاریی و چیرۆکی عاشقانەی لەناو ئەشکەوت و بن تاشە بەردەکانی خۆیدا هەڵگرتووە.

ئیمــڕۆ، هەر ئەو چوار پێشــمەرگەی ڕۆژانی پێشــوونین.. ئیمڕۆ لەگەڵ کەرتێــک پێشــمەرگەی تــردا یەکدەگرینەوە... بــاوەش بەیەکــدا دەکەین و ئەملاوئەولای یەکدی ماچ دەکەین... هێندە بە بینینی یەکتر خۆشحاڵین، دەڵێی هاوڕێی چەند ساڵەین... خۆشــحاڵیی، سیمای هەموومانی گەشکردۆتەوە... هەموومان شــتێک کۆمان دەکاتەوە... شــتێک گەورەتر لە ژیان و بەهێزتر لە مردن... هەموومان دەڵێی دەنکی شــانەی دارین.. لە جلوبەرگ و پێڵاودا، لەکاروفرماندا یەکسانین...

تەمەنم دە ســاڵان دەبێ یان نا... تازە دەســتم بە نوێژ کردن کردووە... بۆ یەکەمجارە بەشداری نوێژی هەینی دەکەم... منێکی مناڵ، لە ڕیزی پیاوە گەورەکاندا وەستاوم، ئەملام هەژارو ئەولام زەنگین... هەموومان بەیەکسانی لە حوزوری خوادا وەســتاوین... هەرهەموومان لەبەردەمی ئەودا بچووک، بچووک دەنوێنین...

ئیمڕۆش، لەگەڵ ئەو حەمکە[٢٥] پێشمەرگەیەدا، هەمان هەستی یەکسانیبوون، ناخم پڕدەکات لە خۆشی...

تاکە جیاوازییەک لە نێوان هەستی ئێستا و ئەوسامدا:

لەوەی ئەوسادا، هەستم بە بچووکی، زۆر بچووکی خۆم دەکرد... لەوەی ئێستادا، هەست بە گەورەیی، زۆر گەورەیی خۆم دەکەم...

لێرەبەدواوە، ئەو کەس و شتانەم خۆش دەوێن کە لەبەردەمیاندا، هەستی گەورەییم پێدەبەخشن نەک بچووکی.

لەبەرامبەریشــدا، چەند بەوانە پەســت دەبم کە هەمیشــە هەستی خۆ بە

---

٢٥ـ حمکە: هەموو

بچووک زانینت دەدەنێ... ئەگەر شتێکیش لە هەستی گەورەییت هەبێ، دەبێ ئـەوەت لەبەرچاوبێت کە ئەوەش پرشـکێکە لە گەورەیی ئـەوان پەڕیوەتە سـەرتۆ... دەبێ ئەوەت لەبەرچاوبێ، تۆ ئەگەر لە سـێبەری ئەواندا نەبیت، هیچ نیت.

چەند دڵخۆشـم کە دەبینم، هەر هەموو لە باسـی سیاسـەت و شۆڕش و جارجارەش قسەی خۆشیشدا بەشداردەبین... دواتریش هەریەکەو، بەخۆی و بە کتێبێک یان نامیلکەو بەیانێکەوە، سێبەری دار بەڕوویەک بۆخۆی دەکاتە سەکۆی خوێندنەوە. هەموو سەرقاڵی خوێندنەوەین، یەکێکمان نەبێ.

پێشـمەرگەیەکی کورتیلەی ڕیوەڵە، بەڵام ڕۆح سـووک و قسـەخۆش... پێشـمەرگەیەکی گورج، هێندە گورج لە پڵنگێکی کێوی دەچێ... کۆڵەپشتێک، شـەش مەخزەنـی کلاشـینکۆف، مەتارەیـەک، دۆلکـەی چاخواردنـەوەو دووربینێک... شمشاڵێکیش، وەک خەنجەری یەمەنیەکان، خۆی لە ناو پێچی پشتێنە ئەستوورەکەیدا قایمکردووە...

هەر کە وەختی پشوودان دێ، شمشاڵەکەی دەردێنێ و هەمووومان مەستی ئاوازی خۆش و جوڵەی لێو و سەمای پەنجەکانی دەکات.

خودایە، ئەم پیاوە ئەو هەموو میلۆدی و بەیت و باڵۆرە و داستان و چیرۆکی دڵداری و کوێرەوەریەی لە کوێ هێناوە و، ئێمەی ئاوا پێ سەرسام و حەیران دەکات.

خـۆ ئەگەر کوێرە خوێنداوەریەکی هەبـاو دەرفەتیش یارمەتیدابا، ڕەنگە ئێستا یەکێک لەبەناوبانگترین شمشاڵژەنەکانی ئەم وولاتەی ئێمەبا... ئەگەر ئەوە ڕوویبدایە، ڕەنگە ئەوە نەبا کە ئێسـتا هەیە، ڕەنگە شاهۆیەکی دیکەبا، نەک ئەو شاهۆیەی کە ئێستا یەک لە پێشمەرگە ئازاکانی کەرتی قەرەداغی هەرێمی پێنجە.

حەزی من بۆ مۆسـیقاو قسەی خۆش، هەر زوو کردمیە هاوڕێی شاهۆ. شـاهۆ، بۆخۆی نـاوی (حەمەی تەلە)یە... خەڵکی دێـی (دەردۆین)ی بناری چیای گولانی هاوسـێی زەردەیە... بینینی شاهۆ لە بناری زەردەدا، بۆخۆی ڕێکەوتێکـی سـەیرە... ڕەنگە لە شـوێنێکی دیکەدا، شـاهۆم دیبـا، هیچ لەو بەسەرهاتەی شاهۆم نەزانیبا کە ئێستا پێیان ئاشنادەبم.

شـاخی زەردە، لە تەمەنی شۆڕشـەکانی کوردا، شـایەتی بینینی دەیان پێشمەرگەی ئازاو قارەمان بووە... بەڵام هیچیان ئەوەندەی شاهۆ، عەشقی

زەردە و ئەوەنــدەی ئــەم بیرەوەرییــان لەگــەڵ زەردەدا، لەنــاو خەیاڵدانی خۆیاندا هەڵنەگرتووە .

شــاهۆ، لە شۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە دەبێ... شۆڕش ئاشبەتاڵ دەکا... بەسەرکردایەتی و بنکردایەتیەوە شاخ جێدڵن و چەک دادەنێن... کەچی ئەم بەتاقی تەنیا، لە ناوچەی قەرەداغدا دەمێنێتەوە... زۆرتریش لەناو لێڕەوار و بن بەرد و ئەشکەوتەکانی زەردەدا، تەنیا باڵ[٢٦] درێژە بە خەبات و بەیاخی بوونی خۆیدەدا...

شاهۆ لە هەموو ئەم دەڤەرەدا، تاکە پێشمەرگە دەبێ کە شۆڕشی کۆن و نوێ بەیەکەوە گرێدەدا...

زەردە بۆ شاهۆ، مێژوویەکە پڕپڕ لە بیرەوەریی تاڵ و شیرین... هەتا ئەم لە شمشاڵ ژەنین نەبۆوە، کەس بەلای هیچدا نەچوو...

چەپڵە قایمەکانی ئێمە، هەناسەیەکی قووڵیان بە شاهۆ هەڵکێشا:

"جا فایدەی لەچی... جا خۆ نازە گوێی لە شمشاڵ لێدانەکەی من نیە."

ماڵی نازە، لەودیو چیای زەردەوەیە... شــاهۆ عەشــقی نازەیەو، چەندین جــار، خەڵک دەنێرێتە داخوازی، کەچی کەســوکاری نازە، جارێک بە ناوی ئەوەوە شوانەو جارێکیش بەناوی ئەوەی پێشمەرگەیە، نازەی نادەنێ...

ڕەنگە ئەو عەشقە قووڵەی نازە نەبووایە، شاهۆ ئەوەشی بەسەر نەهاتبایە کە خۆی وەک نوکتە دەیگێڕێتەوە:

« کادرێکمــان هەبــوو ناوی لەخۆی نابوو هێــرش، مودەتێکی زۆر هەر هەردووکمان وەیەکۆ جەولەمان ئەکرد. ڕۆژێکیان لەسەر ئەوکانی و ئاوەی خوارمانــۆ، پاڵمــان وە قەدی دارتووەکەی ســەرکانیەکەوە دابوو... ئەویش ئاگاداری حیکایەتی ئەو عەشــقەی من بــوو... ئینجا کەس هەبوو حیکایەتی من و نازەی نەبیستبێ!

- شاهۆ، حەزت دەکرد، ئێستا توانیبامان کۆنێک لەم شاخەکەین و لێیەوە، تەماشای ماڵی نازەکەی.

- ئنجا کوا لەوە بۆ من خۆشتر هەیە!

---

٢٦- تەنیا باڵ: بەتەنیاو بێ یارمەتیدەر.

- شــاهۆ بــەڕای تۆ، ئەگــەر من و تۆ بەدەرزی خەریکــی کۆنکردنی ئەم چیایەبین، بە چەند ساڵ بۆمان کون ئەکرێ؟

- وە دەرزی؟! جا ئەم شاخە چۆن وە دەرزی کون ئەکرێ!

- دەســا وەڵلاهی شاهۆ، هەوڵی ئێمەش بۆ ڕووخاندنی ڕژێم، وەک ئەوە وایە بە دەرزی خەریکی کونکردنی زەردە بین.

کاکە ئەوەندە لەو قســانەی بــۆ کردم، وازی لێنەهــاوردم هەتا قەناعەتی خۆ تەســلیمکردنەوەی پێنەهاوردم... وەرە شــاهۆ، ئــەم حەمکە گولەتۆپ و تەیارە و ئەوشــەڕە زۆرانە ورەت پێبەرنەدەن، قســەیەکی ئاوا بتڕووخێنێ! ڕووخام و بەو خەیاڵەش، ڕێی تەســلیم بوونــەوە، بمباتەوە بەر قاپی ماڵی نازە، وە دوای کەوتم... هەتا نەگەیشــتینە بەردەم مەعســکەرەکە، عەقڵم بۆ ئەوە نەچوو، کاکی کادر لەبنۆ پەیوەندی بە حکومەتەوە کردووە ومنیشــی وەک دیاری دەســتی خۆی، بۆ حکومەت هــاوردووە. بڕواتان بێ، هەرچی ســەرباز و دەرەجەداری ئەو ســەربازگەیە هەبــوو، لەبەردەمی دەروازەی مەعسکەرەکەدا، لە پێشوازی ئێمەدا وێسابوون...

لــە دڵ خۆمــا ووتم"ئێژی لــە چاوەڕوانی خولەپیزەدا وێســاون... ووتم دیارە ئێمە لای حکومەت زۆر گرنگین، پێشــوازی وا لە خەڵکی گرنگ نەبێ ناکــرێ"... دواتــر وە خۆمم ووت، ئەو پێشــوازیە ناوێ بــۆ من وێ، من لە حەیاتی عومرمدا دووکەســیش لە پێشــوازیمدا نەوێساون... دیارە ئەو کاک هێرشە، پیاوێ زۆر گەورەیە و من پێم نەزانیە... هەر کە گەیشتینە بەردەمیان، دەرەجەدارێ زۆر گەورە، وە عەقڵی خۆم لە گشتیان گەورەتربوو، باوەشی بە هێرشــدا کرد و ئەملاوئەولای ماچکرد... هێشــتا دووسێ قسەی لە تەکا نەکردبوو، بە تاسەوە بەزمانە عەرەبیەکەی خۆی پرسی:

- ئەی کوا حەمەی تەلە؟!

کادرەکەش بەشانازییەوە، دەسی ڕوەو لای من درێژکرد:

- گەورەم، ئەمە حەمەی تەلەیە...

هــەر لەگەڵ بیســتنی ناوی حەمــەی تەلەیا، وەک شــوڕکێک[٢٧] وە دەمیا دەن، پشتاوپشت گەڕیاوە دواوە... لەبەرخۆیەوە بۆڵەبۆڵێکی کردو جارێ تر لێم هاتۆ پێش... چاوەکانی دەرپەڕاندن و وەک عەلەشــیش خۆی بەســەرما

٢٧- شوڕک: شوڵ یان چڵەدارێکی نەرم و باریک.

گیڤکردۆ... هەتا قورگی گرتی، تفێکی موستەهەقی لێکردم.

- لەعنــەت لە خۆت و لە ئەژدادت... ئاخر ئەم نابووتە پیاوی ئەوەیە، ئەو هەموو بەرپرس و دەرەجەدارە لە پێشوازیدا بوەستین.

لەوعانەیــا، ئەوەنــدە خۆم لا بچووک بۆوە، قەت لــە ژیانمدا هێندە خۆم بچووک نەبینیبوو. هەر خۆم لە بەرچاوی خۆم کەوتم... لەم دنیایەشدا، لەوە ناخۆشترنیە، بنیادەم لە بەرچاوی خۆی بکەوێ... حەزم ئەکرد، زەوی قڵشی بردباو منی هەڵلووشــیباو لەو شــەرمەزاریە گەورەیەی ڕزگار کردوام... چ غەڵەتێ گەورەم کرد... چۆن ئەو پێشمەرگەیەی لە چاوی ئەواندا، بەورێکی بەســام بوو، بەدەســتی خۆم کردمــە بەچکە جرجێکــی زراو تۆقیو... خۆم بەخۆمم دەوت:

ڕاســت ئەکەی گەورەم... تۆ فرە ڕاســت ئەکەی... من کە ئێســتا تەسلیم وە تــۆ بوومەتــۆ، لەوەش بچووکترم کە ئەمبینی... بەڵام تا بەو شــاخانەوە پێشــمەرگەبووم، فــرە لــەوەش گەورەتربــووم کــە تــۆ لە خەیاڵــی خۆتدا داتنابوو.

ئەوەنە پەشیمان بووم، مردنم وە پارە ئەسەند... چ شتێک لەوە ناخۆشتر نیە، هەم دوژمنەکەت بە بچووکت بزانێ و هەم خۆشت...

هەر ئەوکاتە، ســواری ئۆتۆمۆبیلێکی فەرمانگــەی هەواڵگرییان کردین... بردیانینــە ســلێمانی. دوای ئــەوەی کۆمەڵێــک کاغەزیــان پێپڕدەکردینەوە، ئیزنیان داین.

هێنــدە بێتاقەت بووم، ڕقــم لە خۆم دەبۆوە... حــەزم دەکرد ببمە تنۆکە ئاوێک و زەوی قووتمدا... هەر چەند هێرش دڵی ئەدامەوە، لای من قڕانێکی نەئەهاورد... پێشــتر خەونم وە چوونە شــارۆ ئەبینی... بەڵام بریا مردبام و وەو حاڵەمۆ نەمئەدی.

دوای بانگی عەســر، بردمیە شــوێنێک ووتی "ئێــرە مەزاتخانەیە"، ناوی مەزاتخانەم بیســتبوو، بەڵام نەم ئەزانی چیە... ئەوەنە قەرەباڵغ بوو، ســەگ ســاحێوی خۆی نەئەناســیەوە... هەر کۆمەڵە خەڵکێک و دەوریان لە پیاوێ داوە کە گەرەکێتی شتێک ساغکاتۆ... هەر یەکەو هاوار بۆ شتێ ئەکا... ژاوە ژاوێکە، مێشــکی پیاو ئەتەقێنێ... زۆر کەس شــتیان وەدەســۆ بوو، بانگی موشــتەریان ئەکــرد لێیان بکڕن... بــەڵام لەناو هەموویانــدا، یەکێکیان زۆر سەرنجی ڕاکێشــام، پیاوێک هەتا دەســت هەڵبڕی کەڵەگەت... چوارشانەی

سـمێڵ بابڕی مل قەوی... وەک ئەو پیـاوەی ڕەنگە لە خەیاڵی دەرەجەداره گەورەکەدا هەبووبێ... ئەو پیاوە، بەو هەموو شان و شەوکەت و قەڵافەتەی خۆیەوە، باقەیەک بەنەخوێنی بەسـەر مەچەکیدا شـۆڕکردبۆوە و هاواری ئەکرد:

"بەنەخەوێن بە ٢٥ فلس."

کە ئەو پیاوەم بینی، هەر بەجاری نەترەم[٢٨] چوو... ئەوەندەی تر ڕووخام... بەخۆمم ووت:

پیـاوێ بـەو هەموو سەروسـیما و قەڵافەتەی خۆیۆ، لە ناو ئەم شـاره گەورەیـەدا، ئیشـێکی ماقوڵـی دەسـتنەکەوێ و گەرەکێتـی وە بەنەخوێن فرۆشـی ماڵ و منالی بەخێوکا، ئەبێ کەسێکی گول و نابووتی وەک من، چ ئیشـێکی دەسکەوێ... بەم سـەروبیچمەوە، بەخوا هەر ئەومە مەخسەره و گاڵتەجاڕی خەڵک.

هەر لەوێ و لە ناو قەرەباڵغیەکەدا، خۆم لە هێرش وونکرد... وەک هێستریک هەوسـاری پچڕاندبێ، هەر ئەو ئێوارەیە، هەتا جێشانە، ڕانەوێسام... هێشتا چرای زۆربەی ماڵان خامۆش نەکرابوون. گەیشتمەوە دیوی قەراغ.»

کەمێک وەستاو دوایی دەستی بە قسان کردەوە:

«ئێـژن، پیـاو لە هەر خەسـارتێ، عەقڵێ وەرئەگرێ... منیش لەو ئیشـە غەڵەتەی کردم، هەر چەندە زۆرگران لەسـەرم کەوت، بەڵام دەرسێکی فره فره خاسم لێوەرگرت.

شۆڕش وەک دین وایە، ناوێ بیری لێبکەیتۆ... بیرت لێکردۆ بۆتناکرێ... دوای ئەو هەمووەی وە سەرم هات، ئەگەر ئیسە یەکێ لێم بپرسێ، ئەتوانی وە دەرزی زەردە کونکەی؟... بێ بیرکردنەوە پێی ئێژم:

بەڵێ ئەتوانم.»

ئـەو ڕۆژە، حەمەی تەلـەم، وەک مێروولەکەی حەزرەتی سـلێمان هاتە بەرچاو. دەگێڕنەوە، ڕۆژێکیان سلێمان بەلای شاخێکدا ڕەتدەبێ.. مێروولەکە هێندە سەرقاڵە، ئاگای لە سڵاوی حەزرەتی سلێمانیش نابێ... سلێمان بەسەر سوورمانەوە دەپرسێ:

---

٢٨ـ نەترەم چوو: ڕۆحم چوو، زۆرترسام.

ـ ئەرێ مێرووله پێم ناڵێی مەشغوڵی چی؟

مێرووڵەش بە هانکە هانکەوە و بێ ئەوەی لا بەلای سـلێماندا بکاتەوە، وەڵامدەداتەوە:

ـ لێم گەڕێ، قوربان با لە کارەکەم دوانەکەوم...

ـ کار! کاری چی؟!

ـ قوربان من عەشـقی کچێکم، شـارەکەیان لەو دیوی ئەم شـاخەوەیە... چەندین جار کەسـوکاری خۆمم بۆ خوازبینی ناردوە، بەڵام دایک و باوکی ڕازی نابن... دەڵێن هەتا ئەم شـاخەی نێوان شـارەکەی ئێمەو شـارەکەی خۆت لانەدیت، ناتدەینێ... ئینجا قوربان، ئێسـتا خەریکی گواسـتنەوەی ئەم چیایەم...

ـ نەگبەت، نابێ تۆزێک عەقڵت هەبێ... تۆ ملیۆنێک ساڵیش بژیت، نەک ئەم چیایە، بەردێکی بچکۆلەشـت پێناگوێزرێتـەوە... نابێت تۆزێک بیربکەیتەوە. سلێمان بە حەپەسانەوە، وا دەڵێ.

ـ ڕۆحم بە قوربانت بێ لێم گەڕێ... عەشق لێکدانەوە نازانێ، مێروولەکە بەوە، کۆتایی بە قسەکانی نێوان خۆی و سلێمان دەهێنێ.

## ٨

هێندە نابێ، پەڵە داربەڕووی سـەر بەرزاییەکەی بەرامبەر (سێوسێنان)مان کردۆتە شوێنی حەوانەوەی ئەمشەومان. زۆرنابا، مستەفا چاوڕەش و مەفرەزەکەی دەگەنە لامان. لەمشەوەوە، مستەفا چاوڕەش وەک ئامر هەرێمی نوێـی هەرێمی پێنج، دەسـت بەکاردەبـێ. کۆبوونەوەیەکی خێرا بە هێزەکە دەکا... بارودۆخی سیاسـی و پێشـمەرگەیی یەکێتی، لە چەند ڕسـتەیەکدا کورتدەکاتـەوە... دێتـە سـەر باسـی فراوانبوونی شـەپۆلی ناڕەزاییەکانی خەڵک و ئاماژە بە ئازایەتی و چاونەترسیی، شاعیرانی میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی دەدا:

«باوەڕتان بێت، ئەگەر گوێتان لەو کاسێتە شیعریەی ئەو میهرجانی شیعر خوێندنەوەیەبێ، ئەوسا دەزانن، ئەو شەڕە دەستەویەخەیەی ئەو شاعیرانە دەیکەن، زۆر لەو شەڕانە قورسترە، ئیمەی پێشمەرگە لێرە دەیکەین.»

مامۆسـتا ئەنوەر، خەریکە بڵێ" ئێسـتا یەکێک لەو شـاعیرانە لێرەیە."... تکای لێدەکەم وا نەڵێ...

"شـەودرەنگەو دەزانـم هەمووشـمان ماندووین...باقی قسـەکانمان بۆ سـبەینێ هەڵئەگریـن." مسـتەفا چـاوڕەش ئەمـە دەڵێ و ئیتر بـەو ناوەدا بڵاودەبینەوە... هەر یەکەو بن بەردێک یان دارێک، دەکاتە شـوێنی خەوتنی خۆی...

ڕۆژ خەریکە بەلای پاشـنیوەڕۆدا لاسـەنگدەبێ... هێشتا کەتریە ڕەشی چایەکەمـان لەسـەر ئاگرەو، نەهاتۆتـە کوڵ... دەنگی کۆپتـەر لە دوورەوە دەبیستری... بەپەلە ئاگرەکە دەکوژێنینەوە و هەریەکەمان بن دارێک یان پەنا بەردێک دەگرین... هەر هەموومان لە حاڵەتی ئامادەباشیداین... کۆپتەرەکان دەردەکـەون... ئەوە یەک ... ئەوە دوو... ئەوە سـێ و.... ئەوە ئەوە... هێندە زۆرن بەقەد ڕەوە دالاشـێک دەبن... هێندە نابا، سـەرباز و جاشـێکی زۆر، بەسەر بەرزاییەکانی لای چەپمانەوە دادەبەزێنن.

«تکایـە کەس خـۆی دەرنەخا... هەتا تەقەشـمان لێنەکـرێ، کەس تەقە نەکا،» مستەفا چاوڕەش وادەڵێ.

تەقەشمان لێبکەن، من تەقە ناکەم... ئاخر ئەگەر من هێشتا چەکم پێنەبێ، تەقــەی چــی بکەم... دەبــێ چی لەوە ناخۆشــتر بێ، ڕووبــەڕووی دوژمن ببیەوەو چەکت پێنەبێ؟

تــا دێ کۆپتەرە جەنگیەکان نزمتردەبنــەوە... هێندە نزم بوونەتەوە، هەر ئەوەتا پەڕەی پەروانەکانیان، لە لق و پۆپ و گەڵای درەختەکان ناخشێنن.. دەڵێی شــارە زەردەواڵەی وررووژاون و ئاڵاونەتە ســەروگوێلاکمان... هەر بینە بە چزووی چەند ڕۆکێتێک زیرەیان لێ هەستاندین...

پەروانەکان، سیرەسیریان گوێ کەڕدەکاو، بایەکەشیان خەریکە گەڵا بەو دارەوە ناهێڵێ کە من خۆم بە قەدەکەیەوە نووساندووە.

یەکــەم ئەزموونی من لەگەڵ کۆپتەر و مەرگدا.. زۆر جاری تر تارماییی مەرگــەم بینیوە، بەڵام قەت ئەوەندە بە نزیکی نــا... یەکەمجارمە ئاوا نزیک لەگــەڵ مەرگدا ڕوو بەڕوو ببمەوە... بڵێم هیچ ناترســم ڕاســت نیە... بەڵام ئەوەندەش نا، چۆکەکانم بکەونە لەرزین.

ترســیش وەک هەڵامەت وایــە، هەموو کەس شــیمانەی[٢٩] گرتنی هەیە... هەندێک بەسووکی و هەندێکیش بە قورسی... زۆربەی جارەکانیش ئەوانەی لــە گرتنی هەڵامەت دەترســن، ئاســانتر تووش دەبن. مەرگیــش وایە، هەتا زیاتــر لێی بترســی، زیاتر لێت نزیــک دەبێتەوە... هــەر ئەوەندەش جارێک ترست لەمردن شکا، ئیدی تەواو جارێکیتر ئەو ترسە ڕووت تێناکاتەوە.

بترســم یان نەترســم، لە شــوێنێکدا ژیانم تەواودەبێ... منیش گەڵایەکم لــەو گەڵایانــەی بەدرەختی ژیانەوەن... گەڵایەک ڕێــک وەک ئەو گەڵایانەی کەرەشــەبای خولانەوەی پەروانەی کۆپتەرەکان، بەسەرسەری مندا هەڵیان دەوەرێنێ... منیش ڕۆژێک هەڵدەوریم... هەڵدەوەریم و بەڵام ژیان لە ڕەوتی بەردەوامی خۆی ناکەوێ.

هەوڵدەدەم قەناعەت بە خۆم بێنم کە لە مردن ناترسم... نەشترسم بەڵام خۆدەبێ خۆمی لێلادەم... خۆ لادان و لە مردن ترسان جیاوازن...

ئــەو بــە تووندی خۆنووســاندنەی منیش بەقەدی ئــەم درەختەوە، هەر بەشــێکە لــەو خۆ لە مــردن لادانە... ئاخر من کە هێشــتا چەکــم نەکردۆتە شانم و دارێکیشم نەخستۆتە سەر بەردی تەلاری پێشمەرگایەتی، بەزووی دەزانم لە ئێستادا بمرم.

---

٢٩ـ شیمانە: گریمانە، ئیحتیمال.

کۆپتەرەکان زۆر بە نزمی بەسەر سەرماندا چەرخ دەدەن... هەر ئەوەندەش یەکێکمانیان خستەناو بازنەی دووربینەکانی خۆیانەوە، یان هەر ئەوەندە دابەزینی سەرباز و جاش ئەو بەرزاییەشی گرتەوە کە ئێمەی پێوەین، ئیدی شەڕی مانونەمان دەستپێدەکات.

کۆپتەرەکان لە سووڕانەوە ناکەون و زەمەنیش لە چەقین.. زەمەن دەڵێی بەناو سلیخانیکی[٣٠] ئەوەندە خەستا هەنگاودەنێ، تا پێ یەکی هەڵدەهێنێتەوە، پێ یەکەی تری زیاتر ڕۆدەچێ.

ڕەنگە سەربازەکانیش وەک ئێمەو زیاتریش لە تێپەڕبوونی کات بەپەلەبن... ڕەنگە ئەوانیش حەز نەکەن، لەو کێومالّەدا کە دەیکەن، لەبن بەردێکەوە یان لە پیوارێکەوە[٣١]، پێشمەرگەیەک لێیان ڕاپەڕێ.

ئاخر ئەوانیش وەک ئێمە، بەتێداچوونی خۆیان، دایک و باوکیان دەخەنە ناو دۆزەخێکی ئەبەدیەوە.

خۆر چەند گوریسێکی ماوە ئاوابێ، کۆپتەرە جەنگیەکان ئاسمانی ئەو ناوە چۆڵدەکەن... چاومان لێیە، لە دووری دوو سێ کیلۆمەترەوە، سەربازوجاشەکان، وەک ڕیزە مێروولە، بەرەو ئەو کۆپتەرە بارهەڵگرانە، قەتارەیان بەستووە کە لە پشتی سێوسێنانەوە، چاوەڕێی هەڵگرتنەوەیانن...

"وەختیەتی... ئێستا وەختی هێرش بردنەسەریانە."

هەر لەگەڵ دەرچوونی فەرماندا، کۆتایی قەتارەی کشانەوەیان، دەکەوێتە بەر هەڵمەتی پێشمەرگە... ئەوان هەڵدێن و پێشمەرگەش بەدوایاندا. هێندە نابا کۆپتەرە جەنگیەکان پەیدا دەبنەوە... چەند ڕێژنە سارۆخێکمان تێدەگرن... ژمارەیەکیان لەو شوێنەدا دەتەقنەوە کە چەند خولەکێک پێشتر ئێمەی لێبووین.

سەرباز و جاشەکان، لە هەلاتنیاندا بەردەوامن و پێشمەرگەش بەدەم تەقەوە، هەر بە غاردان بەدوایاندا غاردەدەن.

هێز، کە ڕوو لە شکان بوو، وەک لادیواری تلیساوە وایە، هیچ شتێک

---

٣٠ـ سلیخان: قوڕولیتە

٣١ـ پیوار: نادیار، نەدیو

پێی ناگیرێتەوە... دیمەنی شـکانی سەرباز و جاشەکان، چێژێکی تایبەتیمان دەداتێ. سـەیرە شـەڕیش، بـۆ ئەوانەی لە هەڵمەت بردنـدان، تام و چێژی خۆی هەیە.

کۆپتەرە جەنگیەکان فریایان نەکەوتبان، ژمارەیەکیان بەزیندوویی یا یان بە کوژراوی، دەکەوتنە بەردەستمان و منیش دەبوومە خاوەنی تفەنگێک.

## ٩

ئەگەرچی لەو شـەڕەدا، مـن ڕۆڵێکم نەبینیبوو، بەڵام هێندە شـەکەت و ماندوو بووم، هەتا گەیشـتینە شـوێنی حەوانەوەی شەومان، چەندین جار نەترەمدا[32]... هەر ئەوەندەش بن قەدی سـپیدارێکم کردە ماڵی ئەو شـەوەم، خـەو لە پەلوپۆی خسـتم. هێنـدە نیە، چاوم لـە خەو ڕۆچـووە... گوێم لە دەنگـی دکتـۆر چیا و نـاوی خۆم دەبێ. هەڵدەسـتم... ئـەوە دکتۆر چیایە بەسەرسەرمەوە وەستاوە.

چیا، دەرچووی پەیمانگای پزیشکییە... من و ئەو، ئەگەرچی قەت پێکەوە، لە هیچ شـانەیەکی ڕێکخسـتندا کارمان نەکردووە، بەڵام هێندە متمانەمان بە یەکتری هەبوو، هەمووشتێکی کۆمەڵە و شۆڕشمان لەگەڵ یەکتردا باسدەکرد. مەلا حەسـەنی باوکـی، ئیمامی یـەک لـە مزگەوتەکانی سەرشـەقام بوو... ماڵەکەشـیان هەر بەسەر حەوشـەی مزگەوتەکەوەبوو... کتێبخانەکەی مەلا حەسەن، حەشارگەی کاسێت و بڵاوکراوە نهێنییەکانی چیابوو.... چەندین جار هەر لە ناو ئەو کتێبخانەیەدا، نووسراوە قەدەغەکانمان خوێندۆتەوە و گوێمان لەو کاسـێتانە گرتووە کە سروودی شۆڕشگێرانە و وتار و هەواڵ و بابەتی سیاسـی دیکەیان لەسـەر تۆمارکرابوو.... بڕیاربوو پێکەوە بێینە دەرێ... من هاتم و نازانم بۆ هاتنەکەی ئەو سێ هەفتەیەک دواکەوت... ئەوەتا ئەمشەو لێرەیەو وەک هەمیشە ڕەزاسووک و قسەخۆش و دەم بە پێکەنین... ئەوەتا ئەمشـەو لێرە، لەبن ڕەشماڵی ئەو ڕیزە سپیدارەدا بەیەک دەگەینەوە کە تا سبەینێ ئێوارێ، هەواری ماڵە کۆچەریەکەی ئێمەیە.

کەمێـک لەوانیتـر دوور دەکەوینەوە و تا خەو دەمانباتەوە، هەر باسـی شـۆڕش و کۆمەڵە و باسـی ژیانی ناو شـار و شـاخ و، باسی سەردەمی گەنجێتی خۆمان و، باسی ڕۆژانی خوێندن دەکەین.

ڕۆژمان تا عەسەرێکی درەنگ، بەخوێندنەوەو گفتوگۆ و قسەی خۆشەوە بەڕێکرد....

تـا ڕۆژ لـەوە درەنگتـر نەبووە و تا هەتـاو کەمێک نـووزەی گەرمایی تێداماوە، دەبێ جلەکانم بشۆم.

---

٣٢ـ نەترەدان: سەرسم بردن، هەلانگوتن، ڕەتبردن.

لەوەتـەی هاتوومەتـە دەرێ، شـوێنێکی وا گونجـاوم دەسـتنەکەوتوە، جلەکانمـی لێبشـۆم... شـەو و ڕۆژ هەر بـە هەمان جلەوە و پێنج شـەش سـەعات بەپێ ڕۆشـتنی ڕۆژانەش، جلەکانیان وا دژوێن[٣٣] کردوم، خەریکە خۆشـم بەرگـەی بۆنیان ناگرم. شـتنی جلەکانـی ژێـرەوە و جارجار ئاو بەخـۆدا کردنێکیـش، لـە هەرجێیەک با دەکـرا... بەڵام شوشـتنی جلەکانی سـەرەوە هێندە ئاسـان نەبوو... ئاخـر کە تۆ هەر ئەو جلـەت هەبێ کە لە بەرتدایە، دەبێ لە شـوێنکدا بیان شۆی، هەم ترسی هاتنی فڕۆکەت نەبێ و هەم دەفرێکی واشـت دەسکەوێ، شـتێک ئاوی تێدا گەرمکەی. تەنەکەیەکی بەتاڵـی ڕۆن دەدۆزمـەوە و پڕیدەکـەم لە ئاو و دەیخەمە سـەرئاگر... ئاو دێتەکـوڵ و جلەکانمـی تێدەخەم. بەو جۆرە کوڵانـە نەبێ، نە ئەو جلە زۆر پیس بووانە پاک دەبنەوە و نە ئەو ڕشـک و ئەسپێنانەش لەناودەچن کە لە بەینی درووومانەکاندا، خۆیان حەشارداوە.

تاجلەکانـم هەندێـک کزردەبنەوە، گـەڵاو گوڵی چەنـد ژاڵەیەکی ئەودەم چەمە، دەکەمە چەتری چاوەڕوانیم...

جلەکانـم لەبەردەکەمـەوە و لەگـەڵ برادەراندا، بەرەو ئاوایی مەسـافە وەردەگریـن. مـادام جلەکانم خاوێن بوونەتەوە، قیرۆسـیا لـە چرچولۆچ بوون و لە کورتبوونەوەشـیان.

هێشـتا بە تەواوەتی سێبەر بەسەر گوندی (دوکان)دا هەڵنەکشاوە، ئێمە لەبەردەمی مزگەوتی دێدا، چاوەڕێین بەسەر ماڵاندا دابەشبکرێین...

دکتۆر چیا و دلاوەری ئەحمەد مەجید و من، بەر ماڵی فەڕاشی قوتابخانەی دێ دەکەوین... هێشـتا بـۆ نانی ئێوارە ماویەتی... کـورد گوتەنی، گۆچانی خۆمان لەو ماڵەدا دادەنێین و بۆ دەموچاو و دەسـت و قاچ شـتن، دێینەوە سـەر حەوزی مزگەوت. شـووتیەک لەگەڵ خۆماندا دەبەین و دەگەڕێینەوە ماڵی خانەخوێ...

ماڵێـک، ئەو هەسـتەت دەداتێ کـە تۆ میوان نیت و لە ماڵـی خۆتی... لە مـاوەی ئەو سـێ مانگەی پێشـمەرگایەتیدا، هـەر ئێوارەو بەسـەر ورگی ماڵێکەوە بوویـن... هەر هەموویان لە خزمەتکردنماندا بێ قسـووربوون... بـەڵام لـە دوای ماڵی شـێخ حەسـەنەوە، هیـچ ماڵێکم بەقەد ئـەم ماڵە بە خزمەت و میواندۆسـت نەبینیوە.

_ بۆ نانخواردن، هەمووومان دەچینە سەربان... سینەیەکی پڕ لە خواردن بۆ

٣٣- دژوێن: چڵکن.

ئێمە دێ ... خۆشیان، ژن و پیاوێک و سێ منداڵ، لەولای ئێمەوە، دەوریان لە سینیەکەی خۆیان داوە.

سینیەکەی ئێمە، سێ قاپ شلە و بەلەمێک برنج و گۆشتێکی زۆر... لەو کاتەوەی بوومەتە پێشمەرگە، ئەمە دووەم جارمە، گۆشت لەگەڵ خواردندا ببینم... ئاخر خەڵکی ئەو دێهاتانە، چ داهاتێکیان هەیە، تابتوانن مانگی جارێکیش خواردنێکی باش بۆ خۆیان لێبنێن.

ئێمە خەریکی نانخواردنین و خاوەن ماڵ، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە لە هیچمان کەم نیە، دێتە لامان:

ـ ئەوەچییە... دەڵێی دەستتان بۆ گۆشتەکە نەبردووە؟!

ـ بەزیادبێ، بەخوا ئێمە هیچمان ئەوەندە تالیبی گۆشت نین، دکتۆر چیا وا دەڵێ.

ـ کوڕە شتی وا لە کوێ هەیە... پێشمەرگەو حەزی لە گۆشتخواردن نەبێ!!

ئەو پێدادەگرێ و ئێمەش سوورین لەسەر ئەوەی حەزمان لە خواردنی گۆشت نیە...

دواجار، ناچاردەبین پێی بڵێین:

ـ ئەو گۆشتەتان بۆ خۆتان و بۆ منداڵەکانتان لێناوە... ئێمە بەسەردا هاتووین و، بەڕەوای نازانین ڕزقی خۆتان و منداڵەکانیشتان بخۆین.

ـ تکایە قسەی وامەکەن... بەخوا ئەوەی بۆ ئێوە دانراوە، ڕزقی خۆتانە... من، بەیانی زوو لە ناو شیوەکەی ئەوبەری ماڵان بووم... نازانم ئێوە منتان دی یان نا، بەڵام من ئێوەم دی... زانیم بۆ نانی ئێوارە دێنە ناو ئاوایی... بۆیە خەمتان نەبێ، گۆشتمان بەشی ئێوە و بەشی خۆشمان لێناوە...

نانمان خواردو بەر لە هەستانیش، توێشە بەرەیەکیان بۆ پێچاینەوە و لەگەڵ خۆماندا بردمان...

"بڵێی وەختێ سەردەکەوین، بتوانین قەرزی خەڵکی ئەم دێهاتانە بدەینەوە!!"بەر لەوەی لە ناو تاریکی ئەوشەوەدا، بەرەو حەشارگەیەکی تر، دوو دوو، بەدواییەکدا مەسافە وەرگرین، دکتۆر چیا وای بە من گووت.

## ١٠

دوای چەند هەفتەیەک لە بێ چەکی، ئیمڕۆ بە شـێوەیەکی کاتی بووم بە خاوەنی کڵاشینکۆفێک... چەک بە شانی خۆمەوە دەبینم و هەستی ئازایەتیەکی زیاتر بە دەمارەکانمدا دەگەڕێ... عوسمان، گەنجێکی سوورکەڵەی گوشتن، تەمەن سی ساڵەی خەڵکی ئۆردوگای زەڕایەن، بە خۆی و کڵاشینکۆفێکەوە، هاتووەو دەیەوێ ببێتە پێشمەرگە:

"ئەگەر ڕاستی بڵێم، من پەیوەندیم بە ڕێکخستن و شتەوە نەبوو... بەڵام دڵم بۆ شـۆڕش لێی دەدا... چل شـەوێک لەمەوەوبەر بە گومان و تۆمەتی سەر بە ڕێکخستنبوونم گرتیانم... چەند ڕۆژێکە بەهۆی لێبوردنی گشتیەوە ئازادکراوم... لە ترسـی ئەوەی نـەوەک جارێکی کەش بگیرێمەوە، بڕیارمدا لەژێر دەسەڵاتی حکومەتدا نەمێنمەوە... عومەری برام جاشە و ئەم تفەنگەش هی ئەوبوو، فرسـەتم لێهێناو، تفەنگەکەی عومەرم ڕفاند... ئێستاش هاتووم ببم بە پێشمەرگە..."

- قسەکانی زۆر جێی باوەڕنین...

- بەخوا ئێمە مەرجەکانی پێشـمەرگە وەرگرتنمان ئەوەندە قورسکردون، لە دوو مانگیشدا کەسێک نابینین ببێتە پێشمەرگە...

- مادام شاباشی خۆی داوە لێیگەڕێن با قنج هەڵپەڕێت.

هەریەکەمـان شـتێک دەڵێ... مامۆسـتا ئەنوەر دەیباتە ئـەو لاوە و چەند پرسیارێکی لێدەکا... وەڵامەکانی قەناعەت بە مامۆستا ئەنوەردێنن و ئەویش وەریدەگـرێ... "بـەڵام بەشـێوەیەکی کاتیـی تفەنگەکەی لـێ وەرئەگرین و بـۆ ماوەیـەک چاودێریی ئەکەین... کـە تەواو لێی دڵنیابووین چەکەکەشـی ئەدەینەوە".

تا ئەم قۆناغی چاودێریکردنە تێدەپەڕێ، چەکەکەی لای من دەبێ... دوو ڕۆژ بەسـەر هاتنە دەرەوەی عوسـماندا ڕەتنابێ، عومەری برایشی دەگاتە لامان..

"سـەرۆک جاشـەکەمان پێی وتم، یـان چەکەکە دێنمـەوە، یان چەکێکی

تر دەکرم... من دەزانم چەکیشـیان بۆ بکرمەوە، رۆژێک هەر تەشقەڵەیەکم پێدەکـەن، بۆیـە منیـش بریارمـدا واز لە جاشـایەتی بێنـم و پەیوەندی بە پێشمەرگەوە بکەم."

عومـەر، چەند سـاڵێک لە عوسـمان منالْتـرە، بەڵام لەو زیاتـر دەچێتە دڵەوە... کورێکی باریکەلەی رەشتاڵە، ئارام لە جووڵەو قسەکردنیدا... سادە لە بیرکردنەوە و دەربرینیدا... هەر پرسـیارێکی لێدەکەی، وەڵامێکی سادەی وات دەداتەوە، هەستی ئەوەت بداتێ کە شتێکی بۆ شاردنەوە هەڵنەگرتووە. عوسمان دەخرێتە مەفرەزەیەکەوە و عومەریش لەگەڵ ئێمەدا دەمێنێتەوە... چـوار پێنج رۆژێک دواتر، عومـەر دەبێتەوە بە خاوەنی چەکەکەی خۆی و منیش بەشـێوەیەکی کاتی تر، دەمانچەیەکم بۆ پەیدادەکرێ... ئەویش رەنگە تا ئەو کاتەی ئاسۆی دەلاک، بۆ ئەنجامدانی چالاکیەک دەچێتەوە ناوشار.

ئاسـۆ، یـەک لـە پێشـمەرگە زۆر ئازاکانی هەرێمـی پێنجـە... وێرای چالاکیەکانـی لەگەڵ پێشـمەرگەکانی دیکـەی هەرێمەکـەدا، ناوبە ناویش دەچێتەوە ناو شـار و زەبرێکی وا لـە پیاوەکانی رژێم دەدا دەنگبداتەوە... هەر ئەو چالاکیانەی ناوشاریشـیەتی، ئاسۆی دەلاکی لە سلێمانیدا کردۆتە ئەفسـانە... ئەفسـانەیەک کەوا لە دەزگا ئەمنیـەکان دەکات، برِی ۳۰ هەزار دینار(۹۰ هەزار دۆلاری ئەوکاتە) بکەنە خەڵاتی ئەو کەسەی دەیکوژێ یان ۵۰ هەزار بۆ ئەو کەسەی بە گرتی دەدا.

لەبن سێبەری پەڵەدارەکانی پشتی دیوانەدا، خەریکی ئامادەکردنی نان و چای نیوەرۆین... ئاسۆی دەلاک دەمباتە ئەو لاوە و بە سرتە[٣٤] پێم دەڵێ:

ـ ئەو جلانەی من شـوێنی شـایەلە بەسەرشـانیانەوە دیـارە... بەکەڵکی چوونـە ناو شـار نایـەن... ئەوانەی تۆ هێشـتا هیچ نیشـانەیەکی تفەنگ و مەخزەن هەڵگرتنیان پێوە دیارنیە، ئەتوانین بیان گۆرینەوە؟

ـ بۆ ناتوانین، مادام جلەکانمان بۆ یەکتری دەبن، کێشەم نیە.

جلەکانمـان دەڵێـی بۆ یەکتـری دووراون. هەر ئەوەنـدەش لە نان و چا خواردن بوینەوە، ئاسۆ، بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی ناوشار دەروا. هەر ئەو رۆشتنە بوو، ئیدی یەکتریمان نەبینیەوە.

---

٣٤ـ سرتە: چپە

## ١١

وەرز، چاوەڕێی شکانی تەشقی[٣٥] گەرمایەو، ئێمەش چاوەڕێی ئاوابوونی خۆرین... ئەو کاتەش دەگەینە نزیک ڕەبیەکان، دەبێ تەواو تاریک داهاتبێ... ئێســتا دنیا تەواو تاریــک داهاتووە و ئێمەش بەبەردەمــی ڕەبیەکاندا ڕەت دەبیــن... نووزەمــان لــە خۆمــان بڕیوەو ترپەی پێشــمان لە خشــەی پێی مێروولــە نزمترە... هەر ئەوەنــدە کەمێک لە ڕەبیــەکان دوور دەکەوینەوە، هەنگاوەکانمان گورج دەبنەوە... دووکاژێر و نیوی دیکە دەڕۆین و دەگەینە قۆپی قەرەداغ. ئەمشــەو هەرچی پێشمەرگەی هەرێمی پێنجە، لەم شوێنەدا، لەگەڵ یەکیک لە ئەندامانی سەرکردایەتیدا کۆدەبنەوە... هەموو پێشمەرگەی هەرێمی پێنج دەگەنە هەشــتا پێشــمەرگەیەک... هەشــتا، بــەڵام بەقەد ٨٠٠ پێشمەرگە چالاکی ئەنجامدەدەن... هێشتا چەند مانگێکی ماوە ساڵ تەواوبێ، پێشــمەرگەکانی ئەم هەرێمە، ســەرووی ١٢٠ چالاکیان ئەنجامداوە... بەقەد نیوەی چالاکیەکانی هەموو هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

"مام ڕۆستەم و کاک گۆران و کاک سامان" سێ فەرماندەی سێ کەرتی زۆر چالاک." مامۆستا ئەنوەر، ئاوا بەمنیان دەناسێنێ...

مام ڕۆستەم لێم دەپرسێ:

- ئەرێ بەڕاســت کە تۆ زۆرنیە لە شــارەوە هاتووی، خەڵکی شار چۆن تەماشای پێشمەرگە ئەکەن؟!

- وەک ئەفسانە... وەک خەڵکی زۆر پیرۆز...

- ترسام ئەوانیش هەر وەک کوێخا محەممەد سەیرمانکەن...

- کام کوێخا محەممەد؟

- کوێخــای دێیەکە لە گەرمیان... چەند مانگێک لەمەوبەر، بۆ نانی ئێوارە چووینە ماڵی ئەوان... بەحساب موجامەلەی ئەکەین، پێمان ووت:

- ئــەرێ مام کوێخا، خۆ تۆ ماشــەڵا کــوڕت زۆرە، بۆ یەکێکیان ناخەیتە گەڵ ئێمە ببێتە پێشمەرگە؟

٣٥ـ تەشقی گەرما: تینی گەرما.

کوێخاش بێئەوەی بیر بکاتەوە، ووتی:

- کامیان؟

کوێخا بێئەوەی چاوەڕێی وەڵامی ئیمە بکا، درێژەی بەقسەکانی دا.

- ئـەوە مسـتەفایە، ترەکتـۆری هاپێو، حەسـەن خەریکـی مەڕومالاتە... ئـەوەی ماگـە و نەماگە ئەحەیـە، بەخوا ئەحە، هەن خوێـڕی و بێکەڵکە، لە پێشـمەرگایەتی بەولاوە کەڵکی هیچی تری پێوەنیە. گەردنتان ئازابێ بیبەن و لەتەک خۆتانا بیکەنە پێشمەرگە.

ئێمـە لـە قاقای پێکەنیـن دەدەین و مـەلا بەختیار و ئـەو مەفرەزەیەش لەگەڵیدایە، دەگەنە لامان... مام ڕۆسـتەم لەگەڵ ئەویشدا دەیکاتە سوعبەت و هەمووومان دەخاتەوە پێکەنین..

مەلا بەختیار، لە سـەرکردایەتیەوە هاتووە، بەنهێنی سـەردانێکی خێرای ڕێکخسـتنەکانی ناوشـاری کردووە و ئەمشەویش گەیشـتۆتە ئێرە... هەم کۆبوونـەوە بە هەرێمەکـە و بەبەرپرس و کادیرەکانی ڕێکخسـتن دەکا و هەمیـش بەتەمایە بۆ کۆبوونەوە پێکردنی خەڵکی ئەو دێهاتانە جەولە بەناو هەندێ دێدا بکا.

من ئەوە یەکەمجارمە، ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی دەبینم... ئەمە یەکەمین دیدارمە لەگەڵ مەلا بەختیارداو هەر لەو دیدارەشەوە، دەبین بە هاوڕێ...

من ئەگەرچی، هەم ڕێکخستنی ناوشار بۆ ناوچەی قەرەداغیان ناردووم، هەمیـش خـۆم حەزدەکەم لە قـەرەداغ بمێنمـەوە، بەڵام ئـەو لێناگەڕێ لە قەرەداغ بمێنمەوە و قەناعەتم پێدێنێ کە من لە دەزگای ڕاگەیاندنا، دەتوانم خزمەتـی زیاتر بە کۆمەڵە و بە یەکیەتیش بکەم. ئیدی لەوێوە، ماڵئاوایی لە مامۆسـتا ئەنوەردەکەم و لەگەڵ مەلا بەختیار و ئەواندا، سەری ژمارەیەک لە دێهاتەکانی ناوچەی قەرەداغ و بازیان دەدەین... هەر ڕۆژەی لە دێیەک و هەر شـەوەی لەبەردەمی مزگەوتی دێیەکدا، خەڵکی کۆدەکەینەوە، قسەیان بۆ دەکەین و جۆشوخرۆشیان وەبەردەنێین..

بۆ دوایین کۆبوونەوەی ئاواییەکان، دەچینە گوندی تەنگیسەر. بەرلەوەی کۆبوونەوە دەست پێبکات، لەگەڵ مەلا بەختیاردا دەچینە سەردانی ماڵێک... ژن و مێردێکـی میهرەبـان... ئەوەنـدەی بـۆ ئێمە لە دایـک و باوک دەچن،

ئەوەنــدە لــە خانەخوێ ناچــن...ماڵێک هەتا بڵێی ســادە، بــەڵام لە ماڵێکی پۆشتەوپەرداخ گەرموگوڕتر... ماڵێکی لە قوڕ درووستکراوی بچکۆلە... دوو ژوور و هەیوانێــک... دەچینە یەک لــە ژوورەکانەوە...ژوورەکە دەلاقەیەکی چکۆلــەی تێدایــە، هەربایــی ئــەوە ڕۆشــنایی دێنێتــە ژووری، ئــەوەی لە ژوورەکەدایە ببینین. لەناو هەموو ژوورەکەدا، شتێک، تەنیا شتێک سەرنجم زۆر ڕادەکێشــێ، ئەویش ئەو جووتە پێڵاوە لاســتیکەیە کە وەک تابلۆیەکی دانسقە، لەناویەک لە میشکاتەکانی[36] ئەو ژوورە تەڕاوکراوەدا[37] هەڵگیراوە... ئەوە، جووتە پێڵاوەکەی ئارامە و، ئەوەش ئەو ژوورەیە کە دوایین شوێنی حەوانەوەی ئارام بوو... ساڵ و نیوێک بەسەر شەهیدبوونی ئارامدا ڕەتبووە، کەچــی هێشــتا بۆنی ئارام لــەو ژوورە و لەو ماڵە نابڕێ... ســاڵ و نیوێک ڕەتبووە، کەچی هێشــتا هەنگوینی ناوی ئارام، لە شــانەی دەمی ئەو ژن و مێردە میهرەبانەوە دەتکێتە خوار.

لەمودەتی ئەو ٥-٦ هەفتەیەی پێشــمەرگایەتیمدا، ئەوەندەی ناوی ئارامم بەرگــوێ کەوتووە، ناوی هیچ ســەرکردەیەکی دیکــەم نەژنەفتوە... هەموو ئەو شــتانەی لــە دەمی خەڵک و لە دەمی پێشــمەرگەو ئیمــڕۆش لە دەمی ئەوانی دەبیستم، وێنەیەکی جوانی ئارامم، وەک مرۆڤ و وەک پێشمەرگەو وەک ســەرکردەش، لە دیدەدا دەنەخشێنن... وێنەیەک کە بە درێژایی ژیانی پێشــمەرگایەتی و لە نزیکەوە ناسینی سەرکردەکان، لە گفتار و لە بیر و لە کرداریشدا، لای هیچ سەرکردەیەکی دیکە نەمدی... هەر ئەو وێنە جیاوازەشی، لەوتاکە ڕۆژەدا، بایی شیعرێک هەست و خەیاڵیان پێ بەخشیم:

٣٠ بۆ ٣٥ پێشمەرگەیەک، بۆ نیشاندانی ڕێزو وەفاو خۆشەویستی، سەری گۆڕی ئارام دەدەین... دواتر پێشــمەرگەکان، بۆ گوێگرتن لەو قسانەی مەلا بەختیــار دەربــارەی ئــارام دەیانکا، بەدوو ســێ ڕیز، لەبن ســێبەری دارە تاقولۆقەکانی ســەر گۆڕستانەکە دادەنیشــن... چەند مەترێک دوور لەوان... لەبن کەپری دەوەنێکدا، قەڵەم و کاغەز دەردێنم... چل دەقیقەیەک دواتر، مەلا بەختیار لە قسەکانی تەواودەبێ و منیش لە نووسینی پارچە شیعرێک:

---

٣٦ـ میشکات: تاق ، تاقی ناو دیوار

٣٧ـ تەڕاوکراو: سواغکردنی دیوار بەگڵە سپی

دەبا فاشیەکان بزانن[38].

وائێستاکە، لە کوردستانی ئاراما!

لە کوردستانی قەتماغە و کێڵگەی زاما!

هەر دەوەنە و بن تاشەبەردی چیایە!

سەنگەریکەو، قوتابخانەی دروستبوونی ئارامێکی تری تیایە!

....................

..............

خودایـــە، شـــیعر چ هێزێکی ئەفســـوناوی هەیە.... هـــەر یەکەو بەجۆرێک هەستی خۆیم بۆ دەردەبڕێ... هەموو هەستەکان جوانن، بەڵام ئەوەی خالد گەرمیانی لە هەمووان زیاتر:

"شیعر ورەی پێشمەرگە بەرزتر و مەدای گوللەش زیاتر دەکا."

هەمووی چەند ڕۆژێکـــە خالید گەرمیانیم بینووە... کەچی لەو ماوە زۆر کەمەدا، تەواوێک[39] جێی خۆی لە دڵی مندا کردۆتەوە...

کە دەربارەی چالاکیەکانی خۆی و پێشمەرگەکانی دەستەکەی قسەت بۆ دەکا، ئازایەتی پێشمەرگەت زیاتر لابەرجەستەدەکا.

کەدەربـــارەی شـــەڕی پارتیزانیـــش دەدوێ، دنیایـــەک دیـــد و بیرۆکە و ئایدیای شەڕی پارتیزانیت دەداتێ:

* دەبێ دوژمن باش بناسین و خاڵە بەهێزو لاوازەکانی هەڵسەنگێنین.

* دەبێ خۆمان کات و شوێنی شەڕ دەست نیشان کەین، نەک لێگەڕێین

---

٣٨- ئەم شیعرە لە بنچینەدا لە سێ کۆپلە پێک هاتووە. ئەمە کۆپلەی یەکەمیانە کە کراوە بە سروود، بەدەنگی ئازاد خانەقینی و ئاوازی ئاراس ئیبراهیم وەک بەرهەمی تیپی مۆسیقای شەهید کارزان لەساڵی ١٩٨٣ دا بڵاوکراوەتەوە.

٣٩- تەواوێک: بە ئەندازەیەکی زۆر.

دوژمن بەسەرمانیدا بسەپێنێ.

* دەبێ نەهێڵین، لەهیچ کات و شـوێنێکدا، هەسـتی ئیسـراحەت بدەینە دوژمن.

* دەبـێ نە بە زیـاد لە خۆمان بڕوانین و نە بـە کەمیش، دەبێ خۆمان وەک ئەوە ببینین کە هەین.

* کـە دوژمن هێرشـی کـردو، هێرشـەکەی لـە قوەتی ئێمـەدا نەبوو، پاشەکشێ باشترین بەرگریە.

* کە دوژمن پاشەکشێی کرد، هێرشی بکەینەسەر.

* بـۆ ئـەوەی بەهانـەی ئەوەنەدەینـە دەسـت ڕژێم پەلامـاری خەڵکی ئـەو دێهاتانـە بدات، دەبێ تا دەتوانین، ئەو خەڵکە لەشـەڕەکانی خۆمانەوە نەگلێنین.

خالیـد گەرمیانی، نە لـە هیچ کۆلێجێکی سـەربازیدا خوێندوویەتی و نە لەهیچ فێرگەیەکی مەیدانیشدا، مەشق و ڕاهێنانی شەڕی پارتیزانی کردووە، کەچـی هێندە لە شـەڕی پارتیزانی شـارەزایە، هی ئەوەیە کتێبێک لەسـەر هونەری ئەو شـەڕە بنووسـێ... خالد گەرمیانی، پڕبەپڕی چوارچێوەی ئەو وێنەیـەی نـاو خەیاڵدانی منە، کە بـەر لە هاتنە دەرەوەم، بۆ پێشـمەرگەی کۆمەڵە و بۆ پێشمەرگەی شۆڕشی نوێم کێشا بوو.

# ١٢

ئیمـڕۆ دوای چـل ڕۆژی ڕەبـەق و لەگەڵ تەواوبوونی چلـەی هاویندا، جارێکیتر سلێمانی دەبینمەوە... لە تەپوتۆزی دوکەڵکێشی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار و بینا بەرزەکەی حەسیب ساڵح بەولاوە، شتێکی دیکە لەو دوورەڕا نا ناسـمەوە. هەتا مەترسـیی مانی کەمین و هاتوچۆی ئۆتۆمۆبیلان هەبن، دەبێ لە (جێشـانە) دەرنەچین... ڕێنیشـاندەر، ١٠٠ مەترێک لە پێش ئێمەوە ڕێـدەکا و ئێمـەش بەدوایـدا ... دەبێ بەر لەوەی ڕەش و سـپی لە یەکتری جیابکرێنەوە، گەیشتبینە دەوروبەری گوندی هەنارانی دۆڵە ڕووت...

لە خوار (عەواڵ)ەوە، بە شـێوەکەی نێوان سـلێمانی و بەکرەجودا، بەبێ خشـپە و چپـە، ١٠ مەترێـک دوور لە یەکدی و دوو دوو بـەدوای یەکدیدا ڕێدەکەین... کە دەگەینە ئەو شوێنەی تیشکی گڵۆپەکانی کارگەی شەکرەکە دەیگاتێ، بە کۆمەکۆم و بەئەسپایی هەنگاو دەنێین.

لـە هەمووی ناخۆشـتر، پەڕینەوەی ڕێـگا قیرەکەی نێوان سـلێمانی و کەرکوکـە... «دەبـێ لەوێ هێندە بێدەنـگ و ووریابین، خۆشـمان گوێمان لـە ترپـەی پێی خۆمان نەبێت... دەبێت کە دەنگـی ئۆتۆمۆبیل هات، خۆمان لەگەڵ زەویدا جووت کەین و هەناسـە لـە خۆمان ببڕین. هەر ئەوەندە بەر شـەوارەی شـەوقی لایتی ئۆتۆمبیلێک کەوتین، ئیتـر دەکەوینە ناو بازنەی ئاگربارانێکـی چڕەوە و بە ئاسـانی و بـێ خەسـارەت دەربازنابین.» ئەو کاتەی نهێنی شـەومان وەرگرت و خەریکی بەڕێکەوتن بووین، فەرماندەکە وای پێووتین.

ئێستا تەواوێک لە جادەی قیر نیزیک بووینەتەوە... هەر ئەوەندە لە جادەکە پەڕینەوە، ئیدی خەتەری وامان لە ڕێدا نامێنێ... بەناو سێبەری دارەکانی باخی بەختیاریدا و لە پشتی قلیاسانەوە، بەرە و بەرایی دۆڵە ڕووت هەڵدەکشێین. دەنگـی ئۆتومبیلێـک دێتە گـوێ... دەنگەکە نزیکتر دەبێتەوە و تیشـکی لایتە بەرزەکانی ئۆتومبیلەکەش بەر لق و پۆپە بەرزەکانی ئەو درەختە سنەوبەرانە دەکـەوێ کـە دەکەونە دەسـتەچەپی ئێمـەوە... ئۆتومبیلەکە دەگاتە ئاسـتی ئێمەو، ئێمەش، من و ئەو پێشـمەرگەیەی لەتەکمایە، وا خۆمان بەکەندەکەوە نووسـاندوە، خەریکە ببینە بەشـێک لێی... وا نوزەم لە خۆم بڕیوە، گوێم لە ترپەترپی لێدانی خێرای دڵمە، بەڵام گوێم لە هەناسەی خۆم نیە...

درەنگ بەڕێکەوتین تا هەم هاتوچۆی ئۆتۆمبیلان بسرەوێتەوە و هەمیش ئەگەر کەمینیشـیان دانابێ، لە بێرەدا ڕەتبوونمان بێ ئومێدببن و کەمینەکە هەڵگرنەوە. کەمین یان نەبووە، یان ئەگەر هەشبووبێ هەڵگیراوەتەوە... ئەم ئۆتۆمۆبیلـە درەنگ وەختە چـی بوو! ئۆتۆمبیل دووردەکەوێتەوە تیشـکی لایتە سـوورەکانی دواوەشـی لە پێچەکەی دوای بەرزاییەکەدا ون دەبێ... بـۆ چەند چرکەیـەک گوێ هەڵدەخەیـن، دەنگی هیچ ئۆتۆمبیلێـک نایا... بە کەندەکـەدا هەڵدەگەڕێیـن و بە سـێ چـوار بازرەقە[40] دەگەینـە ئەوبەری جادەکە... هەناسـەیەکی قووڵ هەڵدەمژین و لـە تاریکایی ناو دارەکاندا ون دەبین. بڕینی ئەو چەند مەترە جادەیە، چەند قورس بوو... دەتووت هەموو ژیان لەو هەشت نۆ مەترەدا کورتببۆوە...

بۆ پشوویەکی کورت و بۆ دڵنیابوونیش لە بە سەلامەتی گەیشتنی هەموو هێزەکە، تا نە گەیشتینە ئەو دیوی (کانیبەردین)ەش ڕاناوەستین.

ئیتر تەواو، ترسی کەمین و ترسی پەڕینەوەی جادەش تەواو. ئەوەندەی ئیمشـەو کفتم[41]، هیچ شەوێکی تر، ئەوەندە هەسـتم بەهیلاکی نەکردووە... خـۆ ئەوەندەش ڕێمـان نەکردووە، نازانـم، دەڵێی هەموو ئازای جەسـتەم تێکشـکاوە... ڕێکـردن بەنـاو ئەو هەموو چـەو و بەردەی ناو شـیوەکەی بـەردەم عـەوالان، تەواو شـەکەتیان کردم... بەنـاو دڕک و دالا بڕۆ، بەلام بەسـەر بەردوچـەودا مەڕۆ... تەنانەت هێسـتریش بەجادەی ئـاوادا بەری، تێوەی نەژەنی ناڕوا.

هەمـوو هێزەکە دەگات... دوای پشـوویەکی نیـو کاژێریی، دوڵا و دۆڵ، بەدۆڵە ڕووتدا هەڵدەگەڕین... دۆڵێک لەو تاریکیەی شەودا، خۆی لە هەموو دارو درەختێک ڕووت کردۆتەوە...

نانی بەیانی لە (قزلەر) دەخۆین و بە چیای (چەرماوەند)دا سەردەکەوین... هێشـتا مەلا بانگی نیـوەڕۆی نەداوە، لە هەیوانـی مزگەوتەکەی مالومەین، دەسـت و قاچ و دەموچاومان دەشـۆین و سـەرە بـۆ خواردنەوەی ئاوی ساردی ناو کوپەی ژێر دارتووەکەی بەردەم مزگەوت دەگرین.

جامێکی فافۆن، لەڕێی تەلێکەوە بە سێپای کوپەکەوە بەستراوە... جامەکە ئەوەنـدە ئاوی پێخوراوەتەوە و نەشـۆردراوە، ئەوەندە زنجاری[42] لەسـەر

٤٠ـ بازرەقە: هەنگاوی گەورە.
٤١ـ کفت: زۆر هیلاک
٤٢ـ زنجار: ئەو بەڵغە سەوزباوەی کە بەسەر مس و فافۆنەوە دەنیشێ.

نیشــتووە، سەوزســـەوز دەچێتەوە... ئەوەندەش لینج و لووس بووە، توونە توونە نەیگری، وەک ماسی لە دەستت هەڵدەخلیسکێ...

هەر ئەو ڕۆژەش، لەگەڵ جەمالی عەلی باپیر و ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی هەرێمی چواردا بەیەک دەگەین.

جەمالــی عەلــی باپیــر، بەرلــەوەی ببێتە پێشـــمەرگە، یەک لــە یاریزانە بەناوبانگەکانی تۆپی پێی ناو شــاری ســلێمانی بــوو... ڕەنگە هەر ئەوەش بێ، وایلێکردبێ، لە ڕۆشتندا کەس پێی نەگاتەوە... شەقێک لە بەردێکی سەر ڕێــی هەڵدەداو چەند مەترێــک بەهەوادا بەرزیدەکاتــەوە... ئاوڕێک بۆ ئێمە دەداتەوەو بەپێکەنینەوە دەڵێ:

« تا لە شــاربووین، شـــەقمان لە تۆپ هەڵئەدا، کەچی لێرە ئەبێ شەق لە بەرد هەڵدەین.»

جەمالــی عەلــی باپیر، فەرماندەی هەرێمی چوارە و لــە فەرماندە هەرێ ناسراوەکانی شەڕی پارتیزانیە. هەرێمەکەشی، هەرێمی چوار لە هەرێمە زۆر چالاکەکانی هێزی پێشـــمەرگەیە... مانگ نیە ژمارەیەک چالاکی سەرکەوتوو ئەنجام نەدەن.

چەنــد ڕۆژێک بە دیهاتەکانی ناوچەکەی ئەوانــدا جەولەدەکەین... لەگەڵ هەر کەسێک لە خەڵکی ئەو دێیانەی ئەو دۆڵەدا قسەبکەی، وێنەیەکی جوانی جەمال و پێشمەرگەکانی هەرێمی چوارت دەداتێ...

لە دوایین ڕۆژی مانەوەشماندا، بۆ ماڵئاوایی لێکردنمان، تا گوندی باڵخێ لەگەڵمانــدا دێ ... ئــەو لەوێــوە، بــۆ ئەنجامدانی چالاکیــەک دەگەڕێتەوە و ئێمەش بەرەو سەرکردایەتی دەکەوینە ڕێ.

# ١٣

لێــرەوە (زەویــە حەرمکــراوەکان)[٤٣] دەســتپێدەکەن. حکومــەت هــەر جووڵەیــەک لەم ناوچانــەدا ببینێ، فرۆکەی بۆ بەهەوا دەخا... لێرە بەدواوە، ترســی فرۆکەی لێدەرکەی، نە ترسی کەمین و نە ترسی پەلاماری جاش و سەربازییش دەمێنێ.

"مەتارەکانتان پڕ لە ئاوکەن، بەدرێژایی ئەو ڕێیە تووشی ئاو و ئاوەدانی نابــن"، بەر لــەوەی لە باڵخێ دەرچیــن، وایان پێووتین. نــەک هەر ئاوایی، تەنانــەت لادیوارێکیش بەپێوەنابینی... پار ئــەم کاتانە بوو، ڕژێم بەرنامەی وێرانکردنــی دێهاتە ســنورییەکانی، بە قووڵایی ١٥ – ٢٠ کم، دەســپێکرد... خەڵکەکــەی بۆ ناو (ئــۆردووگا زۆرملێ)[٤٤]کان گواســتەوە و خانووی هەر هەموو گوندەکانیشی، بەبلدۆزەر لەگەڵ زەویدا تەختکرد... کانی و کارێز و بیرەکانیشی یان بە کۆنکرێت قەپاتکرد یان بە دینامێت تەقاندنیەوە... دەست لە ڕەز و باخیش نەپارێزرا، هەر هەمووی سووتێندرا.

بــۆ پشــووی کــورت کــورت نەبــێ، دەنــا تــا ســەر زێــی (هەرزنــە) ڕاناوەستین.

ئاســمان، بۆ ناوی ســوێندیش پەڵە هەورێکی پێوە نابینی... خۆر هێشــتا زۆری مــاوە ئاوابێ... هاوینیش هەمووی چەند ڕۆژێکە، جێی خۆی بۆ پایز چۆڵکردووە.

زۆرنابا، پەڵە هەورێک بەســەر لووتکــەی (کوڕکوڕ)[٤٥]ەوە دەردەکەوێ... چەند خولەکێکی تر و، دەیان پەڵە هەوری تر لە دەوری خۆی خڕدەکاتەوە... هەورەکان لەســەرەتادا وەک پرچی دایکم سپین و لەماوەیەکی زۆر کورتا ڕەش هەڵدەگەڕێن ... ئێمە لە ڕۆشتنی خۆماندا بەردەوامین و هەورەکانیش لە داپۆشینی ئاسماندا...

---

٤٣- زەوییە حەرامکراوەکان: بەو ناوچە سنوریانە دەوترا کە ڕژێم بە قولایی ١٥ – ٢٠ کم چۆڵیکردبوون، ژیان و هەموو جووڵەیەکی تیدا حەرام کردبوون.

٤٤- ئۆردوگای زۆرەملی، بەو ئۆردووگایانە دەوترا کە ڕژێم خەڵکی دێهاتە ڕاگوێزراوەکانی تیا کۆدەکردنەوە.

٤٥- کوڕکوڕ: بەرزترین لوتکەی چیای ئاسۆسە.

ئەوەتا بایی شــەبەقێک، شــینایيان لە ئاسمانا نەهێشتووە... هەتاکو دێش زیاتر دادەبەزن، لە ئاســتی ئەو شوێنەشدا ئێمەی پیارەتدەبین، هەر ئەوەتا سکی خۆیان لە زەوی ناخشێنن.

یەک دوو دڵۆپ دەکەونە ســەر ڕوومەتم ... ئەگەر لەبەر گەرمییەکەیان نەبێت، هێندە ســووکن هەســتیان پێناکەم... هەتا دێ ژمارەو قەوارەی ئەو دڵۆپانەی بەر ڕوومەتی من و بەر زەوی دەکەون، زۆرترو گەورەتردەبن... دڵۆپەکان بەرزەوی دەکەون و بەرامەیەکی سیحراوی لە زەوی هەڵدەستێنن... جا چ بۆنێک لە بۆنی خۆڵی زەوی دوای یەکەمین بارانی ســاڵ خۆشــترە... تاســیەکانم دەگــرن، لەو بــۆن و بەرامەیــان پڕدەکەم... دەزانم ئــاوا بڕوا، شــوێنی ووشــکم ددانم دەبێ... بەڵام گوێی نادەمێ... لێدەگەڕێم باران نەک هەر جلەکانم، ئێسقانەکانیشــم تەڕکات... دیمەنی ئەو کچەم دێتەوە بەرچاو کــە بە خۆی و چەترێکەوە، بە هەنــگاوی ورد ورد، بەژێر خوناوەی باراندا ڕێــی دەکــرد، لە دڵــی خۆمدا دەمووت، دەبێ ئێســتا بــاران چەند ڕقی لەو چەترە نەفرتیە بێت کە لێناگەڕێت دڵۆپەکانی، تاڵی قژ و ڕوومەت و لامل و باسکی تەڕ تەڕکەن.

مــن بەکاوەخــۆ دەڕۆم و هاوڕێکانم بانگــم دەکەن... ئــەوان بەڕاکردن خۆیــان بەبن چەند گاشــە بەردێک و بە ناوکەوێڵێکدا دەکــەن... نازانم ئەو کەوێڵــە بەتەنها چۆن لەو چۆڵەوانیەدا بەپێوەمــاوە... ئەگەر هاواری ئەوان و ترســی ڕێ هەڵەکردنــم نەبــێ، جــارێ تــا مووددەتێکی کەش هــەروا بە ئارامی، بەبن باراندا ڕێدەکەم... خۆم دەخزێنمە ناو کەوێڵەوە[٤٦]و جلە باران خووساندووەکانم ئاویان لەبەردەچۆڕێ.

هاوڕێکانم نارەزایی لەو بارانە ناوەختە دەردەبڕن، کەچی باران هەستێکی خۆش و زەردەخەنەیەکی نەرم دەخاتە سەر لێوەکانی من... کەوێڵەکە دڵۆپە دەکا، بەڵام من ئەو دڵۆپانەشــم خۆشــدەوێن... خوایە بە منداڵی چەند ڕقم لــە دڵۆپەی بــاران بوو... بەتایبەتیش ئەو دڵۆپانەی لە نیوەشــەودا خەویان لێدەزڕاندم.

لە خەوێکی قووڵ و خۆشدام... دڵۆپەیەک و دووان و سیان و زۆرتریش، لێفەکەم تەڕدەکەن... لەو خەوە خۆشە خەبەرم دەبێتەوە و نوێنەکانم بڕێک بەو لاوەترەوە ڕادەکێشم...

---

٤٦- کەوێڵ: بەو تاکە ژوورە بچکۆلە گڵینە یان لەکەڵەکە بەرد درووستکراوە دەڵێن کە جوتیار لەناو ڕەزوباخدا درووستی دەکات.

لێفەکە بەسەر دەموچاوی خۆمدادەدەمەوە، هێشتا خەوم لێنەکەوتوتەوە، دلۆپــە لێــرەش لە کۆڵم نابنەوە... بەناچاری لە جێگا دێمە دەرێ و فانۆســە کزەکــە خۆشــدەکەم و بــە پەیــژە دارە تەڕەبووەکــەدا دەچمە ســەربان... سیوســیوەکان[٤٧] لە باگردێنە بەردەکە قایمدەکــەم و دەکەومە بانگێڕان... تا هەموو ئەو درزانەی گەرمای هاوین خســتوونیەتە جەســتەی ســەربانەوە نەپەســتمەوە، نایەمــە خــوارەوە... وەختێکیــش دێمــەوە ژووری، جلەکانم هێندەتەڕن، ناچار بە ڕووتی خۆم دەخزێنمە ژێر لێفەکەوە.

ئەو دلۆپە کریستاڵیانەی ئێستا لە ساپیتەی[٤٨] ئەم کەوێڵەوە دێنە خوارێ، دلۆپەکانی سەردەمی منداڵیم نین... تەواو لەوان جیاوازن و چێژێکی تایبەتیشم پێدەبەخشن... هەر ئەو چێژ وەرگرتنەشم، لە باران و لە دلۆپەکانیش، دەبێتە هەوێنی شیعرێکم.

## کەوێڵ

ڕەهێڵەو با،
سەری بۆران پێچپیان کردین بە کەوێڵێکی لاڕێدا!
پشتی کەوێڵ،
وەکو بەری دەستی زبری خاوەنەکەی پڕ شەقارەو
لەگەڵ هەر ڕێژنە بارانێکی تووڕەدا،
چەند دلۆپێک دەتکێنەخوار!
دلۆپەکان، یەک نین... دە نین... نازانم نا،
هێندە زۆرن بەمنی تەزیو نایەنە ژمار!
بەڵام ئەوەی کە دەیزانم لێم تێکناچێ،
هەر دلۆپێ دێتە خوارێ، تۆیەکی تیای!
ئای چەند خۆشە کە دەتبینم
تۆش وەکو من، ئا بەم شەوە عەشقی چیای!

---

٤٧ - سیوسیوە: ئەو دەسکە لەدار درووستکراوەیە کە جاران باگردێنی پێرادەکێشرا.
٤٨ ـ ساپیتە: بنمیچ

زۆر نابا بـاران خۆشـدەكاتەوە... پەڵـە هەورێک چیە بە ئاسـمانەوە نامێنێ. بەرێدەكەوین و جلەتەڕەكانمان هەنگاوەكانیان قورسـتركردووین... چەنـد هەوراز و نشـێوێک دەبڕین و دەگەینە سـەر زێی (بێـژوێ). لێرەدا زێ وەک تیغێكی تیژ جەسـتەی كوردسـتان دەكاتە دوو پارچە... ئەو دوو پارچەیەی، گورزە سـیمێكی ئەستور بەیەكیانەوە گرێدەداتەوە... ئەڵقەیەكی بە كەڵەسەوە[٤٩] هەڵواسراویش، دەستمان توند توند بەخۆیەوە دەگرێ و یەكە یەكە دەمانپەڕێنێتەوە بەری ئەو بەر.

٤٩ـ كەڵەس: سیم یان پەتی پەڕینەوەی سەر زێ و ڕووباران.

## ١٤

لــە زێ بــەدواوە، تــا دەگەینە بارەگاکانــی ســەرکردایەتی، بەناو خاکی ڕۆژهەڵاتــی کوردســتاندا ڕەتدەبیــن... ناوچــە ســنوورییەکانی ئــەوان، بــە پێچەوانــەی ناوچــە ســنوورییەکانی ئێمەوە، هەمــووی دێهاتــی ئاوەدانن... ئــەوەی زیاتــر لــەو دێهاتانــەدا ســەرنج ڕادەکێشــێ، زۆری و چڕی ئەو هەمــوو دارو درەختەی ماڵەکانیــان لەناو خۆیاندا وونکردووە... شــێوازی دروستکردنی خانووەکانیان، تەواو لەوانەی ئێمە جیاوازە. خانووەکان لە قوڕ دروســتکراون، بەڵام بەســەلیقەیەکی ئەندازیارییە... زۆربەی ماڵەکان دووقاتــن، قاتــی ســەرەوە خۆیانی تێــدا دەژیــن و لە قاتی خوارەوەشــدا وڵســاتیان[٥٠]... پەنجەرەی ماڵەکانیش، هەمووی گەورەو بەرەنگی شــین یان سەوز بۆیەکراون... لەسەر شــیپانەی[٥١] زۆربەی پەنجەرەکانیش، ئینجانەی گوڵ و ڕەیحانە ڕیزکراون... کەم دێش هەیە، ئەوانەی دێنەســەر ڕێی ئێمە، چایخانەیەکیــان تێدانەبــێ کە هــەم دەتوانی نانی تێدا بخــۆی و هەمیش بۆ خەوتنی شەویش تێیدا بمێنیەوە...

هەمووی چەند مانگێکە، ڕژێمی شا ڕووخاوە... لە سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشدا، خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات، بە ئومێدێکی زۆرەوە دەیانڕوانیە ڕژێمی نوێ... چاوەڕێی ئەوەبوون لانیکەم، بەمافە ڕۆشنبیری و مرۆییەکانی خۆیان بگەن...

لــە ســەرەتادا خومەینی ڕایدەگەیەنــێ، "ڕژێمێک بەرقــەرار دەکەین کە ئازادی و دادپەروەری بۆ هەمووان فەراهەم کات."

لە پەیامێکی دواتریدا، لەوەش زیاتر دەڕوا:

"ئیســلامی مەزن، دژی هەموو جــۆرە جوداکاریەکەو، ئیمتیازی تایبەتی بەهیچ توێژێک لە توێژەکانی کۆمەڵگادا نادا... لەسێبەری ئیسلام و کۆماری ئیســلامیدا، هەر توێژێک لە توێژەکانی کۆمــەڵ، مافی خۆیان دەدرێتێ... بۆ نموونــە برایانی کورد، مافی بەڕێوەبردنــی کاروبارە ناوخۆییەکانی خۆیان هەیەو، هەموو جۆرە چەوســانەوەیەکی فەرهەنگی و ئابوری و سیاســیان

٥٠ ـ وڵسات: مەڕومالات.

٥١ ـ شیپانە: لیواری پەنجەرە.

لەســـەر لادەبرێ... دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش، لەکاتێکی گونجاودا هەموو ئەو شتانە جێبەجێکات."

پابەندبوونــی خومەینی و کۆماری ئیســلامیش بــەو بەڵێنانەیان، زۆری برنەکرد... قۆناغە شۆڕشــگێڕیی و مافخوازیەکەی خومەینی کۆتایی هات... قۆناغــی زوڵم و ســتەم دەســتپێیکرد... پێدەچێ ئەوە خەســڵەتی زۆربەی هەرەزۆری ڕابەرە شۆڕشــگێڕەکانی دنیابێ... ڕابەرە شۆڕشگێڕەکان، هەر ئەوەندە سێبەری خۆیان بینیەوە، ئیدی جێی ئەو ستەمکارانە دەگرنەوە کە ساڵانێکی زۆر، خۆیان خەباتیان لە دژیان کردووە...

ئەمانیش هەر ئەوەندە، دەستیان لە جڵەوی دەسەڵات قایم بوو، پەلاماری کوردســتانیاندا و هەرچــی توانــا و ئیمکانیاتــی ســەربازیی ئــەو کاتەیان هەبــوو، لــە لێدانی داخوازیە ڕەواو ئاشــتیخوازەکانی خەڵکی کوردســتاندا بەکاریانهێنــا... فەزایەکی ئەوەندە پڕ تــرس و تۆقاندنیان خوڵقاند، خەڵکیان لــە هەموو ئــەو چاوەڕوانیانەی هەیان بوو بێ ئومێدکــرد... بەتۆمەتی "دژە شــۆڕش" زیندانەکانی ئێرانیان پڕکرد... دادگای بەدناوی (خلخالی) حوکمی لەســێدارەدان و گولەبارانکردنــی بــە کۆمەڵــی، بۆ هــەزاران گەنجی کورد دەرکرد... بەشــێکی ئەو حوکمانەش، لەسەرشــەقام و لەنــاو کۆڵانەکاندا و بەبەرچاوی خەڵکەوە جێبەجێکران.

هــەر کــە هێرشــەکانی کۆمــاری ئیســلامی ئێــران، بــۆ ســەر شــارو دێهاتەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســتان دەســتیان پێکــرد، یەکێتی، ژمارەیەکی زۆر لــە پێشــمەرگەو کادرو فەرماندەی بــۆ هاوکاریی و کۆمەکی خەڵک و پێشمەرگەکانی ڕۆژهەڵات نارد. لە بواری سیاسیشدا، مام جەلال و یەکێتی هەوڵی زۆریاندا، لەســەر شــێوەی یەکێتیی نیشــتمانیی کوردستان، نیمچە بەرەیەک، بەڕابەرایەتی شــێخ عزەدین، لە نێوان کۆمەڵەی زەحمەتکێشــانی کوردســتانی ئێــران و حیزبــی دیموکــرات و ڕەوتەکــەی شــێخ عزەدینی حوسەینیدا، دامەزرێنن.

شــێخ عزەدیــن، پێشــتر ئیمــام و خەتیبــی مزگەوتــی گــەورەی مهاباد بوو... لەســەردەمی خۆپیشــاندانەکانی خەڵکی کوردستاندا، وەک ڕابەرێکی شۆڕشــگێڕو نیشــتمانپەروەر بەدەرکــەوت... لە دوای هاتنەســەر حوکمی خومەینیشــەوە، زیاتر وەک ڕابەری ڕوحی و دینی خەڵکی کوردســتان، لە بەرامبەر ڕابەرایەتی خومەینیدا هاتە پێشێ.

مـــام جـــەلال زۆر هەوڵیدا، بەڵام ئـــەو نیمچە بەرەیە درووســـت نەبوو... نە شـــێخ عزەدین، ئەوکاتە، ئەو ئەزموونە سیاســـیە پێویســـتەی هەبوو، نە ڕەوتێکـــی زۆر ڕێکخراو و نـــە هێزێکی چەکداری واشـــی هەبوو... لەوەش زیاتر حیزبی دیموکرات، هەر لەسەرەتاوە ئەو فکرەیان قبوڵ نەبوو... ئەوان شێخ عزەدینیان بە داشکان بەلای کۆمەڵەدا تۆمەتباردەکرد... ئەوەش زیاتر بە هۆی ئەوەی، هەردوو کچەکەی شـــێخ عزەدین، پێشـــمەرگەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوون... خۆیشی وەک دید و بیرکردنەوە، زیاتر لە کۆمەڵەوە نزیک بوو:

- بڕوای بەجیاکردنەوەی دین و دەوڵەت هەبوو.
- بڕوای بەیەکسانی تەواوی نێوان ژن و پیاو هەبوو.
- بڕوای بە خورافاتی دینی نەبوو.

ئێمە، ئەوە دوو شەو و ڕۆژە، بەناو دێهاتەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا ڕەتدەبین، بەهەر دێیەکدا تێدەپەڕین یان لادەدەین، بە ئاشکرا بەرهەمی ئەو هەڵوێســـت و هاوکاریەی یەکێتی، لەبەرخـــوردی خەڵکەکەدا دەبینین... هەر کەسێ دەبینی، پێشوازی گەرمت لێدەکاو ڕوو لە هەر ماڵێک دەنێی، کارێک دەکا، ئەو هەستەت بداتێ کە تۆ میوان نیت خانە خوێیت.

## ١٥

دواجار، دوای سەفەرێکی چەند ڕۆژەی دووردوودرێژ، دەگەینەسەر یەکەم باسکی[٥٢] تووژەڵە... لەسەر ئەو باسکەوە تەماشاکەی:

شاخێک، هێندە بڵندە خەریکە زمانی لووتکەی لە ڕوومەتی ئاسمان هەڵدەسوێ... لە باوەشیا دۆڵێکی بەدارستان چڕو بەکانیاو پڕ... باسکەکانی ئەمبەر و ئەوبەریش، تارمێکی[٥٣] قایمیان بۆ هەموو ئەو بارەگایانە دروستکردووە کە لە هاویندا ڕوو لێرەدەکەن و بەبن دارگوێزە زۆر پڕەکاندا بڵاودەبنەوە.... چەمێک، هەرچی دامیاوی[٥٤] شاخی مامەندە هەیە، لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ و هەتا تێکەڵ بەو زێیە نەبێ کەبۆتە سنورێکی دیکەی نێوان هەردوو پارچەی نیشتیمان، لە هاژەو کەفچڕینی خۆی ناکەوێ.

بەرەو بارەگاکان شۆڕ دەبینەوە، من خەریکی بەراوردکردنی وێنەکانم... ئەو وێنانەی لەزهنی خۆمدا، لەسەرکردەم کێشاون، لەگەڵ ئەو وێنانەدا کە تۆزێکی تر ڕووبەڕوو دەیانبینم.

یەکەم بارەگای سەر ڕێمان، خێمەکەی (مامۆستا موحسین)ە. موحسین عەلی ئەکبەر، کادیری پێشکەوتووی کۆمەڵەو نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ئێران. چەند ڕۆژێکە ئۆفیسی نوێنەرایەتیەکەی لەسەردەشتەوە بۆ تاران گواستۆتەوە. دوو ڕۆژە لە تاران گەڕاوەتەوە... گەڕانەوەکەشی بۆ زەمینەسازکردنی دیدارێکە لە نێوان بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی و مام جەلالدا. ئومێدەکان لەسەر ئەوەن، مام جەلال بتوانێ ئێرانیەکان بێنێتە سەر ئەو قەناعەتەی، لەبری ڕێگای شەڕ، بە ڕێگای ئاشتیانە، کێشەکانی کورد لە ئێراندا چارەسەرکەن. مامۆستا موحسین، بۆ ئەنجامدانی ئەو دیدارە و بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی دیکەی یەکێتی لە ئێران، لە هاتوچۆی بەردەوامی نێوان توژەڵەو تاراندایە.

دوای پشوویەکی کورت، خێمەکەی مامۆستا موحسین جێدێڵین و من سەرلەنوێ دەکەومەوە بەراوردکردنی وێنەکان.

---

٥٢ ـ باسک: پاڵ، زینوو.

٥٣ ـ تارم: ساتر.

٥٤ ـ دامیاو: ئەو ئاوەی لە توانەوەی بەفر دروستدەبێت.

بۆ ئەوەش تووشی ڕەشبینیەکی زۆرنەبم، دەبێ کەمێک لە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی خەیاڵەکانی خۆم بێمەدەرێ... دەبێ بزانم، ئەو وێنانەی لە خەیاڵدا دروستدەکرێن، جا وێنەی کچێک بن یان هونەرمەند، ئەدیب، سیاسی یان کاراکتەرێکی دینی ، ئەوەندە زێدەڕۆییان تێدادەکرێ، چیوا لەوێنە ڕاستەقینەکانی خۆیان ناچن...

بەو مشتومرانەی ناو خەیالی خۆمەوە، دەگەینە بارەگای مەکتەبی عەسکەریی و ملازم عومەر پێشوازیمان لێدەکا... ملازم عومەر، بەرپرسی ئەو مەکتەبەیە و هەم فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانیشە... قسەخۆش و دەم بە پێکەنین. گورجوگۆڵ و بەخزمەت... ئەدەبدۆست و هونەر دۆست و مرۆڤ دۆست... وەختێکی وات ناوێ، لەگەڵیدا ببیە هاوڕێ... نانی نیوەڕۆ لەوێ دەخوێن و تاوەختی سەردانی مام جەلال دێ، مەلا بەختیار باسی سەردانی شاروباسی جەولەکەی خۆی دەکاو... منیش باسی شیعرو ئەدەب و دۆخی ناوشار... ملازم عومەریش دۆخی شۆڕش و پێشمەرگەمان لە ئاوێنەیەکی ڕووندا دەخاتە بەرچاو.

عەسرێکی درەنگ، لەگەڵ ملازم عومەر و مەلا بەختیاردا، بەرەو بارەگای مام جەلال، بەدۆڵەکەدا هەڵدەکشێین.

بارەگای مام جەلال، خێمەیەک و سێبەری چڕی دارگوێزێکی گەورەیە... چەند خێمە و چەند کەپرێکی پێشمەرگەکانی پارێزگاریش، بەدەوریدا بڵاوبونەتەوە...

هێشتا، چەند مەترێکمان ماوە بگەینە لای ئەو دارگوێزەی مام جەلال لەگەڵ چەند میوانێکیدا لە ژێریا دانیشتوون... مام جەلال، هەڵدەستێتە سەرپێ و بەدەم ووتنەوەی کۆپلەیەک لە شیعری(دوانامە) بەرەوپیرمان دێ:

"ئەمجارەیان،

ئەشکەوتەکان ناڕووخێن و چۆک دانادەن.

ئەمجارەیان،

چیاکان تارای سپی بەفری لووتکەکانیان،

ناکەن بە ئاڵای تەسلیم بوون و

سەری بەرزیان، بۆ هیچ شایەک نەوی ناکەن"[٥٥]

دەگەینە بەردەمی و لەگەڵ باوەشێکی زۆر گەرمدا، بەخێرهاتنم لێدەکات تاساڵانێکی زۆری پێشمەرگایەتیش، هەستم بە گەرمی ئەو باوەشەی مام جەلال دەکرد...

مام جەلال، من بە شاعیری شیعری ئاگرین، بەمیوانەکانی، شێخ عزەدینی حوسەینی وسەلاحەدینی موهتەدی، دەناسێنێ.

دواتر دێتە سەرباسی میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی و دەڵێ:

"ژمارەیەک لەو شیعرانەی لەو میهرەجانەدا خوێندراونەتەوە، خراونەتە سەر کاسێتێک و نووسخەیەکی ئەو کاسێتەیان بۆ من هێنا... کە یەکەمجار گوێم لە کاسێتەکە گرت، لە خۆشیاندا هەردوو چاوم پڕبوون لە ئاو... ڕۆژی دوایی بوو یان دوو ڕۆژ دواتر، کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیمان سازکرد... لەوێدا بە برادەرانی خۆمانم گووت، ئەگەر تا ئێستا هەر لە ئومێد و گەشبینیی خۆمەوە، باسی سەرکەوتنی شۆڕشم کردبێ، ئەوا لە ورۆوە، لەدوای گوێگرتن لە کاسێتی شیعری ئەو شاعیرانەوە، بە دڵنیاییەوە پێتان دەڵێم، سەردەکەوین... هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە، بەسەرهاتێکی (چەرچڵ)م بۆ هێنانەوە:

---

٥٥ ـ ئەم کۆپلەیە، بەراوردیکی خێرایە لە نێوان گیانی بەرەنگاریی پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێ بەرامبەر  بە ئاشبەتاڵ و خۆبەدەستەوەدانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول لەبەرامبەر ویستی شای ئێراندا.

لەسەردەمی شەڕی دووەمی جیهانیدا، ئەو کاتەی (بەریتانیای مەزن)، بەهەموو توانایەکیەوە دژی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی لە جەنگدا بوو، سبەینەیەکیان زوو، چەرچڵ بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران دەڕوا، لە ڕێگایە و لەناو سەیارەکەیدا، بیری دەکەوێتەوە کە تووتنی پایپەکەی لەبیرچووە... دەگەنە بەردەمی کوشکی جەریدە و جگەرە فرۆشێک... بەسایەقەکەی دەڵێ، دابەزە هەندێک تووتنم بۆ بکڕە. ئەویش، هەر لەبەردەمی کوشکەکەدا، سەیارەکەی لەسەرجادەی ڕادەگرێ... دادەبەزێ تا بچێ تووتنەکەی بۆ چەرچڵی بکڕێ... لەو کاتەدا پۆلیسێکی هاتووچۆ دەیبینێ و پێی دەڵێ:

- سەیارە ڕاگرتن، لەم شوێنەیدا قەدەغەیە.

- لە دوو دەقیقە زیاترم پێناچێ، هەر تا ئەو کوشکەی دەچم و دێمەوە، سەیاقەکە وا وەڵامی کابرای پۆلیس دەداتەوە.

پۆلیسەکەش پێی دەڵێ:

- دوو سانیەش قەدەغەیە... ئەگەر هەر ئێستا نەڕۆی، ناچارم تیکتی سزات بۆ بنووسم.

- ئاخر مستەر چەرچڵ لەناو سەیارەکەیدایە... دەچم تووتنی بۆ وی دەکڕم.

- من یاسا جێبەجێدەکەم و کارم بەوەنیە کێ لە ناو سەیارەکەتدایە... ڕێی سەرپێچی کردن بە مەلیکیش نادەم.

سایەقی بەستەزمان، دەگەڕێتەوە لای سەیارەکەی و گفتوگۆی خۆی و پۆلیسەکە بۆ چەرچڵ دەگێڕێتەوە... چەرچڵیش دەڵێ:

«سەرکەوە بابڕۆین.»

کە دەگاتە ناو هۆڵی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیران، یەکەم قسەی ئەوە دەبێ:

"سەردەکەوین، بەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم سەردەکەوین... مادام لە وڵاتی ئێمەدا، خەڵکانێک هەن، تەنانەت لەم بارودۆخەی شەڕیشدا، یاسا دەپارێزن و ئەرکی خۆیان بەجێدەهێنن، سەرکەوتنمان مسۆگەرە."

کاسێتەکەم دەرهێناو، بە برادەرکانم گووت:

گـوێ لەو شـیعرانە بگـرن، ئەودەمـەی تێدەگەن کە ئێمە لـە جەنگماندا دژی ڕژێم، هەر ئەو چەند هەزار پێشمەرگەی ناو ئەو شاخانە نین... پێتان دەڵێم، مادام ئێمە لەناو شـارەکاندا، خەڵکی ئاوا خاوەنبڕوا و چاونەترس و ئازامان هەن و بەشیعر شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ ڕژێمدا دەکەن، دڵنیابن سەردەکەوین. لەدوایدا یەکێک لە برادەرانی ناوکۆڕەکە گووتی:

"مادام وایە، هەقە هەریەک لەو شاعیرانە، پلەی ئامر هەرێمیان بدەینێ."... ئەمنیش گووتم، وەک چۆن لە وڵاتانی دیموکراتیدا، پەرلەمانتاران حەسانەی پەرلەمانییان هەیە، دەبێ لای ئێمەش، هەریەک لەو شـاعیرانە، حەسـانەی هەتاهەتایەی شۆڕشیان هەبێ.

مودەتێک باسی شیعرو ئەدەب کرا... سەلاحەدینی موهتەدی، کە پێدەچوو شـارەزاییەکی زۆری لەسـەر شـیعر و ئەدەبیاتی ئێرانی، بە فارسـی و بە کوردیشـەوە، هەبێ، ئاوا باسـی ڕۆڵی شـیعری لە شۆڕشی گەلانی ئێراندا کرد:

"ئـەو شۆڕشـەی کە ئاقیبەت شـای ڕووخانـد، لە کۆڕێکی شـیعریەوە دەسـتیپێکرد. لە دانشگای تارانێ، کۆڕێک بۆ چەند شاعیرێک سازدەکرێ... شـیعرەکان ئەوەنـدە بەتین و حەماسـەتخولقێن دەبن، هەمـوو خەڵکی ناو هۆڵەکەی هەڵدەسـتنە سـەرپێان و دوایـەش لە شـێوەی تەزاهورەیەکی[56] گـەورەدا بـە خەیابانـێ وەردەبن. ئیدی هــەر ئەو تەزاهورەیـە بوو، کە لە نەتیجـەدا نارەزاییەکانـی خەڵکـی هێنایە سـەرجادەی و هەمـوو تاران و لەدوایەشدا هەموو ئێرانی گرتەوە."

میوانـەکان ڕووخسـەت لە مام جـەلال دەخـوازن و ماڵئاوایی دەکەن... مام جەلالیش بۆ تاوتوێکردنی سەردانەکەی مەلا بەختیار، بۆ ناو شارو بۆ هــەردوو هەرێمـی پێنج و چوار، بـۆ ٤٠ – ٥٠ دەقیقەیەک ئێمە جێدەێڵێ و لەگەڵ ئەودا دەچێتە ژێر خێمەکەی خۆی.

کۆبوونەوەکەیان تەواودەبێ... بۆ کورتە پیاسەیەک من دەباتە ئەولاوە:

"لەوەختێکی باشـدا هاتی... دوای جیابوونەوەی باڵەکەی ڕەسوڵ مامەند لە بزووتنەوەی سۆشیالسـتی کوردستان، ئێستا ئێمە، خەریکی سەرلەنوێ ڕێکخسـتنەوە و دانانەوەی سـەرکردایەتی بزووتنەوەین. ئەمن پێم باشـە

٥٦ - تەزاهورە: خۆپیشاندان.

ئەتو لە سەرکردایەتی نوێی بزووتنەوەدا دانێین. نامەمان بۆ ژمارەیەک برادەریکەش ناردووە، ئەوانیش لەو ماوەییدا دێنە دەرێ و ئەودەمی بەهەمووومان دەتوانین بزووتنەوەی هەستێنینەوە."

ئەگەر من ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان نەبامایەو، ئەو وێنە جوانەشم لە زهنی خۆمدا نەبوایە کە سەبارەت بە ئەندامی سەرکردایەتی هەمبوو، ڕەنگە ئەو پێشنیارەی مام جەلالم ئەوەندە لا نائاسایی نەبوایە. بۆیە، بێ ئەوەی بیر لە پێشنیارەکە بکەمەوە، گووتم:

- زۆر سوپاسی ئەو متمانە زۆرەت دەکەم کە بەمنتداوە، بەڵام داوای لێبووردن دەکەم کە ناتوانم ئەو کارەبکەم. من نە ئیمکانیاتی ئەم پۆستەم هەیەو نە ئەزموونێکی سیاسی واشم هەیە، تا بەکەڵکی کاری لەوجۆرەبێم... بێجگە لەوەش من ئەندامی کۆمەڵەم و ناتوانم لەگەڵ ڕێکخراوێکی دیکەدا کاربکەم.

مام جەلال کەمێک بێدەنگ دەبێ و بەجۆرێک لە نابەدڵیەوە پێمدەڵێ:

- زۆرباشە. مادام وایە، من لەگەڵ برادەرانی ناوەندیشدا قسەدەکەم... ڕەنگە دەزگای ڕاگەیاندن بۆ تو، لە هەموو شوێنەکانی تر باشتربێ.

بزووتنەوە، بەسەرکردایەتی و بە پێشمەرگە و بەو ڕێکخستنەشەوە هەیانە، لە یەکێتی چوونەدەرێ... کەچی مام جەلال بە جیابوونەوەی بزووتنەوەی نازانێ... ئەم، بە جیابوونەوەی باڵی نارەسەنی لە باڵە ڕەسەنەکەی بزووتنەوە ناو دەبا.

ئێستا مام جەلال دەیەوێ، بەو پێنج شەش کەسەی لەو (باڵە ڕەسەن)ە ماون و بەهێنانە دەرەوەی چەند کەسێکیش لەناو شارەکانەوە، بزووتنەوە هەستێنێتەوە و سەرکردایەتیەکی نوێی بۆ درووستکات... دیارە هەموو ئەوانەی لەو سەرکردایەتیە نوێیەدا دادەمەزرێن، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیش، دەبنە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی... بە گوێرەی شایستەی ڕێکخراوەیی و پرنسیپی هاوسەنگیش لە بەینی باڵەکانی ناو یەکێتیدا، بەقەد کۆمەڵە نوێنەریان لەبەرپرسیارێتی هەردەزگایەکی یەکێتیدا دەبێ. ئاوا لێرەوە و لە یەکەم دیدارمدا لەگەڵ مام جەلال چرژێک[٥٧] کەوتە ئەو وێنەیەی من لە سیاسی و لە سەرکردەی (شۆڕشی نوێ)م کێشابوون.

---

٥٧ - چرژ: ئەو درزەیە کە دەکەوێتە سەر ئاوێنەو شوشە.

## ١٦

بـارەگای دەزگای ڕاگەیاندن، لە ناو یەکێک لـە خانووەکانی (زەڵێ)دایە... ئێستا زەڵێ، لەو چەند ماڵەی جارانی، تەنها یەک تاقە ماڵی لێماوە، ماڵی مام ئەحمەد و پورە کەسـکێ... ئەویش هەمووی (٤٠ –٥٠) مەترێک، لە دەسـتە چەپی ئێمەوەیە.

بـەو بەرمانـەوە، بـارەگای مەکتەبـی عەسـکەری و، بەدەسـتە چەپی ئەوانیشـدا و چەند سـەد مەترێک بەو لاوە، بارەگاکانی حیزبی شـیوعی عێراقی... لەپشـتی بارەگاکەی ئێمەشـەوە، بارەگای لقی سـێی یەکێتی.

مامۆسـتا جافـر (فـازڵ کەریم ئەحمـەد) بەرپرسـی دەزگای ڕاگەیاندنە، لـە هەمان کاتیشـدا، ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە و ئەندامی مەکتەبی سیاسـی یەکێتیشە...

ئەو شـوێنەی ئێمەی تێداین، خانوویەکی گەورەی چەند ژووریە، پێدەچێ ماڵـی کوێخای دێ بووبێ... ژوورێک، مامۆسـتا جافر و منـی تێداین... دوو ژوور، برادەرانـی تری دەزگای ڕاگەیانـدن... ژوورێک بۆ کاری چاپکردن و کەرەسـەکانی چاپخانەیە... دوو تایپی برازەر، ڕۆنیۆیەک، چەند بەسـتەیەک ستێنسـڵ، چەنـد کارتۆنێک کاغـەز، مەکینەیەکی دەرزی لێدان، مقەسـتێکی گەورەی کاغەز برین و هەندێ بوتڵی مەرەکەبیش. هەر لەو ژوورەدا هشیار عابیدو سورکێو دەژین. سورکێو تایپیست و هشیاریش وێڕای کاری تایپکردن، هەمـوو کارە هونەریەکانی چاپخانەشـی لە ئەسـتۆیە، هەر لـە تایپکردن و مۆنتاژەوە تا بەکارهێنانی ڕۆنیۆو کۆپیکردنی یەک بە یەکی ستێنسڵەکان.

کەلوپەلەکانـی دەزگای ڕادیـۆش لە ژوورێکدا هەڵگیـراون. ڕادیۆ(دەنگی شۆڕشی عێراق)، بۆ چەند ڕۆژێک لە نەورۆزدا (١٩٧٩)، خراوەتەکار... ئیدی لەو ساوە تا ئێستا، دیارنیە کەی جارێکی تر دەکەوێتەوە کار.

بە پاڵ ژوورەکەی ئێمەوە، شوێنێکمان هەیە لە شێوەی ژووردا کردوومانەتە ناندیـن[٥٨]. لە دەرەوەی بارەگاش موەلیدەیەکی کارەبا، بۆ بەکارهێنانی ئامێرە کارەباییەکانـی چاپخانە و ئەگەر ڕادیۆش بکەوێتە گـەڕ، دیارە بۆ ئەویش... ئەوەی لەو خانووە زلەدا نیمانە، حەمام و ئاودەستە.

---

٥٨- ناندین: مەتبەخ یان شوێنی چێشت لێنان.

بڵاوکراوەکانی شۆڕش، گۆڤاری کۆمەڵە و هەواڵنامەش، هەر لەم دەزگایەدا ئامادە و چاپدەکرێن... ڕۆژنامەکانی ڕێبازی نوێ و (ئەلشـــەرارە)ش، لەشام چاپدەکرێن و دەهێنرێنەوە کوردستان.

بەدەستە چەپی ئێمەدا، هەورازێکی کووڕ، یان شاخێک لە شێوەی هەورازدا، پیادە ڕێیەکی پێچاوپێچ، دەتباتە ناو بارەگاکانی خڕی[59] نێوزەنگ، ئەو خڕەی سەردەمێک بە (دۆڵی حیزبان) ناودەبرا...

ئەگـەر لە خـواری خوارەوەی ئەو خـڕەوە پێهەڵگەڕێی، بـە دوکانەکەی ئەحمەد ساروخ دەستپێدەکات، ئەو دوکانەی زۆرینەی پێداویستیەکانی ئێمەی تێدا دەســتدەکەوێ... کەمێک ســەردەکەوێ و لەدەســتە چەپـا، بارەگاکانی بەشێک لە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی... چەند سەد مەترێ دێیتە سەرێ، بارەگای مـام جەلال و چەنـد بارەگایەکی ترن... بەملاو ئەولای ئەمانیشـدا، بارەگای کەرتەکانی هەرێمی پارێزگارین... زۆر بەپشتی بارەگای مام جەلالەوەو بەسەر زینوویەکی بەرزەوە کە پێیدەوترێ (زینووی ســوور)، بارەگای نەوشیروان مستەفا و کەرتێکی دیکەی هەرێمی پارێزگارییە.

لــە بارەگای مام جەلال تێدەپەڕی، دەگەیتە بارەگای مەکتەبی سیاســی و سەرووتریش، بارەگای کەرتەکەی بەکر پیرۆت و باڵاتریش، بارەگاکانی مەلا بەختیار و ســالار عەزیزن... دوایین بارەگاش، بەسەر ترۆپکی هەورازەکەی نێوزەنگەوە، بارەگای کەرتەکەی عەبدولڕەحیمە.

عەبدولڕەحیم هەم خزم و هەم هاوڕێشمە... کە لە شاربوو، یەک لە کادرە رۆشــنبیر و زۆر چالاکەکانی ڕێکخســتنی کۆمەڵەبوو، لەناوچەی پشــدەرو سەنگەسەردا... ئێستاش فەرماندەی یەک لە کەرتەکانی هەرێمی پارێزگاریە... بارەگاکەیــان ژوورێکــی تۆزێ گەورەی کوخییــەو، ژوورێکی زۆر چکۆلەی کەشــیان هەیە بۆنان و چێشــت کردن بەکاریدەهێنن... ئێســتا دووڕۆژە ئەو ژوورە چکۆلەیــە کراوەتــە یەکەمین زیندانی شــۆڕش و یــەک تاکە زیندانی تێدایە، ئەو زیندانیەش عومەرە.

مــن و عومــەر، جگە لەو چەنــد ڕۆژە بەیەکەوەبوونەی قەرەداغ و لەو ســەفەرەی سەرکردایەتیشــماندا، شــتێکی دیکە بەیەکمانەوە نابەســتێ... تەنانەت پێشــمەرگایەتی بوونەکەشــییم لا غەریب بــوو... تۆ جاش بیت و هەر لەبەر ئەوەی براکەت چەکەکەت دەفڕێنێ و دێتە ناو پێشمەرگە، تۆش بەدوایدا بێیت و ببیە پێشمەرگە!

---

٥٩ ـ خڕ: شیو ، دۆڵ

هۆکاری پێشمەرگەبوونەکەی هەرچیەک بێ، تازە پێشمەرگەیە و ئەوەندەش لەو ماوەی بەیەکەوە بوونەدا ناسـیم، کوڕێکی بەئەدەبی گوێڕایەڵی سـادە و شەرمنە.

هێزێـک لە قەرەداغـەوە، لەگەڵ ئێمـەدا هاتوون... دەیانـەوێ لە ئەگەری پەلاماری هێزەکانی قیادەی موەقەتەدا، پارێزگاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بکـەن. دوو هەفتە زیاترە، هێزێکی قیادەموەقەتە، لە دیوی ئێرانەوە هاتوون، سـەنگەریان بە درێژایی زنجیرە چیای جاسوسـان، بەرامبەر بە بارەگاکانی سـەرکردایەتی لێداوە... ها ئەمشەو ها سبەی شەو هێرش دێنن... عومەر بۆ بەرگریکردن بەرامبەر بەو هێرشـە لە گوینە[٦٠]هاتووە و عوسمانی براشی لە قەرەداغ ماوەتەوە... عوسـمان، چەند شەوێک پێش ئێستا، دوو پێشمەرگە لە شـیرین خەودا دەکوژێ، چەکەکانیان دەباو تەسلیم بە حکومەت دەبێتەوە... دووشـەو دواتر، مەفرەزەیەک لە پێشـمەرگەکانی هەرێمـی پێنج، دەچنە ناو ئـۆردووگای (زەڕاییـن)ەوە و، لەتۆڵەی ئەو دووپێشـمەرگەیەدا، عوسـمان بەخۆی و باوک و دایک و خوشکێکیشیەوە، دەکوژنەوە...

شـۆڕش، لـە ترسـی ئـەوەی، ئەگـەر عومەر بەمـە بزانێ، لە شـۆڕش بەلەسـەدەبێ[٦١] و ئەوەی لە کاری خراپە لە دەستی بێ، دژی شۆڕش دەیکا، عومەر دەگرێ و هەر ئەمشەویش لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندی شۆڕشدا، لە شیوەکەی ئەو دیو زینووی سووردا گوللەبارانی دەکا..

ڕووداوەکان، هێندە زۆر لەیەکدی دەچن، دەڵێی جمکەن[٦٢]. ئەمیان لە شۆڕشی نوێدا و ئەویان لە شۆڕشی ئەیلولدا... شوێن هەمان شوێنەو، پاساویش هەمان پاساو، تۆڵەی خوێنی شەهیدان و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی شۆڕش.

پانزە ساڵ لەوەوبەر و لە قەرەداغ، لە شەڕێکی نێوان هێزەکانی مەلایی و جەلالیدا، دووپێشـمەرگەی مەلاییەکان کە هەردووکیان بارزانین، بەناوەکانی (سـیامەند و ملکـۆ)ەوە دەکوژرێن. عوسـمان عوزێری، لـە (ڕادیۆی دەنگی شۆڕش)ی ئەیلولدا پێشمەرگەیە... هەر لەبەرئەوەی حاجی برایمی چەرمەگای مامی، تۆمەتی کوشتنی سیامەندو ملکۆی دەخرێتە ئەستۆ، لەلایەن بارزانیەوە، فرمانی گرتنی بۆ دەردەچێ... ئیدی هەر ئەو گرتن و بردنەش دەبێ، ئێستاو ئەوساش نەزانرا تەرمەکەشی لە کوێیە...

---

٦٠ ـ لە گوین: چاوەڕوانکراو.

٦١ـ بەلەسە دەبێ: یاخی دەبێ، تەرە دەبێ

٦٢ـ جمکە: دووانە.

## ١٧

زۆرنیە گەیشـتوومەتە ناوچەکانی سەرکردایەتی... هێشتا ڤایرۆسی ڕق لە یەکتربوونەوەم نەهاتۆتە جەسـتەوە... بە مامۆسـتا جافر دەڵێم، هەندێ برادەرم لە ناو حسـیکدا[٦٣] هەن، دەمەوێ سـەردانیان کەم... دوای نیوەڕۆ، ملـی ڕێـی بەرەو (بێـدەلان) دەگرم... شـەش مانـگ دەبـێ، بزووتنەوە لە یەکێتـی جیابوونەتەوە... بارەگاکانی خۆیان بردۆتـە گوندی بێدەلان. دەبێ ئەوەش بڵێم، هەر چەندە بەجیابوونەوەیان، یەکێتی کادری سەرکردایەتی و سیاسـی وا بە توانای لە دەستنەدا، مایەی ئاماژە پێکردنبن، بەڵام کۆمەڵێک فەرمانـدەی سـەربازیی و پێشـمەرگەی ئـازاو دڵسـۆزی لە دەسـتچوو، بەتایبەتیـش لەناوچەکانـی هەولێـر و خۆشـناوەتی و دۆڵـی ئاکۆیەتـی... ئەوە وێڕای زیانگەیاندنیشـی بە ڕەنگاوڕەنگیی ئایدۆلۆژی و سیاسـی ناو یەکێتی... لەوەش خراپتر، ڕێگا خۆشـکەربوو، بۆ هاتنە پێشەوەی کۆمەڵێک خەڵکـی کەم ئەزمـوون و کەم توانا، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشـاییانەی کە لە دەزگا سـەرکردایەتیەکاندا دروست ببوون... بزووتنەوە جیابوونەتەوەو پاساویشیان بۆ ئەم کارەیان ئەوەیە:

مام جەلال، هەموو دەسـەڵاتەکانی دارایی، پێشـمەرگە، پەیوەندییەکانی دەرەوە و دەسـەڵاتەکانی بڕیاردانـی لە دەسـتی خۆیـدا کۆکردۆتەوەو لە دابەشکردنی چەک و تەقەمەنی و پۆستیشدا، بەلای کۆمەڵەدا دایدەشکێنێ.

جیابوونەوەکـە، چەند پەیوەندی بەو پاسـاوانەوە هەبووبێ، لەوە زیاتر پەیوەندی بە باڵادەسـتبوونی ئەو ئاڕاسـتەیەوە هەیە کە دوای تێداچوونی سەرکردە دیارەکانی بزووتنەوە، لە کارەساتی هەکاریدا دەرکەوتن.

سەرکردەکانی ئەو ئاڕاسـتەیە، هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ ئەوەدا نەبوون، بێنـە ژێر چەتـری نیمچەبەرەیی یەکێتیـەوە... وەک خۆیـان ڕایاندەگەیاند، دەیانەویسـت، لە نێـوان جەلالی و مەلاییدا، ببنە هێڵی سـێیەم... هەرچەندە زۆرتریش لە کۆنە مەلاییەکانی ناو بزوتنەوەبوون.

---

٦٣-حسیک: حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی کوردستان، لە یەکگرتنی بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان (ئەو باڵەی مام جەلال بە نارەسەن یان بە جوجە ڕسوڵی ناودەبردن) و لە کومیتەی ئامادەکاریی پارتی دیموکراتی کوردستانی دکتور مەحمود پێکهاتبوو.

ئەوان، هەر لەسەرەتاوە دەیانەویست، ڕێکخستنی جیا، هێزی پێشمەرگەی جیـا، دارایـی، پەیوەندی جیا، بەرنامەو سـتراتیژی جودای خۆیـان هەبێ... ئـەو سـتراتیژەش، بڕوانەبوون بوو بە شـەڕی درێژخایەن و بەدروشـمی ڕووخاندنی ڕژێم... بەرنامەی ئەوان، کۆکردنەوەی هێزێکی زۆری چەکداربوو کە لە بەرامبەر حکومەتدا، بۆ نمایشـی سـەربازیی بـەکاری بێنن، نەک بۆ شەڕکردن... بەو هیوایەی لەو ڕێیەوە، قەناعەت بە حکومەت بێنن لەگەڵیاندا بکەوێتە گفتوگۆوەو، لەوێشـەوە بەشـێک لە داخوازییەکانیان بۆ بێتە دی... ڕەخسـانی ئـەو هەلەیان، لـە جیابوونـەوەی خۆیان لـە یەکێتـی دەبینی. ئـەوان پێیان وابوو کە یەکێتی بەهۆی پەیوەندی قووڵیەوە لەگەڵ سـوریاو لیبیـا و لەگـەڵ (کۆبەندی نیشـتمانیی عیراقی- التجمع الوطنـی العراقی)دا، ڕێـگای سـازان لەگەڵ حکومەتـی عێراقیدا ناگرێتەبەر. هـەر بۆیەش دوای جیابوونەوەیـان لە یەکێتی و، دوای یەکگرتنەوەیان لەگەڵ پارتەکەی دکتۆر مەحمـود عوسـماندا(لیژنەی ئامادەکاری پارتی دیموکراتی کوردسـتان) و پێکهێنانی حیزبی سوشیالسـتی یەکگرتووی کوردستان- حسیک، یەکسەر لەگەڵ حکومەتدا دەستیان بە گفتوگۆکرد.

هەفتەیەک نابێ، دکتۆر مەحمود، سـەرۆکی وەفدی حیزبی سوشیالستی یەکگرتووی کوردسـتان، لە بەغدا گەڕاوەتەوە و هیوایەکی زۆریان لەسەر ئاکامی ئەو دیدارەیان هەڵچنیوە.

دەگەمە ناو بێدەلان... بەپرسیار هاوڕێکانم، شێخ محەممەدی سەرگەڵوو، فەقێ بایز کاکەسـوور و موحسـن بایز[٦٤]. دەدۆزمـەوە... ماوەیەک پێکەوە دەبین و دواتر سـەردانی دکتۆر مەحمود دەکەین... دکتۆر مەحمود، لە پاڵ گابەردێکدا دانیشتووەو گوێ لە هەواڵەکانی کاتژمێر پێنجی بەشی عەرەبی ڕادیۆی BBC دەگرێ....

دکتـۆر مەحمـود، لـە ڕەوتـی گفتوگۆکەیان ڕازیەو پێشـی وایـە، یان واپیشـاندەدا کە بەو ڕێکەوتنەیان دەتوانن بەشـێکی زۆر لە داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان بهێننەدی.

- تۆپێـت وایەحکومـەت لەگـەڵ ئێـوەدا ڕێکدەکـەوێ و مافەکانی کورد دەسـەلمێنێ، لەکاتێکـدا خۆی باش دەزانێ کە هێزی سـەرەکی لە شـاخ و

---

٦٤- شێخ محەمەد و فەقێ بایز دوو سێ مانگێک بەر لەمن ببون بە پێشمەرگە، دوای جیابونەوەی بزوتنەوە لە یەکێتیی... هەر یەکەشیان بەرپرسی لیژنەیەکی ناوچەی ئەو حیزبە بوون. موحسین بایزیش، جێگری فەرماندەی هەرێمێکی پێشمەرگەی حسیک بوو.

لەناوشاریشدا، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە؟!

ـ بەڵێ پێم وایەو هێزی سەرەکیش لە کوردستاندا، یەکێتی نیە.

ـ گریمــان ئــەوە حکومــەت لەگەڵ ئێــوەدا ڕێکــەوت و ئێــوە چوونەوە ناوشــارەکان، تــۆ پێت وانیــە بەمە ســەردەمێکی نوێی جەلالــی و مەلایی دووبارە دەبێتەوە؟

ـ نــا، ئەو ســەردەمە تێپەڕی... هــەر ئەوەندە ڕێکەوتن لــە نێوانی ئێمەو حکومەتــدا ڕاگەیەنرا، ئەوســا ئەبینی کەس بەدەوری جەلالــەوە نامێنێ و، جەلالیش دەبێ جانتاکەی هەڵگرێ و بگەڕێتەوە سوریا.

هێشــتا من دەمەوێ پرسیاری زیاتری لێبکەم، ئەو جانتا دبلۆماسیەکەی دەکاتەوە و زەرفێکی گەورە دەردێنێ.. لەســەر پشــتی زەرفەکە، بەخەتێکی درشت نووسراوە(جەلالیات)... هەندێک نامەی لە زەرفەکە دەرهێنا.. نامەکان، نامەی مام جەلالن کە بۆ هەندێک لە کادر و فەرماندەکانی ئەوانی نووسیون، بەو مەبەستەی قەناعەتیان پێبێنێ بگەڕێنەوە ناو یەکێتی.

دکتۆر مەحمود، لە پیشاندانی ئەو نامانەدا، دەیەوێ بڵێ:

"ئــەوە، ئەو فەرماندە و کادیرانەی ئێمەن، ئێوە و مام جەلال پێیان دەڵێن، شڕەخۆر و گومانلێکراو... هتد، کەچی ئەوەتا مام جەلال بەدەستوخەتی خۆی، نامەیان بۆ دەنووســێ و بە خەڵکی دڵسۆزو قارەمان ناویان دەبات و ئەگەر بگەڕێنەوە ناو یەکێتیش، پلە و پۆستی لەوە زیاتریان دەداتێ کە ئێستا لەناو ئێمەدا هەیانە."

## ١٨

سەردانی هاوڕێکانی ناو حسیکم، نە لای حسیک و نە لای خۆشمان باش لێکنەدرایەوە. ئەوان پێیان وابوو کە من بەمەبەستی بانگەشە بۆ یەکێتی و هەڵگێڕانەوەی ئەو برادەرانە و هەواڵ بردنەوە بۆ یەکێتی سەرمداون... لای خۆشمان بە پابەند نەبوون بە ڕێنماییەکانی ڕێکخستنەوەو بە لە بەرچاوی نەگرتنی بارودۆخی خراپی نێوان ئێمە و حسیک، ڕەخنەی توندم ئاراستەکرا.

هەفتەیەک دوای سەردانەکەی من، کۆبوونەوەیەکی دوو ڕۆژیی و فراوانی کادیرانی کۆمەڵە، لە نێوزەنگ و لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەوە سازکرا... لەو کۆبوونەوەیەدا، ٢٥ کادیر بەشداربوون... ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵەش، مەلا بەختیار و سالار عەزیز و مامۆستا جافر، بەڕێوەیان دەبرد....

سازکردنی کۆبوونەوەکە بۆ گفتوگۆکردن بوو لەسەر:

* بارودۆخی ناوخۆیی کۆمەڵە و یەکێتی.

* مەترسییەکانی جیابوونەوەی حسک و گفتوگۆی نێوان ئەوان و حکومەت.

* چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی، ئەو هێزەی قیادە موەقەتە کە لەسەر بەرزاییەکانی چیای جاسوسان سەنگەریان لە ئێمە گرتووە.

یەک لە تەوەرەکانی کۆبووەوەکە، ڕەخنەو ڕەخنە لە خۆگرتن بوو... یەکەم ڕەخنەش ئاراستەی من کرا:

"من بە توندی ڕەخنە لە هەڤاڵ دەگرم کە بەبێ پرس و ئاگاداریی ئێمە، سەردانی(حسیک)ی کردوە و....." سالار عەزیز وای ووت.

هەرچەندە ڕەخنەکە، بۆ ئەندامانی کۆبوونەوەکە ئاسایی بوو، بەڵام بۆ منێکی ڕانەهاتوو لەگەڵ زەبتوڕەبتی ڕێکخستندا، نا ئاسایی بوو... بەتایبەتیش کە مامۆستا جافر لەو چوونەی من ئاگاداربوو... ئەو چاوەڕێ بوو، من ڕەخنە لە خۆم بگرم و داوای لێبوردنیش بکەم...

بەجۆرێک لە بڕوانەکردن و حەپەسانەوە، ووتم:

- بۆ، سەردانی هاوڕێش پرسی حیزبی دەوێ؟!

- بەڵێ بۆ ئەو حاڵەتەی وەک ئەوەی تۆ دەیەوێ.

- یانی ئەگەر هاوڕێیەکمان لە حزبێکی تر بێ، یان بیروباوەڕی جیاوازبێ، ئازادیی ئەوەشمان نیە سەردانی بکەین؟!

- نەخێـر ئەمە پەیوەندی بە ئازادی و جیاوازیی بیروباوەڕەوە نیە، ئەمە پەیوەندی بە جیاوازیی سەنگەرەوە هەیە.

- پەیوەنـدی بـە جیاوازی هەرچیەکەوە هەبێ، من پەیوەندی سیاسـی و کۆمەڵایەتی تێکەڵ ناکەم.

جەوەکە کەمێک گرژدەبێ و مەلا بەختیار هەڵدەداتێ:

- کاک سالار مەبەستی پرسکردن نەبوو، ئەو زیاتر لە خەمی ئەوەدایە کە تۆ تووشی شتێک هاتبای، بەتایبەتیش کە ئێستا ئێمە و ئەوان، لەسەنگەری بەرامبەر بەیەکتریدا وەستاوین و لە هەر چرکەیەکدا، ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ هەیە...

لەدواییـن دانیشـتنی ڕۆژی دووەمـی کۆبوونەوەکـەدا، مـام جەلالیش بەشـداریکرد. مام جـەلال بەدووروودرێژی باسـی بارودۆخی سیاسـی و سەربازی و پەیوەندییەکانی یەکێتی کرد... باسی گفتوگۆی نێوان حسیک و حکومەتی کرد و ڕاشی وابوو کە ناگاتە هیچ ئەنجامێک.

کە هاتەسەر باسی پەیوەندی نێوان باڵەکانی یەکێتی، بایەخ و ڕۆڵی هەر باڵێکی، لەدیدی خۆیەوە خستە ڕوو. لە باسی باڵەکاندا ووتی:

ئەگـەر خەتـی گشـتی و بزووتنەوە، دەسـت و قاچی یەکێتـی بن، ئەوا کۆمەڵە دڵیەتی...

من بەرلەوکۆبوونەوەیەش دەمزانی مام جەلال ئاگای لە درووستبوونی کۆمەڵـە هەبـووە، بـەڵام هەتا لـەو کۆبوونەوەیەدا، گوێم لە خـۆی نەبوو، نەمدەزانی یەک لە دامەزرێنەران و یەکەمین سـکرتێری کۆمەڵەش بووە...... لـەوەش زیاتـر ئەوەشـی ووت کـە ئەو قـەت ڕۆژێـک لـە ڕۆژان داوای دەستلەکارکێشانەوەی لە کۆمەڵە نەکردووە... ئەو دەیویست بە ناڕاستەوخۆ

پێمـــان بڵێ ئەو هێشـــتا هەر کۆمەڵەیە... ئەگەر زیاتریـــش ووردتکردبایەوە، دەکرا بڵێی، ئەو هێشـــتا خۆی بە ســـکرتێری ســـێبەری کۆمەڵە دەزانێ یان هەر ســـکرتێرێک لە دوای ســـکرتێر بوونی ئەوەوە هاتبێ، سێبەری ئەوە لە ناو کۆمەڵەدا...

ئەو زانیاریانە ســـەرباری تازەییان، جۆرێکیش لە شـــۆک بوون بۆ من... ئاخر من تا ئەو کاتەش، سەرهەڵدانی کۆمەڵەم، وەک ڕووداوێکی لۆژیکی و پێویستی بابەتیانەی ئەو قۆناغەی خەباتی سیاسی و ئایدلۆژی و کۆمەڵایەتی میللەتەکەم دەزانی، نەک وەک بەدیلی هەڵوەشانەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و وەک پەرچەکرداریش بەرامبەر بە زاڵبوونی باڵی مەلا مستەفا لە ناو بزووتنەوەی کوردیدا.

# ١٩

لەو کۆبوونەوەیە بەدواوە، یەکێتیم وەک یانەیەکی گەورەی تیپی فوتبۆڵ دەهاتە بەرچاو... کۆمەڵە و خەتی گشتی و بزووتنەوەش وەک سێ تیمی سەربەو یانەیەو مام جەلالیش وەک خاوەنی یانەکە...

شتێکی کەش کە هەر لەو کۆبوونەوەیەدا، پرسیاری لەلا درووستکردم، ئامادەنەبوونی نەوشیروان مستەفابوو لەو دانیشتنانەدا و بیستنی هەندێ قسەش کە نیشانەی هەبوونی ناکۆکی بوون لە نێوانی ئەم وبەڕێوبەرانی کۆبوونەوەکەدا، ئەو هەستەیان لادرووستکردم کە جۆرێک لە ناکۆکی و ناتەبایی لە ناو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا هەیە.

نەوشیروان مستەفا، لە هاوینی ١٩٧٧دا گەڕاوەتەوە کوردستان... لەکاتی گەڕانەوەیدا، هیچ پەیوەندیەکی بە کۆمەڵەوە نەبووە. ڕاستە ئاگای لە دامەزراندنی کۆمەڵە هەبووە... بەرلەوەش لەڕێگای گۆڤاری ڕزگارییەوە بانگەشەی بۆ ئەو بیروباوەڕە کردووە، بەڵام نە لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا بەشدار بووە و نە دواتریش ئەندامی بووە... ئەوکاتەش گەڕاوەتەوە کوردستان، هەر لە سەرەتای هاتنەوەیدا، وەک خۆی (٧-٨) ساڵ دواتر، لە کتێبی(لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ)دا دەڵێ"نەم ئەویست لەگەڵ کۆمەڵەدا کاربکەم." ئەو هاتۆتەوە تا وەک سەرکردەیەکی یەکێتی کاربکات و زیاتریش لەگەڵ عەلی عەسکەریدا هاوڕابوون کە هەموو ڕێکخستنەکانی ناو یەکێتی، لەناو یەکتریدا بتوێننەوە و ڕێکخستنێکی تازەی لێدرووست بکەن، بەڵام لەسەر داوای مام جەلال دێتە ناو کۆمەڵەوە، چونکە"مام جەلال لای وابوو، پێویستە من لە ناو کۆمەڵەدا بم، بۆ ئەوەی بەلای باشەدا کاریان تێبکەم. منیش زۆر بە نابەدڵی ووتم باشە."

سەرکردەکانی ئەو کاتەی کۆمەڵە کە خۆیان لە ئەندامانی سەرکردایەتی (کۆمیتەی هەرێمەکان)[٦٥]دا دەبینییەوە، جگە لە ئارام، ئەوانی تر بەو دەستپێشخەریەی نەوشیروان مستەفا دڵخۆش دەبن و کۆمەڵەبوونی ئەو، لە بەرامبەر سەرکردە دیارەکانی ئەو کاتەی بزووتنەوەدا، لە بابەتی عەلی

---

٦٥ـ کۆمیتەی هەرێمەکان، ئەو کۆمیتەیە بوو کە لە دوای گیرانی سەرکردەکانی پێشووی کۆمەڵەوە درووستبوو، سەرکردایەتی ئەو کاتە کۆمەڵەی دەکرد... ئەو کۆمیتەیە لە چوار کەس پێکدەهات: ئارام(شاسوار جەلال)، ئازادا هەورامی، مەلا بەختیار و سالار عەزیز.

عەسـکەری و دکتۆر خالد و سـالّح یوسفی، بەدەسکەوتی گرنگ دەزانن بۆ کۆمەڵە... بەتایبەتیش کە ئەم، هەم لە ڕووی تەمەن و هەم لە ڕووی ئەزموونی سیاسـی و توانای فیکری و سیاسـی و نووسینەوە، لەگەڵ ئەواندا بەراورد نەکـراوە. نازانم ئەوان ئـەو کاتە تا چەند ئاگایان لـە کۆمەڵە نەبوونی ئەو هەبووەو تا چەندیش هیچیان دەربارەی فکر و دیدو جۆری بیرکردنەوەشی زانیوە... هەروا ناشـزانم ئاگایان لە بڕوا بەمارکسیزم نەبوونی ئەم هەبووە یان نا... وێڕای ئەوەش خواست وبەرنامەی مام جەلالیان لە هاندانی ئەمدا، بۆ ناو کۆمەڵە، لا نەبۆتە پرسیار.

مـام جـەلال ئەو کاتـە، جگە لە پەیوەندی شەخسـی لەگـەڵ هەندێک لە کۆنە جەلالیەکان، هیچ ڕێکخسـتنێکی لەناو کوردسـتاندا، نە لە شـار و لە لادێشـدا نەبووە، پێگەیشـی لەناو کۆمەڵـەدا، بەتایبەتیش لـە دوای نەمانی سـەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، شەهابی شـێخ نوری و هاوڕێکانی، زۆر پتەونەبووە... بۆیە مام جەلال کە ناتوانێ ڕاستەوخۆ دەست بەسەر کۆمەڵەدا بگرێ، واباشـترە ئەو، بە چوونە ناو کۆمەڵە قایلکاو ڕۆڵی کۆنترۆڵکردن و ئیدارەدانی کۆمەڵەی پێ بسـپێرێ و، خۆیشـی وەک کەسـێکی ((بێلایەن))، سکرتێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەبێ.

ئیدی لەوێ بەدواوە، ڕۆڵ و دەسەڵاتەکان، لە نێوان خۆیاندا بەشێوەیەکی وا بەشدەکەن کە دەرفەتی دەرکەوتنی کاراکتەری نوێی تێدا ئاسان نابێت.

دەزانـم کە فەلسـەفە و هزر و تێڕوانین و بـاوەڕ و ئایدیاکان، ڕێژەیین و هەقیقەتـی ڕەهـا لای کەس نیـە... مرۆڤیش ئازادە لەوەی لە سـەردەمێکدا بـڕوای بـە ئایدلۆژیا و ڕێبازێک هەبێ و دواتر لە ئەنجامی ئەزموون و ئەو گۆڕانە فیکری و فەلسەفییەی بەسەریدا دێ، ئەو ئایدۆژیایە بەجێبێڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا، دەبوو نەوشیروان مستەفا، یان ئەو ڕۆڵە وەرنەگرێ، یان هەر لەسەرەتاوە، بڕوانەبوونی خۆی بە مارکسیزم ڕابگەیەنێ. ئاخر ناکرێ، تۆ ڕابەرایەتی ئایدۆلۆژیا و ڕێبازێک بکەیت و خۆت هەر لە بنچینەدا بڕوات پێینەبێ.

## ٢٠

چەنــد هەفتەیــەک دوای هاتنم بــۆ دەزگای ڕاگەیانــدن و دوو هەفتەش لــەدوای ئــەو کۆبونەوەیەی کادیرانــدا، یەکەم وتاری خــۆم، بۆ ڕۆژنامەی (ڕێبازی نوێ) نووســی. تا ئەو کاتە ڕێبازی نوێ، دەســتەی نووســەرانی نەبوو، مام جەلال و مەکتەبی سیاســیی لە کۆبوونەوەی خۆیاندا، بڕیاریان لەسەر بابەتەکان دەدا.

دوای ئەوەی مامۆستا جافر لە کۆبوونەوەی ئەو ڕۆژەی مەکتەبی سیاسی گەڕایەوە کە بابەتەکانی ڕێبازی نوێیان تێدا هەڵبژاردبوو، پێی ووتم کە مام جەلال نووســینەکەی منی بە نووسینێکی بەهێزوجوان وەسفکردووە، بەڵام پێشی وتووە" ئەوە بەهەڤاڵ مەڵێ، با وازوو لە خۆی نەگۆڕێ."

من وەسفەکەی مام جەلالم زۆر پێخۆش بوو، بەتایبەتیش کە ئەوە یەکەم ئەزموونی نووســینی بابەتی سیاسی من بوو، بەڵام زۆریش لەوە نیگەران بــووم کە حەزی نەکردوە، من بەوەســفەکەی بزانــم... من پێم وابوو، چۆن ڕەخنە لەشتێک دەگرن کە بەلای ئەوانەوە باش نیە، یان کەموکوڕی تێدایە، هەقە کەشــتێکش بەباش دەزانن، دەســت خۆشــی لە خاوەنەکــەی بکەن... بەمە، خاوەنەکە لە خۆی ناگۆڕێ، بەڵکو هاندەدرێ بۆ ئەوەی کاری باشتر بەرهەم بێنێ. بۆ ئەو بابەتە، نەیویست من بە ڕایەکەی ئەو بزانم، کەچی کە چەند مانگێک دواتر، بابەتێکم نووســی و بابەتەکە بەدڵی مام جەلال نەبوو، ڕەخنەی توندی لێگرتم.

بیرۆکەیەکم هەبوو، لەگەڵ مامۆســتا جافردا باســم کــرد... ئەویش زۆر بەدڵــی بــوو. بیرۆکەکــەش لەوەوەهات کە ئــەو خەباتــە چەکداریەی ئێمە دەیکەین و ئەو ئیمکانیاتە پێشمەرگەیی و مادییەی ئێمە هەمانە، لە بەرامبەر باڵادەســتی زۆری حکومەتدا، لە بواری ســەربازی و مادیدا، نامانگەیەنێتە شــوێنێک بــە قازانجــی میللەتەکەمان بکەوێتــەوە... بۆیە دەبێ لــە پاڵ ئەو خەباتە چەکداریەدا، شــێوازی دیکەی خەبات بدۆزینەوە... ئەو شــێوازەش، جۆشــدان و سازدانی کۆمەڵانی خەڵکە لە ناو شار و شارۆچکە و ئۆردوگا زۆرەملێکاندا، بۆ مانگرتن و خۆپیشاندان... دیارە ئەوەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەواڵانە بوو کە بەردەوام لەسەر بێزاری و تووڕەیی و ناڕەزایی خەڵک پێماندەگەیشتن...

لەبــەر ڕۆشــنایی ئــەو بیرۆکەیــەدا و بــە هەڵســەنگاندنی بارودۆخی کوردســتان و عێراقیــش، بەیاننامەیەکــی دوو لاپەڕییــم، بەناوی دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتانەوەنووســی.

لــە بەیاننامەکــەدا، داوامــان لە خەڵــک کردبوو، بەرامبــەر بەو زوڵم و ستەمە زۆرەی لەلایەن ڕژێمەوە لە سەریانە، بۆ چۆک پێدادانی ڕژێم یان هەڵتەکاندنی دەســەڵاتەکانی لە کوردستاندا. دەست بە خەباتی جەماوەری بکــەن... مانگرتن و خۆپیشــاندان بکەنە شــێوەیەکی دیکــەی خەباتی گەلە ســتەمدیدەکەمان.

ژمارەیەکی زۆرمان لەو بەیاننامەیە چاپکرد... بەمەبەستی بڵاوکردنەوەشیان بەناو شاروشــارۆچکە و ئۆردوگاکاندا، بۆ ناردن ئامادەمان کردن. هێشــتا بەتەواوەتی دەســتمان بەبڵاوکردنەوە و ناردنەوەی بەیاننامەکە نەکردبوو، نامەیەکی پڕ لە تووڕەیی مام جەلالمان بۆ هات... لە نامەکەدا، وێڕای ئەوەی داوامــان لێدەکات بە پەلە و دەســتبەجێ بڵاوکردنــەوەی بەیانەکە ڕاگرین، دەشنووسێ:

"ئــەوەی ئێــوە کردووتانە، بەوەی داواتان لە خەڵک کــردووە، ڕاپەڕینی جەماوەریــی ئەنجامبدەن، ئــەوە وەرچەرخانێکی گەورەیە لە سیاســەت و لەســتراتیژی یەکێتیــی نیشــتمانیی کوردســتاندا... ئێســتا، نــە وەختی ئەو وەرچەرخانەیە و، نە ئێوەش لە دەزگای ڕاگەیاندن، ئەو دەسەڵاتەتان هەیە کە بڕیار لەســەر مەســەلەیەکی ئاوا گرنگ بدەن... ئەمە لە دەســەڵاتەکانی ســەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە و دیراسە و تەحلیلی ورد و قووڵ و ژیرانەی زۆریشی دەوێ."

هەر لەو نامەیەیدا، ڕەخنە لە شــێوازی نووســین و زمانی بەیاننامەکە و بەکارهێنانی هەندێ دەستەواژەش دەگرێ... بۆ نموونە، لە شوێنێکی بەیانەکەدا هاتووە "پشــکۆی ئیرادەی جەماوەر لە گەشــانەوەدایە." مام جەلال کۆمێنت لەسەر ئەو دەستەواژەیە دەردەبڕێ و دەپرسێ.

«مەبەستتان کام پشکۆیە!... پشکۆ ئیعلام؟!... ئەو پشکۆیەی ئەگەر ئەمن مانگی جارێک کوڵەکەی نەدەمە بەرێ دەڕوخێ!»

ڕەخنەکانی مام جەلال، ئەوانەی لێدەرکەی کە لەسەر لایەنە زمانەوانیەکە دەربڕیبوون، لەوانی تردا لەسەر هەق بوو:

* ئەوە لە دەسەڵاتی ئیمەدا نەبوو.

* بەیاننامەیەکـی ئاوا، دیراسـەیەکی ووردی بارودۆخی کوردسـتان و ئاستی بێزاریی و تووڕەیی خەڵکی دەویست.

* شیکردنەوەمان لەسەر ئەوە نەکردبوو کە تا چەند خەڵک ئامادەیی بە دەنگەوەهاتنی ئەو داخوازییەی ئێمەیان هەیە یان نا.

* حسـابی ئەوەمـان نەکردبوو کـە ئەگەر هاتو خەڵک بـەدەم داواکەی ئێمەوەهات، ئەو خۆپیشـاندانە جەماوەریانە چۆن بەڕێوە دەبرێن و بەرە و کوێ ئاراستە دەکرێن و، چ دەرەنجامێکیان لێدەکەوێتەوە...

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، دەکـرا بیرۆکەکـە گفتوگۆی لەسـەربکرێ و تووڕەییەکەی مام جەلال وەلای نەنابا.

ڕەنگـە بەشـێکی تووڕەییەکە، پەیوەندی بە بەکارهێنانی دەسـەڵاتێکەوە بووبێ کە هی ئێمە نەبوو، بەڵام بەشـەکەی تری، پەیوەندی بە هەڵوێسـتی ئێمەوەبوو، وەک کادرانی دەزگای ڕاگەیاندن، بەرامبەر بەدانانی حوسـەین سـنجاری و عومەر عەزیز، بە ئەندامی دەزگای ڕاگەیاندن... یەکیان لەسەر حسابی خەتی گشتی و ئەویتریان لەسەر حسابی بزووتنەوە.

ئێمە بڕیاری دانانی هەردووکیانمان ڕەتکردەوە، نەلەبەرشتی شەخسی، چونکە ئێمە هیچ کێشـەیەکی شەخسـیمان لەگەڵ هیچیاندا نەبوو، کێشەی ئێمە دانانی کەسانی نەگونجاوبوو لە شوێنێکدا کە بۆ ئەوان بە گونجاومان نەدەزانـی... هەردووکیـان تـازە پەیوەندیـان بە شۆڕشـەوە کردبوو، نە نووسـەر و نە ڕاگەیاندکاریش بوون، تا بۆ پڕکردنەوەی ئەو پۆسـتانە بە گونجاویـان بزانیـن.

لەڕێی مامۆستا جافرەوە، پەیامی خۆمان ئاراستەی مام جەلال و مەکتەبی سیاسی کرد:

"ئێمـە بڕیاری دانانی ئـەو دووبرادەرە بە ئەندامـی دەزگای ڕاگەیاندن ڕەتدەکەینەوەو داواشدەکەین، بەرپرسیارێتی لە دەزگایەکی وەک ڕاگەیاندنا، لەسەر بنەمای توانا و لێوەشاوەیی بێ، نەک شایستەی ڕێکخراوەیی."

لەسـەرەتادا، مام جەلال ویسـتی بڕیارەکەمان بەسەردا بسەپێنێ، بەڵام سـووربوونی ئێمە لەسـەر هەڵوێسـتەکەمان، ناچاریکردن کە نوێنەرەکەی بزووتنەوە بکێشنەوە و، بۆ نوێنەرەکەی خەتی گشتیش، داوایان لێکردین کە تا شوێنێکی تری بۆ دەدۆزنەوە، بەشێوەیەکی کاتی لای ئێمە بمێنێتەوە.

حوســەین ســنجاری، بەشـێوەیەکی کاتی مایەوە... دەبوایە بە گوێرەی ڕێساکانی بارەگاکەمان، ئەویش ئەوەندەی لامان دەمێنێتەوە، وەک هەریەک لە ئێمە، لە مامۆســتا جافرەوە تا پێشـمەرگەیەکی سادە، بەشداری هەموو کاروبارەکانی بارەگا بکات... دەبوایە بەشــداری خەفەریات[٦٦] و ئێشــگری و دارهێنان و... هتد بکات...

نوێنەرەکــەی خەتی گشــتی، ئامادەنەبوو خەفەریات بگــرێ... واتا لەو ڕۆژەی ســەرەی خەفەریاتیەتــی، پاکوخاوێنــی بارەگا ڕاگــرێ، نانوچای بەیانــی و خواردنــی نیوەڕۆ و ئێوارە ئامــادەکات و قاپ و قاچەغەکانیش بشــوات... بۆ خۆ دزینەوەش لەو ئەرکە، ڕاپۆرتێکی پزیشــکی، لای دکتۆر خدر مەعســوم هێنا، دکتۆر خدر هەم پزیشــک و هەمیش لەســەرمیلاکی خەتی گشتی، بەرپرسی لقی سێی یەکێتی بوو. دکتۆر خدر لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ کە حوســەین ســنجاری، لەبەرئەوەی چاوی بە دووکەڵ و، دەست و پلیشی بەکەف و سابون حەساسیەتیان هەیە، توانای خەفەریات گرتنی نیە. ئێمە ڕاپۆرتەکەمان، ڕەتکردەوە. بەو پێیەش دکتۆر خدر، پزیشکی پێست و چاو نەبوو، ڕایەکەیمان لەسەر ئەو بابەتە، لەبەرچاو نەگرت.

---

٦٦ـ خەفەریات: هەر ڕۆژەی پێشمەرگەیەک ئەرکی ئامادەکردنی خواردن و پاکراگرتنی بارەگای دەکەوتە ئەستۆ... بەو کارە دەوترا خەفەریات و بەپێشمەرگەکەش دەوترا خەفەر.

که هاتمه دەرەوە لە سەرەتادا، ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵەم، وەک ئەندامانی تیپێکی مۆسیقا دەهاتنە بەرچاو کە هەموویان پێکەوە مۆسیقا دەژەنن و ئاوازێکی هارمۆنی بەرهەم دێنن... ئەو تێڕوانینەم تا ئەو کۆبوونە فراوانەی کادیرانی کۆمەڵە بڕیکرد کە چەند هەفتەیەک لەوەوبەر ئەنجامدرا.. ئیدی لەو کۆبوونەوەیە بەدواوە، وورده وورده تاڵە ڕەش و سپیەکانی ناکۆکیەکانی نێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەم بۆ لێکجیابوونەوە... هەرچەندە تا ئەو کاتەو دواتریش ناکۆکیەکان بۆ ناو هەرێم و ڕێکخستنەکان شۆڕنەببوونەوە، بەڵام لەناو بارەگاکانی سەرکردایەتیدا، بەبارەگاکەی ئێمەشەوە، ئاسان دەبینران... بەرەی نەوشیروان مستەفا و بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکان، ئەوانەی خۆیان بە میراتگری خەتی ئارام دەزانی... ناکۆکیەکان، تێکەڵەیەک بوون لە ناکۆکی شەخسی و فکری و سیاسی. تۆش لەگەڵ ئەندامانی کام بەرەیەدا، تێکەڵاوبایت، دەخرایتە ناو ئەو بەرەیەوە. من بەحوکمی هاوڕێیەتی و نزیکی و تێکەڵاوییم لەگەڵ بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، لەسەر ئەو بەرەیە ئەژمارکرام.

ناکۆکیەکان لەسەرەتای دەرکەوتنیاندابوون و گروپی زیندانیش کە هەمووی چەند مانگێک کەمتربوو، لەڕێی لێبوردنی گشتیەوە ئازادکرابوون، یەک یەک و دوو دوو هاتنە دەرەوە.

هەر لەسەرەتادا، ئاسان هەست بە جۆرێک لە دڕدۆنگی و ساردی لە نێوان گروپی زیندان و کۆمیتەی هەرێمەکاندا دەکرا. ئەو گروپە، بەحوکمی ئەوەی هەر لە زووەوە لە ژێر کاریگەریی کەسایەتی شەهابی شێخ نوریدا بوون و چەند ساڵێکیش پێکەوە لە زینداندا بوون، بەوانەی ئەندامی سەرکردایەتی بوون و بەوانەشەوە کە کادر یان هەر ئەندامی کۆمەڵە بوون، جۆرێک لە گونجان و نزیکی لە نێوانیاندا درووستببوو.

هەڵوێستی کۆمیتەی هەرێمەکان و بەیانی شوباتیش[٦٧]، لە دوای گیرانی

٦٧- بەیانی شوبات: ئەو بەیانە ١٦ لاپەڕییەبوو کە لە شوباتی ١٩٧٦دا، لەلایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە(سەرکردایەتی ئەو کاتەی کۆمەڵە)، وەک ڕاپۆرتێکی تایبەتی و نهێنی، بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە دەرچووە. لەوێدا، ڕەخنەی توند ئاراستەی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە(شەهابی شێخ نوری و هاوڕێکانی) کراوە... بەتایبەتیش لە بەجێهێشتنی

ئەمانەوە، ماکی سەرەکی ئەو ساردیە بوون:

* ئەندێشـەی ماوتسـی تۆنگ، لە پاشـکۆی کۆمەڵەی مارکسـی لینینی کوردستان کراوەتەوە و تیژی سێ جیهان ڕەتکراوەتەوە و چیدیش ماوتسی تۆنگ و شۆڕشی چینیش وەک نموونەی باڵای کۆمەڵە تەماشا ناکرێن.

* بەیانـی شـوبات لەوکاتەدا دەرکـراوە کە ئەوان لـە زینداندا بوون و بـەڕای ئـەوان لەو ڕاپۆرتـەدا، کۆمیتـەی هەرێمـەکان ناهەقیەکی زۆریان بەرامبـەر بەوان کردووە، تەنانەت ئەوەش دەڵێن کـە ئەو ڕاپۆرتە، لەکاتی لێکۆڵینـەوەکان و بەر لە حوکمدانیانـدا، وەک بەڵگە لە دژیان بەکارهێنراوە. لەبەرامبـەر ئـەوەدا، ئەندامانی کۆمیتەی هەریمەکان، جەخت لەشـەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو راپۆرتە بە ژمارەیەکی زۆر کەم و دیاریکراو، بەشیوەیەکی زۆر نهێنی لە ناو ڕێکخسـتندا بڵاوکراوەتەوە هیچ ژمارەیەکی نەگەیشتۆتە دەستی ڕژیم.

* کـە ئەمـان، دامەزرێنـەرو ئەندامـی سـەرکردایەتی کۆمەڵەبـوون، ئەوانەی ئێستا لەسـەرکردایەتی کۆمەڵەدان، بەرپرسیارێتیەکی وایان لەناو کۆمەڵەدانەبووە.

ئـەوەش کە قـوڕی ئەو گرژی و سـاردیەی نێوانیان ئـەو دوولایەنەی خەسـترکردەوە، ئـەو ووتـارەی مـەلا بەختیاربـوو کە لەسـەرووبەندی هاتنەدەرەوەی ئەواندا، لە ژمارە( ٦ )ی گۆڤاری کۆمەڵەدا بڵاویکردبۆوە.

مـەلا بەختیـار لـەو وتارەیەدا کە دەیەوێ تیشـک بخاتە سـەر خەباتی کۆمەڵە، ڕەخنەش لەهەڵوێسـتی سـەرکردایەتی پێشـووی کۆمەڵە دەگرێ، لەسەر ئەوەی کوردسـتان و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، لە دۆخێکی شپرزەدا بەجێدێڵن وئەو ڕۆشـتنەیان بەجۆرێک لە هەڵاتن لەبەرپرسیارێتی لە قەڵەم دەدا.

من بۆ خۆم، بەدەر لە وتارەکەی مەلا بەختیار، پرسیارم لەسەرئەوەنەبوو کە ئەوەی ئەمان هەڵاتنبووە یان نا، بەڵام ئەوەی لام پرسیاربوو:

کۆمەڵەو کوردستان و ڕووکردنە هەندەرانیان... هەروا لە شێوازی بەرخوردیان لە زینداندا کە بەخۆڕانەگرو پاکانەکار تۆمەتباریان دەکەن. لەبەشێکی دیکەی ئەو بەیانەدا، باس لە کێشەی زەوی و مەسەلەی جوتیاران و چۆنیەتی هۆشیارکردنەوەیان و، باس لە خەباتی هاوبەشی نێوان جوتیارن و کرێکاران دەکەن. لە دوابەشی بەیانەکەدا، باس لە پێویستی گۆڕینی ڕێکخراوەکە(کۆمەڵەی مارکسیی ـ لینینی، ئەندێشەی ماو) و باس لە هەموارکردنەوەی ڕێبازە فکرییەکەیی و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە دەکەن.

ئـەوان، لە کاتێکـدا ئەندامی سـەرکردایەتی کۆمەڵە بـوون، کۆمەڵەش بـە هەماهەنگـی لەگـەڵ مـام جەلالـدا، یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان دادەمەزرێنن و خەریکی داڕشـتنی بەرنامەی هەڵگیرسـاندنەوەی خەباتی چەکدارن، کەچی ئەوان لەبری ئەوەی لە چیاکانی کوردسـتانەوە، دەسـت بـە جێبەجێکردنـی ئەو بەرنامەیە بکەن، وڵات جێدێڵـن و بە قاچاغی، بەناو ئێراندا، بەرەو سـووریا دەڕۆن و دەیانەوێ لەوێوەوە جارێکیتر بگەڕێنەوە کوردستان و دەست بە خەباتی چەکداری بکەنەوە!

مـن ئـەو کاتە ئەندامی کۆمەڵە نەبووم، بەڵام دواتر بیسـتم کە ئەمان لە دژی ڕژێـم، نەک هەر بەتەمای خەباتی چەکـداری نەبوون، بەڵکو لە دیدی تێزی سـێ جیهانەوە، لە هەوڵی ئەوەدا بوون، ئەڵقە ڕۆشـنبیرییەکانی ئەو کاتـەی کۆمەڵە بکەنە حیزب و بە فەرمی خۆیان ڕاگەیەنن و داوای مۆڵەتی کارکردنیش لە ڕژێمی عێراق بکەن.

ئـەوان، وتارەکەی مەلا بەختیاریان، بەنیشـانەیەکی خراپ لێکدەدایەوەو پێیـان وابوو، ئەوە بۆ ناوزڕاندن و ناشـیرین کردنی وێنـەی ئەمان، لەناو ئەندامانی کۆمەڵەو لە ناو پێشمەرگەشدا نووسراوە.

هەموو ئەمانە وایانکرد، سـەرەتایەکی تەندروسـت لە پەیوەندی نێوان ئەو دوولایەنەدا، گروپی زیندان و کۆمیتەی هەرێمەکانی جاراندا دروست نەبـێ... ئەگەرچی هەمـوو ئەوانەی لەپێشـوودا، ئەندامی سـەرکردایەتی کۆمەڵە بوون، وەک عومەری سـەید عەلی، فەرەیدوون عەبدولقادر، عەلی بچکۆل و ئاسۆی شێخ نوری، بێ ئەوەی هیچ پرسیارێک لەسەر هەڵوێستیان لە بەجێهێشـتنی کوردستان و لەسـەر بەرخوردیان لە ناو زینداندا لێبکرێ و، بێ ئەوەی چاوەڕوانی بەسـتنی کۆنفرانس یان تەنانەت کۆبوونەوەیەکی فراوانـی ئەندامـان و کادیرانـی کۆمەڵـەش بکـرێ، بۆ بڕیاردان لەسـەر مەسـەلەی هێنانەوەیان بۆ ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە، کرانەوە بە ئەندامی سەرکردایەتی... هەر بە مەبەستی پیشاندانی نیاز پاکی زیاتریش، هەریەک لە مامۆسـتا جافر و ئازاد هەورامی، شـوێنەکانی خۆیانیـان لە ئەندامێتی ناوەنـدی کۆمەڵەدا، بۆ عومەری سـەید عەلی و فەرەیـدون عەوبدولقادر چۆڵکـرد

لەگـەڵ هەمـوو ئەمانەشـدا، هەبوونـی ناکۆکیەکانـی نـاو ئەندامانـی سـەرکردایەتی کۆمەڵـەو شـارەزایی و لێزانیی مام جەلال و نەوشـیروان مستەفاش، لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ گروپی زینداندا، کارێکی وایکرد، ئـەو گروپـە، زۆر زوو بکەونە ناو بەرەی دژ بـە کۆمیتەی هەرێمەکانەوە.

ئەو خـۆ یەکلاکردنەوەی گرووپی زیندانیش، جەمسـەرگیریی ناو کۆمەڵەی قووڵترو ڕوونترکردەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرا، نەوشـیروان مسـتەفا، ئەوەندە خۆشـی لەچارەی خەڵکانـی سـەربە گرووپی زینـدان نەدەهات و بە خەڵکـی ئەوەندە بەتواناو لێهاتـووی نەدەزانین، بـەڵام بۆ بەگژداچوونـەوەی نەیارەکانی خۆی لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا، خستنیە ژێربالّی خۆیەوەو هەتا پێویستیشی پێیان بوو، لەشەڕەکانی خۆیدا، دژی نەیارەکانی بەکاریهێنان.

مـام جەلالیش، ئەگەرچی زۆریش کەیفـی بەژمارەیەک لەوانەی گرووپی زینـدان نەدەهـات، بـەڵام هەر بۆ لاسـەنگکردنی تـەرازووی هێـز بەلای نەوشیروان مستەفادا، دڵنەوایی دەکردن و لە پێدانی پلەو پۆستیشدا، چاوی لێیانەوە بوو... دەنا وەکوتر، من بۆ خۆم، چەندجارێک کۆمێنتی سـلبی مام جەلالم لەسـەر هەندێک لەوانەی زیندان بیستبوو... یەک لەو جارانە، لەگەڵ ئازاد هەورامی لای بووین، باسـی سـەرەتاکانی دروستکردنی کۆمەڵەی دەکرد... لە شوێنێکدا ئاماژەی بەکەسایەتی یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە کرد، کە خۆی بە یەکێک لەبیرمەندەکانی کۆمەڵە دادەنا.

تازە کۆمەڵەی مارکسـی – لینینی- ئەندێشـەی ماوتسی تونگ دروست دەبـێ، زۆر مەبەسـتیان دەبێ پەیوەندی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیسـتی چینیدا درووسـتکەن... بۆ ئەو مەبەسـتەش ئەم و شەهابی شێخ نوری، پەیوەندی بەسـەفارەتی کۆمـاری چینـی میللیەوە دەکـەن، لە بەغدا. ئـەو کاتە چین، پەیوەندیەکـی بەهێـزی لەگـەڵ عێراقـدا دەبێ... لـەوێ لەگەڵ بەرپرسـی پەیوەندییەکانی پارتی کۆمۆنیستی چینیدا قسەدەکەن... باسی درووستبوونی کۆمەڵەیـان بـۆ دەکـەن... هەڵبەتـە ئەوانیـش بیرۆکـەی درووسـتبوونی ڕێکخراوێکی ماوییان لە عێراقدا زۆر پێخۆشدەبێ، بەڵام ئەو ترسەیان دەبێ کـە ئەگـەر پەیوەندی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەدا ببەسـتن و حکومەتی عێراقی پێـی بزانێ، زیان بە پەیوەندیە دیپلۆماسـی و سیاسـی و ئابوورییەکانیان بگەیەنێ... بۆیە مەرجی درووسـتبوونی ئەو پەیوەندیە، دەبەستنەوە بەوەی جگە لەو دووکەسـە نابێ هیچ کەسێکی تر لەناو سـەرکردایەتی کۆمەڵەدا، بـەو پەیوەندیە بزانێ. دوای ئەوەی لایەنـی چینی دڵنیادەکەنەوە لەوەی کە ئەمان ڕێکخراوێکی تازە درووستبووی نهێنین و نهێنی پاراستن و دیسپلن، لەناویاندا لە بالاترین ئاستیدایە، چینیەکان ڕەزامەندی لەسەر درووستکردنی پەیوەندیەکـە دەردەبـڕن... هەڵبەتە ئەو پەیوەندییـە، دوای چەند جارێک لە هاتوچۆ درووست دەبێ... دواتر مام جەلال و شەهابی شێخ نوری، داوایان لێدەکـەن کە سـەفەرێکی چینیان بۆ ڕێکخەن، تا چاویان بە(سـەرۆک ماو)

، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی چینی بکەوێ و هەمیش لە نزیکەوە، ئەو گەشەکردنە زۆرەی کۆماری میللی چین ببینن کە لەسەر دەستی (سەرۆک ماو)دا ڕوویداوە. چینیەکان گفتی ئەوەیان پێدەدەن کە ئەو داوایە لەگەڵ بەرپرسە باڵاکانی پارتەکەیاندا باسبکەن و لە ئەنجامەکەشی ئاگاداریان بکەنەوە... بەڵام دیسان جەخت لەسەر مەرجەکەی خۆیان دەکەنەوە، جگە لەو دووکەسە، هیچ کەسێکی تر بەو پەیوەندیە و بەو داوای سەفەرەش نەزانێ. ئەوان جارێکی کەش، بەڵێن دووبارەدەکەنەوە کەلەو دووانە بەولاوە، هیچ کەسێکی تر لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا ئاگادارنین و نابن...

یەکدوو هەفتە دواتر، لەلایەن سەفارەتەوە ئاگادار دەکرێنەوە کە سەردانی سەفارەت بکەن و پاسەپۆرتەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن... پاسەپۆرتەکانیان بۆ ڤیزە لێدان تەسلیم بەسەفارەت دەکەن... دووبارە جەخت لەسەر ئەوەدەکەنەوە کە کەس بەو پەیوەندیە نەزانێ... هەر بۆ جیدیەتی خۆشیان لەسەر ئەو مەسەلەیە، هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکەن، ئەگەر یەک تاکە کەسیش پێی بزانێ، دەستبەجێ پەیوەندیەکە کۆتایی پێدێنن.

ئەمان جارێکی تریش چینیەکان، لە بەنهێنی پاراستنی ئەو پەیوەندیەو ئەو سەفەرەش کە لەسەر ڕێی ئەنجامدانە دڵنیا دەکەنەوە... چینیەکان دڵنیادەکەنەوە، بەڵام ئەمان وەک ئەوەی بڕوایان بەرابەرایەتی بە کۆمەڵ هەیە و ناتوانن هیچ شتێک لەسەرکردایەتیەکەی خۆیان بشارنەوە، هەر لە سەرەتاوە، هەرهەنگاوێکیان ناوە، ئەندامەکانی تری سەرکردایەتیەکەی خۆیان ئاگادارکردۆتەوە و لەسەر هەموو شتێکیش ڕاوبۆچوونیان وەرگرتوون... بەردەوامیش جەخت لەو مەرجانەی چینیەکان کراوەتەوە کە لەم دووکەسە بەولاوە، کەسێکیکە ئاگاداری هیچ شتێک نیە... هەموو جارێکیش وەک چۆن ئەمان چینیەکان لەومەسەلەیەدا دڵنیادەکەنەوە، برادەرەکانی خۆشیان ئەوان دڵنیادەکەنەوە.

ئەمان، لە چاوەڕوانیی سەفەری ئەفسووناوی خۆیاندان کەسەفارەت داوایان دەکات... ئەو ڕۆژە لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا، شەهابی شیخ نوری بەردەست نابێ، مام جەلال بەخەیاڵی وەرگرتنەوەی پاسەپۆرتی فیزا لێدراو بەتەنیا سەردانی سەفارەت دەکات... هەر کە مام جەلال دەگاتە سەفارەت، پێیدەڵێن " لەبەرئەوەی ئێوە ئەهلی پاراستنی نهێنی نین و بەکەڵکی پەیوەندی ئێمە نایەن، لەم ساتەشەوە، وابزانن کە ئێوە نە ئێمەتان دیوە و نەهیچ پەیوەندیەکیش لە نێوانماندا ڕوویداوە."

که مام جەلال پێداگری لەسەر هۆکاری ئەو مەسەلەیە دەکات، پێی دەڵێن کەسێک لە برادەرانی ئێوە بەناوی (فەرەیدوون)ەوە هاتووە و خۆی وەک دامەزرێنەر و ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە ناساندوە.... داوای کردوە کە ڤیزا بخرێتە سەر پاسەپۆرتەکەی ئەویش و ناویشی بخرێتە پاڵ دوو ناوەکەی ترەوە بۆ ئەو سەفەرەی بەتەمان بۆ چینی بکەن.

مام جەلال، ڕووداوێکی تری هاوشێوەی لەسەر هەوڵی درووستکردنی پەیوەندی، لەگەڵ میسردا گێڕایەوە کە هەمان کاراکتەر، ئەویشی بەهەڵوەشانەوە داوە

مام جەلال، دەیویست لەو گێڕانەوەیدا بڵێ، ئەو زاتە کە خۆی بە بیرمەندی کۆمەڵە و ڕیشسپیی گروپی زیندانیش دەزانێ، کەسێکە هەڵپەهەڵپی زۆرە و زۆریش بە پەلەیە، لەوەی بەزوویی بە خواستە شەخسیەکانی خۆی بگات.

## ٢٢

پایز لە ناوەڕاستی تەمەنیدابوو... بەفرێکی پێشوەخت ڕەشانگی لەو ناوەدا نەهێشت و ئەو ناوەی لە تارای سپیەوە پێچا. بەفر ئەوەندە زۆر و ئەوەندە زووش باری، فریای هیچ نەکەوتین. ئێمەی نەشارەزا لە ئاووهەوای ئەو شوێنە، هیچ قایمکاریەکیمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دۆخە چاوەڕواننەکراوە نەکردبوو.

نە دار و سووتەمەنی پێویستمان هەبوو، نە شوێنێکیشمان بۆ خۆشتن و دەست بەئاوگەیاندن درووستکردبوو. من بۆ خۆم دوو دەست جلم هەبوون، کە دەستی یەکەمیانم تەواو چڵکن دەبوو، ئەوی دووەمم لەبەردەکرد... وەختێک قاتی دووەمیانیشم لەوەی یەکەم دژوێنتردە بوو، ناچار ئەوەی یەکەمم لەبەردەکردەوە.

ئاوا بۆ سەرووی مانگێک ئاڵوگۆڕم بەجلە چڵکنەکانم کرد... لە هەموو ئەو ماوەیەشدا، شوێنێکی وامان نەبوو، خۆمانی تێدا بشۆین. شەوان لەبەر کێچ و ئەسپێ، خەومان نەبوو. شەوێکیان ئەسپێکانی ناوقژمم بەشانە داتەکاند، ٩٦ ئەسپێم ژمارد.

کێچ و ئەسپێ، یەک لە کێشەکانی هەر پێشمەرگەیەک بوو کە شوێنی کوڵ[٦٨] و خۆشتنی دەستنەکەوتبایە.

چەندیش دەرمانمان بە خۆمانەوە وەردەکرد، هێشتا هەر لەبەر خۆخوراندنی شەوان، خەوتنمان ئاسان نەبوو.

هەر لەو ڕۆژانەدا، پێشمەرگەیەک، ئەوەندە دەرمانی ئەسپێی بەجلەتەڕەکانیەوە کردبوو، هەناسەی بۆ نەدەدرا... تا گەیاندرایە لای دکتۆر گیانی سپارد.

ئەو دارانەی هەمانبوون، هەر بەشی چەند ڕۆژێکی زۆپا و نان و چا درووستکردنی کرد... پاش نیوەڕۆیەک، مامۆستا جافر و ئاسۆ عەلی و من، بەنیازی هەندێ داری سووتاندن، لەبارەگا هاتینە دەرێ... لەبەر دەرگا تووشی حاجی عەولاغا بووین... حاجی بۆ سەردانی من هاتبوو... عەولاغای باوکی

٦٨ـ کوڵ: جلشتن یان خۆشتن.

فەرمانــدەی کەرت و حاجیش هەر لەگەڵ باوکیدا پێشــمەرگەبوو. حاجی و باوکیشی هەر بەناو ئاغابوون، دەنا نە لە کردار و نە لە بیرکردنەوەشیاندا، تاڵــە دەزوویەکــی باریکیش بەوچینــەی خۆیانی نەدەبەســتنەوە... من ئەو ڕۆژە حاجیم ناسی کە بۆ مەسەلەی جیاکردنەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، ســەردانی بارەگاکەیانم کرد. هەرکە دیتم خۆشمویســت... تەواوێکیش بەو دیمەنــە خۆشــحاڵبووم کە من گەیشــتمە لایــان، ئــەو کتێبی(مەتریالیزمی دیالەکتێکی) دەخوێندەوە... ئیدی لەوێوە، تا ڕۆژی شەهید بوونیشی یەک لە برادەرە نزیک و خۆشەویستەکانم بوو.

هەر چوارمان بەشــاخەکەی پشــتیماڵی مام ئەحمەد و پورە کەســکێدا هەڵگەڕاین... شــاخەکە یەک پارچە بەفربوو... دارەکانیش لە پرژوپەلاشــیان بەو لاوە، شتێکی دیکەیان دیارنەمابوو... هیچمان پێشتر ئەزمونی داربڕینمان نەبوو... نەدەست و پەنجەی ئەو ئیشانەمان هەبوو، نە بەفرەکەش ڕێی دەدا، دارێکی بۆ بڕینەوە ئاســانمان دەســتکەوێ... تادارێکمان دۆزیەوە دەرەقەتی بڕینەوەی بێین، تەواوێک شەکەت بووین... تا بڕینمانەوە، بەو بەفروسەرمایە، ئارەقەی ڕەش و شــینمان دەردا... لق وپۆپەکانمــان هەڵپاچین و دارەکەمان تلدا... بەفرەکە هێشتا نەیبەستبوو، تا پاڵێکمان پێوەدەنا، ئەژنۆیەک بە بەفرەکەدا ڕۆدەچوویــن، دارەکــەش ئەوەندە بەفری لە خۆیەوە ئالانــد، تاوایلێهات، لە توانــای پاڵپێوەنانــی ئێمەدا نەما... دواجار و بەناچــاری هەندێک لە لقوپۆپە هەڵپاچراوەکانمــان، لەگەڵ خۆماندا بۆ بارەگا هێنایەوە... خۆئەگەر ئازایەتی حاجی نەبا، ئەوتۆزە لقوپۆپەشمان بۆ نەدەگەیەنرانەوە.

تازە هاتبووینە ژووری، لە دەنگی حامیدی حاجی غالی هاتمە دەری:

- کوڕە خوامکرد وەگژتانا ئیعلام، هەر ئەم هێســترە بەســتەزمانە مابوو بیچەوسێننەوە!!

- چی بووە کاک حامید؟

- جا چی نەبووە... ئەم هێسترە بەستەزمانە نابینی چۆن لەبرسا قەپ لەم دارە ووشکانە ئەگرێ!

- بەســەری تۆ کاک حامید، بەر لە هاتنی تۆ ئالیکمان داوەتێ، بەڵام هەر خۆی چاوچنۆکەو، دەیەوێ لەبەر چاوی میوان تووشی عەیبەمان کات.

- ئەشــمۆبیلا وایــە، هێســتر ئالیکی درابێتــێ، ئاوا قەپ بەداری ووشــکا ئەکا!!... ئیعلام، هەر هێستر مابوو ڕەخنەی لێبگرن.

لەسـەرێکەوە، حامیـد ڕاسـتی دەکرد، بـارەگای ڕاگەیانـدن لەوکاتەدا، لـە هەمـوو بارەگاکانی تـر، کۆڕوکۆبوونـەوەی ڕۆشـنبیریی زیاتری تێدا سازدەکرا... یەک لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی ناو ئەو کۆبوونەوانەش، بابەتی ڕەخنەبوو... دوایین کۆبوونەوەشـمان، چەنـد ڕۆژێک لەوەوبەر لەگەڵ مام جەلالدا ئەنجامدابوو.

بەو پێەی بارەگای ڕاگەیاندن، لە هەمووبارەگاکانی تر، خەڵکی نووسەرو خوێنـدەواری زیاتری تێدابـوو، ناوبەناو ئەگەر برادەرێکی سـەرکردایەتی یان هەر کەسـێکی تر، بابەتێکی بۆ قسە لەسـەرکردن و گفتوگۆ هەبووایە، دەهاتە لای ئێمەو قسەوباسـمان لەسـەردەکرد... هەر لەو ڕوانگەیەشەوە، ڕۆژێـک مام جەلال هات و کۆبوونەوەی لەگەڵدا کردین... ئەو بابەتەی ئەو قسـەی لەسەردەکرد، زیاتر پەیوەندی بە ئازادی ڕادەربڕین و بیروباوەڕی جیاوازەوە هەبوو...

ئەو، بابەتەکەی خۆی بە قسەیەکی ماوتسی تۆنگ دەستپێکرد:

"لێگەڕێن با سـەدگوڵ بپشـکوێن و سـەد قوتابخانـەی فیکریی کێبڕکێ بکەن."

مـام جـەلال، لەوێوە هاتە سەرباسـی ئەوەی کە ماوتسـی تۆنگ، وەک بەشـێک لـە چاکسـازییەکانی، هـەر لـە دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـەوە، هانـی ڕەخەگرتنی ئاشـکرای لە ڕژێمەکەی خـۆی دەدا، بەتایبەتیش ئەگەر ڕەخنەگرەکان، ڕۆشـنبیرە غەیرە کۆمۆنیستەکان بان... ئەوکارەش زۆرێک لە ئەندامانی حیزبەکەی، تووشی سەرسووڕمان دەکات... ماو بەلایەنگرانی خۆی دەگووت، ئەو هیوادارە بە دەرگاکردنەوە لەبەردەم ڕەخنەدا، وڵاتەکەی لەو کێشـانە دوورخاتەوە کـە بەرۆکی ڕژێمە کۆمۆنیسـتەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیان گرتبوون.

" بۆیـە ئێمـەش، بـۆ قازانجـی شۆڕشـەکەمان و دەوڵەمەندکـردن و سەرخسـتنی ئەزموونـی یەکێتیـی نیشـتمانیی کوردسـتان. دەبـێ کەڵک لـەو ئەزموونـی ئـازادی و ڕەخنەگرتـن و کرانەوەیـەی شۆڕشـی چینی وەرگرین."...

لەگـەڵ ئـەو قسانەشـیدا، ئامـۆژگاری دەکردیـن کە هەموومـان، وەک سـەرچاوەیەکی گرنگی ڕۆشـنبیری مارکسـیزم، کتێبە سـوورەکەی ماو، چەپکێـک لـە ووتەکانی ماو، بخوێنینەوە.... بەباشیشـی زانـی گەر بتوانین سەرلەنوێ چاپی بکەینەوە، تا هەموو پێشمەرگەیەک، کۆپییەکی ئەو کتێبەی

له کۆڵەپشتەکەیدابێ...

هەر سەبارەت بە ئازادی ڕادەربڕین و ڕەخنەگرتن، باسی ئەوەی کرد کە لە هەندێ وولاتی دیموکراتیی ڕۆژئاوادا، شوێنی تایبەتی بۆ خەڵک هەیە، تا بە ئازادی قسەی تێدابکەن و ڕەخنەی خۆیانی تێدابگرن... کەسیش ناتوانێ لەسەر ئەو قسەو ڕەخنانە، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات... وەک نموونەش، ئاماژەی بە (هایدپارک کۆرنەر)ی لەندەن کرد کە چۆن هەموو ڕۆژانی یەکشەممان لەو شوێنەی ناوجەرگەی لەندەندا، هەرکەسێک بیەوێ شتێک بڵێ، یان ڕەخنەبگرێ، لە دەسەلات بێ یان لە هەرکەس و دەزگایەکی تر، دەچێتە سەر کورسیەک یان سێپایەک و لە ناوەڕاستی دەیان و سەدان خەڵکدا، ئەوەی دەیەوێ بیڵێ، بەئازادی و بیگوێدانە هیچ سانسۆرێک دەریدەدەبڕێ.

لەدوای ئەو باسەیەوە، هاتە سەر پێشنیاری دروستکردنی دیوارێک، بەناوی، دیواری ئازاد، تا هەرکەسێک هەر قسەیەک، یان ڕەخنەو پێشنیارێکی هەبێ، بچێ لەوێ بە ئارەزووی خۆی و بەوپەڕی ئازادیەوە، لەسەر ئەو دیوارە دەریببڕێ.

مام جەلال لە قسەکانی بۆوە و داوای لە ئێمەش کرد، ئەگەر قسەیەک یان پێشنیار و سەرنجێکمان هەبێ، بەنۆرە بیڵێین. چەند برادەرێک قسەیان کرد... نۆرەهاتە سەر من... منیش هەر لەسەر هەوای ئەو ئازادیەی باسمان لێوە دەکرد، ووتم:

سەبارەت بە (چەپکێک لەووتەکانی ماو)، دوو سەرنجم هەن.

یەکەم: لەبەرئەوەی ئەو کتێبە، پوختەی قسە و نووسینەکانی ماوە، یان کۆمەڵێک وتار و بابەتی سیاسی و فیکری دوورودرێژن و لەچەند برگەیەکدا کۆکراونەتەوە، بۆیە خوێندنەوەی ئەو کتێبە، خوێنەر تەمەڵ دەکا... لەباتی ئەوەی بەدوای سەرچاوە ئەسڵیەکانی مارکسیزمدا بگەڕێ، فێری خوێندنەوەی سەرجیقی دەبێ و بەوەندەی لەو کتێبەدا دەستی دەکەوێ پاڵی لێدەداتەوە.

دووەم: ئێمە وەک کۆمەڵە، دەمێکە دەستبەرداری ئەندێشەی ماوتسی تۆنگ بووین و پێویست ناکات جارێکی تر بۆ خۆمانی زیندووکەینەوە.

سەبارەت بە (دیواری ئازاد)یش، دەڵێم بیرۆکەیەکی زۆرباشە، بەلام بۆ لای ئێمە نا... ڕەنگە هەندێ خەڵک، خراپ بەکاری بێنن و بیکەنە شوێنی

پەلاماردانـــی شەخســـی... لەبەرامبەر ئەوەشـــدا، ڕەنگە زۆر لـــە برادەرانی ســـەرکردایەتی، ســـنگیان بایی ئەوە فراوان نەبێ، قبوڵی ڕەخنەی ئاشـــکرا بکـــەن... بۆیـــە ئەگەر ئەمـــە بکەین، دەبێ لـــەو کاتەدا ئەو دیوارە دروســـت دەکەین، زیندانیش گەورە ترکەین.

لە کۆتایی قسەکانیشـــمدا، دەمەوێ بڵێم کە ڕاستە ماو داوای پشکوتنی گوڵەکانـــی کـــرد، بـــەڵام هـــەر کـــە گوڵـــەکان خەریکـــی پشـــکووتن بوون، هەڵمەتێکی توندی هەڵپرووکاندنیشـــیانی دەست پێکرد... ڕاستە لە چیندا، دەرگا لەبـــەردەم ڕەخنەگرتنداکرایـــەوە، بـــەڵام هەمـــووی چەنـــد مانگێکی کەمی نەبرد، دوای ئەوەی لێشاوی ڕەخنەگرتن و ناڕەزایی پەرەی سەند، شـــاڵاوی ڕاوەدوونـــان و گرتن و لە زینـــدان قایمکردنیش دەســـتیپێکرد... هەمـــوو ئەوانـــەی ڕەخنەیـــان گرتبوو یان ناڕەزاییـــان دەربڕیبوو، بەر ئەو شاڵاوە کەوتن، تەنانەت زۆریشیان لێکوژراو بێسەروشوێنکران.

لێـــرەدا مام جەلال قســـەکەی پێبڕیـــم و بەتۆنێکی کەمێک توندیشـــەوە بەرپەرچی بۆچوونەکانمی دایەوە.

"دەبێ من زانیارییەکانت بۆ ڕاســـتکەمەوە... جارێ ئەوەی ســـەبارەت بە کتێبەکەی ماو گووتت، هیچی وانیە.

بەپێچەوانەوە، هەر کەسێک ئەو کتێبە بخوێنێتەوە، هەوڵدەدا زیاتر بەدوای ســـەرچاوەکانی مارکسیزمدا بگەڕێ... بۆ قسەی دووەمیشت، ئەوانەی دژی مـــاو بوون، خەڵکی ئینتیهـــازی و ئاژاوەچی بوون... ئەگەر ماو بەو توندیە بەرەنگاریـــان نەبایـــەوە و حزبی لێپاک نەکردبانەوە، ئێســـتا چین، ئەو چینە نەدەبوو کە هەیە.

بۆ (دیواری ئازاد)یش من بەباشـــی دەزانـــم، بەڵام ئەگەر ئێوە ناتانەوێ، کەیفـــی خۆتانە... بۆ مەســـەلەی ڕەخنـــە و بیروڕای جیاوازیـــش، ئێمە نەک کەســـمان نەگرتووە و ئەزیەتمان نەداون، بەڵکو لێپرسینەوەشـــمان لەسەر ڕەخنەو بیروڕا، لەگەڵ کەســـدا نەکردووە... تەنانەت خەڵک هەبووە، جنێوی داوە و ڕەخنەی زۆر نابەجێشی گرتووە."

من ئەگەر لەوە زیاتر دەرفەتی قســـەکردنم پێدرابا و هەقی قســـەکردنی خەڵکی ترم نەخواردبا، هێشتا دەمویست بڵێم:

"لێگەڕێن باســـەد گوڵ بپشـــکوێن..." لەبەر خاتری گوڵەکان نەبوو، بەڵکو بۆ کەشفکردنی دەنگە ناڕازییەکانی ناو پارتەکەی و دەرەوەی پارتەکەیشی

بوو. ماو، بۆ بوون بە کەسیی یەکەم و خاوەن دەسەڵاتی ڕەها، لە ناوەوە لە دەرەوەی پارتەکەیدا، ڕووبەڕووی کۆمەڵێک نەیار و کاراکتەر و بەربەست ببـووەوە کە لە بەردەمیدا ڕێگربوون، هــەر ئەوەندەش ئەو نەیارانەی ماو، ڕاوبۆچوونە جیاوازەکانی خۆیان خســتەڕوو، بە (ئەنتی کۆمۆنیزم و ئەنتی شۆڕش) تاوانبارکران. وایلێهاتبوو، هەرکەسێک بچووکترین ڕەخنەی گرتبا، یان بابەتێکی وای نووســیبا، بەدڵی دەســەڵات نەبوایە، تەفسیری ئەوەی بۆ دەکــرا کــە ئەوە بۆ دژایەتیکردنی ماوتســی تۆنگ و کۆمۆنیزم و شــۆڕش نووسراوە و ڕووبەڕووی سزای زۆرتوندیش دەبووەوە.

# ٢٣

تا ئـەو کۆبوونەوەیەی گەڵ مـام جەلال و دواتریش، ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵـە و یەکێتـی هــەر تێکەڵاوبـوون. ئــەو تێکەڵییە، هەر لەسـەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە دەسـتی پێکردبوو. ئەو کاتەی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان، لە مایسـی ١٩٧٥دا وەک نیمچە بەرە و چەترێک بۆ کۆمەڵێک ڕێکخراوی تر درووسـت بـوو، جگە لە کۆمەڵە، هیـچ ڕێکخراوێکی تر لەو نیمچـە بەرەیـە و لەژێر ئەو چەترەدا نەبوو. هەربۆیـەش کۆمەڵە، ژێر ئەو چەترەی کردە مەیدانی چالاکیەکانی خۆی... ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە، ئەگەر خەڵکیان بۆ ناو خۆشیان ڕاکێشابا، سەرەتا بەناوی یەکیتیەوە ڕێکدەخران و دواتـر بە گوێرەی ئەو پێوەرانەی کۆمەڵە هەیبوون، هەڵاوێردنیان[٦٩] لەناودا دەکـرا... ئەوانــەی مەرجەکانـی کۆمەڵەبوونیان تێدابـوو، دەکرانە کۆمەڵە، ئەوانی دیش هەر وەک ئەندامی یەکێتی دەهێڵرانەوە... ئەو شێوە کارکردنەی کۆمەڵە، تا دوای دروستکردنەوەی بزووتنەوەی سۆشیالستی کوردستان و خۆڕێکخستنی خەتی گشتیش هەر بەردەوام بوو.

ئێمـە، ئەوانــەی لـە دەزگای ڕاگەیاندن بووین، هــەر هەمووومان کۆمەڵە بووین، ئەوە لە کاتێکدا ئەو دەزگایە، دەزگایەکی گرنگی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو... پێشمەرگەی کەرتەکانی هەرێمی پارێزگایش، بەوانەشەوە کە ئەرکی پارێزگارکردنی بارەگای مام جەلالیان لە ئەستۆدابوو، بەشی هەرە زۆریان کۆمەڵەبوون... لەناوەڕۆکدا کۆمەڵەو لەشێوەدا یەکێتی بوون.

ناوەنـدی کۆمەڵە، بڕیاریـدا ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە، لەوانــەی یەکێتی جیاکاتەوە... بۆ ئەو مەبەسـتەش، لیژنەیەکیان پێکهێنا تا بە ئەنجامدانی ئەو کارە هەسـتێ. سـەرەتا مەلا بەختیار سەرپەرشتی لیژنەکەی دەکرد، دواتر عومــەری سـەید عەلی، بوو بە بەرپرسـی لیژنەکە، ئاسـۆ عەلـی و نامیق محەمەد شوکر(پێشڕەو) و منیش ئەندامی لیژنەکە بووین. ئێمە هەر سێکمان، لـە دەزگای ڕاگەیانـدن بووین. پێشـڕەو، دەرچووی کۆلێـژی کارگێڕیی و ئابووریی زانکۆی موسـڵ بوو. لە بواری ئابووریدا، شـارەزاییەکی باشـی هەبـوو... هەربۆیـەش کە خولی کادیرانی کۆمەڵە کرایەوە، وانەی زانسـتی ئابووریـی لــەو خولەدا دەوتەوە. ئاسـۆ، بەرلەوەی ببێتە پێشـمەرگە یەک

---

٦٩ـ هەڵاوێردن: جیاکردنەوە

لە کادیرە چاونەترس و چالاکەکانی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شاربوو... ئەگەر لێبووردنی گشتیی ساڵی ١٩٧٩ نەبوایە، بەحوکمی سووک، لە زیندانی بەعس ڕزگاری نەدەبوو. توانای نووسین و شیعر نووسینیشی هەبوو، هەربۆیەش نێردرابۆوە دەزگای ڕاگەیاندن. ئاسۆ و من، زۆر زوو بووین بە هاوڕێ... نزیکی دیدوبۆچوون و زۆرشتی ترمان لەیەکتری، هاوڕێیەتیمانی بەهێزترو بەردەوامکرد... بە درێژایی تەمەنی هاوڕێیەتیمان، هەمیشە وەک پیاوێکی خاوەن پرەنسیپ و خاوەن هەڵوێستم بینیووە.

کاری لیژنەکەمان، سەرەتا لە بارەگاکانی سەرکردایەتیەوە دەستی پێکرد... لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەمان لەوانەی یەکێتی جیاکردنەوە... بە گوێرەی شوێنی کارکردن و ئاستی هۆشیاری ئەندامەکان، لەشانەی جیاجیادا ڕێکمان خستن.

جێی دڵخۆشیمان بوو کە زۆرینەی هەرە زۆریان کۆمەڵە بوون... بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانیمان بوو، ئاستی هۆشیاریی و ڕۆشنبیریی بەشی هەرە زۆری ئەو ئەندامانە، وێڕای دڵسۆزیی و گیانی قوربانیدانیان، لە ئاستی چاوەڕوانکراودا نەبوو.

ئەگەرچی کۆمەڵە خۆی بەڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی دەزانی، بەڵام ئەندامەکانی شارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی ئەو ئایدۆلۆژیایە نەبوو... لە وەرگرتنی ئەندامدا، بڕوابوون و شارەزایی لە مارکسیزم پێوەرنەبوون... گرنگ ئەوەبوو ئەو کەسە، نیشتمانپەروەر و پاک و دڵسۆزبا و لە پێناوی بەدیهێنانی بەرنامەکانی کۆمەڵەدا ئامادەی قوربانیدان بوایە.

بەرنامەکانی کۆمەڵەش زیاتر لەسەر بنەمای نەتەوەیی بوون تا بنەمای چینایەتی... هەر بۆیەش، دەکرێ بووترێ کە کۆمەڵە زیاتر ڕێکخراوێکی چەپی نەتەوەیی بوو، تا ڕێکخراوێکی چینایەتی مارکسی- لینیی. ئێمە خۆمان، هەم بە مارکسی دەزانی و هەمیش بە نەتەوەیی، بەڵام هیچ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی زانستیی و تیوری وامان لەسەر پەیوەندی مارکسیزم بە نەتەوەیی بوونەوە، لەبەردەستدا نەبوو. هەر بەگشتیش باس و لێکۆڵینەوەی تیۆری و فیکریمان زۆر کەم بوون... ئەوانەی هەش بوون، هەندێ بابەتی گشتیی مارکسیزم بوون. زۆرتریش ئەو بابەتانە بوون کە لە ڕێی ئەدەبیاتی ڕەوتە چەپەکانی ناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی فەلەستینیەوە، چنگمان دەکەوتن. بەگشتی سەرچاوە تیۆریەکانی خۆ پێگەیاندن بە مارکسیزم، زۆرکەم بوون... بایی ئەوە نەبوون ئێمە لە ڕووی تیۆریەوە تەیار و پڕچەککەن. ڕۆشنبیریی مارکسیزم لای ئێمە، زیاتر

ڕۆشنبیریەکی سەرچیخ بوو، تا ڕۆشنبیریەکی قووڵ... ئێمە زیاتر دروشمی ڕۆمانسیانەی مارکسیزممان بەرزکردبۆوە تا قووڵبوونەوە لە فەلسەفە و فیکری مارکسیزمدا... یەک لەو شتانەی کە زۆر باسمان دەکرد، تیۆری شۆڕشگێڕیی بوو، دەمان ووت کە"هیچ بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە، بەبێ تیوریەکی شۆڕشگێڕیی نابێ"، بەڵام لە ڕاستیدا، ئەمە هەر درووشم بوو، دەنا هیچ زانیاریەکی وامان لەسەر ئەو تیۆریە شۆڕشگێڕییە نەبوو کە بە چرا ڕۆشنکەرەوەی ڕێی بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکەی خۆمانمان دەزانی... لەواقعیشیدا تیۆری شۆڕشگێڕیی، بۆخۆی یەک لەو بابەتانە بوو کە لە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی دنیادا، زۆرترین قسەی لەسەرکراوە، لە هەمان کاتیشدا یەک لەو بابەتانەیە کە زۆرترین ناڕۆشنی لە پێناسەکردن و لێکدانەوەیدا هەیە.

کێشەی ئێمە، ئەوەندەی کێشەی نەتەوایەتی بوو، ئەوەندە کێشەی چینایەتی نەبوو. دامەزراندنی کۆمەڵە هەر لە سەرەتاوە، وەک ڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی، لەبەر پەرەسەندنی خەباتی چینی کرێکار نەبووە، یان وەک دەووترا بەری پێداویستیەکی مێژوویی گرنگ و زادەی ڕەخسانی بارودۆخی بابەتی و خۆیی نەبووە، بەڵکو کۆمەڵێ هۆکاری تر بوونە ژینگەی لە دایکبوونی:

* سەرسامیی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، بەئەندێشەی ماوتسی تۆنگ و شۆڕشی گەلی چین.

* کاریگەریی سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران، کە حیزبێکی ماویی بوو.

* پەرەسەندن و سەرکەوتنی خەباتی گەلان، لە ژمارەیەک لە وولاتانی دنیادا، بەرابەرایەتی پارت و ڕێکخراوی مارکسی –لینینی، بە تایبەتیش لە وولاتانی وەک ڤێتنام و لاووس و کەمبودیا و کۆریای باکور و کوبا و لە ژمارەیەک وولاتانی کیشوەری ئەفریقاشدا.

* بڕوانەبوون بە کاراکتەرە خێڵەکی و ووردەبۆرژواکان، لە رابەرایەتیکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا.

* ئەو پەرچەکردارەی کە لە ئەنجامی شکست و هەڵوەشانەوەی باڵی جەلالی و زاڵبوونی باڵی مەلایی لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا ڕوویدا... هەر بۆیەش خەباتە چینایەتیەکەی کۆمەڵە، خەباتی چینی کرێکار بەرامبەر بە چینی سەرمایەدار نەبوو... وەک چۆن خەباتە چینایەتیەکەی

ماوتسـی تۆنگ، دژ بە کۆمیتانگ بوو، خەباتە چینایەتیەکەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەش، دژ بە دەسەلاتی ماڵی بارزانی بوو... ئەو کاتەش کە ئێمە لە شاخ بووین، هێشـتاش زۆرێک لە ئەندامان و کادیران و سـەرکردەکانی کۆمەڵە هەر لەسەرهەمان قەناعەت بوون...

ئـەوەی لـە ئەنجامی کاری ئەو لیژنەیەدا بۆمـان دەرکەوت ئەوەبوو کە پەیوەنـدی کۆمەڵە و زۆرینەی ئەندامەکانی، لەسـەر بنەمای تێگەیشـتن و بڕوابوون نەبوو بە ئایدلۆژیا و فەلسەفە و تیۆریە شۆڕشگێڕیەکەی کۆمەڵە، بەڵکو پەیوەندیەکە حاڵەتێکی ڕۆحی وەرگرتبوو... زیاتر لە پەیوەندی تاک و دین دەچوو، تا پەیوەندی نێوان تاک و ڕێکخستنێکی مارکسی ـ لینینی.

هێشــتا ئەو بەفــرەی دوو هەفتــە لەوەوبەر باریبوو، پەڵەڕەشــانگێکی[٧٠] تێنەکەوتبــوو کــە بەفــری نوێــی بەســەرداباری. جگەرەکێشــانەکەی مام ئەحمەدیش، وەک بەفربارینەکە وابوو، جگەرەیەکی نەکوژاندۆتەوە، یەکێکیتر دادەگیرسێنێ.

مــام ئەحمەد و پورەکەســکێ و ڕەحمانــی کوڕیان، تاکە مــاڵ بوون لە (زەڵــێ) مابوون. ئەویش وەکو خۆی دەیووت"زەڵێــش بڕوا، ئەمن ناڕۆم." بــۆ کــوێ ڕۆیبا؟! ئەو هەموو ژیانی، لە ڕۆژی بوونیــەوە تا ئەو کاتە، هەر لــە نــاو ئەو دۆڵە و لــە بەینی ئەو زنجیرە شــاخانەدا بەســەربردووە... بە ئەقڵیشــیدا نەدەچوو، لەودیوی ئەو شاخانەوە ژیانێکیتر هەبێ. مام ئەحمەد فڕۆکــەی بینیبــوو، بەڵام ئۆتۆمۆبیل نــا، ئەویش لەو پارچە ئاســمانەدا کە وەک ڕەشماڵێک لەسەر ئەستووندەگی[٧١] لووتکەی ئەو چیایانە بەسەریانەوە هەڵدرابوو.

وەک چۆن مام ئەحمەد ئاگای لە دنیای ئەو دیوی چیای مامەندە نەبووە، ئەو دیوی چیای مامەندەش ئاگایان لە هەبوونی ئەم نەبووە. وەختی خۆی باوکــی لە ترســی ئــەوەی نــەوەک کوڕەکەی ببرێتــە ســەربازیی، لە هیچ تۆمارگایەکــی فەرمیدا، نــاوی ئەوی تۆمار نەکردبوو. ئــەو حاڵەتە هەر بە تەنها پەیوەندی بە باوکی مام ئەحمەدەوە نەبووە، لەســەردەمی پاشایەتیدا، لە زۆر شــوێن خەڵکی کــەش وەک ئەمیان کــردووە... تەنانەت لە هەندێک شــوێندا، کوڕیان بە کچ تۆمار کردووە... ئیدی بەو شێوەیە کیشەی چوونە سەربازیان لە کۆڵ کوڕەکانیان کردۆتەوە.

مام ئەحمەد، نە موالیدی خۆی دەزانی و نە تەمەنیشــی. پورە کەسکێش هەروا... دەکرا بڵێی پورە کەســکێ، دوو سێ ساڵێک لە مام ئەحمەد منداڵتر دەینواند.

---

٧٠ - ڕەشانگ: بەو پەڵانەی ناو بەفر دەڵێن کە یان بەفر داینەپۆشیوە یان زووتر بەفرەکەی لەسەر دەتوێتەوە.

٧١ـ ئەستوندەگ: ئەو ستوون یان کۆڵەکەیە کە دەدرێتە بەر ڕەشماڵ.

کەســـەیری پەیوەنــدی نێوانیانت دەکرد، لــە بەختەوەرترین خێزانی دنیا دەچوون.

مــام ئەحمــەد بەهائی نەبوو، بــەڵام بەقەد بەهائیــەک کارکردنی بەیەک لــە ڕەگەزەکانــی عیبادەتکــردن دەزانــی... ئــەو ســەبارەت بــە کارکردن دەیگوت"ئینسان بە ئیشــیوە جوانە... بەخودای ئەمن ئەگەر ڕۆژەکی ئیشێ نەکەم، لە کنم وایە ئەو ڕۆژەم لە عومری بەخەسارچووە."

ماڵەکــەی مــام ئەحمەد کە لــەدەرەوەڕا تەماشــات کردبــا، خانوویەکی لــە قوڕوبەرد دروســتکراوی درێــژ... دوو دەلاقــەی بەنایلۆن داپۆشــراو، دەرگایەکــی تەنەکەش لە نێوان هەر دوو دەلاقەکەدا ســەقامی گرتبوو... کە دەچوویتە ژووری، هەموو خانوەکە یەک ژووری دووروودرێژ بوو، ژوورێکی درێژ، بەتامان کرابووە چەند ژوورێک. ژووری مریشــکان، ژووری مەڕ و بزنان، ژووری مانگا و ژووری دوو هێسترەکەشــیان.... ژوورە چکۆلەکەی خۆشــیان، ڕێک لە پاڵ ژووری هێســترەکاندا بوو... لە ژوورەکەی خۆیاندا، ســێ پارچە لباد بەدەوری ســۆبایەکی دارەوە داخرابوون... لە خوار دەلاقە چکۆلەکەشــدا، ئاگردانێک بۆ چا و چێشتلێنان... هەرزاڵێک[٧٢]، چەند دەستێک نوێنی لەسەربوو... فانۆسێکیش، لە ڕێی بزمارێکی ئەستووری ژەنگاوییەوە، بە کۆڵەکەی ناو ژوورەکەدا هەڵواسرابوو... ساپیتە و دیوراکانی ژورەکەشیان ئەوەندە سیانیان[٧٣] لەسەر نیشتبوو، دەتوت بە گڵەڕەش سواغدراون.

هەر جارێک ئاســۆ و فەرهاد و من چووباینە لایان، مام ئەحمەد پاڵی بە دینگەکەوە[٧٤] دەداو و خەریکی دووکەڵ بە باکردن دەبوو... کە شەوقی کزی فانۆسەکەش، لە پشت سەریەوە، بەسەر دەموچاویدا پەرشدەبوو، بەئاسانی ئەوچرچولۆچانەت دەبینی کە چیرۆکی هەڵکشانی تەمەن و سەختیی ژیانی ئەویان بۆ بەیان دەکردی.

پرچــە ســپیەکانی پورە کەســکێش، ئەوەندە دووکەڵــی داری تەڕی ناو ئاگردانیــان بــە ســەرداهاتبوو، وەک گوڵــە گەنمــی ژەنــگ لێــدراو زەرد هەڵگەڕابــوون... ڕەحمانــی کوڕیشــیان، هــەر لەگەڵ خۆیاندا، لــەو ژوورە چکۆلەیــەدا دەژیا. ڕەحمــان، لەو کاتەدا، کەمێک لە من هەراشــتر[٧٥] دەهاتە

---

٧٢ ـ هەرزال: ستێر، پێرک، لەشێوەی کەپرێکی باریک و چکۆلەدایە، جاران بەر لە پەیدابوونی سندوقی بۆراق و دواتریش کەنتۆر، نوێنیان لەسەر دادەنا.

٧٣ ـ سیان: دوکەڵی لەسەر دیوار و دەفر نیشتوو.

٧٤ ـ دینگە: کۆڵەکە.

٧٥ـ هەراشتر: گەورەتر.

بەرچاو... دوو ســاڵێک لەوەو پێش، وەک شێوازی باوی هاوسەرگیری ئەو ناوچەیــە، ژن هەڵدەگــرێ... هەر ئــەو دەمەش، ماڵی خــۆی جیادەکاتەوە... ساڵێک دواتر، ژنەکەی ڕەدووی[٧٦] پیاوێکی تر دەکەوێ و ئەویش بە ناچاری کەلوپەلەکانی ماڵەکەی خۆی، تێکەڵ بە ماڵی باب و داکی دەکاتەوە و دێتەوە لای ئــەوان... ڕەحمــان، لەبەرئــەوەی کاری کاروانچێتی دەکــرد، زۆرکەم دەکەوتەوە ماڵ. ئامینی کچیشــیان، ســاڵێک لەوەوبــەر ڕەدووی دڵخوازی خۆی کەوتبوو، لەگەڵ مێردەکەیدا لە گوندی شــێنێ دەژیان و ناوبەناویش سەری مام ئەحمەد و پورە کەسکێیان دەدا.

کە ژیانی مام ئەحمەد و پورە کەســکێم دەدی، وام مەزەندە دەکرد، ئەو زەمەنەی سەد ساڵ لەوەوبەر شوێنەکانی دیکەی ئەم وڵاتەی جێهێشتووە، تازە خەریکە دەگاتە لای ئەمان.

ئەو بەشــەی کە خۆیان پێیان دەووت ماڵ، ئەگەرچی بۆ ئەو شەوە زۆر ساردانەی ئێمە زۆر گەرموگوڕبوو، بەڵام ئەو بۆنەی لە دیوی ماڵاتەکانەوە دەهات، قەدەرێکی دەویست تا لە گەڵیدا ڕادەهاتین. بۆنەکە بۆ ئێمە تەواوێک ناخۆش بوو، بەڵام بۆ مام ئەحمەد پێچەوانەبوو... ئەو، ئەو بۆنەی بەخۆشترین بەرامەکانــی دنیا نەدەگۆڕیەوە... وەک ئــەوەش بەناڕەحەتی ئێمەی زانیبێ، بەدەم مژلێدانێکی قووڵی دارجگەرەکەیەوە دەیووت:

ـ ڕەنگبــێ، ئەوە ئەو بۆنــەو پێخۆش نەبێ، بەخودای لەکن من، چ بۆنەک ناگەنــە ئــەو بۆنەی... ئەوە بۆنــی ماڵییە ماڵ!! جا چ بۆنــەک لە دنیایەدا، بۆ بنیادەمی، لە بۆنی ماڵێ خۆشترە!!

مــام ئەحمەد ڕاســتیدەکرد... ئێمەی لە بۆنی ماڵ بێبــەش، لەویش زیاتر هەســتمان بەو بۆنە بەهەشــتیەی مــاڵ دەکرد.. ماڵ، ئــەو بنمیچەی مرۆڤ لە ژێریدا هەســت بە ئارامی و خۆشەویســتی و دڵنیایی و هەدادانی[٧٧] ڕوح دەکات.

کەجارجارەش بزنەکان بارەیەک یان مانگا و هێســترەکان پێرەیەکیان[٧٨] لێهەســتابا، ئەوەنــدە بە تاســەوە گوێی بۆ هەڵدەخســتن، وەک ئەوەی ئەو دەنگانەی لە شاکارێکی بتهۆڤن لا خۆشتربن.

---

٧٦ – ڕەدووکەوتن: بەو حاڵەتە دەڵێن کە ژنێک، بە مەبەستی شوکردن دوای پیاوێک دەکەوێت.

٧٧ ـ هەدادان: سەقامگیری، داسەکنین.

٧٨ ـ پێرە: پرمە، دەنگی لووتی ئەسپ و گا و مانگا.

ئەو، دەنگ و بۆنی مالات[79] و دووکەڵی جگەرەی هەبا، وەک خۆی دەیگوت، هیچیکەی لە داری دنیایە نەدەویست. جاریکیان لەسەر جگەرەکیشان گفتوگۆیەکمان لە نێواندا دروست بوو:

- مام ئەحمەد، بۆ ئەوەندە زۆر جگەرە دەکێشی؟!

- بۆ نەیکێشم؟

- ئاخر بۆ تەندروستیت خراپە...

- بەخودای ئەمن هیچ خراپیم لێ نەدیووە.

- جیا لەوەی تووشی جۆرەها نەخۆشیت دەکا، بۆ تەمەنیشت هەر زۆر خراپە... تەمەن کورت دەکاتەوە.

- چۆنی کورتدەکاتەوە؟!

- بۆ نموونە، لە باتی ئەوەی ٩٠ ساڵ بژیت، ٨٠ ساڵ دەژیت.

- ئینجا بە خودای ئەمن سەوادم[80] نیە، فەرقێ بە هەشتا و بەنەوەتی ناکەم.

من ئەو دابڕانەی مام ئەحمەدم لە دنیا، بەهەل دەزانی تا هەندێ وشەی نەبیستراوی لێوە فێربم... بەڵام هێندە کەم دووبوو، ئەگەر پرسیارێکی درێژشیت لێکردبا، بە وەڵامێکی کورت لە کۆڵ خۆی دەکردیتەوە. تاکە شتێک کە توانی بۆ چەند خولەکیک قسەی لەسەر بکا، بیرەوەری ژن هەڵگرتنەکەی بوو:

"خودا ئەشقی ئەمن و کەسکێی لە دڵی یەکدی هایشتبوو، چەند جارانم ناردە خوازبێنیەی، ئەو بەرازەی بابی ڕازی نەدەبوو... لە ڕێی کچەپوورەکمەوە، قەول و قەراریی هەڵگرتنێماندا. شەوەکی هێندە تاریک بوو، پیاو شۆقاوەکی پێش خۆی نەدەدی... ماڵ نووستبوون و نەنووستبوون، ئەو بەناوی سەراوێوە هاتە دەرێ و ئەمنیش لەو دیوی ئاغەڵێ[81] چاوەڕێم دەکرد... بەخودای بەو سەرما و سەقەر[82] و تەڕوتووشیەی تەواوێکم

---

٧٩ - مالات: ولسات: ئاژەل.

٨٠ - سەواد: خوێندەواری.

٨١ - ئاغەڵ: شوورەی وشکە کەڵەک،

٨٢ ـ سەقەر: بەستەڵەک

چاوەڕێکرد... قەدەرەکی باشی پێچوو هەتا پەیدابوو... ئەسپم لە دەری دێی بەستبۆوە... گوتم نەوەک پڕمەک یان حیلەکی بکاو دنیام لێ بەخەبەربێنێ. هەر ئەوەندە گەیشتینەوە کن ئەسپی، لە پشتی خۆم سوارکرد و لغاوم بۆ ئەسپی شلکرد، یەک تەکان هەتا تووژەڵەی ڕانەوەستاین... لەوێ چووینە ماڵێ کوێخا وسێنی... هەتا مەسلەتی[٨٣] بۆ کردین، حەوتوویەکی لە ماڵێ وان ماینەوە."

ئاوڕێکی بۆ لای ڕاستی دایەوە و دەستی بۆ خەنجەرێک درێژکرد کە بەساوانی[٨٤] ماڵەکەدا هەڵواسرابوو:

- ئەو خەنجەرەو دیوە؟ ئەو شەوەی کەسکێم هەڵگرت، ئەو خەنجەرەشم لەبەر پشتێ بوو... ئیدی لەو دەمیەوە لەو شوێنەمدا هەڵگرتووە. ئەو خەنجەرە لەکن من لە هەموو دیاریەکی دنیایە ئازیز ترە.

- مام ئەحمەد بۆ نایدەی بە من، بەڵکو منیش ژنێکی پێهەڵگرم.

- ئەدی ئەوە نیە ئەتو تفەنگت پێیە! ئەگەر بەتفەنگێ ژنت بۆ هەڵنەگیرێ، بەتەمای بە خەنجەرێ بۆت هەڵگیرێ! وەڵڵا چاوەڕێی خەنجەرێبی، قەت نابیە ساحیبی ژنێ!

ئێمە، هەرسێکمان دەستمان کردە پێکەنین و ئەویش هەر لە جێگاکەی خۆیەوە و بێئەوەی هەستێتە سەر پێیان، پاشماوەی ئەو میوە و خواردنانەی کەلەسەر سینیەکەبوون، بۆ دیوی هێسترەکانی هەڵدان.

هەمووشتێک لە جیهانی ناو ئەو ژوورەدا، مایەی سەرنج و لێوردبوونەوە بوو، بەڵام ئەوەی لە هەمووی زیاتر مایەی تێرامان بوو، ئەو هەموو ماڵاتە جوارجۆرانە، بەمام ئەحمەد و پورە کەسکێ و ڕەحمانیشەوە، لە ناو یەک تاقە ژووری بەتامان دابەشکراو و لە ژێر یەک بنمیچی چکۆلەدا، ئاوا بە ئارامی و بە ئاشتی پێکەوە دەژیان... لە بەرامبەردا، هێزە کوردیەکانی ئێمە، هەر هەموومان بانگەشەی یەک ئامانجی هاوبەشمان دەکرد، کەچی لەناو ئەوهەموو شاخ و دەشت و دۆڵەداو، لە ژێر ئەو ئاسمانە پان و بەرینەدا، پێکەوە هەڵمان نەدەکرد و بەشی هەرە زۆری هێزو توانای خۆشمان، لە هەوڵی سڕینەوەی یەکتریدا بە هەدەردەدا[٨٥].

٨٣ـ مەسلەت: سازان، سوڵح، ڕێکەوتن.

٨٤ - ساوان : ئەوستوونە دارەیە کە لە ناو ژووری دانیشتندا یان چیشت ئامادەکردندا شتی پیا هەڵدەواسرێ.

٨٥ـ بەهەدەردەدا: بەفیڕۆدەدا، بەخەسار دەدا.

## ٢٥

لەمانگـی یەکـی ١٩٨٠دا، بەهەمـوو پێشـمەرگەکانی بـارەگای دەزگای ڕاگەیاندن، پێنج تفەنگمان هەبوون. هەر چەندە زۆرینەمان، کادری هونەریی یـان ڕاگەیاندکاربوویـن و کاری چەکداریمان ئەنجامنـەدەدا، بەڵام هەر بێ تفەنگی بۆ پیشمەرگە، لە ڕووی دەروونیەوە، ئەستەم و ناخۆش بوو.

کە یەک لە هەریمەکان، تفەنگێکی خۆیان بۆ بەجێدەهێشتین، بە جوانترین دیاریمـان دەزانـی. ئـەو ڕۆژەش کە بەو بەفر و سـەقەمە[٨٦]، ڕێگای بەرەو (بانە)مان دەبڕی، وەک ڕۆژێکی سەیرانم دەهاتە بەرچاو.

"دوو ڕۆژی تر نابا دەبمە خاوەنی تفەنگی خۆم." ئەو دوو سێ تفەنگەی دەدرانە بارەگای ئێمە، یەکێکیان بەرمن دەکەوت.

هەموومان سـی و پێنج کەس بووین... زۆرینەشمان، ئەوانەبووین کە تا ئەو کاتە خاوەنی چەکی شانی خۆمان نەبووین... تا سەردەشت، بەپێو بەناو بەفردا، شەش سەعاتان بەڕێوە بووین... ڕۆژ درەنگ داهاتبوو، وەختی ئەوە نەمابوو بەو ئێوارەیە بکەوینە ڕێ... شەو لە هوتێل ماینەوەو بەیانی زووش، بە سواری پاس بەرەو بانە بەڕێکەوتین... بەفر پشتێنیک زیاتر باریبوو، ڕێی نێـوان سەردەشـت و بانەی گرتبـوو... دەبوایە بچینە مهاباد و لەوێشـەوە بە بۆکان و سـەقزدا ئینجا بۆ بانە بگەڕێینەوە... ئەوەش ڕێیەکەمانی چەند قاتێک دوور دەخستەوە.

زۆرینەی شارە کوردیەکان، لە ژێر کۆنترۆڵی خەڵک و پێشمەرگەدابوون، بۆیە ڕێگا چەندیش دووربا، بۆ ئێمە لە سەیرانێکی خۆش دەچوو. لە سێیەم شـەودا گەیشـتینە ناو شـاری بانە... ئێوارەی ڕۆژی دوایـی، چەکەکانمان وەرگرتن... ٧٥ کلاشینکۆف و چەند سەد ساجوریک[٨٧] و ڕێژەیەکی زۆریش لـە تەقەمەنی... تفەنگەکان هێشـتا هەر لەناو سـندوقی سـەرمۆردابوون... دیاربـوو لـەو وەجبە چەکانە بوون کە حکومەتـی عێراقی، وەک هاوکاریی لایەنە بەرهەڵستکارەکانی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی، بە (سازمانی خەبات)ی

٨٦ـ سەقەم: سەرما و سۆڵەی زۆر دژوار.
٨٧ـ ساجور: مەخزەنی کلاشینکۆف.

دابوون... ڕێکخراوی خەبات لەلایەن(مەلا جەلالی حوسەینی)یەوە، برای(شێخ عیزەدینی حوسـەینی)ی ڕابەرایەتی دەکـرا. ئەگەرچی ئێمە چەکەکانمان لە بارەگای ئەو ڕێکخراوە، سـازمانی خەبات، ڕادەسـتکرا، بەلام لە ڕاسـتیدا (عەبدولڕەحمانـی زەبیحی) ئەو چەکانەی بـۆ ئێمە دابین کردبوو. ئەو کاتە زەبیحی، لەسـەرکردە دیارەکانی ئەو ڕێکخراوە بـوو. بەدووریش نازانرێ کە هەر لەسەر ئەو دۆستایەتی و هاوکاریانەی بووبێ کە ڕژێمی بەعس بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، بێسەروشـوێنی کرد. دوای سێ شەوان مانەوە لـە بانە، هـەر بەو ڕێیەی پێیـدا هاتبویـن گەڕاینەوە. لە هەر شـارێک لەو شـارانەی دەهاتنە سـەر ڕێمان، ئەگەر بۆ شـەویش نەمابایینەوە، بۆ چەند کاژێرێک لامان دەدا. لەو سـەفەرەمدا، چەنـد دیمەنێک، زیاد لە دیمەنەکانی تر، سەرنجی منیان ڕاکێشا:

* لـەو چەنـد کاتژمێـرەی لـە مهابـاددا ماینـەوە، سـەری کتێبخانەی (سەیدیان)م دا... سەیدیان، هەر کتیبخانە نەبوو، بەڵکو زیاتر لە دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوە دەچوو. سانسۆری دەوڵەت نەمابوو، چیان بویستایە، چـاپ و بڵاویان دەکردەوە. بەشـێکی زۆر لەو کتێبانـەی لەو کتێبخانەیەدا هەبـوون، یـان سـەر لە نـوێ چاپکرابوونـەوە، یـان ئەوەتا لە باشـوری کوردسـتانەوە هێنرابـوون... لـە ناو ئەو کتێبانەدا، دیوانی شـیعر، بەشـی شـێریان بەردەکەوت. یەک لەو کتێبانەی لەلایەن(ئینتیشاراتی سەیدیان)ەوە چـاپ و بڵاوکرابۆوە، (ئافـرەت و ژانی لە دایک بوونێکی نوێ)بوو... وێڕای ئەوەی من لە چاپکردنەوەی ئەو کتێبە ئاگادارنەکرابوومەوە، لەسـەر دیوی ناوەوەی بەرگی یەکەمیدا نووسرابوو، حقوقی لە چاپدانەوەی ئەو کتێبە، بۆ ئینتیشاراتی سەیدیان پارێزراوە...

لەسەر ئەوە، هیچ قسەیەکم لەگەڵ ئاغای سەیدیاندا نەکرد... تەنانەت خۆشم وەک نووسـەری کتێبەکە نەناسـاند. بۆ من ئەوە مەسەلەیەک نەبوو... گرنگ ئەوەبوو، ئەو کتێبە و سـەدانی کەش، لەسـەر ئەرکی ئەوان، لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتاندا، چـاپ و بڵاوکرابوونەوە... بڵاوکردنـەوەی کتێبی کوردی لەو ڕۆژگارەدا، لەوبەشەی کوردستاندا، بۆ خۆی جۆرێک لە خەبات و خزمەتێکی گەورەشبوو.

* لەو چەند ڕۆژو شـەوەی لە بانەو لە شـارەکانی دیکەشـدا ماینەوە، شەوەکەی سەردەشتی لێدەرکەی، دەنا بۆیەک شەویش نەچووینە هوتیل، و بەدەگمەنیش نەبێ، لە چایخانە و ڕێستوڕانتدا نانمان نەخوارد... خەڵکی هەرکە دەیانزانی، بە قەولی خۆیان (پێشـمەرگەی ئەو دیوین) نەک هەر فەرمووی چوونەوەیان لێدەکردین، بەڵکو بە زۆر لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردینەوە ماڵێ...

چەندیش لەو شارەدا مابینەوە، خاوەنماڵ قبوڵی نەدەکرد، ماڵئاواییان لێبکەین.

* ڕۆژانە، لەو شارانەدا کە کۆمەڵە یان چریکە فیداییەکانی خەڵک پێگەیان تیایاندا بەهێز بوو، ڕێپێوان وخۆپیشاندانی گەورە گەورە بەڕێوەدەچوون... بە هەزاران کچ و کوڕ بەشداریيان تێدادەکردن. دەچوویتە هەر چایخانەو ناو هەر گردبوونەوەیەکی جەماوەریی، گوێت لە مشتومڕ و گفتوگۆی فکری و سیاسی چڕدەبوو... لەناو چایخانەکانیشدا، گەنجانت دەبینین خەریکی کتێب و ڕۆژنامە خوێندنەوە بوون، دیاردەیەک لەلای خۆمان نەمدی بوو... ئەوەشم بە نیشانەی ئەوە دەزانی کە ئاستی هۆشیاری و ئایدۆلۆژیش لای ئەمان باڵاتربێ تا لای ئێمە... زۆر پێچەوانەی ئەو وێنەیەی نەرێنییەی کە لەسەردەمی شا و شۆڕشی ئەیلولدا، بۆمان نەخشێنرابوو... دەیان ووت گوایە لە کوردێکی ئێرانییان پرسیووە:

- ئەرێ ئێوە بۆ شۆڕش ناکەن؟!

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:

- ئەگەر شا ڕەزای لەسەربێ، چۆن نایکەین، حەتمەن دەیکەین.

لەوێدا تێگەیشتم ئەو قسەیە، لە قسەیەکی هەڵبەستراو بەولاوە شتێکی دیکە نیە... تەنانەت ئەگەر ئەوە ڕووشیدابێ، حەتمەن ئەو کەسە وا حاڵی بووەکە مەبەست لە شۆڕشکردن، شۆڕشی ئەیلولە... ئەو کە دەبینێ شۆڕشی ئەیلول، لە چەندین لاوە و بە چەندین قەفە زنجیری ئەستور بەشای ئێرانەوە بەستراوەتەوە، حەتمەن پێی وادەبێت بۆ بەشداریکردن لەو شۆڕشەدا، ڕەزامەندی شای ئێرانی پێویست بێت.

لەسەردەمی شادا، ئەگەر یەکێک میوانیشی هاتبا(میوانی غەیرە)، ئاگادارکردنەوە و ڕەزامەندی (ساواک)ی دەویست، جا نەخوازەڵا بەشداریکردن لە شۆڕشی ئەیلولدا.

هەڵچوون و تووڕەیی خەڵک بەرامبەر بە قیادەی موەقەتە، لە هەموو شوێنێکدا، بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا. کوردانی ڕۆژهەڵات، پێیان وابوو کە قیادەی موەقەتە لەسەردەمی شادا لەبەرەی شادابوون و لەسەردەمی کۆماری ئیسلامیشدا چوونەتە بەرەی کۆماری ئیسلامیەوەو دژ بە خواستەکانی خەڵکی کورد، لە پاڵ سپای پاسدارانلدا شەڕدەکەن.

زۆریــش نەبوو کە هەر لە ئەنجامی ئەو تووڕەیی و ناڕەزاییەی خەڵکدا، هەموو حیزب و ڕێکخراوە کوردییەکان و ئەو ڕێکخراوە ئێرانیانەش کە لقیان لە کوردســتاندا هەبوو، لە مهاباد کۆبوونەوەیەکی گەورەیان سازکردبوو... لەو کۆبوونەوەیەدا، ســەبارەت بە دەســتپێکردنی گفتوگــۆ لەگەڵ کۆماری ئیســلامیدا، داوانامەیەکی هەشــت خاڵیــان پێشکەشــی حکومەتی کۆماری ئیســلامی کردبــوو... لە بڕگــەی ٨ی ئــەو داوانامەیــەدا، داوای دەرکردنی (ئەفرادی قیادەی موەقەت) یان لە خاکی ئێراندا کردبوو... لەو مەسەلەیەدا، هەڵوێســتی حیزبــی دیموکراتی کوردســتانی ئێران، کەمێک لە هەڵوێســتی لایەنەکانی تــر نەرمتربوو، ئەوان تەنها داوای دەرکردنی ســەرانی قیادەی موەقەتیان دەکرد نەک هەموو(ئەفراد)[٨٨]ەکانیان.

زۆرنەبوو هەڵبژاردنی نوێنەرانی شــورای میللی ئێران بەڕێوەچوو بوو. ژمــارەی دەنگی نوێنەرەکان لە هەر شــارێکدا، بەهێزیــی و لاوازیی پێگەی حیزب و لایەنە بەشدارەکانی هەڵبژاردنی دەردەخست. بەشێوەیەکی گشتی خەڵک لە هەڵبژاردندا، دووجار بڕیاردەدا، بڕیارێک کە بەر لە بەڕێوەچوونی پرۆســەکە داویەتی، ئەویــش بڕیاری دەنگدانیەتی بــەکام حیزب و لایەن... بڕیــاری دووەمیشــی لە کاتــی بەڕێوەچوونی پرۆســەکەدایە، لــە ناو ئەو لایەنەدا، دەنگ بە کام کاندیدیان دەدا.

ئــەوەی لــەو هەڵبژاردنانــەدا، مایەی ســەرنجدانی زۆری مــن بوو، ئەو دەنگانەبوون کە حەسەنی قزڵچی بە دەستیهێنابوون. حەسەنی قزڵچی، هەم کەســایەتیەکی سیاسی دیار و هەمیش کەسایەتیەکی ئەدەبی خۆشەویست بوو... لەو هەڵبژاردنەدا وەک کاندیدی(حیزبی تودە)[٨٩]، لەشــارەکەی خۆیدا، (بــۆکان) تەنها ١٥٧ دەنگی بەدەســتهێنابوو، لە کاتێکــدا کاندیدێکی گەنجی کۆمەڵەو ڕکابەری ئەو لە هەمان بازنەی هەڵبژاردندا، سەرووی چەند هەزار دەنگی بەدەستهێنابوو.

---

٨٨ـ ئەفراد: نەفەر، خەڵکانی سەر بە.

٨٩ - حیزبی تودە: حیزبی شیوعی ئیرانی.

## ٢٦

ئێوارەیەکی درەنگ، چەند ڕۆژێک دوای هاتنەوەمان لەسەفەری هێنانی چەک، یەک لە پێشمەرگەکانی بارەگای مام جەلال، لەڕێی تەلەفۆنی[٩٠] بارەگاوە، پێی گووتم:

- مام جەلال دەڵێ: "هەڤاڵ ئاگادارکە، سەعات ١٠ی بەیانی کۆبونەوەی(ڕێبازی نوێ)مان هەیە و پێشی بڵێ باخەبەری کۆبوونەوەکە بە فەریدوونیش بدا."

چەند مانگێک بوو دەستەی نووسینی ڕێبازی نوێ دامەزرابوو، من کرابوومە بەڕێوبەری نووسین... هەربۆیەش دەبوایە هەمووجارێک، بابەتەکانی ژمارەی داهاتوو کۆکەمەوە. بەرلەوەی بابەتەکان بۆ چاپ بنێردرێن، بۆ بڕیاردان لەسەریان، کۆبوونەوەی دەستەی نووسەران دەکرا... کۆبوونەوەکان، هەموو جارێک هەر لە ماڵی مام جەلالدا بەڕێوەدەچوون. هەر هەمان ئێوارە خەبەرەکەم بە فەریدووندا... چارەک بۆ ١٠ی ڕۆژی دوایش، لە دەرگای ژوورەکەیانمدا:

- من هیچی تر بەشداری ئەو کۆبوونەوانە ناکەم. بڕیارمداوە لەمەودوا، خۆم بۆ ئیشوکارەکانی کۆمەڵە تەرخان بکەم و ئیشی یەکێتی ناکەم.

- ئەی من چی بە مام جەلال بڵێم، ئەگەر پرسیاری تۆی لێکردم؟

- هەر ئەوەبڵێ کە ووتم.

بەرەوماڵی مام جەلال، شوێن پێکانم لە دوای خۆمەوە، بەسەر بەفرەکەوە بەجێهێشت. کەمن بەخۆم و بە بابەتە ئامادەکراوەکانی(ڕێبازی نوێ) وە گەیشتم، مام جەلال خەریکی نووسین بوو. هەر لەگەڵ وەڵامدانەوەی سڵاوەکەی مندا پرسی:

---

٩٠.لە دوای ڕووخانی شاوە، ژمارەیەکی زۆر لەو سەربازگانەی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بوون، کەوتنە ژێردەستی خەڵکی و چەک و تەقەمەنی و کەلوپەلێکی زۆریان تێدا گیران... لە ناویاندا، ژمارەیەکی زۆریش لە تەلەفونی سەربازیی. بەشێک لەو تەلەفونانە گەیشتنە لای ئێمە و بۆ پەیوەندی نێوان هەندێک لە بارەگاکان بەکاردەهێنران.

- ئەدی کوا فەرەیدوون؟

- وابزانم نەخۆشــە... ووتی کەمێک نەخۆشــم و ناتوانــم بێم. بۆ ئەوەی کێشــەیەک لە بەینی مام جەلال و ئەودا درووســت نەبێ وا وەڵامم دایەوە، مام جەلال وەک ئەوەی بە ناڕاســتیی وەڵامەکەی منی زانیبێ، بەجۆرێک لە گومان و تۆنێکی کەمێک توورەشەوە، ووتی:

- گوتی نەخۆشم؟!

_ بەڵێ شتێکی لەو جۆرەی ووت.

- ڕاست ناکات نەخۆش نیە... دەزانم ڕاست ناکات... نایا، با نەیا... ڕێبازی نوێ لەسەرە وی پەکیناکەوێ.

هێشــتا کەســیتر لــە ئەندامانی دەســتەی نووســەران نەگەیشــتبوون، فەرەیدوون لەگەڵ سڵاوکردندا، ڕووی لە من کرد:

- ئەرێ هەڤاڵ بۆ تۆزێک چاوەڕێت نەکردم تا خۆم ئەپێچایەوە؟

بەرلەوەی من فریای وەڵامدانەوە بکەوم، مام جەلال هەڵیدایە!

- هەڤاڵ ئیشەکەی بۆ چاکردووی، تێکی مەدە.

- بۆ هەڤاڵ چی ووتووە؟

- هیچ، هەر گوتی نەخۆشە.

- وەڵڵا ڕاســت دەکات کەمێک ناســاغ بووم، بەڵام بەخوا لەبەر قسەی تۆ هاتم.

ماڵــی مــام جەلال ئاوابێ، بەچوونە سەرباســی بابەتــەکان، کۆتایی بەو دۆخە هێنا کە منی تێکەوتبووم.

لە ڕێگای بەرەو بارەگا گەڕانەوەمدا، تووشی ملازم عومەر هاتم... لەگەڵ ئــەودا چوومە بارەگاکەی ئەوان، بارەگای مەکتەبی عەســکەری کە هەر لە زەڵــی و بەوبــەری بارەگاکەی ئێمەوەبــوو. دەمەو ئێوارە، لــەو کاتەدا من خەریکــی ماڵئاوایی کردن بووم، دکتۆر عومەر شــێخموس، ســڵاوی کرد، دکتۆر شــێخموس، لەسەر پشکی خەتی گشــتی، ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوو... ژوورەکەیشی، هەر لە نزیکی ماڵەکەی مام جەلالەوەبوو.

هەتا بڵێی پیاوێکی ئارام و لەسەرخۆبوو، کەچی لەو ئێوارەیەدا، جیاواز لە سروشتی خۆی، پەست و شڵەژاو دیاربوو... ملازم عومەر کە دکتۆر شێخموسی بەو حاڵەوە بینی و کە بە تەنیاش هاتۆتە لای ئەمان، بەجۆرێک لەسەرسوڕمانەوە پرسی:

- خێرە کاک عومەر بەم ئێوارەیەو بەتەنیا هاتووی؟!

- وەڵڵا هاتووم لای ئێوە داوای پەنابەری بکەم، ئەگەر پەنابەر وەربگرن!

ئێمە هەمووممان وامانزانی گاڵتەدەکا... بەڵام دیاربوو گاڵتەی نەدەکرد... هەر ئەو عەسرە مام جەلال، لەسەر کارێک زۆر لە پێشمەرگەیەکی لای خۆی تووڕە دەبێ... قسەی زۆر توند و ناشرینیی پێدەڵێ، لە دواییشدا چەکی دەکات.

دکتۆر شێخموس، زۆر هەوڵ لەگەڵ مام جەلالدا دەدات، لەوکارەی پەشیمانیکاتەوە، کەچی ئەو زیاتر هەڵدەچێ و تەنانەت بەگژ ئەویشدا دێ.

دکتۆر شێخموس، کە پێشتر حاڵەتی وای لە مام جەلال نەدیبوو، زۆر نیگەران و ناڕەحەت دەبێ... تەحەمولی نامێنێ و هەر لەوێدا نامەی دەستلەکارکێشانەوەی خۆی دەنووسێ و بۆ مام جەلالی بەجێدەهێڵێ.

هەر چەندە حاڵەتەکە کەمێک جدی و ناخۆشیش بوو، بەڵام دواتر بوو بە مایەی پێکەنین، بەتایبەتیش کە ملازم عومەر گووتی:

- قوڕبەسەرمان، خەڵک لێرەوە دەڕوا تا داوای پەنابەری لە سوید بکا، کەچی تۆ لە سویدەوە هاتوویت و ئەتەوێ لای ئێمە ببیتە پەنابەر.

# ٢٧

عومەر شـێخموس، ئەو کاتە یەک لەو دوو نوێنەرەی خەتی گشـتی بوو کە لە مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا هەیانبوون.

یەکێتـی لـە ڕووی پێکهاتەی سـەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسـیەوە، تا جیابوونەوەی بزووتنەوە، لەسـێ باڵ پێکدەهات: کۆمەڵەو خەتی گشـتی و بزووتنەوە.

خەتی گشـتی، بەو کەسـانە دەووترا کە هەر یەکێتی بوون، نە کۆمەڵە و نە بزووتنەوەش بوون. دەنا لە ڕاسـتیدا، ڕێکخستنێک نەبوو بەناوی خەتی گشتیەوە. خەتی گشـتی ڕێکخراونەبوون، بەڵام لەمەسـەلەی نوێنەرایەتی، لە دەزگا سـەرکردایەتیەکاندا، حسابی باڵێکیان بۆ دەکراو بە قەد هەر یەک لـە کۆمەڵە و لـە بزووتنەوەش، نوێنەرایەتیان لەسـەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسیدا هەبوو.

بزووتنەوە، لە دوای جیابوونەوەی ئەو باڵەی مام جەلال بەباڵی نارەسەن یان بە (باڵی جوجە ڕەسوڵ)ی ناو دەبردن، نە ڕێکخستنێکی وایان مابوو، نە لە دەزگا سەرکردایەتیەکانیشدا کەسیان مابوو، عومەر دەبابەی لێدەرکەی، ئەویـش لـە ئەوروپا دەژیـا و بەسـەردانی زۆر کورت نەبـا، نەدەهاتەوە کوردسـتان... بـۆ پڕکردنـەوەی ئەو پۆسـتە چۆڵانە کە وەک شایسـتەی ڕێکخراوەیـی بزووتنـەوە حسـابیان بۆ دەکـرا، ئەندامانی سـەرکردایەتی یەکێتـی، لە کۆتایی زسـتانی ١٩٨٠دا، کۆبوونـەوە... کۆبونەوەکان نزیکەی دوو هەفتەیان خایاند. هۆکاری درێژە کێشـانی کۆبوونەوەکانیش، کێشەی دانانی نوێنەرانی بزووتنەوەبوو لە مەکتەبی سیاسیدا. مەکتەبی سیاسی، لە حەوت کەس پێکدەهات:

مام جەلال، وەک سـکرتێری گشـتی، دوو ئەندامی هەریەک لە کۆمەڵە و بزووتنەوەو خەتی گشتیش.

نوێنەرانی خەتی گشتی لە مەکتەبی سیاسیدا، دکتۆر عومەر شێخموس و دکتۆر کەمال خۆشناوبوون... سەرکردایەتی کۆمەڵە لەگەڵ ئەو دووانەدا هیچ کێشـەیەکیان نەبوو. ئەوەی مایـەی نارەزایی ئەوان بوو، دوو نوێنەرەکەی

بزووتنـــەوە بـــوون، جەمال ئاغـــا و عەلی حەویـــز... هەردووکیان لەو چەند کەسانەبوون کە بەو دواییانە، بە نامەی مام جەلال هاتبوونە دەرەوە.

ســـەرکردایەتی کۆمەڵـــە، نوێنەرەکانـــی بزووتنەوەیـــان بەشایســـتەی ئـــەو پۆســـتە نەدەزانـــی... پێیان وابوو ئەمـــە هەم هەیبەت و کەســـایەتیی مەکتەبی سیاسی بچووک دەکاتەوە و، هەمیش وەک ناهەقیەکی گەورەیان دەبینـــی کە لە کۆمەڵـــە و لە یەکێتیش دەکرا. مام جەلال پێداگری لەســـەر ئـــەو دوونـــاوە دەکرد و ســـەرکردایەتی کۆمەڵـــەش ئامـــادەی قبوڵکردنی ئـــەو فەرزکردنەی مام جەلال نەبوون... کارگەیشـــتە ئـــەوەی، مام جەلال هەڕەشـــەی دەستلەکارکێشـــانەوە و بەجێهێشـــتنی کوردســـتان و بەیـــان دەرکـــردن بکات. ئەگـــەر هەوڵی زۆری نەوشـــیروان مســـتەفا نەبوایە، لە ڕازیکردنـــی ســـەرکردایەتی کۆمەڵەدا، بەقبوڵکردنـــی داواکەی مام جەلال، یەکێتی ڕووبەڕووی کێشەیەکی زۆر قووڵ دەبۆوە. لەوێشەوە، کەسایەتی مام جەلال و نەوشـــیراوان مستەفام وەک تەواوکەری کەسایەتی یەکتری دەبینـــی، تـــا دوو کەســـایەتی جیاواز... جیاواز لە شـــێوە و لـــە ڕۆڵبینیندا، بـــەڵام تەواوکـــەری یەکتری لە نـــاوەڕۆک و لە بەڕێوەبەردنی شۆڕشـــدا. ســـەرکردایەتی کۆمەڵـــە ملیان بۆ داخوازییەکەی مام جـــەلال داو، مەکتەبی سیاســـی بەو شـــێوەیە پێکهـــات کە ئەو دەیویســـت... بەوەش ئـــەو زۆرینە ڕەهایە لەناو مەکتەبی سیاسیدا دروستبوو کە بە شێوەیەکی(دیموکراسیانە) هەمـــوو بڕیارەکانـــی بەدڵـــی مـــام جـــەلال یەکلاییدەکـــردەوە... لەواقعـــدا، بزووتنـــەوەو خەتـــی گشـــتیش، هەردووکیـــان دوو ڕێکخـــراوی مام جەلال بوون، نوێنەرایەتیشـــیان لە دەزگا سەرکردایەتیەکاندا، هەر نوێنەرایەتی مام جەلال بوو... بەهەردووکیان، ئەو هەرێمانەی لێدەرکەی کە لەســـەر بنەمای پێکهاتەی عەشـــایەری درووستکرابوون، لەناو پێشمەرگە و ڕێکخستنەکاندا وجودیکی وایان نەبوو...

لـــەو کۆبوونەوەیـــە بـــەدواوە، جۆرێـــک لەســـەرکردە پەیدابـــوون کـــە جیاوازییەکی ئەوتۆیان، لە ڕووی تواناوە، لەگەڵ کادرێکی ئاســـاییدا نەبوو. جۆرێـــک لەســـەرکردە کە هەموو توانـــای خۆیان لە ڕازیکردنی ســـەرووی خۆیانـــدا کـــورت دەکردەوە و، ڕێگا خۆشـــکەریش بوون بـــۆ کۆبوونەوەی زۆرترین دەســـەڵات لە دەستی یەکدوکەســـدا... لە هەمان کاتیشدا دەبوونە ڕێگـــر لە بـــەردەم ســـەرهەڵدان و هاتنە پێشـــەوەی کادری ســـەرکردایەتی خۆرسکدا.

جۆرێک لەسەرکردە لە سێبەری ڕابەرانی یەکێتیدا هاتنە پێشەوە، ئەگەر لەو سێبەرە دەرچووبان، دیارنەدەمان... سێبەری ڕابەرانی کوردیش، وەک

سـێبەری داربەڕوویەکـی گـەورە و بە عومر وایە، لە تـەڕاش[91] و کۆتەرە بەولاوە، شتێکی دیکەیان لە ژێردا سەوز نابێ. دلێری سەید مەجید دەیگووت، «پلە و پۆست لەو یەکێتیەی ئێمەدا، وەک توورەکەی یانسیبی جاران وایە... دەسـتی پیائەکەی، ئیتر خۆت و بەختت... هەیە ئەندامی مەکتەبی سیاسـی، هەیە ئەندامی مەڵبەند و، هەشە بنێشتێک یان شانەیەکی بۆ دەرئەچێ.»

من تا ئەو کاتەش وامدەزانی سەرکردەی سیاسی، کۆمەڵێک خەسڵەت و تایبەتمەندی وای تێدایە کە لە خەڵکی ئاساییدا یان لە سیاسی ئاساییدا نین... تا ئەو کاتەش وامدەزانی ئەوەی دەبێتە ئەندامی سـەرکردایەتی و ئیدیعای ڕابەرایەتی خەڵک دەکات، دەبێت هەموو یان بەشێکی زۆر لەو خەسڵەت و کوالێتیانەی تێدابێ کە لە خەڵکی تری جیادەکاتەوە... وامدەزانی ئەو کەسـە دەبێ:

* ئاستێکی باڵای فکری و سیاسی و ئەزموونی خەباتی هەبێ.

* لـە کـرداروو گفتاردا پاک و ڕاسـتگۆبێت و لەوەرگرتنی هەڵوێسـت و بڕیاردا ئازا و بەجورئەت بێ.

* توانای شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی هەر بارودۆخێکی هەبێ کە دێتە پێشێ و بڕیاری حەکیمانەی لەسەربدا.

* لە کاتی سـەرهەڵدانی کێشـەو تەنگژەدا، بەپێوە بوەسـتێ و مامڵەی درووستیان لەگەڵدا بکاو وەڵامی جدیشی بۆیان هەبێ.

* لە پێناوی شـەڕی بەرژەوەندیە گشـتیەکاندا، دەسـتبەرداری شەڕی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی ببێ.

* دەبـێ بەو خەسـڵەتە جیاکەرانەوە، توانای متمانـە وەرگرتنی هەموو ئەوانەی هەبێ کە نوێنەرایەتیان دەکات.

بەداخەوە، ئەو خەسـڵەتانەی لەسـەرکردەدا پێویسـت بوون، تا دەهات کەمتـر دەبوونەوەو لـەوەش ناخۆشـتر گومانت دەکرد لەوەی کەسـێکت دەسـکەوێ هەموو ئەو خەسـڵەتانەی لە خۆیدا کۆکردبێتەوە کە بیکاتە ئەو سەرکردەیەی خەڵکی بتوانن چارەنووسی خۆیانی پێبسپێرن.

---

٩١ - تەڕاش: دەوەن

## ٢٨

کە منداڵ بووین، دایکم، بەدوو گوریس و دۆشەکەڵەیەک، لە بەینی قەدی هەردوو دارتووی حەوشەکەمان، جۆلانەی بۆ هەڵدەبەستین. قەدی دارەکان زۆریش ئەستوور نەبوون، بەڵام هێندە قایم و پتەوبوون، تا ئێواری دیلانێمان کردبا، نەترسی پچڕانی گوریس و نەترسی بەلاداهاتنی دارەکانیشمان هەبوون.

تا ئەو کۆبوونەوانەی سەرکردایەتی نەکرابوون، زۆرینەی سەرکردەکانم، وەک قەدی ئەو دارتووانە وێنا دەکرد، قایم و پتەو... خۆ ئەگەر دانە دانەی لایەز[٩٢] و کلۆریشیان تێدابان، ئەوەندە بەهەندم وەرنەدەگرت. دەرهاویشتەی کۆبونەوەکان، تێڕوانینیان تەواو هەڵگێڕامەوە.

بۆ یەک لەو سمینارانەی ناوبەناو لە بارەگاکەماندا ساز دەکران، خەریکی نووسینێک بووم لەسەر ئەو بابەتە... هێشتا لەسەرەتای نووسینەکەمدابووم، کەسێک بەژوورکەوت... هەر چەندە ژوورەکەش ئەوەندە ڕووناک نەبوو، بەڵام هەر کە سڵاوی کرد ناسیمەوە... (سێمان)ی کوڕی حەمەدی ڕەسوی زوورکان، دۆستی قەدیمی بابم. حەمەدی ڕەسو، جاران شوانکارەبوو... بەهۆی ئەو هەموو شەڕوشۆڕەوە، چیتر گەرمیان و کوێستانیان بۆ نەکراو بەناچاری لە گوندی زوورکان[٩٣] جێگیربوون.

من منداڵبووم، چەند سەد سەر مەڕێکی ئێمەی لابوو... هەرجارێک هاتبایە ماڵمان، ماست و پەنیرو جارجارەش بەرخێک یان گیسکێکی بۆ دەهێناین... دوای هەندێک باسو خواس، سێمان، بۆ هەواڵ پێدانێک بردمیە دەرێ:

«ڕۆژنیە حکومەت کەسوکاری پێشمەرگەی نەگرێ و لەو دەشتودەرانە فرێیان نەدا. دوێنێ ئێوارێش، باب و داکتیان بە پشتی زیلێکی هێنابوونە ئەو لای ماڵان و لەوێ بەرەڵایان کردبوون... پێشیان گوتبوون، یان کوڕەکەتان دێننەوە، یان خۆشتان بڕۆنە لای ئەو... ئێستا لە ماڵی ئێمەن و منیان بەدوای تۆدا ناردوە، دەیانەوێ بتبینن. هەر باشە نەیانگرتوون، کەمێک

٩٢ـ لایەز: ئەو کۆتەرە دارەی لافاو لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ.
٩٣ـ زوورکان یان زووران: گوندێکە دەکەوێتە پشتی سەنگەسەر. دواین گوندی ژێردەسەڵاتی ڕژێم بوو بەرەو بناری قەندیل و قەڵاتووکان.

گەنجبان، لەبری دەرکردن، لە زیندانیان قایمدەکردن.»

نانێکی بەپەلەمان خوارد. روخسەتم وەرگرت، تفەنگم لە شانکرد و دووقۆڵی ملی ڕێی بەرەو (زوورکان)مان گرت.

«ئەگەر کەمێک خۆش بڕۆین، شەوی دەمێنێ کە دەگەینە ناومالان. وەختێکی باش دەگەین، ئەگەر کەمێنی جاشانیش هەبێ، تا ئەو دەمەی نامێنێ.» سێمان وایووت.

هێشتا هیچی وا ڕێمان نەبڕیبوو کە دنیا تەواو تاریک داهات. هێندە تاریکبوو، بەزەحمەت چەند هەنگاوێک پێش خۆمانمان دەبینی... لە تاریکیەکەش ناخۆشتر ئەو بایە ساردەبوو کە وەک دەمی گوێزان، دەموچاوی توێ توێ دەکردین... هێندە ساردبوو، دەتووت هەرچی ساردیو سەرمای ئەو قەندیلە هەیە، لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. تێکەڵ بوونی لوورەی با و هاژەهاژی ئەو چەمەش کە لە خوار ئێمەوە، بەناو دۆڵێکی زۆر قووڵدا سەربەرەوخوار دەبۆوە، ئاوازێکی سامناکیان دروست دەکرد... سامناکتر لە مۆسیقای پێش بەرپابوونی شەڕ...

کە مانگ وەک ڕێبوارێکی زۆرماندوو، بەهەنگاوی قورسەوە پەیدابوو، شەو ئەوەندەی بە بەرەوەنەمابوو. هێندە ساردبوو، سەرما بەتریفەی مانگیشەوە دیاربوو. مانگ هێندە کزبوو، دەتووت بەرلەوەی تریفە لەرزۆکەکانی بگەنە سەرزەوی، سەرما لە هەوادا بەستوونی. گەر وانەبا، ڕەنگە ئەو باریکە ڕێیەی ئێمە پیادەڕۆشتین، لەوە ڕووناکتر ببایەوە کە هەبوو.

وەک سێمان پێشبینی دەکرد، بەر لە مەلابانگدان، گەیشتینە قەراغی دێ. لەگەڵ چەند کۆکەیەکی ئەودا، ڕەوە سەگێک دەستیان بە وەڕین کرد.

- بەو کۆکەیەت هەموو سەگەکانی ئاواییت بەخەبەر هێنان.

- نەشکۆکیبام سەگەکان هەر دەوەڕین. سەگ لە دوورەوەو بەر لەوەی ببیستێ بۆن دەکات.

سێمان کە هەستی بە لە سەگ ترسانی من کرد ووتی:

- مەترسێ پەلامار نادەن.

- پەلاماریش نەدەن، جاشانمان لێ بە ئاگا دێنن.

- زووركان جاشی نین...جارجاره جاشەكانی هەباسی بایزی باڵواغای، بۆ كەمین دانانی، دێنە پشـتی زۆركان. خەمت نەبێ ئەگەر كەمینیش هەبووبێ، ئێستا هەڵگیراوە.

- من وەڕینی ئەو سەگانەم، لە هەموو دەنگێک لا ناخۆشترە.

- دەوەڕن با بوەڕن. سـەگ هەر کە بۆنی خەڵکی غەریبی کرد دەوەڕێ. وەک باپیـرم دەیگـوت، توانـای بۆنکردنی سـەگ، چل ئەوەنـدەی توانای بۆنکردنـی بنیادەمیـە... ئەو دەیگوت سـەگ لە ڕێی بۆنکردنـەوە، خەڵک و سەگەکانی دیکەش دەناسێتەوە.

- بەڵام ئەوەتا بەرەو من دەوەڕن.

- ئێ وایە، ئەوان دەزانن تۆ دەترسێی، بۆیە بە تۆ دەوەڕن. نازانی سەگ هەسـتی چەند بەهێزە... هەسـت بە هەڵکردنی ڕەشـەبای بەهێزو ڕوودانی تۆفان و تەنانەت هەست بە هاتنی فڕۆکەی جەنگیش دەکات.

بەقسـەی باپیری سێمان بێ، سـەگ زمانی لە کلکی دایە... ئەو دەیگوت، سەگ لە ڕێی جوڵاندنی کلکیەوە، هەموو شتێکت پێدەڵێ:

بـۆ نمونـە، ئەگـەر لەسـەرەخۆ ڕایوەشـاند، مانـای ئەوەیە بـە بینینت خۆشـحاڵە... ئەگەر بەلای ڕاسـتا ڕایوەشـاند، مانای ئەوەیە کەیفی هەیە و دڵخۆشـە... ئەگەر بەلای چەپدا ڕایوەشاند، واتا لە شتێک دەترسێ... ئەگەر بەرەو خوار ڕایوەشـاند، واتا نادڵنیایە و هەست بە سەلامەتی ناکا... ئەگەر زۆر خێـراو وەک فرفڕۆکـە بە هەموو لایەکدا ڕایوەشـاند، ئەوە نیشـانەی شەڕەنگێزی ئەو سەگەیە.

بەوەباش بوو هیچ کام لە سەگەکانی ئەو شەوە، کلکیان بەهەموو لایەکدا ڕانەدەوەشـاند، دەنا لەگەڵ سێمانیشدا، هەر شـتێک دەترسام. ڕەنگە ئەو لە سەگ ترسانەم پەیوەندی زۆری بە ئەزموونی سەردەمی منداڵیمەوە هەبێ...

مچە نەکەی... مچە سەگی نووستوو بەخەبەر مەهێنە!.

مچە لەگەڵ خرکە بەردێکدا، زرمە لەو سـەگە دێنێ کە لە بن دیوارەکەی ئەو بەرمانەوە پاڵکەوتووە... سەگ هەڵمەت دێنێ و هەموو ڕادەکەین... لەناو هەموویاندا ئامبازی من دەبێ.. لەگەڵ یەکەم قەپاڵیدا، لایەک لە شـەرواڵەکەم دەپچڕێنـێ.. خۆ ئەگـەر خاوەنی سـەگەکە فریام نەکەوتایە، زیـواڵ زیواڵی کردبووم.

بەئەســپایی و لەســەرەخۆ، خۆمان بە ژووریّ داکرد، نەمانهێشت کەس بەخەبەربێت. هێندە کفتی ڕێگابووم، خەریکبوو گۆت دەبووم.

خۆمان خزاندە نــاو جێگا... وەختێک بەخەبەرهاتم، زۆری نەمابوو ببێتە نیوەڕۆ.

ئەوان لە بەیانی زووەوە هەســتاون... چاوەڕوانی بە خەبەرهاتنی منن... لــە جێگا دێمە دەریّ و بــاوەش بەیەکتریدادەکەین...لە نێوانی هەردووکیاندا هەڵدەتروشکێم... دەستێکم دەکەمە ملی باوکم و دەستەکەی تریشم لە ملی دایکمدایە. ئەوان تەپڵی ســەرو ناوچاوان و ڕوومەت و لاملم ماچ دەکەن و منیش دەستەکانی هەردووکیان. ئەوان دەگرین و منیش لەگەڵیاندا... دەترسم لە ســڕینی فرمیســکەکانیان ببنەوەو پێم بڵێن"دە ڕۆڵە بەزەییەکت بە حاڵی ئێمەشدا بێتەوە و واز لەو پێشمەرگایەتییەی بێنە."

قەدەرێک بەدەم هەنسکدان و ڕۆندک[٩٤] ڕشتنەوە، بە بێدەنگی بەیەکتریدا هەڵدەڕوانیــن. هەســت بە ئازاری قورســی ویژدانیی خــۆم دەکەم. بەهۆی منەوە نەبا کوا ئەو هەموو ناڕەحەتیە زۆرەیان بەسەردەهات.

هەمووی چەند مانگێکە نەمدیون، کەچی سیمایان پێم دەڵێ لە ١٠ ساڵیش زیاترە... ئەوە یەکەمجارە شوێندەستی پیری بەسەر دەموچاویانەوە دەبینم. دەڵێــی ئەو درەختە گوڵکردوەی ســەرەتای بەهــارن و تەرزەیەکی لەناکاو نەک هەر لە گوڵ، لە گەڵاشی ڕووت کردونەتەوە.

یەکــەم جاربوو لە ژیانمدا، بەچــاوی بەزەییەوە بڕوانمە دایک و باوکم... دەبێــت چ لەو دۆخە ســەختربێت کە تــۆ تێیدا بەزەیت بەخۆشەویســترین کەســەکانی ناو ژیانی خۆتدا بێتەوە. باشبوو ئەوان ئەو درزانەیان نەدەدی کە کەوتبوونە باڵەخانەی بیروباوەڕمەوە، دەنا بۆ خۆیان و بۆ منیش زیاتر دەگریان.

بۆ چەند خولەکێک، نەمن هیچم بۆ وتراو نەئەوانیش. وشەکان، بەر لەوەی لە قوڕگم بێنە دەرەوە، دەبوونەوە بە چەند پیتێکی پچڕپچڕ... بەهەزار حاڵ توانیم بڵێم:

توخــوا بمبــورن... بمبوورە بابە گیــان بمبوورە... بمبــوورە دایە گیان مببوورە.

---

٩٤ - ڕۆندک: فرمێسک، ئەشک، ئەسرین.

باوکم ئازایەتی وەبەر خۆیدەنێ و بەزەحمەتێکی زۆرەوە دەڵێ:

ـ تازە ئەوەی چوو چوو.

ماڵــی باوکــم ئاوابێ، بەو چەند وشــەکەمەی لە ڕموزنــی[95] ئەو داوایەم ڕزگاردەکات کە لە بیستنی دەترسام.

ـ ئەی ئێستا بەتەمای چین؟

ـ بەتەمای چ بین... دەبێ خۆمان لەگەڵ ئەو وەزعەیدا ڕابێنین. دەڕۆینەوەو هەتا مودەتێکی دەچینە شوێنێکیدی... یەک دوو مانگان خۆمان لە بەرچاوی حکومەتی بزردەکەین، هەتا ئەو دەمیش خوا کەریمە.

دایکم بۆ پاڵپشتی قسەکانی باوکم دەڵێت:

خوا لە سوڵتان مەحمودی گەورەترە.

بەنۆرە باوەش بە هەردووکیاندا دەکەم. بۆ دەربڕینی سوپاســگوزاریی و پیزانینی خۆم، چەند جارێک و لەســەریەک، دەستەکانیان ماچ دەکەم و وەک سەردەمی منداڵیشم، سەرم دەخەمە سەر ڕانی دایکم، دەستی باوکم دەخەمە سەر سنگم و چاوەکانم دەنوقێنم. هەتا خۆم پێڵووەکانم لێکنەکردنەوە، ئەوان بەخەبەریان نەهێنام.

ـ دەمێک بوو پێویستیم بە خەوێکی ئاوا خۆش و ئارام بوو.

ـ دیاربوو زۆر ماندووی ڕێیە بووی... دەترسام لە پرخەی خۆت بەخەبەر بێی.

نانی نیوەڕۆ دەخۆین و ئەوان ئامادەی گەڕانەوەن. لەگەڵ کوڵی گریانێکی بەخوڕدا، هەردووکیان توند توند باوەشم پێدادەکەن و ڕێژنە بارانێک ماچم بەسەردا دەبارێنن... لەگەڵ نزای سەلامەتیدا، ماڵئاوایی لە من و لە ماڵی مام حەمەدیش دەکەن.

ئەوان دەڕۆن و منیش دەبێ تا تاریک و ڕوونی سبەینێ چاوەڕێبم .

ئــەو ژوورەی جێیــان بۆ تێدا ڕاخســتم، هەمان ژووربوو کە ١٧ ســاڵ لەوەوبەر، من و باوکم، لە هاتنێکماندا بۆ ماڵی مام حەمەد، لەسەربانەکەیدا خەوتین.

---

٩٥ـ ڕموزن: مێردەزمە، دێوەزمە، کابووس.

ئاسمان شـینێکی تاریک تاریک... ئەستێرەکان دەڵێی ملیۆنان چلچران و ڕۆشنایی دەتکێننە ناو دیدەمەوە.

لەپڕ ئەستێرەکەی خۆم دەدۆزمەوە.

- ئەها بابە، ئەوە ئەستێرەکەی منە.

- ئەستێرەیەکی چەند گەش و جوانت هەیە.

- ئەدی بابە ئەستێرەکەی من بۆ لێرەیە؟!

- ئاخـر هەر کەسـەو ئەسـتێرەی خۆی هەیـە... ئەو کەسـە بچێتە هەر جێیەک، ئەستێرەکەشی لەگەڵیدا دەچێ...

ئەو شـەوە، تا خەو بردمیەوە، من هەر تەماشـای ئەسـتێرەکەی خۆمم کردو، ئەویش تا بەیانی خوناوەی[٩٦] ورشەی بەسەردا باراندم.

---

٩٦- خوناوە: بارانی زۆر ورد.

## ٢٩

خۆر هێشــتا قەڵاتووکانی هەتاو پرژێن نەکردبوو کە گەیشــتمە بەردەم کۆڵیتەکەی مام ئەولا. تاقە ژووریکی لە قوڕوبەرد دروووســتکراو، بەڵام لەو چۆڵەوانیەدا خۆشیی کۆشکێکت دەداتێ.

دوو ساڵ دواتر هەمان کۆڵێت، بووبە کۆشکی خەونە پەمەییەکانی دکتۆر خــدر. ئــەو، وەک خۆی دەیــووت، ئەگەر خوا ژنێکی بە نســیبکات، دەیکاتە هێلانەی مانگی هەنگوینی خۆی.

خــدر، ســاڵێک دوای بەرپابوونەوەی شــۆڕش، لەگەڵ چەند پۆلیســێکی تــری پۆلیســخانەی سەنگەســەردا، بەخۆیان و چەکەکانیانــەوە، پەیوەندی بە شۆڕشــەوە دەکەن... دواتر بەشــداری خولێکی ســێ ڕۆژیی برینپێچیو دەرزی لێــدان دەکا، ئیــدی لەوێ بــەدواوە دەبێتە دکتۆر خــدر. ئەوکاتەش قەڵاتووکان بووبە مەڵبەندی بارەگاکانی هەرێمی (٨)، ئەو ســەرپەرشــتیاری بــارەگای کەرتەکــەی (بەکر پیرۆت) بوو. ئەوەندە حەزی لە ژن هێنان بوو، دانیشتنی ناو بارەگا نەبوو، یەک لە بابەتەکانی قسە لەسەرکردن، مەسەلەی ژنهێنان و نەهێنانەکەی دکتۆر خدر نەبێ.

"ترســی زۆر گــەورەی مــن ئەوەیــە، بەرلــەوەی جووتێــک قــاپ قاپ، لەبەردەمــی ژوورەکەی خۆمدا ببینم، لە شــەڕێکدا بکوژرێم... ئای خودایە، دەبێ هیچ مۆسیقایەک ئەوەندەی دەنگی قاپ قاپی پێی ژن بەچێژبێ... وەرە ســی تێپەڕێنی و هێشــتا ژنێکت لە باوەش نەگرتبێ... خودایە، دوای ماچی ژنێک، بمبەرەوە بۆ لای خۆت و باکم نیە... ئەمن ئەوەی حســابی بۆ ناکەم مردنە، بەڵام دەترسم خوا بمباتەوە بۆ لای خۆی و پێم بڵێ:

هەتیــو خلــە، من لەو دنیایەدا هەرچی هەســتی چێژوخۆشــی وەرگرتن بوون بەتۆم بەخشین، کەچی شتاقیانت[٩٧] بەکار نەهێنا.

"بــە خودای بــەدووری مەزانــن، ســزای بەکارنەهێنانی ئەو هەســتانە، لەسزای نوێژ نەکردنیش گرانتربێ."

سەرینەکەی لەبن ئەم ئانیشکیەوە، بۆ بن ئەو انیشکەی دەگۆڕێ... بزەیەک

٩٧- شتاقیان: هیچیان.

دەکەوێتە سەرلێوی... بەتۆنێکی ئارامەوە، درێژە بە باسەکەی دەدا:

"ئـای لەو ڕۆژەی ژنێکم بەسەرپشـتی هێسـتریکەوە بـۆ دەگاتە ئێرە... نایەڵـم دابەزێ، دەچم ژوورەکەی لە مام ئەوڵای دەخوازم... کوڕە ژووری چی! بڵێ قەسـری خلـەی... ئەڵقەرێزی دەربەکەی هەڵدەکێشـم و لە دیوی ناوێـڕا دایدەکوتمەوە و قوفڵێکی گەورەی لێدەدەم... بۆ یەک مانگی ڕەبەق، بۆ سەراوێ نەبێ، نایەمە دەرێ."

کە گەیشتمە بەردەم کۆڵیتەکەی مام ئەولا، دەرگاکەی قوفڵێکی گەورەی پێوەبـوو... ئەو لەوێ با، ئەو نـان و پەنیرەی لە زوورکانەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم، لەسەر شەکیلەکەی[٩٨] ئەو، پێکەوە دەمانخوارد.

بەر لەوەی ڕاگواسـتن دەسـت پێبکات، ئەو بنارە، لـە قەڵاتووکانەوە تا دەگەیشتیەوە زەڵێ، هەر هەمووی ئاوەدانی بوو... ئێستا لە جێی ئەو هەموو دێیانە، چەند کەرتێکی پێشمەرگە، هەریەکەو چەند کەلاوەیەکی دێیەکیان بۆ خۆیان کردۆتە بارەگا. ئەگەر لێرەوە تەماشای شۆڕش کەی، وادەزانی تازە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلولە.

ئـەوە بارەگای کوێخا محەمەدی مەلا شـەریف... بەولاتـرەوە بارەگای کوێخا حەسـەن و... بارەگای کوێخا قادر و بارەگای کوێخا عەلی و.... دوا بارەگاش، بارەگای کوێخا حەمەدەمینی ڕەزگەیە.

لای هەریـەک لـەو بارەگایانە لادەدەم، گلەیـی و ناڕەزایی خۆی هەیە... گلەیـی نەبوونی چـەک و تەقەمەنی و بەسـەرنەکردنەوە... ئەوان گلەیی و داواکاریەکانیان لە مام جەلال و سەرکردایەتی بە من دەڵێن و منیش بەڵێن دەدەم بیانگەیەنمە جێی خۆی.

کوێخـا حەمەدەمیـن کە دەزانـێ تازە لای ئـەو میوانی شـەو دەبم، لە دەربڕینـی گلەیـی و داخوازییەکانیـا پەلەناکا... وەختێکیـش، بەدرەنگەوەو دوای نانی ئێوارە، دێتە سەرباسی خۆی، بەشەوقەوە گوێی بۆ ڕادەدێرم:

"ئەمن بەگەنجیش هەر سەرکێشبووم. جارێ ژنم نەهێنابوو... کوڕە ژنی چی، خۆ ئەمن مووم لێنەهاتبوون... لەبەینی مەنگوڕان و مامەشان، سەورەک قەڵما(شۆڕشـێک قەوما) ئەوسـەری دیارنەبـوو... ئەمن لەو سـەورەیەیدا

---

٩٨ـ شەکیلە: هەمانەی خۆشکراو کەوەک سفرە بۆ نان لەسەر خواردن، یان بۆ بە سەردادانی نانی ڕشێنراو بەکاردێت.

بەشـداربووم و پریشـکە گوللەیەکیش بەر بەلەکی[٩٩] ڕاسـتم کـەوت... لەو سەورەیدا ناوم پەیداکرد... لە هەردووک هەڵلایانیشدا، هەڵلای مەلامستەفای و هەڵلای مام جەلالیش، بەتفەنگ و چەکداری خۆمەوە بەشداربووم، کەچی کەسەکیش حسابەکن بۆ ناکا."

ئەگـەر کوێخا حەمەدەمین ڕۆشـنبیربا، دەمگـووت لەبەرئەوەی دەزانێ جولانەوەیـەک فکـر و بەرنامەی نەبێ، نابێتە شـۆڕش، بۆیە بە شۆڕشـی ناونابا و بە هەڵلای ناو دەبا.

چەنـد ڕۆژێک دوای گەڕانەوەم، بەمەبەسـتی گەیاندنـی داخوازییەکانی ئـەو برادەرانە، سـەری مـام جەلالمـدا... بارەگاکەی بەکر پیرۆت لەسـەر ڕێگام بوو... هەر بۆ هەواڵ پرسـینێک لامدایـە لایان، بەکر پیرۆت، یەک لە ئامرکەرتەکانـی هەرێمـی پارێزگاری بوو، کوێخـا حەمەدەمین گوتەنی، لە هەردووک هەڵلایانیشـدا بەشـداربوو. ئەندامی کۆمەڵە و زۆریش دڵسۆزی مام جەلال بوو. پیاوێکی ڕاست و ڕەوان، لە هەرجێیەک و لەگەڵ هەرکەسێکدا با، ئەوەی لە دڵیدابا، دەهاتە سەردەمی. لە سێیەم شەوی گەیشتنە ناوچەی سـەکردایەتیمدا، لە بارەگاکەی ئەو مامـەوە... ژوورێکی چکۆلەی بەکەڵەکە بـەرد هەڵچنـراو... ئەوەنـدە کەلێن و کونی تێدابوون، هەر پشـووە بایەکی هاتبـا، دەتگوت چەند کەسـێک پێکـەوە، بلوێر دەژەنن.. سـاپیتەکەی هێندە نەوی بوو، ئەگەر لە هەسـتاندا تەواوێک خۆت نەچەماندبایەوە، سـەرت لە دارە ڕایەکانی دەدا.

کـە بە بەکرم ووت، بۆ گەیاندنی گلەیـی و داخوازێکانی ئەو کوێخایانە، سـەرێکی مـام جـەلال دەدەم، ووتـی "ئەمنیـش دێـم... بزانـم تـا پڕەکی پێناکرم."

لەو ڕۆژگارەدا، چوونە لای مام جەلال زۆر ئاسـان بوو، بەتایبەتیش بۆ خەڵکانـی وەک ئێمە... ئەوەندەت بەس بوو، لە ڕێی پاسـەوانی بەردەرگای ماڵەکەیەوە، لە هاتنی خۆتی ئاگادارکەیتەوە.

وەختێک من لە خستەڕووی ڕاسپاردەکانی ئەوان تەواوبووم، ڕوویکردە بەکر:

- ئـەرێ بەکر خۆ ئەتوش خەڵکی ئەو بنارەی، ڕۆژێک حەیوانە کێویەکت بـۆ نەهێنـام... ئەوە کوێخـا حەمەدەمیـن، هەفتەی پێشـوو، دوو حەیوانی

٩٩ـ بەلەک: پوز، نێوان ئەژنۆو گوێزینگی پێ.

بـۆ ناردم... مانگی پێشـووش، کوێخا قادر، گۆشـت و پەنیرێکی زۆری بۆ ناردم.

بەکر، لە خوای دەویست، مام جەلال داوایەکی ئاوای ئاراستەکات:

- ئاخر مامە خۆ ئەوانە لەبەر ڕاوێ ئاگایان لە پێشـمەرگایەتی نیە. ئینجا بـۆ خۆشـت دەزانـی ڕاو بەتاپڕێ دەکرێ. ئـەوان هەر هەموویـان تاپڕی زۆرچاکیان هەیە... تاپڕێکی باشـم بۆ بکڕە، وەعدت دەدەمێ، بێ گۆشـتت نەکەم.

- تاپڕ بە چەندیە؟

- تاپڕکەوتووە، لە بیست دیناریەوە هەیە هەتا سەدو زیاتریش.

- باشە ٢٠ دینارت دەدەمێ... تاپڕەکی پێبکڕە.

- تاپڕێک ٢٠ دیناری پێبدەی، وەڵلا چۆلەکەشی پێ ناکوژرێ.

- ئەدی تاپڕێک حەیوانە کێوی پێ بکوژی بە چەندەیە؟

- تاپڕی باش لە ٨٠ دیناری کەمتر نیە.

مام جەلال و بەکر پیرۆت کەوتنە مامڵە... مام جەلال هەندێک هەڵکشا و بەکریش کەمێک داکشا... دواجار لەسەر ٦٠ دینار ڕێکەوتن.

مام جەلال هەر بەسروشـت، لە مەسەلەی پارەدا گیرنەبوو، بەڵام ئەگەر بەرلـە چوونی ئێمـە، هەواڵی بـە بارمتەگرتنی ژمارەیەک بیانـی، ئەوەندە دڵخۆشـیان نەکردبـا، ڕەنگە شەسـت دینـاری بۆ کڕینی تاپڕێـک بە زۆر زانیبا.

شەسـت دینارەکەی لە مام جـەلال وەرگرت و بەرەو خـڕی نێوزەنگ، خوا حافیزیمان لە مام جەلال کرد. خڕی نێوزەنگ وەک فرۆشگای شۆڕش وابوو، ژمارەیەک دووکانی لێبوو... بەشی زۆری زەخیرە و پێداویستیەکانی پێشـمەرگە، لەو دووکانانەدا دەستدەکەوت. بەو دواییانەش کەبابخانەیەکی لێکرابۆوە... خۆمان بە کەبابخانەکەدا کرد... من نەفەرێک و ئەویش دوونەفەر کەبابـی داواکـرد. دوانـزە پێشـمەرگەی تریش لـەوێ نانیان دەخـوارد... کەهەستاین، بەکر پارەی خۆمان و هەر دوانزە پێشمەرگەکەشیدا... وابزانم کردیە ٢٨ (بیستو هەشت دینار).

هەرچەنــدە دڵنیابووم، مام جەلال نەبەتەمــای ئەوەبوو بەکر بەو پارەیە تاپڕبکڕێ، نەچاوەڕێی حەیوانە کێویشــی لەو دەکرد، بەڵام هەر بۆ خۆشی پێم ووت:

- تۆپارەت بۆ تاپڕکڕین لە مام جەلال وەرگرت، کەچی هەر لە ئێســتاوە، نزیکی نیوەیت سەرفکرد.

- گۆشت هەر گۆشتە... قەت حازری بە قەرزیمەدە.

- بــەڵام تــۆ بەڵێنــت پێــدا بــەو پارەیــە تاپــڕ دەکــڕی... ئــەوە نابێتــە کڵاوکردنەسەر.

- ئــەو، ســەد کڵاوی کردۆتە ســەری ئێمــە، خۆ دنیــا کاول نابێ، ئەگەر ئەمنیش جارەکی کڵاوێکی بکەمە سەر.

## ٣٠

"با ڕفاندنی بەرپرسـانی بەعس و کەسـانی یەکەمی ناوخێزانەکانیشان، بکەینە یەک لە شـێوازەکانی خەباتمـان... هەر هیچ نەبێ لەگەڵ گیراوەکانی خۆماندا، گۆڕینەوەیان پێدەکەین."

ئەوە پێشنیاری خالد گەرمیانی بوو کە بۆ دوایین جار لە تەنگسەر بینیم... حەوت مانگێک دواتر، هەر لەسـەر ئەو پێشـنیارەی خۆی، کوڕی قایمقامی کفـری ڕفاند. هەفتەیەک دواتر، بەدوان لـە گیراوانی خۆمانی گۆڕییەوە کە هەردووکیان ئەندامی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشاری کفری بوون.

ڕەنگـە هـەر ئەنجامی سـەرکەوتووانەی ئـەو چالاکیـەو کاریگەرێتیی شـێوازی خەباتـی فەلەسـتینیەکان، لەسـەر بیرکردنەوەی سـەرکردایەتی یەکێتـی، مەکتەبی سیاسـی گەیاندەبێتە بڕیاری ڕفانـدن و بەبارمتەگرتن... مەکتەبی سیاسـی، لـە کۆبونەوەیەکی ئاسـایی خۆیدا، لە کۆتایی نیسـانی ١٩٨٠دا، بڕیـاری ڕفانـدن و بەبارمتەگرتنی ئەو بیانیانەیـدا کە لە کۆمەڵێ پـرۆژەی جیاجیـادا، لە عێراق کاریان دەکرد... ئـەوەش بەو هیوایەی چەند ئامانجێک لەو بڕیارەدا بەدەست بێنن:

* بـۆ ئـەوەی دەنگدانەوەیەکـی جیهانیـی لێبکەوێتـەوە و لـەو ڕێیەشەوە، "شۆڕشـی نوێـی کـورد، بـە حکومـەت و هاوولاتیانـی دنیـا بناسێنرێت".

* بۆ ڕاکێشـانی سـەرنج و سـۆزی وولاتانی دنیـا، بەرامبەر بەدۆخی عێراق و کوردستان.

* بـۆ ئاڵوگۆڕپێکردنیان لە بەرامبەر گیراوەکانی خۆمان، لە زیندانەکانی ڕژێمدا.

هـەر لەدوای دەرچوونی ئەو بڕیارەشـەوە، کۆمەڵێک چالاکی لە بواری بەبارمتەگرتنـدا ئەنجامـدران. لە کۆتایـی بەهاری ئەو سـاڵەدا، ژمارەیەک ئەندازیار و پسـپۆڕی ڕووسـی، بۆ ڕاوە ماسی، دێنە سەر چەمی(باسەڕە)ی قـەرەداغ... مامەڕیشـە، بە خـۆی و مەفرەزەکەیەوە دەچێتە سـەریان... هەر نۆیـان بەبارمتە دەگـرێ... هەواڵەکە ، بەخۆشـیەکی زۆرەوە لەلایەن

سەرکردایەتەوە وەرگیرا... ئومێدی زۆری لێدەکرا، وێڕای سەپاندنی هەندێک مەرج بەسەر حکومەتی بەعسدا، دەنگدانەوەیەکی جیهانییش بەدوای خۆیدا بێنێ.

بۆ ڕۆژی دوایی، حکومەت بە هێلیکۆپتەر و سەرباز و جاشێکی زۆرەوە، هێرشێکی بەربلاوی بۆ سەر ئەو ناوچەیە ئەنجامدا کە بەبارمتەگیراوەکانی لێبوون.

ئاکامەکەی بە بەرەلابوونی بارمتەکان و بە شەهیدبوونی چەند پێشمەرگەیەکیش کۆتاییهات... (گۆران) فەرماندەی ئازای کەرتێکی هەرێمی پێنجی قەرەداغ، یەک لەو شەهیدانەبوو...

لەکات و شوێنی جیاجیادا، ژمارەیەکی تری بیانی ڕفێنران... ڕفێنراوەکان هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەڵمانی و ژاپۆنی و فەڕەنسی و چیکی و یۆگۆسلاڤیو پۆلۆنیان تێدابوو... هەموو ئەو بەبارمتەگرتنانە، هیچ لەو ئامانجانەیان نەهێنانەدی کە مەکتەبی سیاسی یەکێتی چاوەڕێیان بوو. وورده وورده داخوازییەکانی شۆڕش، لە پێناوی بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەدا، بۆ داواکردنی پارەو هەندێ شتی تر بچووک بۆوە.

ژاپۆن و ئەڵمانیا، بۆ بەردانی بارمتەکانیان پارەیاندا. چیک و پۆلۆنیا، کامیراو هەندێ بابەتی تری لەو جۆرە. ڕووسەکان، ئامادەی پارەدانیش نەبوون.

سەیرەکە لەوەدابوو،هەموومان، بە مەکتەبی سیاسیشەوە، لە بێهودەیی ئەو شێوازە چالاکیانە گەیشتبووین، کەچی تا ماوەیەکی زۆر دەستبەرداری نەبوون.

خۆ ئەگەر نارەزایی ژمارەیەک لە بەرپرس و کادیرانی یەکێتی نەبووایە کە لە ئەوروپا دەژیان، ڕەنگە بەبارمتەگرتن وەک یەک لە شێوازەکانی خەبات هەر بەردەوام بوایە.

ئەوەی لەو بڕیارەدا جێی هەڵوێستەبوو، بەشی هەرە زۆری ئەوانەی لەدەرکردنیدا بەشداربوون، سالانێک لە ئەوروپا ژیابوون... دەبوایە بیانزانیبا، ڕفاندن و بە بارمتەگرتن، کارێکی نایاساییە و دەچێتە خانەی تیرۆرەوە... بە گوێرەی یاسای نێودەوڵەتیش، سزای قورسی بەدواوەیە. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، دەبوایە بیانزانیبا، کاری ڕفاندن و بەبارمتەگرتن، وێنای بزووتنەوەی کورد، لای خەڵکی ئەوروپا، ناشیرین دەکاو، وەک

بزووتنەوەیەکی تیرۆرستیانەی بە دنیا دەناسێنێ. لەوەش خراپتر، بەردانیان بە پارە و شــتی تر، دەچێتە خانەی کاری جەردەیی و چەتەگەرییەوە، نەک کاری شۆڕشگێڕانەی بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخواز و ڕەوا.

دەبوایــە مەکتەبی سیاســی، لە کاتی ئەو بڕیاردانــەدا، هەم ئەو خاڵانەی ســەرەوەیان لە بارچاو گرتباو، هەم زانیباشیان ئەوەی هەندێک ڕێکخراوی فەلەســتنی، لــە ســاڵانی هەفتاکانــدا پێی هەســتان، لە کاری ڕفانــدن و بە بارمتەگرتندا، بە خراپ لەســەر مەســەلەی فەلەســتین شــکایەوە و وێنای فەلەســتینیەکان و عەرەبیشــی، لە دیــدی دنیای مەدەنیدا، تەواو ناشــیرین کرد.

یەک لە کێشــەکانی ئێمە، هەر لەســەرەتاوە ئەوەبوو، زۆر بە مەسەلەی فەلەستین و بە ئەزموونی فەلەستینیەکان سەرسام بووین. هەر دروستکردنی یەکێتیی نیشــتیمانیی کوردستانیش بەو شێوە نیمچە بەرەیەی، کۆپیکردنی نیمچــە بەرەیی(ڕێکخــراوی ڕزگاریخــوازی فەلەســتینی) بــوو. بیرۆکــەی بەبارمتەگرتنیش، هەر بەرهەمی ئەو سەرسامیەی ئێمەبوو بەوان.

ڕاســتە ئێمە لــە ڕووی پەیوەنــدی دەرەکیــەوە زۆر لاوازبووین، بەڵام نەدەبوایــە بەبارمتەگرتن بژاردەیەک بێ، بــۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو خاڵە لاوازەمان.

# ٣١

زەڵی شـوێنی زسـتانەو، تووژەڵـەش هاوینەهەواری ئێمـە و زۆرینەی بارەگاکانـی دیکەش بوو... هەر کە نیسـان ڕەتدەبـوو، باروبنەمان دەبردە تووژەڵە... بەرلـەوەی ئۆکتۆبەریش کۆتایی بێ، دەگەڕاینەوە زەڵێ... ئەگەر ئەو تۆپبارانە دووڕۆژییە نەبوایە، بەرنامەی ئەو ساڵەشمان هەروادەبوو.

هێشـتا سـوورایی لـە ئاسـۆ نەبڕابوو، لەگـەڵ چەنـد برادەرێکـدا، لە گۆڕاییەکـەی[100] بەردەم بارەگا، لەسـەر مەسـەلەی بەبارمتەگرتنی بیانیان، خەریکی قسـەکردنبووین... بابەتەکە هێندە گەرمی داهێنابووین، ئاگامان لە هیـچ نەمابوو، هەتا بڵاچـەی[101] چەند چەخماخەیەک لەودیـوی مامەندەوە هەسـتان... هێندەی نەبرد، بڵاچەکان بوون بەگرمەگرم ... چەند چرکەیەکی کەمی تریش، لوورە و زرمە لەزەوی هەستانی گوللەتۆپەکان، هەر هەموومانی خزاندە پەنایەکەوە... چەند گوللە تۆپێک، بە ملاوئەولای بارەگاکەمان کەوتن، ئەوانی دیش سـەر یان کورتیـان کرد... بۆ بەیانیش، بەهەمان دەسـتوری دوێنێ، تۆپباران دەسـتپێکردەوە، بەڵام گوللەتۆپەکان دوورتر لە ئێمە بەر زەوی دەکەوتن. ئێمە ئەو کاتە نە کونە تەیارەمان هەبوو، نەشـوێنێکش بۆ خۆپارستن لە قەسفی تۆپ و تەیارە.

لە ڕۆژی سـێیەمدا، هەر لە دوای نانی بەیانیـەوە، باروبارگەمان بەرەو تووژەڵـە گواسـتەوە... دۆڵێکی دامێنی تووژەڵەمان کردە شـوێنی بارەگا... لە تەختاییەکی کەمێک ڕووتەنـدا، خێمەکانمان بەدەوری کەپرێکی گەورەدا هەڵدان.

لـە نیـوان بارەگاکەی ئێمـە و بارەگاکانی تردا، تەختایـەک بە ئەندازەی گۆرەپانێکـی فتبـۆڵ هەبوو... لـە دوانیوەڕۆی دووەم ڕۆژی گەیشـتنماندا، هەرچی پێشمەرگەی ئەو ناوە هەبوو، لەو گۆڕەپانەدا ئامادەبووین. هەموان چاوەڕێی گەیشتنی بەرپرسێکی بەدیلگیراوی بەعس بووین.

بەتاسـەیەکی زۆرەوە دەمانڕوانیە ئەو ئاقارەی عەدنانیان لێوە دەهێنا... عەدنان بەرپرسێکی بەعسیەو، چەند هەفتەیەک لەمەوبەر، لە دۆڵی خەلەکان،

---

١٠٠- گۆڕایی: تەختایی.

١٠١- بڵاچە: بلیسە.

له بۆسەیەکی پێشمەرگەدا گیراوە. ڕژێم ئامادە نیە، بە هیچکام لە گیراوەکانی ئێمەی بگۆڕیتەوە... هەر بۆیەش دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوە، بڕیاری(ئیعدامی شۆڕشگێڕانە)ی بۆ دەرچووە. ژمارەیەک لەو بەعسیانەی ئێمە بە بەعسی ڕەسەنیان ناودەبەین، لەوکاتەدا لە توژەڵەن. بەعسیەڕەسەنەکان، خۆیان بە باڵی چەپی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دەزانن. بارەگایەکی چکۆلەیان لە خڕی نێوزەنگە و بارەگای سەرەکیشیان لە شامە. جارجارە وەک چالاکیەکی گرنگی خۆیان، دژ بە ڕژێمی سەدام حوسەین، سەرێکی ناوچەکانی سەرکردایەتی یەکێتی دەدەن... ئەوان لەو فەرمانی کوشتنەی عەدنان زۆر نیگەرانن. تووڕەیی زۆری پێشمەرگە نەبوایە، لەو هەڵوێستەی ئەمان، دوورنەبوو فەرمانی ئیعدامکردنەکە هەڵوەشێتەوە. ئەمان، عەدنان بە ئەندامێک لە ئەندامەکانی حزبەکەی خۆیان دەزانن... نەک هەر ئەم، بەڵکو زۆرینەی هەرە زۆری ئەندامانی حیزبی بەعسیان، بەهی خۆیان دەزانی... ئەمان پێیانوابوو، جگە لە سەدام و دار و دەستەکەی، ئەوانی دی هەرهەموویان موڵکی ئایندەی خۆیانن...

لای پێشمەرگە، بەعس هەر بەعسە، چەپ و ڕاستیان تێدا نیە... هەر بۆ خۆشیش دەوترێ، بەعس وەکو کڵاشی دۆمییە، ڕاست و چەپی بۆنیە.

هەموومان بەتاسەیەکی زۆرەوە چاوەڕێین. لەپڕ هەموو سەرەکان بەرەو ئەولایە دەسووڕێن کە عەدنانی لێوە دەردەکەوێ... عەدنان بەهەمان جلی فەرمی بەعسیەکانی ناوشارەکانەوە و بە قۆڵی بەستراو و بەهەنگاوی قورس قورسەوە، دەگاتە ئەو پنتەی لەوێدا، دوای چەند خولەکێکی کەم، میلی کاتژمێری ژیانی ئەوی تیا جامدەبێت.

عەدنان لە دیدی ئێمەدا، وەک هەر بەعسیەکی تر، دڕندەیەکی خەتەرناکەو چەندیش زووتر لە کۆڵ خۆمانی کەینەوە درەنگە.. ئێمە عەدنانمان وەک مرۆڤ لە بیر نیە. بیری خۆمان بردۆتەوە کە ئەویش وەک ئێمە، دایک و باوک و خوشک و براو ڕەنگە ژن و منداڵیشی هەبێ... لە بیرخۆمان بردۆتەوە کە ئەویش وەک ئێمە، دوورنیە کەللەی سەری، هێلانەی دەیان چۆلەکەی خەیاڵ و خەونی ڕەنگاوڕەنگ نەبێ...

عەدنان، لەبەردەمی پێنج پێشمەرگەی ئەژنۆ لەزەوی چەقیوی پەنجە لەسەر پەلەپیتکە، وەک قەدی درەختێکی ووشکهەڵاتوو ڕاوەستاوە و ئێمەش بە چەند ڕیزێک، بەملاوئەولای پێشمەرگەکاندا وەستاوین.

« ئێستا دەڵێی چی... پەشیمان نیت لەوەی بەعسی بووی؟» فەرماندەکە

بەرلەوەی چاوی عەدنان ببەستێتەوە، پرسیاری لێدەکا..

نیگا غەمگینە لێڵەکانی عەدنان چون مەلێکی باڵشکاوی هاوسەنگیی لە دەستداو، هەر جارەی بەلایەکدا دەسوورِێ.

دەنگ لە بەردبێت لە عەدنان نایا. بێدەنگیی عەدنان، ئەوەندەی تر قەرەباڵغیەکە تووڕە دەکاو، ڕەوایی زیاتر بە (ئیعدامی شۆڕشگێرانە)ی خۆی دەدا.

"هیچ ڕاسپاردەیەکت بۆ کەسوکارت هەیە؟" فەرماندەکە، دوا پرسیاری لێدەکات. دیسان عەدنان، لەسەر بێدەنگیی خۆی بەردەوامە.

من نازانم، ئەو بێدەنگیەی عەدنان، لەبێ باکیەتی لە مردن، یان هەر لەگەڵ میل هێناوەی پێشمەرگەکاندا، جووڵە لە جەستەیدا نەماوە...

- یەک... دوو...

عەدنان لە چاوی ئێمەدا، چیتر مرۆڤ نەماوەو بۆتە نیشانەیەک لەو نیشانە بێ گیانانەی کە ڕاهێنانی نیشان ئەنگاوتنیان لەسەردەکرێ.

لەگەڵ وتنی(سێ)دا، کۆمەڵێک قەوان دەپەڕنە سەر زەوی و عەدنان بەدەمدا دەکەوێ...

تفەنگەکان بێدەنگ دەبن... غەڵبەغەڵبێک ئاورمان پێدەداتەوە... چوار پێشمەرگە تفەنگەکانیان کردۆتەوە شان و پێنجەم هێشتا ئەژنۆی لە زەوی جیانەبۆتەوە.

"کە تۆ ئەوەندە ترسنۆکیت، بۆ بوویت بە پێشمەرگە؟!"فەرماندەکە بە تووڕەییەکی زۆرەوە وای پێدەڵێ.

پێنجەم دەیەوێ شتێک بڵێ... بەڵام ووشەکانی ناو گەرووی، وەک فیشەکەکانی ناو مەخزەنی کلاشینکۆفەکەی لە جووڵە کەوتوون.

زۆری دەوێ تا سەرهەڵدەبڕێ و بەزەحمەتێکی زۆرەوە بڵێ:

- نەخێر ترسنۆک نیم، بەڵام...

- بەڵام چی؟ ئەگەر ترسنۆک نیت بۆ تەقەت لێ نەکرد؟!

- ویستم ... میلیشم هێنایەوەو... بەڵام ...

- ناکا بڵێی چروکی کرد!!

- نا... نا، واناڵێم... بەڵام نەمتوانی تەقەی لێبکەم..

- بڵێ ترسام و تەواو...

- نا نەترسام... بەڵام کەویستم پەنجەم لەپەلەپیتکە توندکەم... لەپڕ ڕووخساری ئەو بوو بە ڕووخساری براکەم... منیش نەمتوانی تەقە لە براکەی خۆم بکەم...

ئەم قسەیە، ئەوەندەی تر فەرماندەکە تووڕەدەکا!

- بەسە، بیبڕەوە... وەختی گوێگرتنمان لە فەلسەفەو قسەی قۆڕ نیە.

فەرماندەکە ڕوو دەکاتە یەک لە چوار پێشمەرگەکە:

«تفەنگەکەی لێوەرگرنەوە... ئیتر لە ئێستاوە پێشمەرگە نەما.»

دیمەنێکی زۆر تراژیدیە... من هەر بەسڕبوون سڕبووم. هیچ ناڵێم ... وەختی هیچ ووتن نیە.

ئەگەر بکرێ، باوەشێکی توند توندی پێدادەکەم و بە دەنگێکی بەرزیش دەڵێم:

"نەخێر ئەم ترسنۆک نیە... لە هەموومان ئازا و ئازادترە. گەر هەموومان توانیبامان بگەینە ئەو حاڵەتە ویژدانیە باڵایەی ئەم، ئیتر چیتر مرۆڤێک بیری لە کوشتنی مرۆڤێکی تر نەدەکردەوە."

# ٣٢

ئەگەر هەردوو رۆژان، دوای ئەو رووداوە، گەشـتی دەڤەری باڵەکایەتی و دۆڵی ئاکۆیەتیم نەکردبا، ڕەنگە دیمەنی ئەو کوشتنە، تا مودەتێکی زۆر بەرۆکی خەیاڵی بەرنەدابام.

نامـەی ناوەندی کۆمەڵە، بۆ هەریەک لـە هەرێمەکانی حەوت و چواردە وەردەگرم وبەمەبەسـتی جیاکردنەوەی ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە، لەو دوو هەرێمەدا، دەکەومە گەڵ ئەو هێزەی بەرەو ئەوێ دەڕۆن.

لـە دوانیـوەڕۆی دوایین ڕۆژی هاوینـدا بەڕێ کەوتین. ئـەو ڕێبڕینەی کەوتـە ڕۆژەوە، ئارەقـەی زۆری پێدەرداین، دەنا ئەوەی کەوتە شـەوەوە، ئەوەندەی ماندوو نەکردین. ئەو ڕێگایەی لە شـەوانی هاویندا دەیبڕێ، دوو ئەوەندەی ئەو ڕێگایە دەبێ کە لە شەوانی زستاندا دەیبڕی. زستانان ئاسمان سـایەقەش بێ، ئەسـتێرەکان ئەوەنـدە بەتین نین ڕێـی بەردەمت ڕووناک کەنەوە... قوڕوچڵپاویش لەولاوە بوەستێ.

کـە گەیشـتینە بـن دارتووەکانی سـەرکانیاوەکەی (ئاشـی پشـکاوێ)، بەشـی زۆری شـەومان بڕیبوو... لەوێ بەدواوە ترسی کەمین و ڕەبیەمان نەدەما... دەمانتوانی بۆ چەند سەعاتێک بە ئیسراحەت بخەوین. ئەو کاتەش بەخەبەرهاتم، هەتاو، خەریکی داماڵینی تەنکە تەمی سەر سنگی قەندیل بوو. تاتە بەردە بەشەونمی شەو تەڕبووەکان، وەک ئاوینەی بەر باخەڵی کچانی جارانی لادێ، لەدوورەوەڕا دەبریسـکانەوە. نان و چای بەیانی دەخۆین و ملی ئەو باریکە ڕێیە دەگرین کە تا ناو پەڵە بەفرەکانی قەندیل ڕاماننناگرێ.

بەشـێکی زۆری ڕێگاکەمـان بـە قەندیلـدا تێدەپـەڕێ... قەندیـل لە هیچ شاخێکی دیکەی ئەم وولاتە ناچێ... هەر هەورازەو ڕادەستی هەورازێکیترت دەکا... خەریکـە بگەینـە ترۆپکی هەورازو هەورازێکی کە سـەر دەردێنێ... پێشمەرگەیەکی خەڵکی بناری قەندیلمان لەگەڵدایە، دەڵێ"ئەوەندەی خۆشی لـە بەهـەوراز سـەرکەوتندا هەیە، ئەوەندە لەگەیشـتنە ترۆپکەکەیـدا نیە... حیکمەتەکەشـی لەوەیدایە، هەتا خەریکی پێهەڵگەڕانی، دنیایەک دڵت بەوەی خۆشە، هەر ئەوەندە گەیشتیە سەرێ، ئیدی هەوراز تەواودەبێ و بۆ خۆت ئیسـراحەت دەکەی... بەڵام کە دەگەیە سـەری سـەرێش، سەر وەدەرنانی

هەورازێکی تر ئەژنۆت دەشکێنێ."

نازانم کێ بوو دەیگوت، "ژیانیش وەک هەورازەکانی قەندیل وایە... ئامانجێک بۆخۆت دادەنێی، وادەزانی کە بەو ئامانجەی گەیشتی، ئیدی دنیات بۆ تەخت دەبێ... بەو ئامانجەی دەگەیی و ئامانجێکی کە لەبەردەمتدا قوت دەبێتەوە... ئەوەندە خەریکی بەدیهێنانی ئامانجەکانت دەبی، وەختێک دەزانی کاتێکی وات بۆ ژیانی خۆت بەدەستەوە نەماوە."

هەر ئەوەندە پەڵەڕێواسێکمان لێدەرکەوت، ماندووبوون و هەوراز بڕینمان لە بیرچۆوە. هەتا زیاتریش هەڵدەکشاین، جوزەرە ڕێواسی زیاتر و ناسکتر لە ناو بەفری لاپاڵاندا سەریان دەردەهێنا.

ڕێواس، لە ئاینی زەردەشتیدا پیرۆزییەکی تایبەتی هەیە. هەندێ سەرچاوەی زەردەشتی، ئەسڵی مرۆڤ بۆ ڕێواس دەگێڕنەوە... دەڵێن گوایە لەسەرەتای ئەفراندندا، بە فەرمانی خوا(ئاهورامازدا) جوزەرە ڕێواسەکان، لە ژێر بارستایی بەفرەوە سەریان دەرهێناوە، باڵایان کردووە و لێکئاڵاون... لە کۆتایشدا وردە وردە ڕوخساریان گۆڕاوەو شێوەی مرۆڤیان وەرگرتووە... نێرەکانیان(مەشیە) سروشت و ڕووخساری پیاویان داوە بە خۆیان و مێیەکانیش(مەشیانە) سروشت و ڕووخساری ژن.

نازانم ئەو چیرۆکە چەند لە ڕاستیەوە دوورە یا نزیک، بەڵام بۆ من، زۆر لە چیرۆکی ئادەم و حەوا ناسکتر و ئەفسووناوی ترە...

ئەو تەنکە سوراوەی، هەزاران گۆپکەی سپی و پەمەیی ڕێواسان خستوویانەتە سەر ڕوومەتە سفتەکانی بەفر، چ دیمەنێکی دڵڕفێنیان خولقاندووە.

نە لە بینین و نە لە خواردنی ڕێواسان تێر نابین، بەڵام بەر لەوەی درەنگ دابێ، دەبێ بڕۆین. بزنە ڕێیەکی کاژێر و نیویی، هەتا ناو کاولەکانی (چۆمە)ی نەوەستاندین. جگە لە هەندێ لادیواری لەبەرد درووستکراو، شتێکی تر لە پاشماوەی ئەو دێیە نەماوەتەوە... کەچی دارودرەختەکان هێشتا بە پێوەن و هەر سەوزن... ئاخر ئەو هەموو زنە و کانیاوە، لێناگەڕێن تاکە درەختێکیش لە تینواندا ڕەق هەڵێ.

پێش ئەوەی بەرەو بارەگای کەرتەکەی برایمی حاجی کوێخا هەڵکشێین، بۆ کورتە پشوویەک، بەسەر قەراغی چۆمەکەدا بڵاوبووینەوە. خودایە چ ئاوێکی ساف و ڕوونە... هێندە ڕوونە، دانە دانەی زیخ و چەوی ژێری

ژێـرەوەی دەبینی...ئـەم ڕووبارە ملیۆنەها سـاڵە لێـرەوە ڕەتدەبێ، کەچی تۆزقاڵـە بەڵغێک چیە نایبینی... هێندە ڕوونە، کچان دەتوانن قژیانی لەبەردا داهێنن... ئەو خوڕیەی چەند شەقاوێک لەسەرووی ئێمەوە هەیەتی، تا دەگاتە بەردەمی ئێمە نامێنێ... دەڵێی بۆ لە ئامێزگرتنی ئەو گوززە تێشـکانە ئارام بۆتەوە کە لەبەینی قەدی سـوورەچنارەکانەوە، خۆیـان هەڵدەدەنە ناوی... ئەوەی لە هەمووی زیاتر من مەسـت دەکات، مۆسـیقای وردە شـەپۆل و، نەرمە سـەمای ئەو تیشـکە هەڵگەڕاوانەی ناو ئاوەکەن کە لەسـەر ڕووی ژێرەوەی گەڵای پانی سوورە چنارەکاندا درووستی دەکەن.

مـن لە ناو ئەو دیمەنە ئەفسـووناویەدا ڕۆچـووم و برادەرێکمان بانگم دەکات:

« تـا لەوە درەنگتر نەبووە، هەسـتە بڕۆین... بـرادەران چاوڕێن لەگەڵ ئێمەدا نانی ئێوارەیان بخۆن.»

نانی ئێوارەمان، نان و پەنیری مەیرەو هەنگوینی بناری قەندیلە... نازانم کاری برسیەتی من بوو یان هەر بەڕاستی هەنگوینەکە ئەوەندە خۆشبوو... بۆنەکەی بەر لەتامەکەی مەستی کردم.

"ئـەو هەنگوینەی لەو بنارەی بەرهەم دێ، لە هەنگوینی هەموو جێیەکی دیکـە جودایە، هـەم ڕەنگی و هەم تام و بۆنیشـی. ئینجا بۆن چۆن خۆش نابێ، هەنگوینێک لە گوڵە کێویەکانی قەندیلی سازبێ، هەر دەبێ بۆنی ئاوا خـۆش بێ. ئاخر هەنگ هەڵاڵەی چ گوڵێکـی بچینێتەوە، هەنگوینەکەی بۆنی ئەو گوڵەی لێ دێ."

ئەوە قسـەی ئەو پێشـمەرگەیەبوو کە سـێ ڕۆژ بەر لە گەیشتنی ئێمە، تەشتێک هەنگوینی سپی لە قەدی دار بەڕوویەکی بەعومر دەرهێنابوو....

ئـەو پێشـمەرگەیە، ناوی سـمایل بـوو، پێشـمەرگەکانی کەرتەکەی بە (هاوڕێ سـمکۆ) بانگیان دەکرد... هاوڕێ سمکۆ، بەتەمەنترین پێشمەرگەی کۆمەڵەبـوو کـە من تا ئەوکاتە بینیبووم... زۆریش بەتەمەن نەبوو، هەر ٤٥ ساڵێک دەبوو یان نەدەبوو.

دووساڵ لەوەوبەر، لەگەڵ هەموو خەڵکی دێیەکەی خۆیاندا، لە ئۆردوگای زۆرەملێی چوارقورنەیان قایمکردبوون...

"خودایە ئەمن ئەو ئۆردوگایەم چەند پێ ناخۆش بوو، بەخودای بۆ من وەک

زیندانی وابوو... خۆ ساڵێکیکەی لێمابامەوە، دڵم دەتەقی... باوەڕدەکەن هەموو ڕۆژەکی، سبەینان و ئێوارانیش، دەچوومە سەربانی و لەسەر باگردێنەکەی، بەرامبەر بە قەندیلی دادەنیشتم... لەشم لە ئۆردوگای و ڕوحیشم لە قەندیلی بوو. ڕۆژەکی بەخۆمم گوت: سمکۆ، بەقەد ئەو حەیوان و باڵندانەشت پێناکرێ، بیـان بەنـە هەرجێیەکی، هێندە نابا دەگەڕێنەوە جێی خۆیـان... لەوەی زیاتر لەوێ مابامەوە دەمردم... سـوڵتان بەو سوڵتانیەی خۆی، لەسەر تەختەکەی لایەن، لە حەیبەتان[102] دەمرێ... ئەدی شای ئێرانێ بۆ مرد... ئەویشیان لەسەر کورسی لانەبردبا، وازوو نەدەمرد."

سـمایل لـەوە زیاتـر بەرگەی ژیانی نـاو ئۆردوگا ناگـرێ... ژن و دوو منداڵەکەی بەسەر باوک و دایکیدا جێدێڵی و دەبێتە پێشمەرگە....

لـەو دوو ڕۆژەی لەگـەڵ ئەواندا مامەوە، هەموو کارەکانی ڕێکخسـتنم لـەو کەرتەدا تەواو کرد و بۆ ڕێکخسـتنی کەرتەکانی دیکەی هەرێمەکەش، دەبوایـە قادر خەبات ببینـم. بۆ بینینی قادر خەباتیـش باریکەڕێیەکی نیوە کوێرەوەبـوو، هەتـا ناو گوندی(خەزێنە)ی شـوێن بارەگای قـادر خەباتی ڕانەوەستاندین.

---

١٠٢ـ لەحەیبەتان: لەداخان، لەمەراقان.

## ٣٣

سێ هەفتەیەک لە سنوری هەرێمی حەوتدا مامەوە. سنوری ئەو هەرێمە، هەموو دۆڵی باڵەیان، باڵەکایەتی، ناوچەی حاجی هۆمەران، چۆمان، گەلاڵە، وەرتێ و تا دۆڵی ئاکۆیان و ڕەواندزیشی دەگرتەوە. لەو سێ هەفتەیەدا، چوومە زۆرینەی ئەو شوێنانە... هەموو کەرتەکانم بەسەرکردنەوە، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەشم لەوانەی یەکێتی جیاکردنەوە... فەرماندەی هەرێم و ژمارەیەک لەو پێشمەرگانەی لێدەرکەی کە لەگەڵ ئەودا هاتبوونە هەرێمەکە، ئەوانی دی هەر هەموویان کۆمەڵە بوون... هاوکاری و کۆمەکی قادر خەبات نەبا، کارەکانم بەو ئاسانیە بۆ ئەنجام نەدەدران.

قادر خەبات، ئەو کاتە جێگری فەرماندەی هەرێم و خەڵکی گوندی (خەزێنە)ی دۆڵی باڵەیان بوو. پیاوێکی ڕەشتاڵە و لە بالادا کورت... هەتا بڵێی چالاک و گورج و گۆڵ و ئازا... کۆمەڵەیەکی زۆر بیروباوەڕ قایم و هۆشیار... نموونەی ئەو جوتیارە شۆڕشگێڕەی، کۆمەڵە وێنەی لە زیهنماندا کێشابوو... بەسیما و دامەزراوەیی جەستە و سمێڵە پڕ و چاوە زیتەکانی، لە پڵنگێکی چیایی دەچوو..

قادر خەبات، تاکە پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە بوو کە لە ئاشبەتاڵیشدا، ئاشبەتاڵی نەکردبوو.. کە شۆڕشی نوێش دەستی پێکردەوە، ئەم لە ڕیزی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدابوو... ئەو کاتەش بنکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە (دۆڵە نێ و دەراوی گورگان)ی قەندیل بوون، بەشێکی زۆری ئازووقە و تەقەمەنیش لە ڕێی قادر خەباتەوە دابین دەکران. قادر خەبات، لەگەڵ خەڵک و ئەوانەی خوارخۆیدا، پیاوێکی هەتا بڵێی سادە و بێ فیز، لەگەڵ ئەوانەی سەرووی خۆشیدا، بەدەمار[١٠٣] و خۆی لە کەسیان بە کەمتر نەدەزانی.

جارێکیان لەسەر مەسەلەیەک، لەگەڵ مام جەلالدا لێک هەڵدەبەزنەوە... مام جەلال بە هەڵچوونەوە پێی دەڵێ:

- دەڵێی نازانی لەگەڵ کێدا قسان دەکەی!

---

١٠٣- بەدەمار: بەغیرەت، شەهم.

- بەڵێ دەزانم، جەنابت مام جەلالی و ئەمنیش قادر خەباتم.

بەر لەوەی بەرەو ناوچەکانی هەرێمی (١٤) بڕۆم، دەبوایە جەولەیەکی لای گەلاڵەو حاجی هۆمەرانیشمان کردبا.

بەرنامەوابوو، لەگەڵ قادر خەبات و برایمی حاجی کوێخا و پێشمەرگەی دەستەکانیان، یەک دوو کاژێریک لە قەسرێ لادەین و لەوێشەوە، هەرهەمان شەو بەرەو سەرەوە هەڵکشێین.

دەوری قەسرێ، هەرهەمووی ڕەبایەی جاش و سەربازبوو... شەو شەوەش کەمینیان لەسەر ئەو ڕێیانە دادەنا کە دەچوونە ناو قەسرێ... کە گەیشتینە ناو ماڵان، دنیا دەمێک بوو تاریک داهاتبوو.. هەر بەپێوە سەری چەند ماڵێکماندا... ماڵەکان هەموو بۆ من غەریب و بۆ قادر خەبات و ئەوان، خزم و دۆست و ناسیاو بوون... دەچووینە هەر ماڵێک، زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێدەکردین، تەنانەت لە زۆر ماڵدا، ژنەکانیش باوەشیان پێدادەکردین.

لە هەمووی خۆشتر بۆ من، ئەو جووتە پێڵاوەبوو کە گەنجێکی یەکێک لەو ماڵانە پێی بەخشیم... پێڵاوەکانی خۆم بەکەڵکی لەوەزیاتر لە پێکردن نەمابوون... گەرچی ژمارەیەکیش لە ژمارەی پێی خۆم بچووکتربوون، بەڵام بەو هیوایەی بە لەپێکردنیان، بڕێک فەراحتر ببن، لە پێمکردن.

- بابە، پێڵاوەکانم دڕاون، ئەگەر ئەمجارەچوویە شاری جووتە پێڵاوێکی تازەم بۆ دێنی؟

- بەسەر ئەو چاوانەم بۆتدێنم... بڕۆ تاڵەبەنێکم بۆ بێنە، تا ئەندازەی پێیەکانتی پێبگرم.

ئەو ڕۆژەی بابم لە شاری دێتەوە و جووتە پێڵاوەکەم دەداتێ، هەر ئەوەتا لە خۆشیاندا بەئاسماندا نافڕم... هەر لە ڕێوە پێڵاوەکانی لێوەردەگرم و لە پێیان دەکەم:

- بابە دەڵێی کەمێک بەپێم تەنگن.

- کێشە نیە کوڕم، یەک دوو ڕۆژ لە پێیان کەی بە ئەندازەی پێت فراوان دەبن.

لەو کاتەدا خەریکی لە دێ دەرچوونین، دەنگی ڕیزە تەقەیەک هەموومان ڕادەوەستێنێ.

- لەسەر ڕێگای بەرەو حاجی هۆمەران، کەمینی جاشان هەیە، یەکێک لە ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو قەسرێ، وا بە قادر خەبات دەڵێ.

- چـار نیە دەبێ چاوەڕێ بین. هەتا لە هەڵگیرانەوەی کەمین دڵنیا نەبین، لەناو قەسرێ دەرناچین، قادر خەبات وا وەڵام دەداتەوە.

"کۆمەڵـە لەنـاو قەسـرێدا ڕێکخسـتنی چـالاک و بەهێـزی هەیـە. ئەو کاتەش کەسـەرکردایەتی لە بناری قەندیلی بوون، زۆر لە پێداویسـتیەکانی سەرکردایەتیمان لە ڕێی ڕێکخستنەکانی ناو قەسرێوە دابین دەکرد. هەر بۆ زانیاریشت، لەو سنورەیدا، ژمارەیەکی باش لە ئافرەت، لە ناوڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدان." بەرلەوەی بگەینە ناو قەسرێ، قادر خەبات وای پێووتم.

ئەندامانی ڕێکخسـتنە نهێنیەکانی کۆمەڵە، هەموو ڕێیەکان دەپشـکنن تا دەریچەیەکی سەلامەت بۆ دەرچوونی ئێمە پەیدا دەکەن.

ئـەو چەنـد کاژێرە دواکەوتنەی ناو قەسـرێ، نەیانهێشـت بـەر لەوەی ئەستێرەکان چاو لێکنێن، بگەینە جێی مەبەستمان.

"برادەرینـە، هەر چەند جێیەکەمان ئەوەندە قایم و ئەمین نیە، بەڵام تازە هەتا خۆر ئاوابوون دەبێ هەر لێرە بین. هەر یەکەو خۆتان لەبن تەڕاشەکی نێن... تا شـەودادێ نابێ کەسمان لە جێی خۆمان جووڵەبکەین... ڕەبیەکان تفەنگهاوێژێکیـش لێمانەوە دوورنین... هەر ئەوەندەش پێیان زانین، ژیانمان لەدەستی خۆماندا نامێنێ."

وەک قـادر خەبات ووتی، هەر یەکەو خۆمان لەناو دەوەنێکدا وون کرد. ڕەبیەکان هێندە نزیکبوون، سـەربازەکانی بەردەمیان، بەبێ دووربین و بە ئاسای دەبینران.

پێدەچـوو حکومـەت بە جووڵـەی ئەو هێـزەی ئێمەی زانیبـێ، بۆیە لە بەیانیەوە تا ئێوارە، هەلیکۆپتەر بە ئاسـماندا خولانەوە... شـوێنەکەی ئێمە چونکـە زۆر لـە ڕەبیەکانەوە نزیک و جگە لە دەوەن و پنچکە گیاش، هیچی دیکـەی لـێ نەبـوو، بۆیە جێی شـک نەبـوو... کۆپتـەرەکان زۆر دوور لە ئێمـە دەسـووڕانەوە، وەک ئەو پێشـمەرگەی لەگەڵ مندا، لـە ژێر چەتری هەمـان دەوەندابـوو دەیووت، بەسـەر ناوچەی گەلاڵەو حاجـی هۆمەراندا دەسوڕانەوە.

لەدیدی مندا، ئەو ڕۆژە بەقەد ساڵێک درێژبوو... لەبەرچاوی من، خۆر بە

ئاســمانەوە نووسابوو، جووڵەی تێدا نەمابوو. چ ڕۆژێکی سەخت بوو. نان، ئەگەر زۆر دەســتمان پێوە نەگرتبا، هەر تا نیوەڕۆ بڕی دەکرد... ئاویش، هەر یەکە و پڕی مەتارەیەکمان پێبوو، مەتارەی تاینیش وا گەرمداهاتبوو، قومیشــت لێدابــا، ســوکناییت نەدەهــات... ئێوارە، وەک کەســێکی یەکجار شــەکەت و مانــدوو، زۆر بە زەحمەت گەیشــتە لامــان. ئیوارەهات، بەڵام شەوقی مانگی پێنج شەوە، تەواوێک دوایخستین.

نــەوا حکومەت بە بەرنامــەی جەولەکەی ئێمەی زانیبــێ، بەرنامەی ئەو چوونەمان هەڵوەشــاندەوەو، ئاڕاســتەی ڕۆیشــتنمان بەرەو چیای کاروخ گۆڕی.

لەو شــوێنەدا کە دەبوایە لە جــادەی خانەقا بپەڕینەوە، زرمەی بەزەوی کەوتنی کەسێک یان شتێک وە ئاگای هێناینەوە...

"وریابن... پێدەچێ کەمین بێ."

یەکێــک ئەمــە دەڵێت و هــاڕەی چەند دەســڕێژێک کە زیاتــر لە هاڕەی هەرەس هێنانی کەرتە شاخێک دەچێ، هەموومان بەزەویەوە جووت دەکات... ئەو پێشــمەرگانەی فریای لە جادە پەڕینەوە کەوتوون، لێیان دێنەدەســت... بــەدەم تەقەوە، هەمووومــان دەگەینە ئەوبــەری جادەکە... چەنــد هەنگاوێ واوەتر، خڕێکی پڕ ژاڵە و تاوێرە بەردی گەورە گەورە، هەمووومان دەگرێتە خــۆی. تەقە بەردەوامە... هەندێکمان وەڵامــی تەقەکانی ئەوان دەدەینەوە و هەندێکیشــمان، یــەک یــەک و دوو دوو، خڕاوخڕ بەرەو شــوێنێکی قایمتر هەڵدەکشــێین... نیــو کاژێریک دواتــر، نەتەقە دەمێنێ و نــە ئێمەش تازە لە قەمچــی[١٠٤] تفەنگــدا ماوین... قادر خەبــات هەمووان بەســەردەکاتەوە... بە سەغڵەتیەوە دەپرسێ:

«برادەرینە کێمان نوقسانە؟»

- وا بزانم سمایلمان لەگەڵ نیە، پێشمەرگەیەک وەڵامدەداتەوە.

یەکێکیتر دەڵێ:

- ئەمــن گوێــم لە دەنگــی یەکێکی بوو، بــەڵام لە بەرهــاڕە و تەقوتۆقێ، بۆم نەناســرایەوە کێیە!.. هەر ئەوەندەی لێ حاڵی بووم کە دەیگوت"بەجێم مەهێڵن."

---

١٠٤ - قەمچی تفەنگ: مەدای گوللە، ئەوندەی گوللەی تفەنگ دەیگاتێ.

قادر خەبات و برایمی حاجی کوێخا، بەرەو شوێنی تەقەکان دەگەڕێنەوە. دوای پتر لە کاژێرێک چاوەڕوانیی پڕوکێنەر، بەخۆیان و بەسمایلەوە دێنەوە.

سمایل، هیشتا بۆنی ئەو کژوگیا کێویانەی لێدێ کە بەدەم ناڵە و هاواری"بەجێم مەهێڵن"ەوە، لەتاو ئازار و خوێن لەبەررۆشتندا، لەناویاندا گەوزیدابوو.

بۆ چەند خولەکێک، کەسمان لێومان بۆ ناجوولێ... هەمانە دەنگی گریەی دەبیستریٚ و هەشمانە، سەری خستۆتە ناو کۆشیەوەو بە بێدەنگی دەگری.

هاوڕێ سمکۆ، هێشتا دڵی لێدەدا، بەڵام هێندە خوێنی لەبەر ڕۆیشیتووە، لە زمان کەوتووە. وەک ئەوەی بمەوێ شتێک لە زیندوویەتی خۆمی بدەمێ، دەستم دەخەمە ناودەستی... پێڵووەکانی لێکدەنێ و پەنجەکانی لەناو لە پی دەستمدا وردە وردە، ساردو ساردتردەبنەوە، تا وایلێدێ دەستی لە دەستم دەترازێ... لەو کاتەدا کە ژیان دەستی لێبەردەداو مەرگ باوەشی پێدادەکا، سمایل لەبەرچاوم، وێنەی ئەو ئەستێرە کشاوە لە خۆدەگرێ کەبەر لەوەی لە شوێنێکدا بەتەواوەتی بکوژێتەوە، هەرچی ڕۆشنایی ناخیەتی بەشەوەزەنگی دەبەخشێ.

قادر خەبات، وەک ئەوەی دڵی خۆی و ئێمەش بداتەوە، لەبەرخۆیەوە دەڵێ:

کە گەیشتینە سەری، هێشتا قسەی بۆ دەکران. هەر کە ئێمەی دی، وەک ئەوەی لە دەستی مردنمان قووتارکردبێ، پێی گووتین:

"دەمزانی دەگەڕێنەوە سەرم. دڵم خەبەری دابوومێ بەتەنیا لێرە جێم ناهێڵن... ئێستا بشمرم باکم نیە.. مادام ژن و منداڵەکانم دەزانن هاوڕێ پێشمەرگەکانم بە برینداری بەجێیان نەهێشتووم، بشمرم باکم نیە... بەڵام توخوا! ئاگاتان لە ژن و منداڵەکانم......"

سمایل دەیویست هەندێک شتیدیکە بڵێ، بەڵام بەداخەوە بۆی نەگوترا.

برایمی حاجی کوێخا، بەلچکی جامادانەکەی فرمێسکەکانی دەسڕێ و ڕوو لە تەرمی سمایل، دەڵێ:

«بەجێت ناهێڵین سمکۆگیان، بەجێت ناهێڵین.»

ئینجا ڕوو دەکاتەوە ئێمەو دەڵێ:

«بەخودای بەجێمان هێشــتبایە، هەتا ســەد ســاڵی کەش، ڕێبوارێک بەو گوزەرەیدا ڕەتبایە، گوێی لە هاواری "بەجێم مەهێڵن"ی سمایلی دەبوو.»

## ٣٤

سمایلمان پێلەچنگی مردن دەرنەهات، بەڵام جێمان نەهێشت.

بەویــان خۆم ئــازار دەدەم و بەمیــان دڵی خۆم دەدەمــەوە. بەدەم ئەو ململانێ ویژدانیەوە، هەنگاوە قورسەکانم ڕۆحی ماندووم، تا سەری کاروخ بەکێش دەکەن.

پشوویەکی نیو کاژێری دەدەین... هەرپێنجمان، قادر خەبات و من و سێ پێشمەرگەی تری دەستەکەی، بەرەو سنوری هەرێمی چواردە شۆڕدەبینەوە... لێرە بەدواوە، هەموو ئەو دۆڵانە دەستپێدەکەن کە بە دۆڵی ئاکۆیەتی ناسراون... دۆڵی بۆتێ، دۆڵی گوڵان، دۆڵی پڵنگان، دۆڵی شاورێ و دۆڵە ڕەقە... هەموو دێهاتەکانــی ناو ئەو دۆڵانە، ئاوەدانن و لە جێی خۆیاندا ماون... خەڵکەکەی بــە کشــتوکاڵ و بە ئاژاڵداریــەوە خەریکن و لەســەرداهاتێکی کەم دەژین. توتنی ئــەو ناوچەیە، بەتایبەتیش توتنی دۆڵی شــاورێ، ناوبانگێکی زۆری هەیە و ڕمێنێکی زۆری لەسەرە.

کــە منداڵبــووم، باوکــم دوکانــی هەبوو... ســاڵانە ســەد کیلۆیــەک لەو توتنــە بۆندارەی بۆ دەهــات... هەتا هەر هەمووی، کیلۆکیلۆ ســاغ دەبۆوە، دوکانەکەمان بۆنی توتنی شاورێی لێنەدەبڕا.

ئــەو ڕۆژە باوکــم بــۆ هێنانی هەندێک شــمەک، چووبووە ســلێمانی و، دووکانی بەســەر مندا جێهێشــت... من ئەو کاتە هەشت نۆ ساڵێک دەبووم. فوئــادی پــوررزام کە مــن بۆ چەنــد مانگێک لەو هەراشــتر بــووم. هەموو هاوینێــک لە ســلێمانیەوە دەهاتــە لامان... ئــەو ڕۆژە ئەویــش لەگەڵمدا لە دووکان بــوو. ئــەو کەمیک لە مــن بزێوتربوو... بەردەوام شــتێکی دەکرد. هەریەکەو شــخارتەیەکمان هێنا و دەستمان بە شەڕە شخارتە کرد... دەنکە شــخارتەیەکی ئەو، پەڕیەســەر یەکێک لە فەردە تووتنەکان... هەر ئەوەندە بڵێسەی ئاگر لە تووتنەکە بەرزبۆوە، فوئاد ڕایکرد... تا سوراحیەک ئاوم لە چایخانەکەی تەنیشــتمانەوە هێنا، هەندێ شتی تر و سیپەچایەکیش ئاگریان گرتبوو.

ئەگــەر خەڵکی ناو چایخانەکە فریا نەکەوتنایــە، هەر هەموو دووکانەکە

دەبووبە قەرەبرووت.

"دیارە بەوە بەڵایەکی گەورەترمان لە کۆڵ بۆتەوە."

باوکم دوای گەڕانەوەی، لەســەر سووتانی ئەو شتانەی ناو دووکانەکە، لەوە زیاتری نەووت.

هەفتەیەک بەســەر ئەو ئاگرەدا تێپەڕیبوو، بەڵام بۆنی توتنی شاورێ لە دووکانەکەمــان نەدەبڕا... دەتووت دەپانزە کەس پێکەوە ســیگاری تووتنی شاورێ دەکێشن.

مــن لەو کاتەوە، رقم لە جگەرەیە و تەنانــەت بۆ تاقیکردنەوەش، مژێکم لێنەداوە.

دۆڵی ئاکۆیەتی، ناوچەیەکی عەشایەری بوو.. پێشمەرگەکانی هەرێمەکەش، تێکڕا لە خەڵکی ئەو ناوچەیە پێکهاتبوون. سواراغا، فەرماندەی هەرێم بوو... هەباســاغای باوکی، لە شۆرشــی ئەیلوولدا کەســایەتیەکی دیــار و لە ئاغا نیشــتمانپەرەوەرەکانی ناو هێزی پێشــمەرگەبوو.. بایزاغای برای سواراغا، بەر لەم پێشمەرگەبوو، دواتر خۆی ڕادەستی ڕژێم کردوە و لە ڕووداوێکدا تێداچوو.

ســواراغا بۆ خۆیشی، لەسەر و بەندی درووستکردنەوەی بزووتنەوەدا، هاتە ناو یەکێتییەوە و یەکســەر کرایە ئەندامی ســەرکردایەتی بزووتنەوە... بە گوێرەی ئەو ڕێسایەش کە ئەندامانی سەرکردایەتی باڵەکان، ڕاستەوخۆ دەبوونــە ئەندامــی ســەرکردایەتی یەکێتــی، ســواراغاش بوو بــە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

ئەگەرچی سنوری هەرێمەکە، هەر پێنج شەش کیلۆمەترێک لە هێزەکانی ڕژێمــەوە دووربوو، بــەڵام هیچ بەیەکدادانێــک لە نێوانیانــدا ڕوویدەدا... پێدەچــوو ئاگربەســتێکی نهێنی، لە نێــوان هەرێمەکە و ڕژێمــدا هەبووبێ. هــەر بۆیەش بینینی کەســوکار، لەســنوری ئەو هەرێمەدا ئاســانتر بوو تا شوێنیتر.

ئەم تێڕوانینە، کەرتەکەی عەلی نەبی نەدەگرتەوە. عەلی نەبی، فەرماندەی یەکێک لە کەرتەکانی ئەو هەرێمە و، یەک لە فەرماندە چالاک و زۆر ئازاکانی هێزی پێشمەرگەش بوو.

بەرلــەوەش لــە ســاڵی ١٩٧٨دا ببێتــە پێشــمەرگە، ئەندامی ڕێکخســتنە

نهێنیەکانی کۆمەڵە بووە... هەموو پێشـمەرگەی کەرتەکەشی کۆمەڵە بوون. هەر بەیارمەتی ئەم و فەقێ مسـتەفا و چەند برادەرێکی تر، لەماوەی سـێ ڕۆژدا، هەموو کارەکانی ڕێکخسـتنم لەو سـنورەدا جێبەجێکرد. دەبێ ئەوە بڵێـم، بـە حوکمی پێکهاتە عەشـایەریەکەی ئـەو ناوچەیـە و هێزی دین و نزمی ئاسـتی خوێندەواریش، بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی مارکسیزم ئاسان نەبوو. هەر کادرێک ویسـتبای کاری ڕێکخستن لەو ناوچەیەدا بکا، دەبوایە تایبەتمەندی ناوچەکە و ئاستی هۆشیاریی خەڵکەکەی لەبەر چاوبگرێ.

کادرێکی کۆمەڵە، لەدواییدا بوو بە ئەندامی سـەرکردایەتیش، ڕۆژێک لە یەکێـک لە دێیەکانی ئەوناوچەیدا، کۆبوونـەوە بە خەڵکی ئاوایی دەکات...بە ئارەزووی خۆی، باسـی مارکسـیزم و سـۆڤیەت و ئەمریکا و ئیسرائیل و دەوری تێکدەرانەی قیـادەی موەقەتە دەکات. پیرەمێردێک کە پاڵی بەقەدی دارتوویەکـی ناو حەوشـەی مزگەوتەکەوەداوەو خەریکە بەسـەری زمانی پەڕەی سـیغارەکەی تەڕدەکا، سەرهەڵدەبڕێ و لەبەرخۆیەوەو، بەدەنگێکی تەواو بیستراوەوە دەڵێ:

"ئەرێ پێم ناڵێن ئەو کابرایە، ئەو هەموو چەڵتە چەڵتەی لە چیە؟"

ئاوڕێک بەلای ئەو پیاوەی تەنیشـتیەوە دەداتەوە کە بە مەزەندەی ئەم، بەووردی گوێی لە قسەکانی کادیرەکە گرتووە:

- ئەرێ ئەوە باسی چ دەکا؟

- بەخودای نازانم. ئەمن وا دەزانم گوێزانم لە بۆ دەژمێرێ.

ڕۆژێـک بـەر لە گەڕانـەوەم، دایک و باوک و بـرا و ژمارەیەک هاوڕێم هاتنە لام. هاتنی کەسوکار، وێڕای ئەوەی خۆشیەکی ڕۆحی زۆری دەداینێ، ئەوەندەش خواردنی خۆشـیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا، قەرەبووی خواردنی ئەو هەموو نیسک و نۆکەی ناو مقەڕیان بۆ دەکردینەوە.

لـە دواییـن ڕۆژی مانـەوەی دۆڵی شـاوڕێمدا، بۆ ماڵئاوایی، سـەرێکی عەلی نەبی و دواتریش سـواراغام دا... لای سـواراغابووم کە مەفرەزەیەک پێشمەرگەی هەرێم، دووکەسیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا. یەکێکیان ناوی(یاسین محەمـەد کەریم)بوو، برای حەبیب محەمەد کەریمی، سـکرتێری پێشـووی پارتـی. هەر دووکیـان ئەندازیاری ڕێگاوبان بوون... لـەو کاتەدا بۆ لێدانی جادەیـەک بـۆ چیای کۆڕەک، خەریکی نەخشـەدانان دەبـن، مەفرەزەیەکی هەرێمی چواردە تووشیان دەبن. یاسین دەیگوت:

« ئەگەر ئەو شـوانە هەواڵی ئێمەی بەو برا پێشـمەرگانە نەدابا، ڕەنگە ئێستا ئیشی خۆمان تەواو کردبا.»

وەک یاسـین دەیگێڕایەوە، ئەو چەند ڕۆژەی ئەوان خەریکی پێوانەکاری بـوون، شـوانێک لەو ناوە مـەڕی لەوەڕانـدووە کە دەیانبینـێ، بەخۆیان کۆمەڵێک ئامێرەوە دێن و دەچن، ڕۆژێک دێتە لایان:

- ئـەرێ کاکینە، ئەوە پێم ناڵێن ئەو چەنـد ڕۆژەی، لەو چیایەی خەریکی چن؟

- خەریکی دەستنیشانکردنی شوێنی جادەین.

- جادە! جادە لەبۆ کوێ؟!

- بۆ سەر ئەم چیایە.

- ئینجا جادە لێدان، ئەو هەموو ترۆتفاق و خۆ سەخڵەتکردنەی بۆ چیە؟

- ئەی بەڕای تۆ چیی ئەوێ؟

- کەرەکـەی منـی دەوێ و تەواو. وەرن کەرەکەی من پێش خۆتان دەن، بەسـاناییترین ڕێدا، هەتا تەپڵەسـەری شـاخیتان دەبا. ئـەوەی ئەنگۆ[105] بە چـوار ڕۆژان بۆتـان نەکراوە، بەخودای کەرەکەی من، خۆ موهەندیسـیش نیە، بە سێ سەعاتانو بۆ تەواو دەکا.

بەر لەوەی یاسـین و هاوڕێکەی، سـوود لە ڕێناسـیی کەری شـوانەکە وەرگـرن، مەفرەزەکـە دەیانگرن و وەک بارمتە لەگـەڵ خۆیاندا دەیانهێنن. هەڵبەتە ئەوان بیانی نەبوون، تا بچنە خانەی بارمتەوە، بەڵام سواراغا زۆر کەیفی بەخۆی دەهات کە دەیگوت:

- ئەمەش بارمتەن گرتوون[106].

---

١٠٥ ـ ئەنگۆ: ئێوە.

١٠٦ ـ ئەمەش بارمتەن گرتوون: ئێمەش بارمتەمان گرتوون

ئەو دەمەی لە (زینووی ئەستێرۆکان)، دۆڵی شاوریێمان لێوون دەبێ، (کوێستانی مەکێ) سەردەردێنێ. ئەو کوێستانە، ئەوەندەی لە مافوریێکی ڕەنگاوڕەنگی دەستکرد دەچێ، ئەوەندە لەلاپاڵی شاخێک نا... ئەو هەموو بێری و مەڕ و بزن و ڕەشماڵانەش، ئەوەندەیتر نەخشی سەر ئەو فەرشە جوان دەکەن.

لێرەوە، ڕەشماڵەکەی ماڵی کاڵێ دەناسمەوە... ڕەشماڵێکی گەورەی پێنج ئەستووندەگی، لە نزیک پەڵەدارگوێزەکەو لە دامێنی ڕەشماڵەکانی دیکەدایە. شتەکانی ناو ڕەشماڵەکەم ئەوەندە لەبەرچاون، دەڵێی لە ناویدام... هەرزاڵێک و چەند دەستە نوێنێک، ئاگردانێک و چەند لبادێک بەدەوریدا، فانۆسێک بەیەکێک لە ئەستووندەگەکانەوە هەڵواسراوە، چیغەکانی چواردەوری ڕەشماڵەکە، بەو هەموو ڕەنگانەی لە چنینیاندا بەکارهاتوون، هەریەکەو لە تابلۆیەکی هونەریی دەچێ، هەموو ئەم شتە سادانە، ئەو ڕەشماڵەیان لای من کردۆتە خۆشترین ماڵی دنیا... ئەو ماڵەی بەرلەچوونمان بۆ سنوری هەرێمی چواردە، چوارشەوان لەناویدا ماینەوە. چوار شەوی جیا لە هەمووشەوەکانی ڕۆژگاری پێشمەرگایەتیم... جا چی لەوە خۆشترە لەو ژیانە لە هەموو شتێک دابڕاوەی ئێمەدا، سەرنجی گەرم و پڕ لە هەستی کچێک بەلای خۆتا ڕاکێشێت.

ئەوکاتەی گەیشتینە بەردەم دەوارەکەی ئەوان، ئەو مەشکەی دەژاند... ئەو هەر بەڕاستی مەشکەی دەژاند کەچی لەبەرچاوی من مەشکە دەبووە (باگپایپی)[١٠٧] سکۆتلەندیەکان و شلێوهوڕی دۆیەکەی ناویشی، ڕیتمێکی خرۆشەریان پێدەبەخشیم.

هێشتا بەتەواوەتی لەگەڵ مام پیرۆت و خێزانەکەی، لە چاکوچۆنی نەبووینەوە، ئەو بەخۆی و بە (بادی)ەک[١٠٨] دۆی تازە لە مەشکە دەرهاتووەوە دەگاتە بەردەممان... بێ ئەوەی سەرم هەڵبڕم، جامە دۆیەکەی لێوەردەگرم. لەگەڵ یەکەم فڕدا، دەگەڕێمەوە بۆ ئەو خۆشییە زۆرەی کە لە منداڵیمدا، بۆ

١٠٧-ئامێرێکی مۆزیکی سکۆتلەندێکانە لە شێوەی مەشکەدایەو چەند بلوێرێکی پێوەیە.
١٠٨-بادی: جامێکی دارینی گەورەیە، جاران زیاتر بۆ دۆ و ماستاو تێکردن بەکاردەهێنرا.

یەکەمجار لە خواردنەوەی کۆکا کۆلادا بینیم.

پـارەی بوتڵێک لە باوکــم وەردەگرم و بەڕاکردن خــۆم بە چاخانەکەی (شاڵی)دا دەکەم. ٢٥ فلسەکەی دەدەمێ:

- زەحمەت نەبێ، کۆکا کۆلایەکم دەدەیتێ... بەڵام توخا با زۆر زۆر ساردبێ.

شــاڵی پارەکــەم لێوەردەگــرێ و لەناو ســیپە پڕ لە کۆکا کۆلا ســەر بە ســەهۆڵ داپۆشــراوەکەدا، دانەیەکــی کەلە تەزێنم بۆ دەردێنــێ. لەو کاتەدا کلیلەکە لەسەری بوتڵەکە گیردەکا، بۆ ئەو دەنگە پڕ لە ئاوازەی لە هەڵپچڕینی ســەری بوتڵکەدا، دنیایەک خۆشیم دەداتێ، هەموو جەستەم دەبێ بە گوێ. بــە پەلــە بوتڵەکــەی لێوەردەگرم... بەر لــەوەی لێگەڕێم هیچ لــە گازی ناو بوتڵەکــە بەفیرۆچێ، چاوەکانم دەنووقێنم و توونـد توونـد دەمی پێوە دەنێم. ئەوەندەی چێژ لەو تامە ئەفسوناوییەی وەردەگرم، ئەوەندەش لەو گازە کە لەشێوەی تەنکە دووکەڵێکی شینباودا، لە هەردوو کونە لوتمەوە دەردەچێ. لە دڵی خۆمدا دەڵێم "خودایە ئەو هەموو تاموچێژە خۆشــە چیە، تۆ لە ناو ئەو شوشە چکۆلەیەدا جێتکردۆتەوە"

لەگەڵ دواین قومیشمدا، سەرم بەرەو ئاسمان هەڵدەبڕم و دەڵێم "خودایە تــو گەورەیــی خۆت، با یەک لــە ڕووبارەکانی ناو ئەو بەهەشــتەی بەڵێنت پێداوین، ڕووباری کۆکاکۆلا بێ."

ئەمەم دەوت و لاشــم ســەیربوو کە خودا لە قورئانا، ناوی هەندێ شتی هێنــاوە کە مــن هیچ پێمخۆش نین کەچی ناوی کــۆکا کۆلای نەهێناوە. خۆ ئەگــەر ئەو کاتە قومێک لەو دۆیەی ئێستاشــم خواردبایەوە، ڕەنگە هەمان تکام لە خوا بکردایە.

جامە بەتاڵەکەی دەدەمەوە دەستی... بێئەوەی تەماشای کەم:

- دەستەکانت خۆشبن، دۆیەکی زۆر بەتام بوو.

- با جامێکی کەشت بۆ تێکەم.

لــەرەی دەنگــی چ مۆســیقایەکی ئەفســوناوی تێدایــە، مۆســیقایەک کە لێناگەڕێ لەوە زیاتر ســەرهەڵنەبڕم.. دەڵێی مەلی بەرشەوارەکەوتووم و لە تیشکی ڕووناکی بەولاوە، شتێکی دیکە نابینم... بەرامبەر بەو هەموو جوانیە سروشــتیەی خودا لەودا کۆیکردۆتەوە، تووشی حەپەسان و دڵە کوتێیەکی توونــد دەبــم... بەهەموو هێــزی خــۆم هەوڵــدەدەم ڕووی گوڵەبەڕۆژەی

نیگاتیژەکانم لە خۆری ڕووخســاری ئەو وەرگێڕم، ناتوانم. ئەو کاتەش پێم وایە، هەســتەکانی خۆی لە ڕێی چاوە لە قەرســیلی ســەوز چووەکانیەوە، ئاراســتەی مــن دەکا، شــڵەژانێکی بەهێــز، هەمــوو جەســتەم دەتەنێتەوە. هێندە دەشــڵەژێم هەر چەند دەکەم، ووشــەیەکم لە پیتە پچڕپچڕەکانی ناو گەرووم بۆ درووست نابێ. نیگاکانم لە ڕووخساری ئەو دوور دەخەمەوەو بەبەتاڵاییەکی بێ کۆتاییدا دەڕوانم... خودایە، ئەو تۆڕی نیگا تیژانە چۆن وا بە خێرایی ماسی هەستی منیان لوولدا.. لوولدانێک، کونێک لەو تۆڕەدا شک نابــەم خۆمی لێوە قوتاربکەم. بۆ چەند خولەکێک بێدەنگ دەبم. هەســت بە گێژبوونێکی لەپڕ دەکەم.

بەناوی ماندوویەتی ڕێگاوە، ڕووخســەتی سەرخەوشکاندنێک دەخوازم. لبادێک وەردەگرم... لەپاڵ گاشە بەردێکا دایدەخەم. بۆ سووکە بۆرژانێک[١٠٩]، قەدەرێک پێڵوەکانم لەســەریەک دادەنێم... نەدەتوانم بخەوم و نەدەشــتوانم کلافەی کۆلارەی خەیاڵم، لە ئاسمانی بیرکردنەوەی دەوری ئەودا هەڵکەمەوە... بێ ئەوەی بە خۆشم بزانم، بەدزییەوە نامە نیگایەکی بۆ دەنێرم.

لەبەرزاییەکەی پشــتی ماڵان، بە خۆمان و کۆلارەکانمانەوە وەستاوین... لەگەڵ هەڵکردنی کزەبایەکدا، کۆلارەکانمان بە حەوا دەکەون.

ـ ئەوەی من لە هی هەمووتان بەرزتر بۆتەوە.

ـ ئەدی ئەوەی من، خەریکە کلکی لە بنی ئاســمان دەخشــێنێ. بەخودای ئاسمان لەوێ نەبا، دەزووی زیاتریشم لە دوو دەدا.

هەریەکــەو پەڕەکاغەزێــک کوندەکەیــن و بەنــاوی نامــەوە، لــە ڕێــی دەزووەکەوە، بۆ کۆلارەکانمانی دەنێرین.

ـ نامەکەی من زۆری نەماوە بگات،.

ـ ئەوەی منیش.

ئــەوان گوێ بە توندبوونی بایەکە نادەن، بەدەم چاوەڕوانی گەیشــتنی نامەکانیانەوە، هێشتا هەر دەزووی زیاتری لە دوادەدەن.

منیش لە ترسی ئەوەی، نەوا بایە توندەکە کۆلارەکەم لەدەست بڕفێنێ، چاوەڕێی گەیشتنی نامەکەم ناکەم و بەپەلە دەزووەکەی هەڵدەکەمەوە.

---

١٠٩ـ بۆرژان: چاوگەرم کردن، خەوێکی کورت و سووک.

ئەوەتـا ئەویـش لە هەورِ[110] شـتن بۆتـەوە و خەریکی گسـکدانی جێی دانیشـتنی ئێوارەیـە. هەرچیـەک دەکا، هەولـدەدا ڕووی لە مـن بێ... هەر کە دەشـبینێ پەپوولە نیگاکانی من، بەرەو گوڵی ڕووخسـاری ئەو دەفڕن، برووسـکەی خەندەیەکم تێدەگرێ.. لە نێـوان دزە نیگای من و بزەی لێوی ئەودا، ئەوەی پێی بڵێن مەودا نامێنێ.

لەو دوو سـێ ڕۆژەی مانەوەمانـدا، نازانم چۆن ئەو دەرەفەتە زێڕینەی بە تەنیا بەیەکەوە بوونەوەمان بۆ ڕەخسا.

مـن لـە ژێـر سـوورەچناری دەم جۆگەلـە ئاوەکـە دانیشـتووم و بە خوێندنەوەی کتێبەکەوە سەرقاڵم... نیوەی هۆشم لای کتێبەکەیە و نیوەکەی تریشی لای ئەو...

بـەر لـەوەی ئاوازی ترپـەی نەرمی پێیەکانـی بگاتە گوێـم، بۆنی گوڵە کێویەکانـی بـەر باخەڵی، سـییەکانم پڕدەکـەن. دەمەوێ لەبەری هەسـتم، قاچەکانـم بەهانامەوە نایەن. بە ئەسـپایی دێت و لە پاڵما دادەنیشـێ... من دەشڵەژێم... یەک دووشت دەڵێم کە خۆشم نازانم چین.

خودایە ئەو هەمو ئازایەتیە چیە بەوت داوە و، ئەو هەموو ترسنۆکیەش بە من!

- دەڵێی پێت ناخۆشە هاتم؟!

"پێم خۆشە، هەرزۆریشم پێخۆشە، بەڵام کێشەی من لەوەدایە، بۆخۆشم نازانم چیم دەوێ."وا بەخۆم دەڵێم و بەویش دەڵێم:

- نا، پێم ناخۆش نیە بەڵام...

- بەڵام چی..

- من پێشمەرگەم، پێشمەرگەش موڵکی بیروباوەڕەکەیەتی نەک خۆی.

- ئێوە بە بیروباوەڕەکەتانەوە جوانترن...

ئەو وا دەڵێ بەڵام نازانێ کە بیروباوەڕ بوو بە خاوەن، خاوەنداریێتی هیچ کەسی تر قبوڵناکات... واز لەو مەسەلەیە دێنم و دەڵێم:

---

١١٠- هەورِ: قاپوقاچاخ.

ـ ئەدی ئەگەرماڵەوەتان بمان بینن؟!

ـ کەسیان لە ماڵێ نین، دایکم نەبێ... دایکیشم بە هەموو شتەکی من دەزانێ.

کەمێک ئارام دەبمەوە و ئەویش بەدەنگێکی متمانەدارترەوە دەڵێ:

ـ سبەینێ دەڕۆن و دەشترسام وا بەئاسانی نەتبینمەوە.

ـ بەڵێ، بەداخەوە سبەینێ دەڕۆین. چی بکەین، پێشمەرگایەتی ئاوایە، وەک دەرویشی گەڕیدە واین، هەر ڕۆژەی لە شوێنێکین.

ـ ئەرێ ئەو پیشمەرگایەتیە کەنگێ دەبڕێتەوە؟

ـ بەناوەکەیدا بێ، شۆڕشی درێژخایان، ئێمە دەبڕێنێتەوە خۆی نابڕێتەوە.

سەرنجێکی قووڵم دەداو، چاوەکانی پڕدەبن لە ئاو.

ئێستا بۆ یەکەمجار بە دیقەتەوە لێی دەڕوانم.

دەمی لە شانەی هەنگوین و تاڵەکانی قژی لە بژۆڵی[111] گوڵە گەنمی دەشتی قەراج دەچن.

چاوەکانی، سەوز سەوز، لە سەوزایی گۆماوی ژێر سێبەری پەڵە داربیەکی چڕ سەوزترن. پێستێکی کاڵ و تەنک... لێوە ئاڵەکانی، لە چوزەرە ڕێواسی تازە سەر لە بەفر دەرهاتووی لاپاڵی قەندیل دەچن... دەنگی لە هەموو مۆسیقایەک زیاتر، چرای هەژان لە ناخمدا هەڵدەکا...

کە نیگاکانی لە نیگاکانی من دەئاڵێن، هەموو ئارەزووە خەوتووەکانی ناخم بەخەبەردێن...

دەمەوێ شتێک بڵێم... هەر هیچ نەبێ بە چەند ووشەیەکی کەمیش بێ، هەستی خۆم بەرامبەر بەو هەموو جوانیەی ئەو دەبڕم، بەڵام هیچم بۆ ناووترێ...ئەو بە هانامەوە دێ و بە دەنگێکی ئارامتر لە ئارامی بە گوێمدا دەچپێنێ:

"هەڤاڵ"

---

١١١- بژۆڵ: برژانگ.

ئەو جارێک دەڵێ هەڤاڵ، بەڵام سەدان هەڤاڵ لە ناخمدادەنگدەدەنەوە... هەزاران جاریتر(هەڤاڵم) لە دەمی خەڵکی ترەوە بیستووە، بەڵام قەت ئەوەندەی ئێستا، ناوی خۆمم لاشیرین نەبووە.

- هەڤاڵ، شتێک لە تۆدا هەیە، لە هەموو ئەو پیاوانەت جیادەکاتەوە کەمن دیومن... شتێک لە تۆدا هەیە، منی شەیدای تۆکردووە.. شتێک هەیەو ناشزانم چیە. ڕۆژنیە پێشمەرگە نەیەنە ماڵمان... ئەوان بەشی هەرە زۆریان، بەچاوی برسیەوە دەڕوانن... من قەت حەزم لەو پیاوانە نەبووە بە چاوی برسیەوە لە ژن دەڕوانن... بەخودای کە پیاوێک بە چاوی برسیەوە لێم دەڕوانێ، دنیایەک پێی بێتاقەت دەبم. بینینی ئەو جۆرە پیاوانە، لەبری خۆشی، هەستی نارەحەتیم دەداتێ.

کە قسەم بۆدەکا، هێندە گۆنا و لاملی لە لێوەکانم نزیک دەبنەوە، هەر بینە چپەکان بوون بە ماچ. بەیانووی کتێب لەسەر زەوی دانانەوە، کەمێک سەرم دەبەمە دواوە... دەترسم ئەو چپە ماچانە ببنە گڕو ئاگر لە دارستانی جەستەمان بەردەن و بەهیچ ئاوێک بۆمان نەکوژێتەوە...

لە نێوان حەزی خۆدوورخستنەوە و زیاتر نزیکبوونەوەدا، دێم و دەچم... خەریکە وەک پارچەیەک سەهۆڵی ناو ئاوێکی لە کوڵ دەتوێمەوە... هەتا زیاتریش دەتوێمەوە، چپەکانی ئەو لە نزیکترەوە دەبیستم... ئێستا هێندە لێم نزیک بۆتەوە، دەتوانم یەکەبەیەکەی لێدانەکانی دڵی بژمێرم... هەناسەدەداو لەگەڵ هەر هەناسەیەکیدا، مووەکانی سەر تەوێڵ و ڕیشم، وەک مەرەزەی بەردەم شنەبایەکی فێنک، دەکەونە نەرمە سەما. بەئاستەم سەری پەنجەی بەر مەچەکم دەکەوێ... خەریکە وەک قاوەی[112] بەینی پەنجەو(بەردەستێ)[113]، لەو بەریەککەوتنە خێرایەدا گڕدەگرم.

دەمەوێ ماچی کەم... لێوەکانم وەک قفڵێکی ژەنگاوی واکلۆم بوون، هەر چەند دەکەم بۆ لێکناترازێن... دەبمە دووبەش، بەشێکم دەیەوێ ببێتە ئەو هەنگەی بەسەر گوڵێکەوە نیشتۆتەوە و، هەتا هەموو شیلەی ناو هەڵاڵەکەی هەڵنەمژێ، جێی ناهێڵێ. بەشەکەی تریشم دەیەوێ وەک باڵندەیەکی لە دەنووکی هەڵۆبەربوو، هەتا تین لە باڵەکانیدایە هەڵێ... بەشێکم وا دەبینێ ژیان بەبێ تێرکردنی ئارەزووەکان بەتاڵ و بێ مانایە... بەشەکەی ترم

---

112- قاوە: پووشوو پارچە دارێکی تەبەدۆرییە، جاران بۆ ئاگر کردنەوە بەکاریان دەهێنا.

113- ئەستێ: پارچە ئاسنێکی چکۆلەی سێ گۆشەییە، بە لێخشاندنی لە بەردێک پریشکە ئاگری لێهەڵدەستێ و ئاگر لە قاوەکە بەردەدا.

پێـی وایــە، خـۆ ڕادەســتکردنی ئـارەزووەکان، پێچەوانەی پرنســیپەکانی پێشــمەرگایەتی و بیروبــاوەڕی کۆمەڵەیــەو، ئەنجامدانــی کوفرێکی هێندە گەورەیە، لێخۆشبوونی بۆ نیە.

چەنـد چرکەیەک لە نێوان ئەو حاڵەتی خۆڕادەســتکردن و یاخیبوونەدا. تێدەمێنم... خۆم وەک بەلەمێکی کونتێبوو دەبینم، نەوایە نقوم ببم و نەواشە بەتەواوی سەر ئاوکەوم... دواجار بایی ئەوە ئازایەتی لە خۆمدا کۆدەکەمەوە هەســتم قومێک ئاو بخۆمەوە و شــڵپێک ئاویش بە دەموچاوی گڕگرتومدا بدەم... یەک دوو قولانج دوورتر لەو دادەنیشمەوە...

ئەو هەست بەو دوودڵیەی من و بەو زاڵبوونەی بەشێکم بەسەر بەشەکەی ترمدا دەکات... هەناســەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێ... بە تۆنێکی غەمبارەوە پێم دەڵێ:

ـ دەزانم ئەمن شێتی تۆبووم... ئەوەی دەزانم بەلام هیچ پێناچێ ئەتۆ بۆ من وابی...

"ئــەو دەزانــێ، بەڵام من نازانم ژن، هەر بە غەریــزە دەزانێ کە پیاوێک عەشقی بووە یان نا..."

بەدەنگێکی حەسرەتاویەوە دەپرسێ:

ـ ژنت هەیە؟

ـ نا، نیمە.

کەمێـک بێدەنـگ دەبــێ... من وای بۆ دەچــم لە دڵی خۆیــدا، دڵ بە ژن نەبوونی من خۆشــکا... ئــەو نازانێ هەبوونی قەزیەیەک لــە ژیانی مندا، لە هەبوونــی ژن ڕێگرترە... ئەو نازانێ ژن، ڕەنگە بتوانی جێ بە ژن چۆڵکات، بەڵام بە قەزیە نا.

ئەشــق، وەک تیشــکدانەوەی ســەر ڕووی ئاوێنــەی بــەر خۆرەتــاو دەبرســکێتەوە... ئەو ئاشــقەو، منیش ئەو ئاشــقبوونەی ئــەو بەجۆرێک لە شێتیی وەردەگرم... شێتیی ژنێک بۆ پیاوێک کە پێی وایە لەو دنیا گەورەیەدا، لــەو پیاوەی زیاتر تێدا نیە... ئەوەی ئەو بەشــێتی دەزانــم و، ئەو بەرگریە زۆرەی خۆشم بە جۆرێکیتر لەشێتی... شێتیی پیاوێک کە خۆڕاگریی خۆی لەبــەردەم ئــەو هەموو مێینیەیەی خودا لە ژنــدا کۆیکردۆتەوە، بە ئازایەتی دەزانێ.

خۆم ڕادەگرم و دەشـــزانم من بەو خۆڕاگریەم سـێ جاران تاوانبارم... جارێـک دڵــی ئــەو دەشـکێنم و جارێک دڵی خــۆم و سـێیەم جاریش دڵی خودا... خودا لەوە نامبورێ کە دەستم بە هەموو ئەو شتانەوە نا کە ئەو لە جەستەو ڕۆحی ئەودا بۆ منی حەشارداون.

بەر لەوەی لەگەڵ بانگکردنی دایکیدا هەسـتێ، بەتۆنێکی پڕ لە متمانەوە دەڵێ:

- ئەتو مەیلی خۆتە... بەڵام ئەمن عەشقی تۆبووم.

ئــەو هەڵدەسـتێ و منیـش دووکەڵــی هەناسـەی پەشـیمانیەکی قووڵ بەبــادەدەم... چ دەبـوو ئەگــەر ڕێـم بەخـۆم دابایــەو بەماچێـک، بۆ چەند چرکەیەکی کەمیش با، خۆم کردبا بە بەختەوەرترین پیاوی دنیا.

ئــەوە چ بیروباوەڕێکە، ئەو هەمــوو بەرەنگاریە زۆرەی لە مندا، کردۆتە دژمژەی[١١٤] دەمی کاریلەیەکی شیرەخۆرە... ئاخر بۆ دەبێ ماچێک، لە دیدی بیروبــاوەڕدا، بچێتە خانەی ئەو گوناهە گەورانەوە کە قابیلی لێخۆشــبوون نین...

خۆزگــە ســەرکردە و فەرماندەکانیـش، وەک ئێمــە، ئەوەنــدە پابەند و گوێڕایەڵی پرنسیپەکانی بیروباوەڕدەبوون و قسەکەی کاکە مینی حەمەدی مامەغایان بەســەردا نەدەچەســپی کە ســەبارەت بە دینــداری بابی و بابم دەیگوت"ئــەو مــەلا بیژووانە[١١٥]"، خوایان لە بابت و بابم کردۆتە شـێرو، بۆ خۆشیان بە ڕێوی نازانن."

ماڵی بیروباوەڕ بە قوڕگیرێ، لێناگەڕێ هەموو دیوەکانی ژیان ئەزموون کەین.

مەگەر هەروام نەهێناوە، ئەو کاتەی هەرزەکاربووم، لە ترسی دۆزەخ و ئەوســزا قورسانەی قورئان و فەرموده نیشانیان دەدایـن، خۆم لە چەشتنی هەموو ئارەزوەکانم بێبەشکرد... کە هاتمە ناو سیاسەتیشەوە، ئەوەندەی تر خۆم لەناو قۆزاخەی دابڕاندا قەتیس کرد... وامدەزانی هەتا لەگەڵ حەزەکانما گیرتربــم، ئازاترم... ترســی ئەوەم نەبوو ئەو هەموو خۆ ســندمکردنەم[١١٦]،

---

١١٤ـ دژمژە: گزمک: دەمبەست، دارێکە دەیخەنە دەمی کارو بەرخ و گوێلکی شیرە خۆرەوە، تا لە شیری دایکی ببڕنەوە.

١١٥- بیژوو: زۆڵ

١١٦- سندمکردن: کۆتکردن، بەستنەوە بە پێوەندی ئاسن.

لەدواییدا ئەوەندە چەپاندنم بۆ درووستکا، ئارەزووەکانم لێبکاتە ئەسپێکی سەرکێش و بەهیچ شتێک بۆم لغاو نەکرێ.

دوای پشوویەکی باش، زینووی ئەستێرۆکان جێدەیلێن و بەرەو کوێستانی مەکێ، بەکاروخدا شۆڕدەبینەوە. هەر کە میلکانەکەی[١١٧] ئەوانمان لێدەردەکەوێ، قادر خەبات بە جۆرێک لە گاڵتەوە دەڵێ:

- بزانم ڕەشماڵی ماڵی مام پیرۆتی دەناسیەوە.

- وابزانم ئەوەی کەوتۆتە دامێنی هەمووانەوە، ئەوەیە.

ئاوڕێک دەداتەوە، پێشمەرگەکان، تەواوێک دوور لە دوای ئێمەوە ڕێ دەکەن.

- لەبیرتە وەختی ماڵئاوایی، کاڵێ گوتی: "توخوا کاک خەبات زوو وەرنەوە."

- گوێم لێبوو شتێکی وای ووت.

- ئەوە لەگەڵ منی نەبوو، مەخسەدی ئەتوبوو.

گەرچی بۆ خۆشم هەروام وەرگرتبوو، بەڵام ناتوانم خۆمی لێنەبان نەکەم، بۆیە بەجۆرێک لەسەرسووڕمانەوە دەڵێم:

- بۆ من؟!

- پێم وابێ دڵی بە تودا چووبێ.

بۆ ئەوەی تووشی درۆ نەبم، هیچ ناڵێم. خەبات کە دەبینێ، خەریکە لە شەرماندا ئارەقەی شینومۆر دەردەم، تۆنی قسەکانی دەگۆڕێ و بەجدیتر دەدوێ:

- گەر حەزدەکەی، خوازبێنیت لە مام پیرۆتی بۆ دەکەم؟!... مام پیرۆت، دۆستێکی زۆر خۆشەویستی منەو، هەرچیەکی داوا لێبکەم، باوەڕناکەم ڕەتی کاتەوە.

خەبات، باسی خوازبێنی و هاوسەرگیری دەکاو منیش ئەوەی بیرم لێنەکردۆتەوە، ئەو شتەیە. من پێویستیم بە عاشق بوونە نەک هاوسەرگیری.

---

١١٧ـ میلکان: هۆبە: جێی کۆمەڵی تاوڵی(دەواری) کۆچەرییانە.

لای من، عەشــق لــە باڵندەیەک دەچێ هەتــا تین لە باڵەکانیــدا هەیە، هەر دەفڕێ و دەفڕێ و بیر لە نیشــتنەوە ناکاتەوە...

من بە ئاسمانی خەیاڵدا دەفڕم و ئەویش دەیەوێ بمهێنێتەوە سەر زەوی.

- بۆ بێدەنگی؟ دەڵێی چی... خوازبێنیەکەت بۆ بکەم یان نا؟

- سپاست دەکەم، بەڵام من جارێ بەکەڵکی ژن هێنان نایەم.

- بــۆ بەکەڵک نایــەی! وەڵا تۆغیانی[118] ژن هێنانتە.. ئەوەندەی تەماشــای کاڵێ دەکەم، دەزانم زۆر حەزدەکات ببێ بە ئی تو.

- ببێ بەهی من! کوڕە کوا ئەو بیروباوەڕەی مێشکی پڕکردووین دەهێڵێ کەس ببێ بە هی ئێمەو، ئێمەش ببینە هی کەس.

- بیروباوەڕ بەڕێ خۆی و هاوسەرگیریش بەڕێی خۆیدا.

- بەڵام ئەو پێشــمەرگایەتیەی ئێمە لە کوێ بەکەڵکی ژیانی خێزانی دێ... لەوەش زیاتر، بۆ من، کچێکی ئاوا شۆخ و جوان تووشی ئەو ژیانە سەختەی خۆم کەم!

- جا خۆ ئەوان پێشمەرگەش نەبن، لە ئێمە زیاتر بەکێوانەوەن.

- ئــەوە وایــە، بــەڵام وەک مــن بزانم دەخوێنــێ، بۆ لە خوێندنــی کەم... جگەلەوەش، بۆ ئەو باشترە قەدەرێکی تر بۆ خۆی هەڵبژێرێ، قەدەرێک کە تووشــی پیاوێکی کات، ژیانێکی سەقامگیری بۆ دابینکا، نەک پیاوێکی وەک من کە ژیانی لە شەمەندەفەر دەچێ، لەهیچ ویستگەیەکدا ناسرەوێ.

بەر لەوەی خەبات قســەکانی تەواوکات، کاڵێ لە زالکی[119] ڕەشماڵەکەوە بەخێرهاتنەوەمان دەکا. گومانم لەوە نیە، هەموو ڕۆژێ کاڵێ لەو شوێنەیدا، لە چاوەڕوانی ئێمەدا، چەندین جار بە زینووی ئەســتێرۆکانیدا هەڵڕوانیوە. دەزانم هەموو ڕۆژێ. تا تەواو تاریک دانەهاتووە و لە گەڕانەوەی ئێمە بێ ئومێد نەبووە، زالکی ڕەشــماڵی بەجێنەهێشتووە... دەزانم چەند تامەزرۆی بینینەوەی منە... منیش هەروا... لەو زیاتر نەبێ، کەمترنا.

ڕەنگــە خەبات ئەو باســەی کاڵێی لەگەڵدا نەکردبــام، بەبینینەوەی کاڵێ

١١٨-تۆغیانی ژنهێنانتە: وەختی ژنهێنانتە.
١١٩-زالک: شوێنی چوونە ژوورەوە یان دەمی هەر شتێک

چووبامە دنیایەکی ترەوە... دنیایەک مەگەر هەر لە خەیاڵدا بۆم خولقابا.

بەشەرمێکی زۆرەوە، وەڵامی بەخێرهێنانەوەی کاڵی دەدەمەوە.. لەشەرمان وا سووربومەتەوە، دەموچاوم وورەی[120] گەرمی لێهەڵدستێ هەست بە نارەحەتیەکی هێندە زۆردەکەم، هەموو جەستەم دەکەوێتە سەرئارەقە... وا دەزانم هەر هەموویان بەو پەیوەندیە خێرا و هەڵچووەی نێوانمان دەزانن... هەستم چۆنبێ و دەروونم چەندیش لە کوڵاندابێ، نابێ هیچ ئاماژەیەکی گوماناوی لە دەموچاو و لە هەڵسوکەوتمدا دەرکەوێ. دەبێ زیاد لە پێویست خۆم بە ئەدەب نیشاندەم و تەمی هیچ گومانێک بەسەر شووشەی روومەوە نەهێڵم... ئەگەر سووکە گومانێکیشیان کردبێ، دەبێ بیرەوێنمەوە.

هەموون ئاسایی قسە و رەفتاردەکەن، من نەبێ. کە هەستدەکەم، یەکێک بەلاچاویش سەیرم دەکا، رووی خۆم دەسورێنم و نیگاکانم لە زەوی قایم دەکەم.

هەتا ئەو هەموو هەژان و هەڵچوونی سۆزەی لەناخمدا شەپۆلدەدا، لە پەلوپۆیان نەخستووم، دەبێ ئەم ناوە جێبیلم.

ئەو کە لە رۆیشتنمان دڵنیا دەبێت، حەژمەتی[121] لەبەردەبرێ... جورئەت دەدەمە بەرخۆم و، بەبیانوی ماڵئاوایی کردنەوە، برووسکە نیگایەکی تێدەگرم. کە دەبینم چاوەکانی لە خوناوەی فرمێسکاندا نوقم بوون، غەمێکی بەسوێ، رۆح و جەستەم دەگروێ.

دەیەوێ شتێک بڵێ، هەرچەند دەکات لێوە لەرزۆکە وشکهەڵاتووەکانی بە هانایەوە نایەن. بە بێدەنگی خواحافیزی لێدەکەم و بەدەربرینەکانی سەر رووخساریشم سۆڵەچرایەکی[122] هیوای گەرانەوەی بۆ پێدەکەم. لە چاوەروانیدا بەجێیدێڵم و ناشزانم، بای سیاسەت و ئایدۆلۆژیا، گەمەیێ[123] چارۆکەداری ژیانم، بەرەو چ کەنارێکی نادیار دەبا.

---

١٢٠-وورە: هەڵمی گەرمی

١٢١-حەژمەت: ئۆقرە

١٢٢-سۆڵەچرا: دەستە چیلە: ئەو چەپکە چیلکەیەیە کە سەرێکی ئاگری پێوەیەو سەرکەی تری بەدەستەوە دەگیرا. جاران لە بری چرا و لایت لەشەواندا بۆ رێ رووناککردنەوەی بەر پێی خۆیان بەکاریان دەهێنا یان ئاگریان لە ئاگردانێکەوە بۆ ئاگردانێکتر پێدەگواستەوە.

١٢٣-گەمی: بەلەم، کەشتی.

لــە دووەم ڕۆژی گەڕانەوەمدا، ڕاپۆرتێکی دوانزە لاپەڕەییم، ســەبارەت بە گەشتەکەم، ڕادەستی ناوەندی کۆمەڵە کرد... لەوێدا، کۆمەڵێک زانیاری‌و باری ســەرنج و بیروبۆچوون و پێشــنیارم، خســتبوونە بەردەم ئەندامانی ناوەنــدی... یــەک لەو پێشــنیارانەم، لــە ئەنجامی ئەو هەواڵانــەوە بوو، کە سەبارەت بە کەمکردنەوەی قورسایی سەربازیی ڕژێم دەمان بیستن.

مــن هێشــتا لە دەڤــەری باڵەیــان بووم کە بــە چاوی خــۆم چۆڵکردنی ژمارەیەک ڕەبیە و سەربازگەم بینی. هەردوای ئەوەش، هەواڵی ئەوەشمان بۆ دەهات کە لە زۆر ناوچەی کوردســتاندا، ڕژێم دەســتی بە کێشــانەوەی بەشــێک لــە هێزەکانی خۆی کردوە... کــە لە ڕێگادا بــووم و ئەو ڕۆژەش کە گەیشــتمەوە ســەرکردایەتی، هەواڵی ئەو هێز کێشــانەوەیە، پەیتا پەیتا دەگەیشــتن... هەواڵ دەگەیشــتن بەڵام هیچ زانیاریەکی دروست و تەنانەت هیچ بەرچاو ڕوونیەکیش لای سەرکردایەتی نەبوو، نە لەسەر هۆکاری ئەو هێز گوازتنەوانەو نە لەسەر ئاقاری جوڵانی ئەو هێزانەش.

ئــەو حاڵەتەم لــە ڕاپۆرتەکەمدا، وەک حاڵەتێکی ناتەندرووســت و وەک کەموکوڕییەکــی مەترســیدار، لــە دامەزراوەی شۆڕشــدا لــە قەڵەمدابوو. هەروا نووسیبووشــم، لام سەیردەبێ ئەگەر سەرکردایەتی، بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی دروســتیان لەبەر دەســتدابێ، بڕیارێک لەســەر ئەو مەسەلەیە بدەن. هەموومان دەزانین کە هیچ سیاســیەکی سەرکەوتوو لە دنیادا، بڕیار یان هەڵوێســت لەسەر هیچ بابەت و مەسەلەیەک وەرناگرێ، ئەگەر هەموو زانیارییەکــی ورد و دروســتی بــۆ فەراهــام نەکرابێ.. بــەڵام بەداخەوە لای خۆمــان لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، لە بڕیاردان و هەڵوێســت وەرگرتندا، ئەوەندەی پشــت بــە ڕمڵێدان[١٢٤] و مەزەندە و مەزاج دەبەســترێ، ئەوەندە پشت بە زانیاری نابەسترێ.

هــەر لەو ڕوانگەیەشــەوە، پێشــنیاری ئەوەم کردبوو کــە دەزگایەک بۆ کۆکردنەوە و شــیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی زانیاری دابمەزرێ، بۆ ئەوەی

---

١٢٤ـ ڕمڵێدان: لە گوترە پێشبینیکردن.

سـەرکردایەتی بتوانێ لە بڕیار وەرگرتندا، پشـت بە کارەکانی ئەو دەزگایە ببەستێ.

ڕاپۆرتەکەم ڕادەست کرد... چاوەڕێ بووم سەبارەت بەو ڕاپۆرتە و بەو پێشـنیارو بەو کارانـەش لەماوەی ئەو مانگەدا ئەنجامـم دابوون، ناوەندی قسـەم لەگەڵدا بکەن... بەڵام نەکەسـیان بۆ ئەو مەسـەلەیە هیچیان لەگەڵدا باسکردم و، نەزانیشم ڕاپۆرتەکەم خوێنراوەتەوە یان نا.

ئەو کاتەش کە دوای چەند مانگێک لە ڕێی ئەندامێکی ناوەندی کۆمەڵەوە، وەک زانیارییەکی زۆر نهێنی و تایبەت، بیستم کە ناوەندی کۆمەڵە بەتەمای دامەزراندنـی دەزگایەکی کۆکردنـەوەی زانیارییە، تەواوێک دڵخۆش بووم. دڵخۆشـیەکەم هەر تا ئەو کاتە بڕیکرد کە تێگەیشـتم ئەو دەزگایەی ئەوان گەرەکیانـە دایمەزرێنن، ئەو دەزگایە نیە کە من لە ڕاپۆرتەکەمدا پێشـنیارم کردبوو. ڕاستە دەزگاکە، دەزگای کۆکردنەوەی زانیارییە، بەڵام بە فۆرم و پسپۆڕییەکی تەواو جیاواز لەوەی لە خەیاڵی مندا هەبوو.

ئـەو دەزگایـەی مـن پێشـنیارم کردبـوو، بـۆ کۆکردنـەوەی زانیاریی وردبوو، لەسەر ڕژێم و نەیارانی شۆڕش... ئەو دەزگایەی ئەوان نەخشەی دامەزراندنیان بۆ کێشـاوە، دەزگای کۆکردنەوەی زانیاری وورده لەسـەر ئەندامانی کۆمەڵە بە تایبەتی و ئەندامانی یەکێتی بەگشـتی... دیارە ئەوەش بەمەبەستی زانینی وەلا و بیروڕا و جموجۆڵیان.

ئەمەش سـەرەتا و ئاماژەیەکی خراپ بوو، لە بەرتەسکردنەوەی پانتایی ئازادی و ئازادی ڕادەربڕین، لەناو کۆمەڵەو لە ناو یەکێتیشدا.

# ٣٧

ڕژێم لە جووڵاندنی هێزەکانیدا بەردەوامە و دەزگای پێشمەرگایەتیش، لەبەر ئەگەری هێرشی ڕژێم، بۆ سەر ناوچەکانی سەرکردایەتی، ڕێنمایی بۆ هەموو بارەگاکان دەردەکا... بەپێی ئەو ڕێنماییانە، سەنگەرەکان قایمتر دەکرێن، ئێشکگرتنی شەوانە توندتر دەکرێ و، هەموو بارەگایەکیش دەبێ کونەتەیارەی[١٢٥] خۆی هەبێت.

هەرئەو ڕۆژەی ڕێنماییەکانمان پێدەگەن، دەست بەلێدانی کونەتەیارەدەکەین. ئەگەر هەتا لەهەڵکەندنی چاڵەکە دەبوینەوە، دنیا تاریکی نەکردبا، هەر ئەو ڕۆژە، سەرمان دەگرت و نەماندەخستە ڕۆژی دوایی.

بەرنامەی ڕۆژی دواتر، دوای تەواوکردنی کارەکانی هەواڵنامە، سەرگرتنی کونە تەیارەکە دەبێت. کات، ١٠ی سەر لەبەیانی، ڕۆژی ٧ی ئابی ساڵی ١٩٨٠یە:

لە ژێر کەپرە گەورەکەی ناوەڕاستی خێمەکانی بارەگادا، خەریکی ژمارە (٩)ی هەواڵنامەین[١٢٦].

هەموو لاپەڕە چاپکراوەکانمان، بەڕیز بەژێر کەپرەکەدا بڵاوکردوونەتەوە. هەندێکمان لاپەڕەکان دەخەینە سەریەک و یەکێکیشمان دەرزیان لێدەدا و یەکێکیکەش گۆڤارەکان سەفتەدەکا.

"ئێمە ئەو هەمووە خۆمان بەم بڵاوکراوانەوە ماندوودەکەین و بڕواشناکەم حکومەت هەر بە هەبوونیشیان بزانێ."برادەرێکمان وا دەڵێ.

بەرلەوەی کەس فریای وەڵامدانەوەی ئەو کۆمێنتە کەوێ، دەرکەوتنی

---

١٢٥ -کونە تەیارە، لە شێوەی پیتی (L)ێ ئینگلیزیدا لێدەدرا... قوولیەکەی مەتر بۆ مەترو نیوێک و پانەیەکەشی لە مەتر بەرەو خوار... بۆ خۆ لە پارچەی بۆمب پاراستنیش، سەری بەدارو گەڵا و خۆڵ دەگیرا...

١٢٦ـ هەواڵنامەی: بڵاوکراوەیەکی وەرزیی دەزگای ڕاگەیاندن بوو، لە شێوەی گۆڤاردا دەردەچوو. زیاتر بایەخی بە هەواڵ و بە چالاکیەکانی پێشمەرگە دەدا. لە هەمانکاتیشدا وتارو، بابەتی سیاسی و سەربازیشی تێدا بڵاودەکرایەوە. نوسەرە سەرەکیەکانی هەواڵنامە، مامۆستا جافر، فەرید ئەسەسەرد، ئەبوبەکر خۆشناو و من بووین.

چەنـد فڕۆکەیـەک، هەموومان لە ژێـر کەپرەکە دەردەپەڕێنـێ. فڕۆکەکان هێشـتا لە ئاسـمانی نێوزەنگن کە ئێمە دەیانبینین. دەڵێی کۆمەڵێک داڵاشی برسین و بەرەو ئێمە دادێنەوە. هەریەکەمان بەلایەکدا ڕادەکەین... هەندێکمان بـەرەو کونە تەیارە... ئەوانی دیش بەرەو پەناگەی تر. من بەرەو کونەتەیارە غـاردەدەم و چاوم لێیـە، فڕۆکـەکان بۆمبەکانیان ڕووەو ئێمـە دەترازێنن. دووریی کونەتەیارەکە، لە کەپرەکەوە لە هەشت نۆ شۆقاو تێناپەڕێت، کەچی لەو چرکەسـاتەدا، بۆتە هەشت نۆ فرسـەخ. بەرلەوەی بۆمبەکان بەر زەویی کەون، زۆربەمان فریای خۆهەڵدانە ناو کونەتەیارە دەکەوین. بەوەی باشبوو، هێشتا فریای سەرنەگرتنی نەکەوتبووین و هەروا بەسەرئاواڵایی مابۆوە، دەنا لە یەک دوو کەسمان بەولاوە، دەرفەتی خۆ هەڵدانە ناوەوەیمان نەدەبوو.

لـە ناو کونـە تەیارەکەدام... بۆ ئەوەی ناڵەو و هەوای بەهێزی تەقینەوە، پەردەکانی گوێم نەدڕێنێ. هەردوو دەسـتم بە گوێمەوە گرتووە و دەمیشم تەواوێک کردۆتەوە...

هێشـتا بۆمبەکان بەرزەوی نەکەوتوون، بۆ برووسـکە ڕوانینێک سـەر هەڵدەبـڕم... فەرهـاد بـەرەو لای ئێمە غـاردەدا... پێدەچێ سـەرەتا بەرەو شوێنێکی دی ڕایکردبێ و دواتر ڕای گۆڕیبێ.

مـاوەی نێـوان بینینـی فەرهاد و زرمە لـە زەوی هەسـتانی بۆمبەکان، چرکەیەک زیاتری پێناچێ. لەگەڵ هاڕژنی بۆمبەکاندا، سەدان تەلزم و خڕکە بەرد، بەسەر سەرماندا گیڤەیان دێ.

"ئـای قۆڵـم..." ئازاد عەبدوڵلا سـدیق کە خەریکـی خۆفڕێدانە ناو کونە تەیارەکەیە و هێشتا دەستێکی لە هەوادایە، هاواری لێهەڵدەستێ.

هەموو، خۆمـان بەبنی کونە تەیارەکەوە نووسـاندووە.. خەریکە لە ناو دووکەڵ و تەپوتۆزدا دەخنکێین... یەکێک دەڵێ:

- ئەوە کێ بوو دەیووت، حکومەت ئاگای لە هەبوونی ئێمە نیە؟

- ئـەرێ کـەی وەختی ئەو قسـانەیە! یەکێکـی تـر بەتووڕەبوونەوە، وا وەلامدەداتەوە.

فڕۆکـەکان، بـە دەنگیاندابـێ، گەلێـک دوور کەوتوونەتـەوە. نازانـم بۆمبابارانەکە چەندی خایاند، بەڵام دەزانم کات بۆتە ئامێرێکی ژەنگ گرتوو، وا جـام بـووە، دەڵێی جووڵەی لەبەربڕاوە. فڕۆکـەکان بۆ چەند چرکەیەک

دەنگیان نابیسـرێ... بە ئاستەم سەری لە بارووتا نقوم بووم، لە چاڵەکەوە دەردێنـم. تەپوتۆز و دووکەڵ، وا ئاسـمان و زەمینیـان بەیەکەوە گرێداوە، مەودایەکیان بۆ بینین نەهێشـتوتەوە. سـەرم دەبەمــەوە ناو چاڵەکەو بیرم بـەدوای فەرهـادا وێڵە. دەنگی تەقینـەوەی بۆمـب دەگات و فەرهاد ناگا... بۆنـی بـاروت دەگات و فەرهاد ناگا... ڕەنگی مـردن دەگات و فەرهاد ناگا. دیم بەرەو ئێمە ڕایدەکرد، بەڵام نەمدی خۆی هەڵداتە ناو کونە تەیارەکەوە. دڵی خۆم بەوەدەدەمەوە، بەڵکو ئەویش بەر لە تەقینەوەی بۆمبەکان، خۆی دابێتە پەنایەک.

فەرهاد، بورهان مستەفا مەعروف، لەوکاتەوە دەناسم کە بۆتە پێشمەرگە. ئەوەندە خەسڵەتی جوانی تێدان، ناتوانی هەر لە یەکەم دیدارەوە زۆرخۆشت نـەوێ. فەرهاد، یەک لە کادرە ڕۆح سـووک و چالاکەکانـی دەزگاکەمانە... نووسەرێک لەسەرەتای دەرکەوتنیدایە. لە دەزگای ڕاگەیاندن، وێڕای کاری ڕۆژانەی بارەگا، بەشی زۆری بابەتەکان، بە پەنجەکانی ئەو تایپ دەکرێن... هــەر بابەتێـک ئەو تایپی کات، پێویسـتی بە پێداچوونــەوە و هەڵەچنی نیە. هەفتەیــەک زیاتـرە، نامەیەکی بۆ ئەو کچە نووسـیوە کە چەند سـاڵێکە لە پەیوەندیەکی قووڵی ئەویندار‌یدان. نامەکەی فەرهاد ئامادەیە، بەڵام هێشـتا قاسیدێک ڕێکنەکەوتووە بۆی بیگەیەنێتە شیرینەکەی خۆی. هەموو ڕۆژێک، دوای ئەوەی سێبەر بەسەر دۆڵەکەدا هەڵدەکشێ، دێتە ژێر خێمەکەی ئێمە... کـە دڵنیـا دەبێ لــەوەی هەر من و ئەویــن، نامەکە لە گیرفانـی لای چەپی کراســەکەی دەردێنێ... بەدەنگە نەرمە ئارامەکەی، لەسەرخۆو بە سۆزێکی قووڵــەوە، دەسـت بــە خوێندنــەوەی دەکات... جارجارەش لە ژێـر بژۆڵە درێژەکانیەوە، بە چاوە وەک دەنکە ترێ ڕەشەکانی تیلەیەکم دەداتێ... حەز دەکات بزانێ مۆسـیقای ووشەکانی لە سەردەموچاوی مندا، چ جووڵەیەک درووست دەکەن، بەتایبەتیش کە دەگاتە ئەم ڕستەیەی:

"لەتیف هەڵمەت لە شیعرێکیدا ئەڵێ:

"من بشمرم باکم نیە... نە دایکم هەیە بۆم بگری و نە وێنەشم لە جانتای هیچ کچێکی شۆخدا جێدەمێنێ."

لە تیف وادەڵێ و ڕەنگە ناهەقیشی نەبێ ئاوا لە مردن بێ منەت بێ. کەچی مــن هەر کە بەخەیاڵیش بیر لە مردن دەکەمەوە، دنیایەک خەم دامئەگرێ... ئەو ناحەقی نیە لە مردن بێ منەتبێ، منیش ناهەقم نیە ئەوەندە ژیانم خۆش بوێ... من هەم دایکم هەیە، جۆگەلەیەک لە فرمێسکم بۆ هەڵبەستێ و، هەم وێنەکەشم لە ناو کوپەڵە هەنگوینی دڵی تۆدا هەڵدەگیرێ."

ئیمڕۆ کە فڕۆکەکان، وەک ڕەوە واشـــەیەکی چنگ بەخوێن، بەئاســمانی ســـەرتووژەڵەدا دەخولێنـــەوە و دۆڵەکەیان پڕکردووە لە دەنگی ناســـازیی خۆیـــان و لە گرمەوناڵەی تەقینـــەوە، من خەمی ئەوە دایگرتووم، بەرلەوەی فەرهاد نامەکەی ڕەوانەکا، نەتوانێ جارێکیتریش بۆم بخوێنێتەوە.

لەگەڵ هەر دوورکەوتنەوەیەکی دەنگی فڕۆکەکاندا، ســـەرێک لە چاڵەکەوە دەردێنــم... چــاو بەدوای فەرهــادا دەگێڕم. بەناو چڕایــی دووکەڵدا دەڕوانم، جگە لە ئاگر شــتێکی دیکە نابینم. خێمەیەک بەپێوە نابینرێ... هەر هەموویان واگڕیان گرتووە، کەڵکی کوژاندنەوەیان پێوە نەماوە... هەمووشتێک دووکەڵی لێهەڵدەستێ. لەنێوان کەپر و کونەتەیارەدا، بۆمبێک بە تیرەی چەند مەترێک و بە قووڵی مەترێک زیاتر، چاڵێکی هەڵکەندووە... چاڵێک ڕێک لەو شوێنەدا کە من بۆ دوایین جار فەرهادم دی بەرەو لای ئێمە ڕایدەکرد.

وەک ئەوەی باوەشـــێک دڕکەزی بەناو هەناومدا بێنن، ئازای جەســـتەم دەکەوێتە ژان.

بۆ چەند چرکەیەک ژیان  لە جووڵە دەکەوێ و هەموو شـــتێک ڕەنگ و بۆنی مـــەرگ دەگرێ... تەنانەت خوڕەخـــوڕی کانیاوەکەی پاڵ کەپرەکەش، لـــە لاواندنەوەی مردوو دەچـــێ. ئەوەی دەیبینم و ئـــەوەی دەیڵێم و ئەوەی دەیبیســـتم و تەنانـــەت ئەو هەوایەی هەڵیشـــیدەمژم، هـــەر هەموویان بۆنی مەرگیان لێدێ... وای چ بۆنێکی کاسکەر و سامناکە.

لەوەدایـــن کونە تەیارەکە جێبێڵین، هاشـــە و گرمەگرمی فڕۆکەکان بەناو کونەتەیارەکەماندا دەکەونەوە. پەلاماری ئەمجارەیان بارەگاکانی سەرووی دۆڵەکەی گرتەوە. لە ڕاستیشـــدا لای ئێمە شـــتێک بە ســـاغی نەماوە تا بۆ جاری دووەم بۆ بۆردومان کردنەوەی بێنەوە.

دیســـانەوە، بۆ چەند خولەکێکی تر، هاڕەهـــاڕی فڕۆکە، هەموو دەنگێکی تری ناو ئەو دۆڵە، لەناوخۆیدا بزردەکا، بەو دوو ســـێ دۆشکەیەشـــەوە کە ئێمە وەک سیستمی بەرگریی هەوایی، پشتی خۆمان پێبەستبوون.

دواجار فڕۆکەکان، دوای ئەوە تووژەڵە لەناو دووکەڵ و تەپوتۆزدا نقوم دەکەن، لە چیای مامەندەوە ئاوا دەبن.

فڕۆکەکان دیارنامێنن، بەڵام هەستێکی قورس و سامناکتر لەوەی پێشوو، خۆیم تێوە دەئاڵێنێ.

فرۆکـەکان دیـار نامێنـن و فەرهادیـش لەگەڵیاندا. بە سـەر و خوار و، بەچەپ و ڕاسـتدا دەڕوانم بەڵام فەرهادم پێپەیدانابێ... فەرهاد دەبێتە تاڵە دەزوویەکـی زۆرباریـک، لە نێـوان ژیان و مردندا... دەبێتە ئەسـتێرەیەکی کشـاو، لـە نێوان تیشـکدانەوە و کوژانـەوەدا. مەرگی فەرهاد دەبیسـتم و دەمەوێ باوەڕ بە گوێیەکانی خۆم نەکەم. مەرگی فەرهاد دەبینم و دەمەوێ بـاوەڕ بـە چاوەکانی خۆم نەکەم. بۆنی مەرگی فەرهـاد دەکەم و دەمەوێ بـاوەڕ بە کونـە لووتی خۆم نەکەم. ئـای مردن چ هەقیقەتێکـی تاڵی، ئەی تاڵترین تاڵیەکانی هەموو دنیا.

من هەمیشـە مەرگی ئازیزانم بەسـەفەر دەچوێنم... لـە خەیاڵی خۆمدا، وایادەنێـم کـە بۆ سـەفەرێکی دوور، زۆر زۆر دوور ئێمـە بەجێدێڵن... لە هەموو ئەو ماوەی سەفەرەشیاندا، نە ناویان دەهێنم و نە دەمەوێ لەدەمی کەسێکی دیکەوە گوێم لە ناوەکەشیان بێ... ئاخر دەزانم هەرکەسێک ناویان بێنێ، وەک مردوویەک باسـیان دەکات و منیش دەمەوێ وەک زیندوویەک لە زیهن و هۆش و هەستی خۆمدا بیانپارێزم... من هەر ئاوا مامەڵەم لەگەڵ مردندا کردووە، تەنانەت ئازیزترین کەسم مردبێ، نەمویستووە بچمە سەر گۆڕەکەی... ئاخر من نامەوێ بینینی گۆڕەکەی، بۆ من بێتە بەڵگەی مردنی... بـەڵام کوا لـەوەی فەرهادا دەتوانـم قەناعەت بە خۆم بێنـم، فەرهاد چۆتە سەفەر، سەفەرێکی دوور، زۆر زۆر دوور.

"هەقیقەت ئاوێنەیەک بوو لە ئاسـمان کەوتە خوارەوەو بوو بە هەزاران پارچە... هەر پارچەیەکیش هەقیقەتێکـی لەناوخۆیدا هەڵگرتووە." مەولانای ڕۆمی وا دەڵێ. ئەمڕۆ فەرهادیش لە بەرچاوم بوو بەو ئاوێنەی هەقیقەتەو هەر پارچەیەکیشی خۆی بە ڕۆشنایی فەرهادێک پڕکردووە.

لـە کونـە تەیارەکـە دیمـەدەری... حاڵەتێکـی هیسـتریایی دامدەگرێ.. تەشـتێک بەدەسـتەوە دەگرم و بـەدوای کۆکردنەوەی پارچـە بە پارچەی ئـەو هەقیقەتانەدا، بن بەرد و بـن پنچکە گیاو ناو دەوەنە هەڵکوڕوزاوەکان دەگەڕێـم... دەگەڕێـم و نە هەموو پارچەکانم بۆ کۆدەکرێنەوەو، نە بۆشـم دەبنـەوە بە ئاوێنەکەی جارانی هەقیقەت. فەرهاد، ئێمە بەجێدێڵێ و سـامی مەرگیشـی شـوێنی بارەگاکە بە ئێمە. چەند سـەد مەترێک بەرەو سەروو هەڵدەکشـێین... نەدیوێک[127] دەکەینە شـوێنی بارەگا، کەپرێکی شەقوشڕش بە پەناگا. لێرەش، چاوم دەکەوێتە سـەر هەرشـتێ، سـەرهەر دار و هەر بەرد و هەر بسـتێ، فەرهاد لێیەوە بەرەو ئێمە، بەغاردان دێ. ئەستێرەکان

١٢٧- نەدیو: پێوار: نادیار، شوێنێکە کە بەرچاونیە.

دەخەون، بەڵام من هێشتا بێدارم. چاوەکانم هیلاک دەبن، کەچی پێڵووەکانم دەبنــە دوو کەنــاری جۆگەلە ئاوێک، جۆگەلە چۆڕەبــڕ دەبێ، بەڵام ئەوان بەیەک ناگەن. هانا بۆ زیندەخەو دەبەم، خەونەکانیش دەبنە مۆتەکەو یەخەی ڕۆحم بەرنادەن.

بۆ ڕزگاربوون لەو کابوسە یەک لە دوای یەکانە، پەنا دەبەمە ئەو ڕۆژەی، لەیادی دامەزراندنی یەکێتی، لە گۆڕەپانەکەی پشتی بارەگاکەماندا، ئاهەنگمان دەگێڕا... هەرچی پێشمەرگەی سەرکردایەتی هەبوون، بە نوێنەرانی هەموو لایەن و پارتە ئۆپۆزسیۆنە عێراقیەکانیشەوە، ئامادەی ئەو ئاهەنگەبوون.

من هەم ووتاری دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی نیشتمانیم، بە هەر دوو زمانی عەرەبی و کوردی خوێندەوەو، هەمیش شیعرێک کە تازە نووسیبووم.

**ئەگەر گوڵ بای،**

**ڕەنگە بەسەر سنگی کچێکی شۆخەوە بای.**

**تا سیس دەبووی، چەندجارێ بۆنی دەکردی، لەدوایدا فڕێیدەدای.**

**یان ئەوەتا، بەسەر لاسکە سەوزەکەی خۆتەوە،**

**بۆچەند ڕۆژێ وەک ئەستێرە دادەگیرسای.**

**لەدواییدا، بەسەرگەڵا و ڕەگەکانتا هەڵدەپرووکای.**

**بەڵام هاوڕێ، خۆ تۆ گوڵ نیت... تۆ شەهیدی.**

**نەسیس دەبی و نەدەشوەری...**

**تۆ وەک خوێن و خۆشەویستی و ئازادی وای**

**لە ناو دڵی پڕ ئومێدی هەمووماندای[١٢٨].**

---

١٢٨- ئەو شیعرەم لە گۆڤاری نووسەری کوردستاندا بڵاوکردەوەو پێشکەشم کرد بە(شەهید فەرهاد). ئەو شیعرە دووجار ئاوازی بۆ دانراوە، جاری یەکەم لەلایەن هونەرمەند ئاراس ئیبراهیمەوە و بەدەنگی شوان کابان وتراوە، جاری دووەمیش بەدەنگ و ئاوازی خالد ڕەشیدی هونەرمەند. هەر لەسەر پێشنیاری ئەویش وشەی (پڕ

شــیعر خوێندنەوەکەی من کەوتە دوای پێشکەشــکردنی شانۆگەریەکی بێدەنگ(پانتۆمایم). کە فەرهاد، ڕۆڵی پێشــمەرگەیەکی شەهیدی تێدابینی. کە لە خوێندنەوەی شــیعرەکە بوومەوە، باوەشــێکی توونــدی پێداکردم و پێی گووتم:

"ئــای کە شــیعرێکی جوان بــوو... خۆزگە بۆ دوای شــەهیدبوونی منت هەڵدەگرت."

ئەو ڕۆژە وامدەزانی فەرهاد بەگاڵتەوە وام پێدەڵێ، کەچی ئەوەتا ئیمڕۆ، هەر بەڕاســتی شەهید دەبێ... شەهید دەبێ و پارچەکانی دەکەینە توورەکە کفنێکەوەو لە نزیک سەرچاوەی ئاوی تووژەڵە، بەشێوەیەکی کاتیی بەخاکی دەسپێرین.

چ دیمەنێکی پڕ ئازارە، دەڵێی خەنجەرێکی ژەهراویەو تاســەر ئێســقانم ڕۆدەچێ.

ســبەی ناگاتــە ئەم وەختە، دایک و خوشــک و براشــی دێــن... دەبێ لە ئێســتاوە تا ئەو کاتە، لە چاوەڕوانیی دیدارێکی تاڵدا بژیم... تاڵترین دیداری ژیانی من.

"بەمردوییش نامەوێ بچمەوە ژێر سێبەری دەسەڵاتی بەعس."

ئەو قســەیەی فەرهادیــان پێدەڵێم. دەبــێ قەناعەتیان پێبێنــم گۆڕەکەی هەڵنەدەنــەوە و توورەکــە تەرمەکەی لەگەڵ خۆیانــدا نەبەنەوە... دەبێ لەو ئازارە بەســوێیەی دوا دیمەنی فەرهاد بیــان پارێزم. دەمەوێ ئەوان، وەک منیان لێنەیات و هەر بەو خەیاڵەوە بژین کە فەرهاد بۆ سەفەرێکی یەکجار دوور و درێژ ڕۆیشتووە و ڕۆژێ لە ڕۆژان دێتەوە بۆ لایان.

ئەوان دێن و هەوڵی من لەبەردەم ویستی ئەواندا، لە بردنەوەی تەرمەکەدا، شکست دێنێ.

---

لەزامی) ناو دوا دێڕیی هۆنراوەکەم، بە (پڕ ئومێدی) گۆڕی.
ئەو شەوەش تیپی مۆسیقای شەهید کارزان ئەو کاسێتەیان پیشانی مامجەلالدا کە یەکەم بەرهەمی خۆیان بوو، مامجەلال لە بارەگاکەی ئێمە میوان بوو... بەگشتی گۆرانی و سروودەکانی بەدڵبوو، بەڵام کە هاتە سەر شیعرەکەی من، وتی «من هەڤاڵبام ئەو ئاوازەم بەدڵنەدەبوو... ئەو شیعرە هێند ناسکە، شەهیدبوونت لا ئاسان و جوان دەکات، بەڵام کە بەو ئاوازەوە گوێت لیدەبێت، ناسکیەکەی لەدەستدەدات.»

بۆ شـــەوێش، چەند پێشمەرگەیەک، لەگەڵ گریە و لاواندنەوەی ئەواندا، تەرمەکە بە شان تا دێی (سونێ) دەبەین. چ شەوێکی سامناک و ناخۆشە... ناخۆشترین شەوی ژیانی من.

ئـەو کاتەی بـەلای بارەگا چۆڵەکـەی زەڵێماندا ڕەتدەبوویـن، خوێندنی کوندەپەپوویـەک، بەسـەر لادیـواری ئـەو ژوورەی کـە لەگـەڵ فەرهـادا بەتەمابووین بۆ حەمام دروستیکەین، ئەوەندەی تر غەم و سامی لە دڵدا دەچاندیـن. ئەو وەختـەی دەگەینە(سـونێ)، مانـگ وەک پیرەژنێکی ڕەنگ زەردی کۆماوەی بەسـاڵاچوو، بە هەنـگاوی قورس قورس، بەرەو لێواری گۆڕی گەشتی ئەو شەوەی خۆی دەچێ.

بەئەسـپایی تەرمەکـە لەبن هەیوانـی مزگەوتا دادەنێـن و دوا ماڵئاوایی لە فەرهاد دەکەین... دایک و خوشـک و برا و کەسـوکار، بەدەم قژڕنین و شـین و شـەپۆڕەوە، باوەش بەیـەک بەیەکمانا دەکـەن.. ئەوەندە بەتوندی باوەشمان پێدادەکەن، وەک ئەوەی، باوەش بەو خەونانەدا بکەن کە فەرهاد بۆ بەدیهێنانیان ببوو بە پێشمەرگە.

# ٣٨

لــە دوای بۆردوومانەکــەوە چیتر، نە دڵ بەرگەی دەگرت، نەچاو بەرایی دەدا و نە شوێنەکەشــمان هەســتی ئەمان و دڵنیایی دەداینێ، بۆیە بڕیاری گواســتنەوەماندا. بەرامبەر بە خۆمان و بەو بەری چەمەوە، گردی کوپان دەکەینە شــوێنی بارەگا. گردی کوپان، باســکێکی درێــژی بەدار و درەخت چڕو، لە شــوێنی پێشــوومان کەمێک گەرمتر، بەڵام لە ڕووی سەربازییەوە قایمترە. ئەگەر فڕۆکە جەنگییەکانی عێراقیش، بیانویستایە بۆمباباران کەن، دەبوایە بایی چەرخدانێک، بچنە ناو ئاسمانی ئێرانەوە و لەوێوە بۆ سەرمان بادەنەوە... ئەوەش بۆ ئەوان، ئەوەندە سانا نەبوو. نازانم بۆ هەر یەکەمجار کــە لە (زەڵــێ)وە هاتیــن، ئێرەمان لەبەرچــاو نەگرت. دیــارە عەقڵی دوای خەســارەت باشتر ئیش دەکا. تا نەکەوتینە بناغە لێدان و چەند کوپەیەکمان نەدۆزییەوە، نەمادەزانی بۆ بەو گردەیان دەگووت، گردی کوپان... کوپەکان، لــەو جۆرانەبوون کە وەختی خۆی زەردەشــتیەکان ئێســک و پرووســکی مردووی خۆیانیان تێدا هەڵدەگرت.

زۆرنەبوو ڕادیۆیەکی (ســۆنی) بچکۆلەم کڕی بوو... لەو ڕادیۆیانەی کە پێشــمەرگە بــە ملی خۆیانــدا دەکرد و لە هەر جێیەک بــان، هەم گوێیان لە هەواڵ دەگرت و هەم لە گۆرانی و مۆسیقاش.

خەریکــی گڵەبانکردنــی خانووی بارەگاکەمان بوویــن، ڕادیۆکەم بە لقی دارگوێژەکەی پشتی خانووەکەوە هەڵواسیبوو... بەدەم ئیشکردنەوە گوێمان لەو ســروودە حەماســەت خولقێنانە دەبوو کە ڕادیۆی بەغدا لێکدا لێکدا[١٢٩] بــڵاوی دەکردنــەوە. لەپڕ ســروودەکان، بــۆ خوێندنــەوەی بەیانێکی زۆر گرنگ وەستان. ســەدام حوسەین، بەدەنگی خۆی بەیانی هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی جەزائیری خوێندەوە. بیانووی ســەدام، لە هەڵوەشاندنەوەی ئــەو ڕێکەوتننامەیدا، ئەوەبوو کە گوایە وەختی خــۆی، لە ئازاری ١٩٧٥دا، بەناچاریی ئەو ڕێکەوتننامەیەی لەگەڵ شــادا مۆرکردووە... بەقسەی خۆی ئەگــەر ئەوەی نەکردبا، ســوپای عێراقی کە لە پێنج بۆمبــای گەورەو پێنج هەزار گوللەتۆپ زیاتری نەمابوو، لەبەرامبەر شۆڕشی کورددا، ڕووبەڕووی شکستێکی حەتمی و گەورە دەبۆوە.

---

١٢٩- لێکدا لێکدا: پەیتا پەیتا

سـەدام دەیویست دەرفەتی رووخانی شـا و هەڵوەشانەوەی دامەزراوە سـەربازی و هەواڵگرییەکانی ئێران، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو شکسـتەی خـۆی بقۆزێتـەوە کـە لـە پەیماننامـەی جەزائیـردا بەرامبـەر بەشـای ئێـران دووچـاری هاتبوو... هەر ئەو هەسـتی شکسـت و بینینی دەرفەتی قەرەبووکردنەوەش بوو کە وای لە سەدام کرد، هەر لەگەڵ ڕووخانی شادا، دەسـت بە زەمینەسـازیی پەلاماردانی خاکی ئێران بکا. سـەرەتا لە کوردە فەیلییەکانەوە دەستپێکرد.

لەبەرە بەیانی چواری نیسـانی ئەو سـاڵەدا، (١٩٨٠) بەعس شـاڵاوێکی سستماتیک و دڕندانە دژی کوردە فەیلییەکان بەرپا دەکا. لەو شاڵاوەدا:

* هەمـوو بازرگانە کـوردە فەیلییەکانـی بەغدا، بەنـاوی کۆبوونەوەی بازرگانان، بۆ ژووری بازرگانیی بەغدا بانگهێشـت دەکا. دوای دەسـتگرتن بەسەرهەموو ناسنامەو مەدرەک و بەڵگەنامەکانیاندا، هەر هەموویان دەگرێ و لە کات و شوێنی جیاجیادا وونیان دەکا.

* هەرچـی نێرینـەی کوردانی فەیلی هەن، لە مێرمنداڵەوە تا سـەرووی حەفتا سـاڵی، بەوانەشـەوە کـە لـە دامودەزگاکانی حکومـەت و لە ڕیزی سـەربازیدا خزمەت دەکەن، هەر هەموویان دەگرێ و بێ سەروشـوێنیان دەکات.

* ژن و منداڵ و پیروپەککەوتەکانیش، بەجلی بەریانەوە، لەپشـتی ئیڤای سەربازی قایم دەکا و لەسەر سنوورەکانی ئێران فڕێیان دەدات.

.مافی ڕەگەزنامە لە هەموو ئەوانە دەکێشیتەوە کە ڕەگەزنامەی عێراقییان هەیە.

* هەرچی سامان و موڵک وماڵیان هەیە، دەستی بەسەردا دەگرێ.

بەعس، ئەو شـاڵاوە بە تۆمەتی ئەوە ئەنجام دەدا، گوایە کوردانی فەیلی بەڕەچەڵـەک ئێرانیـن و وەلا و دڵسـۆزییان بۆ خاکی عێـراق نیە... ئەمە لە کاتێکدا بە گوێرەی زۆر لەسەرچاوە مێژووییەکان، کوردانی فەیلی، زۆر لە پێش هاتنی عەرەبەوە بۆ عێراق، لەم وڵاتەدا ژیاون.

بەدوای ئەو پاکتاوە ڕەگەزیەدا، عێراق کەوتە کێشانەوەی بەشێکی زۆر لە هێزە سەربازییەکانی خۆی، لەناوچەکانی کوردستانەوە بەرەو سنوورەکانی ڕۆژهـەڵات و خوارووی عێراق... بەمەش گرژی و ئاڵۆزییە سـنووریەکانی

نێـوان هەردوو دەوڵەت دەسـتیان پێکرد و دواتریش سـەریان بۆ هەندێک پێکدادانی چەکداری کێشـا. تا کار گەیشتە هەڵوەشـاندنەوەی پەیماننامەی جەزائیر و، پێنج ڕۆژ دواتریش هێرشە هەوایی و زەمینییەکانی عێراق، وەک سەرەتای شەڕی هەشت ساڵەی نێوانیان، بۆ سەر ئێران دەستیان پێکرد.

ئێمە، ئەگەرچی بەرچاوڕوونیەکی وامان لەسەر شەڕەکەو، لەسەر ئاقاری پەرەسـەندن و لێکەوتەکانی نەبوو... لەگەڵ ئەوەشـدا هەر هەڵوەشانەوەی پەیماننامەکەمـان، بـە دەسـکەوتێکی گەورە بـۆ میللەتەکەمان لـە قەڵەمدا. ئەگەرجـاران بە گوێـرەی بڕگە و ماددەکانـی ئـەو پەیماننامەیە، هەردوو دەوڵـەت توانیبایان لـە لێدانی بزووتنەوەی کورددا، لە هـەردوو پارچەیدا، هـاوکارو هەماهەنگبـن، ئیدی لەوێ بەدواوە ئـەوە کۆتایی دێ و هەریەک لەو دوو دەوڵەتەش، ناچاردەبن هەم هاوکاری کوردی ناو دەوڵەتەکەی تر بکەن و، هەمیش ناتوانن بە هێز و توانای سەربازیی جارانیانەوە، پەلاماری بزووتنـەوەی کورد بدەن. لەوێ بەدواوە دەمایەوە سـەر سـەرکردەکانی کورد، تا چەند دەتوانن لەو بەینەدا یارییەکی زیرەکانە بەڕێوە بەرن و نەبنە کارتی گەمەی دەسـتی هیـچ لایەکیان و، ئەوەنـدەش دەتوانن، بۆ قازانجی جوڵانەوەی کورد، کەڵک لەو دۆخە تازەیە وەرگرن.

هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕەکەدا، گوشارە هەوایی و زەمینیەکانی ڕژێـم بۆ سـەر هێـزی پێشـمەرگە بەڕادەیەکـی بەرچـاو کەمبوونەوەو، چالاکیەکانی پێشمەرگەش هەڵکشانێکی زۆریان بە خۆیانەوە دی.

یەکێتی، لە هەڵگیرسـانی شـەڕەکەوەو تا دواییش، هەڵوێستێکی فەرمی بەرامبەر بەو شـەڕە ڕانەگەیاند... لەلایەکەوە دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی بەغدای هەڵگرتووەو لەلایەکەی تریشەوە، لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێرانیدا، لە پەیوەندییەکی ناجێگیرو لەقدایە.

ئەگەرچی سـەرکردایەتی یەکێتی لەسـەرەتادا، ئومێدێکی زۆری لەسەر پەیوەندیەکانـی خۆی لەگـەڵ ئێراندا هەڵچنیبوو... چەنـد جارێکیش وەفدی یەکێتـی چووبوونـە ئێـران و سـەردانی خومەینیشـیان کردبـوو، بـەڵام ئێرانیەکان، ئەوکاتەی ئەو قەناعەتیان لاپەیدابیوو کە دەتوانن ڕژێمی سەدام بڕوخێنن و ڕژێمێکی هاوشـێوەی کۆماری ئیسلامی لە عێراقدا دامەزرێنن، ئەوەنـدە حسـابیان بـۆ پەیوەندییەکانی خۆیـان لەگەڵ یەکێتیـدا نەدەکرد. سـەرباری ئەوەش ئەوان یەکێتیان بەهێزێکی سـێرکولار (عەلمانی) دەزانی لە دیدی ئەواندا هێزی سـێرکولار نابێتە هاوپەیمانی کۆماری ئیسلامی... لە هەمانکاتیشـدا کۆماری ئیسـلامی، یەکێتی بە هاوکاری و دۆستایەتی هێزە

کوردیەکانــی ئێــران تۆمەتبــار دەکرد. هــەر بۆیەش کە لە کۆتایی ســاڵی (١٩٧٩)دا، لیبیــا فڕۆکەیەکــی پڕ لە چەکی ســووک و قورســی بۆ یەکێتی ڕەوانــەی تاران کرد، ئێرانیــەکان، بەبیانووی ئەوەی ئەو چەکانە دەکەونە دەســتی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و حیزبی دیموکرات، دەستیان بەسەریاندا گرت. ســەرباری دەخالەتی لیبیا و ســوریاش، جگە لــە ژمارەیەکی کەمی دەمانچەو کلاشــینکۆف، ئەوانی تریان بۆ خۆیان برد.

درێژەکێشــان و پەرەسەندنی شەڕەکە و ســەرقاڵبوونی هەر دووکیان بەیەکتریەوەو، سووکبوونی گوشاریان لەسەر پێشمەرگە، ئەو بۆچوونەیان لای هەندێ لە ئەندامی ســەرکردایەتی یەکێتی درووستکرد کە لاوازبوونی هــەردوو ڕژێــم و ناشــیرین بوونییــان لەنــاو کۆمەڵــگای نێودەوڵەتیــدا، زەمینەیەکی لەباری بۆ کوردانی هەردوو پارچە خوڵقاندووە، تا ستراتیژیان یەکخەن و دەوڵەتێکی کوردی، لەسەر خاکی هەردوو پارچەدا ڕاگەیەنن... بۆ ئەو مەبەســتەش، قســە لەگــەڵ کۆمەڵە و ڕەوتەکەی شــێخ عیزەدینی حوســەینی و حیزبی دیموکراتیشدا کرا... دواجار هەوڵەکە نەگەیشتە هیچ ئەنجامێــک.

ئەو مەسەلەیە، مەسەلەی دەوڵەتی کوردی، لە خەیاڵێکی خۆشی هەندێ لــە ئەندامانــی نــاو ســەرکردایەتی یەکێتی بــەولاوە شــتێکی دیکەنەبوو... دەنــا نە دیراســەیەکی وردی ئــەو بابەتەکرابوو، نە زەمینــەی نێوخۆیی و نێودەوڵەتیشی بۆ سازکرابوو... وێڕای ئەوەش هیچ کام لەو دوو دەوڵەتانە ئەوەندە لاوازنەببوون، هەرکاتێک بیانەوێ نەتوانن بانەدەنەوە سەر ئێمە.

ئێمــە، دەبوایــە بەهاتنــە پێشــەوەی ئەو دۆخــە، لەبــری بیرکردنەوە لە درووســتکردنی دەوڵەتێــک کەهیــچ زەمینەیەکــی نێوخۆیــی و هەرێمیی و نێودەوڵەتیشــی نەبوو، بیرمان لە وەســتاندنی شــەڕی ناوخۆکردبایەوە و بەرەیەکی نیشــتمانیی فراوانمان، بۆ یەکخستنی هێزو توانای هەموو لایەنە کوردییەکان درووستکردبا و بەرنامەیەکی نەتەوەییمان داڕشتبا. قسەکردن لەســەر مەســەلەیەکی ئاوا گــەورە و گرنگ، بەبێ هەبوونــی بەرنامەیەکی نەتەوەیــی و یەکێتیــی و هەماهەنگــی نێوان هەمــوو لایەنــە کوردییەکان، نەدەنگدانەوەی دەبێ و نەدەشبێتە کردار.

## ٣٩

تا دێ پلەی ســاردیی لای ئێمە بەرەو خوارتر دەکشــێ و، پلەی گەرمیی شــەڕی نێوان ئێراق و ئێرانیش، بەرەو سەرووتر هەڵدەکشێ. لە نێوان ئەو داکشــان و هەڵکشانەدا، یەکێتی هێزەکانی خۆی بەرەو قووڵایی زیاتر دەبا، قیــادەی موەقەتـــەش، لە دیوی ئێرانـــەوە، هێز دەهێنـــێ و پەلاماری هەندێ ناوچـــەی ســنووریی و ژێر کۆنترۆڵـــی یەکێتی دەدا... چەند شـــوێنێک بە بێ شـــەڕدەگرن... زۆر نابا، بەشـــەڕ لێیان وەردەگیرێتەوە. هێنانی هێز لەلایەن قیــادە موەقەتـــەوە، بۆ ئـــەو ناوچانە، زیاتر بۆ نمایشـــی هێز و بۆ گڕیشـــە پێکردنە[١٣٠] و هیچی ترنا... دەنا خۆشیان دەزانن، لەو ناوچانەدا، نە خاکیان بەدەستەوەیە، نە هێزێکی شەڕکەریان هەیە و نە ڕێکخستن و جەماوەرێکی واش، مایەی پشت پێبەستنیان بێت.

ئێمە، ئەوان بە مقاشـــی دەســـتی داگیرکەران و بە تێکدەری شـــۆڕش و بە شۆڕشـــی چەواشـــە دەزانین، ئەوانیش ئێمە، بە جەلالی و بە بەشـــێک لە بەرنامەی بەعس وێنادەکەن.

ئەوان لە دیدی ئێمەدا، ئەو قوفڵە ژەنگاوییەن کە دەرگای ســـەر ئاســـۆی ئازادیان کلۆم داوەو، شـــکاندنی بە ئەرکـــی چینایەتی و نەتەوایەتی خۆمان دەزانیـــن... ئەوانیـــش، ئێمە بە ڕێگر لە بـــەردەم گێڕانـــەوەی پیرۆزییەکانی پێشووی خۆیان دەبینن و لە ناوبردنمان بە بەدیهێنانی یەک لە ئامانجەکانی شۆڕشی ئەیلول دادەنێن.

ئێمە شۆڕشـــی نوێ و ئەوانیش شۆڕشـــی گوڵانیـــان ڕاگەیاند. هەردوو لامان، خۆمان بە زادەی هۆکاری بابەتی و پێداویستیی قۆناغ و زەروورەتی مێژوویی دەزانی و ئەوی دیکەش بە پیلان و بەرنامەی داگیرکەران.

ئێمە، تەنها ئەو دیوەی سەرهەڵدانی شۆڕشی خۆمان و ئەوانمان دەدی و دیوەکەی ترنا... ئەو دیوەنا کە پەرچەکردار و گیانی تۆڵە سەندنەوە و گرێی دەروونی، ڕۆڵی سەرەکییان دەبینی تا هۆکاری تر.

جەلالیەت، گرێیەکی دەروونی لای مام جەلال و، ئاشـــبەتاڵیش لای ماڵی

---

١٣٠. گڕیشە پێکردن: شەڕپێفرۆشتن.

مەلا مستەفای درووستکردبوو. هەر لایەو کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیەی لە تێکشکاندنی ئەوی دیکەدا دەبینی.

ئاشبەتاڵ، بۆ مەلا مستەفا گلان و بۆ مام جەلالیش هەستانەوەو ڕاستکردنەوەی هەڵەی کوشندەی جەلالیەت.

ئیمە، ئەوانمان بە خاوەنی ئاشبەتاڵ دەزانی و مافی ئەوەمان پێنەدەدان، جارێکی تر شۆڕش بەرەو هەڵدێر بەرنەوە. ئەوانیش لە بنەماڵەی بارزانی بەولاوە، مافی ڕابەرایەتیکردنی شۆڕشیان بەهیچ کەسێکی دیکەنەدەدا. ئاوا هیچمان واوەتر لە سنوری حیزب و لەو دیوی ئایدۆلۆژیاوە، پانتاییەکمان بۆ ڕەوایی هەبوونی ئەوانی دی و بۆ پیکەوە ژیان و هەڵکردن نەدەدی.

لێرەوە، هەوڵی هەردوولا بۆ سڕینەوەی یەکتری دەست پێدەکا. مام جەلال و ماڵی بارزانی، هەمان ململانێی سەردەمی جەلالی و مەلایی، بۆ ناو شۆڕشی نوێ و شۆڕشی گوڵان دەگوازنەوە... بە هەمان کۆنە شمشێری ژەنگاوی، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد، دەکەن بە دولەتەوە. هەر لەتەو توانا و کاتێکی زۆری خۆی لە سڕینەوە و دزێوکردن و بە خائن ناساندنی ئەویتردا بە فیڕۆ دەدا... هەوڵی سڕینەوەی یەکدی، لای هەردوولا، دەبێتە ئامانجێکی باڵا، باڵاتر لە بەرژەوەندی نیشتمان، باڵاتر لە بەژنی ئەو هەموو توانا گیانی و مادییانەی تا ئەو کاتەو دواتریش بە هەدەرمان دان. شەڕی نێوان ئێراق و ئێران بەردەوام دەبێ و ئێمەش لە مل وەبەرنانی یەکتری و لە هەوڵی سڕینەوەی ئەویتردا.

شــەڕی ناوخــۆ دریژە دەکێشــێ و لەگەڵ خۆیــدا خەونەکانــی ئێمەش بەدرووستکردنی هێزێکی چەکداری هۆشیار و خاوەن بیروباوەڕ و دەم و دەســت و داوێن پاک، بەرەوکاڵبوونەوە دەبات. لە زۆر شوێندا، چەندایەتی دەکەوێتــە پێــش چۆنایەتیــەوە... دڵنەوایــی و مــودارا کــردن [١٣١]، جێــگای لێپرسینەوە و سزادان دەگرنەوە.

لــە هەندێ شــوێن، پارە لە خەڵک ســەندراوە، جەردەیــی و ڕاوڕووت کــراوە، ســووکایەتی و بێ ڕێزی بــە هاووڵاتیان کــراوە، تەنانەت خەڵک هەبــووە، بەبــێ لێکۆڵینــەوە و دادگایی کــردن کوژراوە، بەڵام لە ترســی ئەوەی نەوەک تاوانکار بچێتە پاڵ هێزێکی نەیارەوە، چاوپۆشی لێکراوە.

هەندێک لە فەرماندە سەربازییەکان، ئەو دۆخە دەقۆزنەوە و وەک حاکمی ڕەهــای ناوچەکانی خۆیــان ڕەفتاردەکەن و، حســابێکی وا بــۆ کادیرانی ڕێکخســتن ناکــەن... بەمەش کێشــەی قــووڵ دەکەوێتە نێــوان ئەو جۆرە فەرمانــدە و کادیرەکانەوە. دەکــرێ هەرێمی یەک وەک یەک لەو نموونانە تەماشــاکەین. کادیرانی کۆمەڵە، لە ســنوری ئەو هەرێمــەدا، چەندین جار، ڕەخنە و ناڕەزایی خۆیان لەســەر بوغرایی و لەســەر ڕەفتار و کردەوەکانی محەمەدی حاجی مەحمود، فەرماندەی هەرێمی یەک، خستبووە بەرچاوی مام جــەلال و ناوەندی کۆمەڵە و مەکتەبی سیاســیش، بەڵام کارێکی وا نەکرا، چارەســەرێک بۆ ئەو کێشــانە بدۆزنەوە. کادیــرەکان، محەمەدی حاجی مەحمودیان بە لادەر لە پرنســیپەکانی پێشــمەرگایەتی، بە شــڕەخۆری و ڕاووڕووت، بە پارە لە خەڵک ســەندن و بە پەیوەندی گوماناوی تۆمەتبار دەکرد... ئەویش لە بەرامبەردا، کادیرەکانی بە تووندڕەو و گێرەشــێوێن و ڕێگر لە بەردەم کارەکانی خۆیدا وەسف دەکرد.

بەشێکی زۆر لە ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵە، بەتایبەتی ئەوانەی بە کۆمیتەی هەرێمەکانی جاران حساب بوون، پشتگیری داواکاریی کادیرەکانیان دەکرد... هەوڵیان دەدا کێشــەکان بە شێوەیەک چارەســەر بکرێن، هەم سنورێک بۆ بوغرایــی محەمــەدی حاجی مەحمود دانێن و هەمیش بــە قازانجی کۆمەڵە بشــکێتەوە. هەرچی مام جەلال و نەوشــیروان مســتەفاش بوون، بەدوای

١٣١ـ موداراکردن: دڵڕاگرتن، ئاگالێبوون

چارەســەری مامناوەندیدا دەگەڕان... چارەســەرێک، هەم محەمەدی حاجی مەحمود نەڕەنجێنێ و هەم کادیرەکانیش ڕازیکا.

ئــەوان زیاتر لە ســەرکردەکانی دیکــە و لە کادیرەکانیــش، مێنتاڵەتی و بیرکردنەوەی محەمەدی حاجی مەحمودیان دەناســی و دەیانزانی بەو پێگە عەشایەریەی لەناوچەکەدا هەیەتی، لە هەر لێکۆڵینەوە و سزایەک بەرامبەری ئەنجامبدرێــت، یاخــی دەبێ و ســەنگەر گۆڕین بۆ ئەو، لــە ئاوخواردنەوە ئاســانتردەبێ... بۆیــە ئــەوان لەگــەڵ چارەســەرێکدابوون، کــورد گوتەنی «نەشیش بسووتێ و نە کەباب.»

لــە ئامادەنەبوونــی مام جەلال و نەوشــیروان مســتەفادا، بــە پێداگری کادیــرەکان و بە پشــتگیریی کۆمیتــەی هەرێمەکانیش، مەکتەبی سیاســی، بەمەبەستی یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی خەریک بوو، هەرێمەکەیان ئیفلیج دەکرد، لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی لە مەلا بەختیار و عومەر شێخموس پێکهێنا. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان، بەبڕیاری ســڕکردنی محەمەدی حاجی مەحمود و جێگرەکەی و ژمارەیەک لە کادیرەکانی کۆمەڵە کۆتایی هات.

محەمــەدی حاجی مەحمــود و جێگرەکەی (ڕەئووفی خەلیفە ســەعیدی ئامــۆزای)، لەگــەڵ ژمارەیــەک فەرماندەی کــەرت و مەفــرەزە و نزیکەی نیــوەی هەرێمەکــە، وەک مــام جەلال و نەوشــیروان مســتەفا پێشــبینیان دەکرد، پەیوەندیان بە حســیکەوە کرد. حسیکیش یەکسەر کردیانە ئەندامی ســەرکردایەتی خۆیان. ئیدی لــەوێ بەدواوە، کێشــەکانی هەرێمی یەک لە کێشــەی محەمەدی حاجی مەحمود و کادیرەکانەوە، بوو بە کێشــەی نێوان حســیک و یەکێتــی. گرتنی نەوشــیروان مســتەفاش[132] لەلایــەن ئەوانەوە، کێشەکەی بەرەو ئاستێکی مەترسیدارتر برد.

بۆ گفتوگۆکردن لەســەر ئەو ڕووداوە تازەیە و لەسەر هاتنی هێزەکانی

---

١٣٢- چەند هەفتەیەک لەوەوبەر، نەوشیروان مستەفا بۆ سەردانێکی خێزانی بە خۆی و سێ پێشمەرگەوە، دەچێتە ناوچەی شارباژێڕ... لەوکاتەدا، هەندێک کێشە لە نێوان هێزەکانی یەکێتی و هێزەکانی حسیکدا ڕوودەدەن. بەمەبەستی قسەکردن لەسەر ئەو کێشانەو دۆزینەوەی چارەسەرێک، تایەری عەلی والی، ئەندامی سەرکردایەتی حسیک، بۆ شوێنەکەی خۆی داوەت دەکات. لەکات و شوێنی دیدارەکەدا، محەمەدی حاجی مەحمود، بەخۆی و هێزێکەوە، پەلاماری نەوشیروان مستەفا وهاوڕێ پێشمەرگەکانی دەدا... هەر هەموویان چەک دەکەن و بەگیراوی لەگەڵ خۆیاندا دەیانبەن. بەمەش کێشەکانی نێوان یەکێتی و حسیک، چوونە ئاستێکی زۆر ئاڵۆزو مەترسیدارترەوە.

قیادەی موەقەتەو، بۆ قسەکردنیش لە سەر سەربەخۆیی و پێگەی کۆمەڵە لە ناو یەکێتیدا، لە مانگی یەکی ١٩٨١دا، زنجیرەیەک کۆبوونەوە بۆ کادیرانی کۆمەڵە، لە زەڵێ ڕێکخران. بەڕێوەبەرانی کۆبوونەوەکان، مامۆستا جافر و فەریدوون عەبدولقادر بوون... ئەمیان نوێنەرایەتی دیدی کۆمیتەی هەرێمەکان و ئەویان نوێنەرایەتی دیدی گروپی زیندانی دەکرد... هەردووکیشیان لەسەر زۆربەی مەسەلەکان هاوڕابوون، بەتایبەتیش ئەوانەی پەیوەندیان بە نەوشیروان مستەفاوە هەبوو. زەحمەتێکی وای نەدەویست بگەیتە ئەو ئەنجامە کە بەڕێوەبەرانی کۆبوونەوەکان، ئەوەندەی مەبەستیان وەبەرهێنان بوو لەو دۆخەی درووستببوو، ئەوەندە مەبەستیان گەیشتنە ڕایەکی گشتگیر نەبوو، لە دۆزینەوەی دەریچەیەک بۆ ڕزگارکردنی نەوشیروان مستەفا، یان بۆ بەرزکردنەوەی وورەی ئەندامانی کۆمەڵە.

لەو برگەیەشدا کە باس لە پێگە و سەربەخۆیی کۆمەڵە، لەناو یەکێتیدا دەکرا، دەیانویست وێنەیەکی وا نیشانی ئامادەبوانی کۆبوونەوەکان دەن کە تێیدا کۆمەڵە لە ناو یەکێتیدا مەغدور و هەق خوراو دەرکەوێ.... ئۆباڵی مەغدوریەکەشیان، وەک تێبینی دەکرا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەخستە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا...

ئەو ئەنجامگیریەی بەڕێوەبەرانی کۆبوونەوەکان دەیانویست بیخەنە بەرچاوی ئامادەبووان، لەو قەناعەتەیانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ڕەنگە نەوشیروان مستەفا، بە ئاسانی لە چنگی حسێک ڕزگاری نەبێ... ئەگەر ڕزگاریشی بێ، تووشی جۆرێک لە تێکشکانی دەروونی و بێ ئومێدیەکی وا دەبێ کە ناتوانێ چیتر بە هەمان نەفەسی پێشووی، درێژە بەکارەکانی بدا... تەنانەت ئەگەر بەردەوامیش بێت، ئەو هەیبەت و کاریگەریی و هەژموونەی جارانی، لەناو کۆمەڵە و یەکێتیشدا نامێنێ.

زۆر بەسەر تەواوبوونی کۆبوونەوەکاندا تێنەپەڕی، هەواڵی دەربازبوونی نەوشیروان مستەفا، خۆشی و ئاسوودەیی بۆ ناو ئەندامانی کۆمەڵە و هێزی پێشمەرگە گێڕایەوە... ئەو گیرانە و دواتریش ڕزگاربوونەکەی، شەپۆلێکی بەهێزی لە هاوسۆزی و پشتیوانی، لەناو ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵەدا بەدوا خۆیدا هێنا.

زۆری نەخایاند، ئەو بەرە کاتیەی لەناو بەڕیوەبەرانی کۆبوونەوەکاندا دەتبینی، تووشی لەبەریەکترازان هات.

هەندێک لەوانەی خەونیان بە ئاوابوونی ئەستێرەی دەسەڵاتی ئەوەوە و بە جێگرتنەوەیەوە دەبینی، بەتایبەتیش فەریدوون عەبدولقادر و هاوڕێکانی، بەخێرایی بایاندایەوە و بە ئاراسـتەی تەوژمی شـەپۆلەکانی هاوسۆزیی و پشتیوانیی خەڵک لە نەوشیروان مستەفا، کەوتنە مەلەکردن.

ئەوەش ئەو ڕاستیەی دەردەخست کە لە سیاسەتدا، نە دوژمنایەتیەکان و نە دۆسـتایەتیەکانیش تاسـەر و بەردەوام نین... ئەوەی تاسەر بڕیار لەسەر ئەوە دەدا، کێ دۆستەو کێ دوژمنە، تەنها و تەنها بەرژەوەندیەکانن.

دەربازبوون و گەڕانەوەی نەوشیروان مستەفا، یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی بەدوادا هات. کاتی کۆنفرانس دیاریکرا. بە گوێرەی ئەو پێوەرانەی بۆ ئەندامێتی کۆنفرانس دانرابوون، ئەندامانی کۆنفرانس دەستنیشانکران. پێوەرەکان: سێ ساڵ کەمترنەبێت ئەندامی کۆمەڵە بێت، خۆی ڕادەستی ڕژێمیش نەکردبێتەوە.

بەمەبەستی یەکتر ناسین و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و بۆ دەوڵەمەندکردنی تەوەرەکانی کۆنفرانس، بەسەر چەند گروپێکدا دابەشکران. هەر گروپەش کەسێک بەڕێوەی دەبرد کە زۆرتر لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە دەستنیشان کرابوون. کۆڕەکان بۆچەند ڕۆژێک و، هەر ڕۆژەش بۆ چەند کاژێرێک بەڕێوەچوون. لە پاڵ گفتوگۆکردن لەسەر بابەتە سیاسی و فیکری و ڕێکخراوەیی و پیشمەرگاییەکاندا، کۆمەڵێک بابەتی شەخسیش ورووژێنران کە دواتر و لە ڕۆژانی کۆنفرانسدا، پانتاییەکی زۆریان لە مشتومڕەکان داگیرکرد. لەو کۆڕانەدا، بەئاسانی دووبەرەییت دەبینی... بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکان و بەرەی نەوشیروان مستەفا و گروپی زیندانیش لەگەڵیدا.

کاری کۆڕەکان کۆتایی هات و ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شاریش، بەدەمامکەوە گەیشتن. بە درووشمی "لە پێناوی پتەوکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵەدا" کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، لە ڕۆژی ٧ی ئایاری ١٩٨١دا، یەکەمین کۆنفرانسی خۆی بەست. لەو کۆنفرانسەدا کە لەبناری چیای (مالیمۆس)ی نزیک گوندی کانیزەرد، چەند کیلۆمەترێک دوور لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بەڕێوەچوو، ١٨٥ ئەندام ئامادەبوون... لەو ژمارەیە تەنها(٥) پێنجیان ژن بوون... هەر پێنجیان لەو ژنانەبوون کە لەگەڵ مێردەکانیاندا پێشمەرگەبوون.

کۆنفرانس بەو دووسێ ڕۆژەی وەستانی کارەکانیشیەوە، هەشت ڕۆژی خایاند... دوو ڕۆژ لە بناری مالیمۆس و ڕۆژێک بەهۆی بارانەوە، لەناو مزگەوتەکەی کانیزەرداو، باقیەکەشی لەو ڕووتەنەدا کە دەکەوتە پشتی زینووی سووری خڕی نێوزەنگەوە.

بەدڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیەکی زۆرەوە، یەکەمین ڕۆژی کۆنفرانس

دەستپێکرد. ئەندامانی کۆنفرانس چاوەڕێن، کۆمەڵە بە گوڕ و تینێکی زیاترەوە بەیەکێتیەکی فیکری و ڕێکخراوەیی پتەوترەوە هەنگاو بەرەو قۆناغی نوێ هەڵبێنێ. هەمووان چاوەڕێن، کۆمیتەی هەرێمەکان چاوەڕێن، بەرامبەر بەو ڕۆڵەی لە گرتنەوەی شیرازەی لەبەریەکترازاوی ڕێکخستن و لە هەستانەوەی کۆمەڵە و لە درووستکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکاندا گێڕابوویان، لەلایەن ئەندامانی کۆنفرانسەوە، ستایش و سپاس بکرێن. چاوەڕێن ئەندامانی کۆنفرانس ئەو ڕۆڵەیان لەبەرچاوبگرن و متمانەی هێشتنەوەیان لە پێکهاتەی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا پێبدەن.

گروپی زیندان، وێڕای چاوەڕوانیان لە کۆنفرانس کە خەبات و ماندووبوونی سالانی سەرەتای کۆمەڵە و ڕۆژانی سەختی ناو زیندانیان لە بەرچاو بگرێ و، چاوەڕێشن بەشێکی زۆر لەو دەسەلاتانە وەرگرنەوە کە لە غیابی ئەماندا، کەوتۆنەتە دەست ئەندامە گەنجەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان و نەوشیروان مستەفاوە و، چاویان لەوەیە، کۆمەڵە بگێڕنەوە پێش سەردەمی شەهید ئارام.

گروپی نەوشیروان مستەفاش چاوەڕێن، پێگەی سەرکردەکانی گروپی کۆمیتەی هەرێمەکان، لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا لاوازکەن و دەسەلاتی ڕەهای کۆمەڵە بکەوێتە دەستیان و کۆمەڵە بەو ئاقارەدا بەرن کە لەگەڵ بیرکردنەوە و بەرنامەی ئەواندا بگونجێ.

کۆنفرانس دەستپێدەکا، چاوەڕوانییەکان، لە هەڵکشان و داکشاندان. سکرتێری کۆمەڵە، نەوشیروان مستەفا، ڕاپۆرتی خۆی دەخوێنێتەوە. لەو شوێنەوە دەستپێدەکا کە کۆمەڵە لە سێ گروپ پێکدێت، گروپی مام جەلال و گروپی شەهید شەهاب و گروپی خۆی و هاوڕێکانی، بەلام باسی ئەوە ناکا کە خۆی لەدەستەی دامەزرێنەر نەبووە، دواتریش تا دوای گەڕانەوەی، کاری لەناو کۆمەڵەدا نەکردووە... باسی یەکەمین ناکۆکی و جیابوونەوەی باڵی عێراقی لە باڵی کوردستانی ناو کۆمەڵە دەکات. دێتە سەر قۆناغی سەرکردایەتی شەهید شەهاب و لەوێدا ئاماژە بە چۆنیەتی جێهێشتنی کۆمەڵە و چوونە ئێران و گیران و ڕادەستکردنەوەیان بە عێراق دەکات، تا دەگاتە باسی هەڵوێستیان لە زیندان و دواتریش ئیعدام کردنی سیانیان و زیندانی کردنی ئەوانی تر. لە باسی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵەدا، دوور و نزیک بەلای ئەوەدا ناچێ کە ئەو سەرکردایەتیە، بەر لە گیران و ڕادەستکردنەوەیان، لەبیری ئەوەدابوون لەو بۆشاییە سیاسییەی ئاشبەتاڵ بەدوای خۆیدا هێنابووی، کۆمەڵە لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانەوە، بکەن بە حیزب و ڕوخسەتی کارکردن لە حکومەتی عێراقی وەرگرن و دواتریش، گفتوگۆ لەسەر چوونە ناو بەرە

نەتەوەییەکـــەی حیزبی بەعس بکەن. هەڵبەتە تیزی ســێ جیهانی ماوتســـێ تۆنگ[١٣٣]، کە ئەوان باوەڕیان پێیبوو، ئەو مافەیان بەخۆیان دەدا. بە گوێرەی ئەو تێزە ڕژێمی عێراق نەدەچووە خانەی ناکۆکی ســـەرەکیەوەو لە خانەی ناکۆکیی لاوەکیدا دەمایەوە.

لەباســـی شـــەهید ئارام و کۆمیتەی هەرێمەکانیشدا، شـــتێکی وا ناڵێ کە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان دەیانویست گوێیان لێی بێ.

شـــیکردنەوەی بارودۆخی عێراق و کوردســـتان، ڕژێمـــی بەعس، ڕۆڵی قیادەی موەقەتە، کاروباری ڕێکخستن، هێزی پێشمەرگە و پەیوەندی نێوان باڵەکانی ناو یەکێتی، بەشی هەرە زۆری ڕاپۆرتەکەیان پێکهێناوە.

ڕۆژی یەکـــەم هەربەشـــی خوێندنـــەوەی ڕاپۆرتەکـــە و ئـــەو گفتوگۆ و مشـــتومڕانەی کـــرد کە بـــەدوای خۆیـــدا هێنانی.مشـــتومڕەکان ئەوەندەی پەیوەندیان بە بابەتی شەخســـیەوە هەبوو، ئەوەنـــدە پەیوەندیان بەبابەتی فیکـــری و سیاســـی و ڕێکخراوەییـــەوە نەبـــوو. لەبـــەر ئـــەوەی ئەندامانی ڕێکخســـتنە نهێنیەکانـــی نـــاو شـــارەکان دەگەڕانـــەوە، هەڵبـــژاردن خرایە ڕۆژی دووەمـــەوە... بابەتـــە فیکـــری و سیاســـی و ڕێکخراوەییـــەکان و نووســـینەوەی پەیـــڕەوی ناوخـــۆ و بەرنامەی کۆمەڵـــەش، خرانە ڕۆژانی دوایی هەڵبژاردنەوە.

لە دووەم ڕۆژداو بەر لە پرۆسەی دەنگدان، کۆمەڵێک بابەتی شەخسی، بەمەبەستی یەکتری شکاندن ورووژێنران، ئەوەش کەشی ناو کۆنفرانسی تەواو بارگاویکرد.

هەر چەندە، نەوشیروان مستەفا ڕایگەیاندبوو کە ئەو لیستی کاندیدی نیە، بەڵام لیستێک بەناوی ئەوەوە بڵاوکرایەوە و جەختیش لەسەر هەرەشەکەی ئەو دەکرایەوە کە ئەو ئامادەنابێت لە کۆمیتەیەکی سەرکردایەتیدا کاربکات کە سالار عەزیز و مامۆستا جافری تێدابن.

پرۆســـەی خۆکاندیدکردن دەســـتپێکرد. بیســـت و دوو کەس خۆیان بۆ ئەندامێتـــی ســـەرکردایەتی کۆمەڵە کاندیدکرد. ئەوەی مایەی ســـەرنج بوو، کـــەس لە کاندیدەکان، پرۆژە یان بەرنامەیەکی هەڵبژاردنی نەبوو. نە ئەوان

١٣٣- بە گوێرەی تێزی سێ جیهان، دنیا دەکرا بە سێ جیهانەوە: زلهێزەکان، کە بریتیبوون لە سۆڤیەت و وڵاتە سەرمایەدارەکان... جیهانی دووهەمیش: هاوپەیمانانی زلهێزەکان بوون.... جیهانی سێیەمیش: دەوڵەتان و میللەتانی جیهانی سێ بوون بەڕابەرایەتی چین... بەگوێرەی ئەو تێزە، عێراقیش دەکەوتە ناو جیهانی سێیەمەوە.

بەرنامەیـــان هەبوو، نە ئەندامانی کۆنفرانســـیش لەســـەر بنەمـــای بەرنامە، دەنگیان بەکاندیدەکان دەدا.

ئـــەوەی لەنـــاو هەمـــوو کاندیدەکاندا، زیاتـــر مایەی سەرســـوڕمان بوو، خۆکاندیدکردنـــی دکتۆر کەمال خۆشـــناوبوو. دکتۆر کەمـــال تا ئەو ڕۆژە، یەک لەسەرکردەکانی خەتی گشتی و هەر لەسەر میلاکی ئەوانیش، ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوو.

بەو پێیەی زۆرینەی ئەندامانی کۆنفرانس، ژمارەیەکی زۆر لە کاندیدەکانیان نەدەناسی، دەبوایە هەر کاندیدێک، سێ کەس قسەیان لەسەرکردبا... یەکێک لایەنە چاک و بەهێزەکانی ئەو کاندیدەی دەخســـتە ڕوو، دووانەکەی کەش ڕەخنەیـــان لێدەگـــرت. دەبوایە هەریەک لەوانەی ڕەخنەیـــان دەبێت، لە دوو ڕەخنە زیاتر نەگرن.

من یەک لەو کەســـانەبووم کە بۆ ڕەخنەگرتن لە نەوشـــیروان مســـتەفا، چوومە سەر سەکۆی قسەکردن:

"ڕەخنەکانی من هەوڵێک نین بۆ کەمکردنەوە لە بایەخی کاک نەوشیروان. ئـــەو جیـــا لەوەی لە ڕووی فیکری و سیاســـی و ڕۆشـــنبیریی و کاراکتەر و ئەزموونەوە، بێ ڕکابەرە، گومانیشم لەدەرچوونی نیە، بۆیە ڕەخنەی لێدەگرم. ڕەخنەی یەکەمم، هەرچەندە زیاتر پرسیارە تا ڕەخنە، ئەوەیە:

کە لەساڵی ١٩٧٧دا، بۆ یەکەمجار گەڕاوەتەوە کوردستان، ئەگەر لەسەر داوای ئەندامانـــی ســـەرکردایەتی کۆمەڵـــە و هاندانی مام جـــەلال نەبووایە، نەیدەویســـت لەگـــەڵ کۆمەڵـــەدا کاربـــکات... ئەویش هەمان ڕای شـــەهیدان عەلی عەســـکەری و دکتۆر خالیدی هەبووە، لەوەدا کە هەموو باڵەکانی ناو یەکێتی هەڵوەشـــێننەوەو ڕێکخراوێکی تازەی لێدروستکەن. پرسیارەکەی من ئەوەیە، ئەگەر کاک نەوشـــیروان دەســـەڵاتی ڕەهای کۆمەڵەی بکەوێتە دەســـت، ئایا هەمان بەرنامە بەئەنجام ناگەیەنێت یان لەســـەر سەربەخۆیی کۆمەڵە بەردەوامدەبێت؟!

ڕەخنـــەی دووەمیشـــم کە زیاتر ترســـە تـــا ڕەخنە، ترســـەکەش ئەوەیە، پەیوەندی مام جەلال و کاک نەوشیروان زۆر بەهێزە، چەندیش بەهێزتربێ، من کێشـــەم لەگەڵ ئەو پەیوەندییەدا نیە، بەڵام ئایا ئەوە ترســـی ئەوەمان لادروست ناکات کە ئەو پەیوەندییە بەهێزە، ببێتە پردێک بۆ گواستنەوەی هەیمەنەی مام جەلال بۆ ناو کۆمەڵە؟

بەدوای مندا، برایم جەلال هەستاو، ڕەخنەی خۆی بەم شێوەیە گرت:

"مـن ڕەخنـەی توندم لە کاک نەوشـیروان هەیە... ئـەو بەتەنیا موڵکی خۆی نیە، موڵکی هەموو کۆمەڵەیە. بۆیە دەبێ زۆر بایەخ بە پاراستنی خۆی بدا. چەندین جار دیومە، بەخۆی و پێشـمەرگەیەکەوە سەردانی ئەم مقەڕو ئەو مقەڕی کردووە... بەمەش سەلامەتی خۆی خستۆتە خەتەرەوە..."

برایم جەلال هێشـتا (ڕەخنە توندە)کەی تەواونەکردبوو، شـەپۆلێک لە پێکەنین، کەمێک لە جەوی گرژی و بارگاوی ناو ئەو سـاتەی کۆنفرانسـی کەمکردەوە.

هەڵسـەنگاندنی کاندیدەکان کۆتایی هات. ئەنجامی دەنگدان بە شکسـتی بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکان شـکایەوە... لە کۆی هەموو کاندیدەکان، تەنها حەوت کەس، بەربەستی لە (٥٠٪) یان تێپەڕاند.(نەوشیروان مستەفا، د. کەمال خۆشـناو، عومەری سـەید عەلی[١٣٤]، فەرەیدون عەبدولقـادر، عەلی بچکۆل، مـلازم عومـەر و مەلا بەختیار، ئەگەرچی پرۆسـەی دەنگـدان، گەمەکانی هەڵبژاردنی لێدەرکەی ، پرۆسەیەکی شەفاف و دیموکراتیانە بوو، بەڵام ئەو ئەنجامـەو ئەو دەنگە زۆرانەش کە دکتۆر کەمال خۆشـناو، لە دوای یەک ڕۆژ لـە کۆمەڵەبوونـی هێنابوونی، بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکانی تووشـی هەڵچوون پەرچەکردار کرد. هەر یەک لە سـالار عەزیز، مامۆسـتا جافر و ئازاد هەورامی، ناڕەحەتیی خۆیان بەرامبەر بەو ئەنجامە دەربڕی و بەغەدرو نادادپەروەریان وەسـف کرد. مەلا بەختیـار کو چاوەڕێی ئەوەنەبوو کەس لەدوای نەوشـیروان مسـتەفاوە، دەنگی لەو زیاتری هەبێت، کەچی ئەوەتا بەشەرەشەق دەنگی دەرچوون دێنێ، چووە سەرسەکۆ و جامی تووڕەیی خۆی بەسـەر ئەندامانی کۆنفرانسـدا هەڵڕشـت. ئەنجامی دەنگدانەکەی، بە ئاماژەکردن بۆ دەنگە زۆرەکانی دکتۆر کەمال خۆشـناو، بە سـەرەتایەکی مەترسـیدارو بەنیشـانەی نزمی ئاستی هۆشـیاری و بێویژدانی و هەستی نابەرپرسـیاریتی ئەندامانـی کۆنفرانس لێکدایەوە. قسـەکانی مەلا بەختیار، ڕاسـتیان تێدابووبێ یان نا، جۆرێک لە بەهەڵە لە خۆگەیشتن و ڕێزنەگرتن لە ویست و ئیرادەی کۆنفرانسی تێدا دەبینرا. دەنگدەر، بە تەرازووی خۆی کاندیـد دەکێشـێ، نەک بەو تەرازووەی کاندیـد گەرەکێتی... هەر لایەکیش

١٣٤ـ عومەری سەید عەلی، تاکە کاندیدبوو کە بە هۆی بەسەختیی بریندارنبونیەوە، نەیتوانی ئامادەی کۆنفرانس بێت. ئەو لەکاتی بەڕێوەچوونی کۆنفرانسدا، لە سوید لەژێر چارەسەری پزیشکیدا بوو.

بتوانێـت قەناعەت لای دەنگدەر درووسـتکات، ئـەو دەیباتەوە... ئینجا ئەو قەناعەتە چەند دادپەروەریی تیدایە یان نا، بایەخێکی ئەو تۆی نابێت.

ئەنجامـی دەنگدانەکە و ئەو قسـە و مشـتومڕانەش کـە بەدوایدا هاتن، دۆخەکەی بە چەشـنێکی واگرژوئاڵۆزکرد، کارەکانـی کۆنفرانس، بۆ چەند ڕۆژێـک پەکیـان کەوت. دوای سـێ ڕۆژ لەو تەنگژەیە، هەوڵ و کۆششـی هەندێک لە میانڕەوان، جۆرێک لە ئارامیی ڕێژەیی گێڕایەوەو دانیشـتنەکان دەستیان پێکرایەوە.

تەوەرەکانی ئەو جارەی قسەکردن، زیاتر مەسەلەی فیکری و سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی بوون.ناکۆکیەکان بەشەخسی و ناشەخسیەکانەوە، ئەندامانی کۆنفرانسیان کردە دوو بەشەوە... بەشە زۆرەکەی چاویان بڕیوەتە دەم و دەسـتی نەوشـیروان مسـتەفا، هەرچیەک ئەو بیڵێ یان دەسـتی بۆ هەڵبـڕێ، دەنگـی زۆرینە بەدەسـت دێنێ. لەیەکێـک لـەو دەنگدانانەدا، بێ شیکردنەوە و خستنە ڕووی زانیاری ورد و درووست، پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی، کرایە ڕڤیژنیست و یەکێتی سۆڤیەتیش کرایە سۆشیال ئیمپریاڵ.

"نابێ ئێمە، بێئەوەی هیچ شـارەزاییەکمان لەسـەر ئەو مەسەلە تیۆریانە هەبێ، بەدەنگدان بیان بڕێنینەوە. من پێشـنیاردەکەم، بۆ هەر مەسـەلەیەکی فیکـری کە خۆمان دەرەقەتی نایەین، کەسـێکی شـارەزا لەو بـوارەدا، جا بـا لە دەرەوەی کۆمەڵە و کۆنفرانسـیش بێت، بانگکەین و کێشـەکەمان بۆ چارەسـەرکات." ئازاد هەورامی، کە لە جێی خۆیەوە هەسـتابووە سەرپێ، ئەوەی گووت.

بابەتەکە، بۆ ڕۆژی دوایی هەڵگیرا، تا (خەجۆ)، هاوسەرۆکی ئەو کاتەی (ئاڵای ڕزگاری)[١٣٥] ، هات و مەسـەلەکەی لە ڕووی تیوریەوە، واشیکردەوە کە چیدی پێویسـت بەوە نەمێنێ، جارێکتر، بۆ دەنگ لەسـەردان، بخرێتەوە بەردەم ئەندامانی کۆنفرانس.

ڕەنگـە یەکێک بپرسـێ، جا ئەو مەسـەلەیە، چ بایەخێکی بـۆ کۆنفرانس هەبوو، تا ئاوا ببێتە کێشـە! وەڵامەکەی ئەوەیە، ئەگەر پارتی کۆمۆنیسـتی

١٣٥–ئاڵای ڕزگاری، ڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی، باکوری کوردستان بوو، نزیکی ٤٠ پێشمەرگەیەکیان، هاتبوونە نێوزەنگ و بەمەبەستی مەشقکردن و پەیداکردنی ئەزمونی شەڕی پارتیزانی، لەپاڵ بارەگاکانی ئێمەدا بارەگای خۆیان دانابوو... بۆ هەمان مەبەستیش، ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی خۆیان بەسەر بارەگاکانی ئێمەدا دابەشکردبوو.

سۆڤێتی بە ڕیڤژنیست و یەکێتی سۆڤیەتیەش بە سوشیاڵ ئیمپریال ناسرابان، ئەوا سـۆڤیەتیش لە پاڵ(ئیمپریالیزمی جیهانیدا، بەسـەرۆکایەتی ئەمەریکا) دەچووە خانەی دوژمنە سەرەکیەکانی کۆمەڵەوە.

کێشـەکانی ناو کۆنفرانس، زۆرتر کێشـەی شەخسـی و ململانێی سەر دەسەڵات بوون... بۆ ئەوەی سروشتی شەخسیی ناکۆکیەکان دەرنەکەوێت، هـەر لایەو هەوڵیەدا، چوارچێوەی فیکرییـان بۆ بدۆزێتەوە. ئەگەر لایەک، بیروبۆچونێکی لەسـەر مەسـەلەیەک دەربڕیبا، لاکەی تـر، بیروبۆچوونی پێچەوانە یان جیاوازی دەخسـتە ڕوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشـدا، لە کۆمەڵێک کێشەو ناکۆکی فکری و سیاسیش خاڵی نەبوون:.

* لـە بابەتی سـەربەخۆیی کۆمەڵـەدا، لە کاتێکدا لایەنی بـراوە، جۆرێ پەیوەنـدی کۆمەڵـەی بەیەکیەتیـەوە، بـە پەیوەندیەکـی دروسـت دەزانی، لایەنەکەی تر، داوای سەربەخۆیی زیاتری بۆ کۆمەڵە دەکرد.

* لەبابەتی ناکۆکی سـەرەکی و لاوەکیـدا، هەردوو بەرە، پارتی وماڵی بارزانی و ڕژێمی بەعس و ئیمپرالیزمی جیهانییان، دەخستە خانەی ناکۆکی سەرەکیەوە... بە گروپی زیندانبا سۆشیال ئیمپریالیزمی سۆڤیەتیش دەکرایە ناکۆکی سەرەکی و، ڕژێمی بەغداش، بەگوێرەی تێزی سێ جیهانی ماوتسی تۆنگ، دەبووە ناکۆکی لاوەکی.

* بۆ پاشـگری عێراق بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردسـتانەوە، وێڕای پێداگـری بەرەی کۆمیتـەی هەرێمەکان، لەسـەرمانەوەی ئەو پاشـگرە بە کۆمەڵەوە، بەزۆرینەی دەنگ، ئەو پاشگرە لە کۆمەڵە کرایەوەو کۆمەڵە بوو بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

* بۆ لۆگۆی کۆمەڵە و ئاماژەکردن بە مارکسـیزم ـ لینینزمیش، هەرچی بـەرەی کۆمیتـەی هەرێمەکان بوون، زۆر جەختیان لەسـەر قوڵکردنەوەی پرنسیپەکانی مارکسیزم ـ لینیزم و هێشتنەوەی پێناسە و مۆرکە چینایەتیەکەی کۆمەڵـە دەکرد... پێچەوانـەی پێداگریی ئەوان، کۆنفرانس بڕیاری لەسـەر کاڵکردنەوەی ئەو پرنسیپانەدا و تەنانەت داس و چەکوشەکەشی لە لۆگۆی کۆمەڵە داماڵی و ئەسـتێرەیەکی تەنیای لەناو ئەو دوو گوڵەگەنم و جۆیەدا هێشتەوە کە لە لۆگۆکەدا هەبوون.

لە دوایین ڕۆژەکانی کۆنفرانسـدا. مەسـەلەی نووسـینەوەی بەرنامەی کۆمەڵە، بۆ کۆنفرانسی دووەم هەڵگیرا... بۆ ئامادەکردنی پەیڕەوی ناوخۆش، لیژنەیەکـی پێنج کەسـی هەڵبژێردرا... من یەکێک لەو پێنـج ئەندامەبووم و

لەماوەی دوو ڕۆژدا، ڕەشنووسی پەیڕەوی ناوخۆمان ئامادەکرد و لەلایەن کۆنفرانسەوە پەسەندکرا. لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا، کۆمەڵێک گۆڕانکاریی ڕێکخراوەیش بەسەر تەلاری کۆمەڵەدا هاتن.

دوای هەشت ڕۆژی ڕوح و جەستە ماندووکەر، کۆنفرانس کۆتایی هات. کۆتایی هات و کۆتاییشی بە بەشێکی زۆر لە خەونە ڕۆمانسی و ڕەنگا و ڕەنگەکانی من هێنا و فڕێیدامە سەر ئەرزی واقیع... ئەو ئەرزی واقیعەی درز بە بیروباوەڕە پۆلاینەکەم دەداو، بۆ بەرەنگاربوونەوەی لەوێ بەدواوەی زوڵم و ستەمی نەتەوەیی، بە هەست و سۆز و ویژدانم دەسپێرێ.

بەداخەوە کۆنفرانس لەو خەوە قووڵەی هەستاندم.

جاران وامدەزانی کۆمەڵە، لە ئامێرێکی میوزیکی پڕ لە ئاواز و ئاهەنگی ئەفسووناوی دەچێ... وامدەزانی ژەنیارەکانیشی هێندە کاراماولێهاتوون، لەگەڵ جووڵاندنی هەر ژێیەکدا، سەدان پۆلە باڵندەی ئاوازی ڕەنگاوڕەنگ لەشەقەی باڵدەدەن.

جاران تا سنووری پیرۆزکردن، سەرکردە و سیاسیەکانم خۆش دەویست... وامدەزانی هەریەکێک لەوان، پاسەوانێکی بەئەمەک و دڵسۆزی میللەت و کلیلدارێکی ئەمینی دەرگای بەهەشتی ئازادیە... وامدەزانی لە خەمە گشتیەکانی خەڵکدا، دەتوێنەوە و خەمە کەسیەکانی خۆیان بیردەچێتەوە... وامدەزانی هەریەک لەوان، قوتابخانەیەکی فیکری و سیاسی و ئەخلاقی گەورەن و لە سێبەریاندا، خەڵکانی گەورە هەڵدەکەون.

جاران وامدەزانی ئەوانەی پیشەی سیاسەت هەڵدەبژێرن، پڕپڕن بە ڕۆشنبیریی و بە بیروبۆچوون و بە حیکمەت و بە دووربینی... وامدەزانی سیاسیەکان، لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەندامەکانی ڕێکخراوەکەی خۆیاندا، جگەلە پێوەری دڵسۆزی و پاکی و ئازایەتی و لێهاتوویی، پێوەرێکی دیکە پەیڕەوناکەن.

جاران، وامدەزانی هەموو ئەو درووشمانەی بەرزدەکرانەوە، هەموو ئەو قسانەی لەسەر ڕابەرایەتی بە کۆمەڵ و لەسەر دیموکراسی و ئازادی تاک و دادی کۆمەڵایەتی و ئازادی ژن و یەکسانی مرۆڤەکان و خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی دەووترێ، هەر هەموویان لە قەناعەت و بیرو باوەڕی قووڵی سەرکردەکانەوە هەڵقووڵاون.

جاران وامدەزانی و کۆنفرانسیش شتێکی دیکەی پێووتم.

کۆنفرانس، کۆتایی هات و هەموو ئەو وێنە جوانانەش کە لە هزر و هۆشی خۆمدا، لەسەر سیاسەت و سیاسی و سەرکردە نیشتمانیەکان کێشابوومن، وەک قـۆری فەخفوری جـاران، واچڕژان، بەکەڵکی تـەوق تێگرتنەوەش[١٣٦] نەمـان. ئیـدی لەوێ بـەدواوە، بەشـی هــەرە زۆری سیاسـیەکانم، وەک ئەکتەری سەرشـانۆ دەهاتنە بەرچاو... ئـەو ڕۆڵەیان دەبینی کە خەڵک لێی چـاوەڕێ دەکردن... ئەوەندە دەچوونە ناو ڕۆڵەکانیانەوە، هەقیقەتی خۆیان لـە بیردەکرد... هــەر بۆیەش ئەوەندەی لە دیدی مندا لـە ئەکتەر دەچوون، لە مرۆڤی ڕاسـتەقینە نا. جارجارەش بۆ دڵدانـەوەی خۆم و لەبەرخۆمەوە دەمووت:

"ڕەنگـە ئەمانـە لـە ڕۆڵ بینینـدا جوانتربـن، تا ئـەوەی هــەن... ڕەنگە ئەونمایشـکردنە نەبووایەو، هەقیقەتی خۆیان چۆنە ئاوا دەرکەوتنایە. ژیانی ناو کۆمەڵگای سیاسـی، لە ژیانی ناو دارسـتان باشتر نەبووایە. لێگەڕێ با هەر نمایشـی خۆیان بکەن، هەر هیچ نەبێ لە نمایشـکردندا، مرۆیی ترن تا ئەوەی لە هەقیقەتدا هەن."

١٣٦- جاران قۆری فەخفوری هەبوو... نەخش و نیگاری لەسەربوو... یەک لە شتەجوان و دانسقەکانی ناو هەر ماڵێک بوو... کە دەشکا، دەیانبردە لای تەنەکەچی و ئەویش لە ڕێی پەیکەرێکی تەلەوە کە تەوقی پێدەووترا، پارچە شکاوەکانی لێکدەدایەوە، هەرچەندە نەدەبووە بە قۆرێکەی جاران، بەڵام هەرچۆنێکبا بەکەڵکی چالێنان دەهاتەوە.

وەک چـۆن لەنێک[١٣٧]، ڕووبارێک دەکاتە دوو لقەوە، کۆنفرانسـیش ئاوا کۆمەڵەی کردە دوو بەرەی ئاشکرا، کوردستانی و داش عێراق. ئەوانەی لە کۆنفرانسـدا لەگەڵ ئەوەدابوون کۆمەڵە، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بێ، بە کوردسـتانی ناودەبران و ئەوانەش کـە لەگەڵ ئەوەدابوون کۆمەڵە، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان – عێراق بێت، بە داش عێراق ناودەبران. کۆنفرانـس، بەزۆرینەی دەنگ، ئەوەی یەکەمیانی پەسـەندکرد بوو. من پێم وانەبوو کوردسـتانیەکان بەومانایە کوردسـتانی بن کـە بڕوایان بەوەبێ، کۆمەڵە لە هەموو پارچەکانی کوردسـتاندا، ڕێکخستنی هەبێ و هاوخەباتی هێـزە کوردییەکانی ئەو پارچانـەی تربێ. ئەوانیش وەک بەرەکەی تر، هەر لەگەڵ ئەوەدابوون کە کۆمەڵە، لە سـنورە جوگرافیەکەی ناو کوردسـتانی عێراق نەچێتە دەرەوە. بەرنامە و ستراتیژیش ناوچەیی بوو نەک نەتەوەیی. ئـەوان کوردسـتانی بـوون، بەڵام هیشـتا ڕادیـۆ، هەر دەنگی شۆڕشـی عێراق و، شۆڕشـیش، هەر شۆڕشـی عێراقی و، کۆمەڵـەش چالاکترین و بەهێزتریـن ڕێکخراوی ناو ئەو بەرە عێراقیە بوو کە بە (جوقد) دەناسـرا. لەبەرامبەردا، داش عێراقیەکانیش، عێراقی نەبوون بەو مانایەی بڕوایان بەوە بێت کە خەباتی گەلی کورد، بەشـێکی دانەبـڕاوە لە خەباتی گەلانی عێراق. ئـەوان ئەوەندەی لـە هەوڵی بەهێزکردنـی پەیوەندییەکانی خۆیاندابوون، لەگـەڵ لایەنەکانی پارچەکانـی دیکەدا، ئەوەندە بەتەنـگ هاوخەباتی لایەنە عێراقیەکانـەوە نەبـوون، بـەڵام مادام ئـەوە دەبێتە خاڵێکـی جیاکەرەوەی بەینـی ئـەو دوو بەرەیـە، هـەردوولا وەک جیاوازییەکی قووڵـی فکیری و سیاسـی دەیخەنـە ڕوو... جیاوازییەک کە لە دواجـاردا وەک خەنجەرێکی تیژ، دەچەقێتە جەستەی کۆمەڵە.

من بۆخۆم، وەک بڕوا و بیرکردنەوە، لە کوردستانیەکانیش کوردستانی تربووم... بڕوام بەیەک بەرنامەیی و یەک سـتراتیژیی خەباتی گەلی کورد، لە هەموو پارچەکانی کوردسـتاندا هەبوو. هەر بۆیەش کوردستانی بووم... بەڵام لە هاوڕێیەتی و هەڵویسـت و لە مەسـەلە چینایەتیەکان و لە کاری ڕۆژانەدا، لەداش عێراقیەکانەوە نزیکتربووم.

١٣٧ـ لەن: بەرزایی نێوان دوو لقی ڕووبارێک یان دوورگەیەکی بچووکی ناو چەم و ڕووبار.

لەگەرمەی ئەو مشتومڕانەدا، نامیلکەیەکی(٤٠) لاپەڕەییم، سەبارەت بە پێویستی بوونی پارتێکی چەپی کوردستانی نووسی... پارتێک کە بەرنامە و ستراتیژی نەتەوەیی بێ. نەک ناوچەیی، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیی هەر پارچەیەک بەو مانایەی کە لقی ئەو پارتە لەهەر پارچەیەکدا، بڕیار لەسەر شێوازی کار و خەباتکردنی خۆی دەدات.

لەو نامیلکەیدا، وێڕای پاساوە تیۆری و ئایدۆلۆژیەکان، جەختم لەسەر ئەوە کردبۆوە کە:

* هەبوونی پارتێکی ئاوا، دەتوانێ هێز و تواناکانی خەڵکە شۆڕشگێڕەکان لە هەموو کوردستاندا، یەکخاو برەوی زیاتر بە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیی کورد بدا، لەسەر ئاستی دەرەوەش، مەسەلەی کورد بکاتە جێی بایەخی زیاتر.

* یەکبوونی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، لەڕووبەڕووبوونەوەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی خەڵکی کوردستاندا، یەکبوونی بەرنامە و ستراتیژی کوردیی دەوێ.

* لە حاڵەتی هەبوونی پارتێکی لەو جۆرە، ئەگەر و مەترسیەکانی بەکارهێنانی جووڵانەوەی کوردانی پارچەیەک، لە دژی جووڵانەوەی کوردانی پارچەکانی تردا، لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرانەوە، کەمتر دەکاتەوە.

بەر لەوەی نامیلکەکەم چاپکەم، بەجیا پیشانی هەریەک لە مام جەلال و نەوشیروان مستەفامدا. هەردووکیان کۆمەڵێ سەرنج و تێبینی بەکەڵکیان دامێ... لە دووبارە نووسینەوەی نامیلکەکەدا، سوودی زۆرم لێبینین.

ئەوەی لە دیداری هەردووکیاندا، مایەی هەڵوێستە و سەرنجی من بوو:

لەوەی مام جەلالدا، هەرچەندە، لە ناکۆکیەکانی نێوان کوردستانی و داش عێراقیەکاندا، پشتیوانی لە کوردستانیەکان دەکرد، کەچی وەک داش عێراقیەکان بیری دەکردەوە:

"ئەمن دروستبوونی پارتێکی لەو جۆرەم، لە حاڵی حازردا، بەشتێکی عەمەلی نایاتە بەرچاو. ئەو فکرەیە ئەگەر باشیش بێ، بە بڕوای من، ئێستا وەختی نیە. خەباتی ئێمە لە ناو عێراق و کوردستانی عێراقدایە... با خەباتی پارچەکانی کە، بۆ خەڵکی ئەو پارچانە بە جێبێڵین." مام جەلال وایپێگووتم

لەوەی نەوشیروان مستەفاشدا، سەرباری ئەوەی، ئەو سکرتێری

ڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی بوو، کەچی ڕای وابوو کە:

"پارت و ڕێکخراوە مارکسی ـ لینینییەکان، لە دنیادا فەشەلیان هێناوەو چیتر خەڵک بە دوایان ناکەوێ. ئەگەر لە قۆناغێکدا ڕابەرایەتی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی هەندێک لە میللەتانی دنیایان کردبێ، ئێستا ئەو دەورەیان لە دەستداوە."

ڕەنگە هەر لەسەر ئەو بۆچوونەشی بووبێت کە بەرەی کۆمیتەی هەرێمەکان، ئەویان بەوە تۆمەتباردەکرد کە دەیەوێت ناوەرۆکە چینایەتیەکەی کۆمەڵە کاڵکاتەوە... لەبەرامبەردا ئەویش، ئەوانی،بەتایبەتیش مەلا بەختیار و سالار عەزیزی، بە کەسانی سەرکێش و توندڕەو لە قەڵەم دەدا و دەیگوت "ئەگەر لێیان گەڕێی کۆمەڵە بەرەو توندوتیژی دەبەن."

نامیلکەکەم چاپ و بڵاویشکردەوە، بەڵام هێشتا لای هەندێ هەر داش عێراقی بووم... یان هەندێک دەیانویست هەروا بمبینن... ڕەنگە هەر ئەوەش وای لە فەریدوون عەبدولقادر کردبێ، داوا لە هەندێ لە کادیرانی ناو هەرێمەکان بکات، ئەو ژمارانەی نامیلکەکەی بۆ ڕەوانە کەن کە لەلای ئەوان دەستدەکەون... وەختێک لەسەر ڕاستی و ناڕاستی ئەو خەبەرە لە خۆیم پرسی:

"لە ڕێکخستنەکانی ناو شارەکانەوە، داوای هەندێ نوسخەیان لێکردووین، منیش داوام لەو کادیرانە کرد لای خۆیان، هەندێک نوسخەمان بۆ پەیداکەن."

ئەو وایووت، بەڵام من قەناعەتم بە وەڵامەکە نەهات... گەر وابووایە، لای من دەسکەوتنیان ئاسانتربوو تا لای ئەوان. چەند مانگێک دواتر، هەر خودی فەرەیدوون عەبدولقادر، نامیلکەیەکی بە هەمان نەفەسی نامیلکەکەی من بڵاوکردەوە... ئەوەی من لە قەناعەتی ئەوکاتەی خۆمەوە نووسرابوو، ئەوەی ئەویش، بۆ شەڕی داش عێراقیەکان.

جیا لەو نامیلکەیەش، من خۆم بە کوردستانی و بە مارکسیش دەزانی، کەچی لەو ڕاپۆرتەدا کە بەرپرسی ئەو کاتەی ڕادیۆ، لەسەر من بۆ ناوەندی کۆمەڵەی نووسیبوو، منی بە ئیسلامدۆست و کۆنەپەرست ناوهێنابوو...

چەند ڕۆژێک بوو مام جەلال، لە سەفەرێکی دەرەوە گەڕابۆوە، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کادیرانی ڕاگەیاندن و ڕادیۆشدا ئەنجامدا. لە کۆبوونەوەکەدا، باس لە چۆنیەتی و هەماهەنگی نێوان ڕاگەیاندن و ڕادیۆ و

بەرەوپێشبردنیان کرا. من پێشنیارێکم بەم شێوەیەکرد:

"کۆمەڵگای ئێمە، کۆمەڵگایەکی موسـڵمانە، هێشـتا دین لە زۆر شوێن و ناوچەی وولاتەکەماندا، برەوی زۆری هەیە و... وردە وردەش بە کۆمەک و دەسـت لە پشتدانی کۆماری ئیسلامی ئێران، ڕەوت و ڕێکخراوی ئیسلامی سـەرهەڵدەدەن، کە تازەترینیان (لەشکری ئیسلامی کورد)ە. قەناعەتم وایە، ڕەوتی ئیسلامی تریش درووستدەبن و هەستی ئاینیی خەڵک دەجووڵێنن... ڕەنگە لە زۆرکات و شوێنیشدا دژی ئێمە بەکاریبێنن... بۆیە پێشنیار دەکەم، بەرنامەیەکی ئاینیمان لە ڕادیۆیدا هەبێ... لە ڕێی بەرنامەیەکی ئاواوە، هەم پڕوپاگەندەی ئەنتی ئیسـلام، لەسەر خۆمان لادەدەین و هەمیش دەتوانین، ئێمـەش ئایـن، وەک ئامرازێک لە ڕاکێشـانی خەڵک بـەلای خۆماندا بەکار بێنین."

مـن دەمویسـت لە ڕێـی ئـەو بەرنامەیـەوە، خزمەتی نیشـتمان، وەک یەک لە رووکنە سـەرەکیەکانی ئاین، لای خەڵکی موسـڵمان نیشـاندەین و، "خۆشەویسـتی نیشـتمان لە ئیمانەوەیـە." بکەینە پەنجەرەیـەک و لەوێوە هەستی دینی خەڵک بۆ خزمەتی نیشتمان بجووڵێنین و پێیان بڵێین:

دینتان، بەبێ جێبەجێکردنی ئەرکی نیشتمانیتان، ناتەواوە.

پێشـنیارەکەم قبوڵنەکـرا... ئـەو ڕاپۆرتەشـی بەدواداهـات کـە تێیـدا ڕاپۆرتنووس، لەسـەر ئەو ڕایە((کۆنەپەرسـتانە))ی مـن، داوای پێکهێنانی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە دەکات.

سـڵاو لـە ئەندامانـی لیژنـەی لێکۆڵینـەوە دەکـەم. گەرمیەکـی وا لـە وەڵامەکانیانـدا نابینم. کە بەرەو بارەگای لیژنەی ناوچە دەهاتم، وامدەزانی بۆ خەڵاتکردن بانگهێشـت کراوم. ئاخر خوێندکارێکی تەمەن ١٦ ساڵان، بۆ یەکەم جار، لە هەموو ناوچەی ڕانیەدا، بابەتێک بنووسێ و لە ڕۆژنامەیەکی ئاوا نیشـتمانیدا بڵاوبکرێتەوە، حەتمـەن چاوەڕێی خەڵاتکردن دەکات، نەک لێپرسینەوە...

- ئەوەی تۆ کردووتە، دژی پەیڕەوی ناوخۆ و پرنسیپەکانی پارتیمانە.

بـاوەڕ بە گوێی خۆم ناکەم. بەرپرسـی لیژنەی لێکۆڵینەوە کە لە هەمان کاتدا، ئەندامی لیژنەی ناوچەی پارتی و بەرپرسی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی سـەر بە پارتی دیموکراتی کوردسـتانە، لەسەر ئاڕاستەکردنی تۆمەتەکانی بەردەوام دەبێ.

- ئەگەر ڕەخنەشـــت هەبووایە، دەبوایە لـــە کۆبوونەوەدا ڕەخنەی خۆتت بگرتایە، نەک لە ڕۆژنامەیەکی بەربڵاوی وەک (برایەتی)دا. لەوەش خراپتر، هاتووی لە بری هاندان و پشتیوانی، ڕەخنە لە نمایشی تیپی شانۆی لاوانی پارتیمان دەگری...!

- ئاخــر خۆ نمایشـــەکە لەناو هۆڵێکی داخراوی حیزبیـــدا بەڕێوەنەچووە، تامنیـــش لەنـــاو کۆبوونەوەدا قســـەی لەســـەربکەم... جگە لـــەوەش، ئەوەی من نووســـیوومە، بابەتێکـــی ئەدەبییە و هیچ پەیوەندییەکی بە سیاســـەت و حیزبایەتیـــەوە نیە. دوای ئەوە من بابەتەکەم لەڕۆژنامەیەکدا بڵاوکردۆتەوە کە زمانحاڵی پارتیە، نەک حیزبێکی تر.

- کەیفی خۆتە... ئێستا دوو بژاردەت لەبەردەمدایە:

شـــتێکیتر لـــە هەمـــان ڕۆژنامـــەدا بڵاوبکـــەرەوە، لەوێدا لایەنـــە باش و جوانەکانـــی ئەو شـــانۆگەریەی تیپی لاوانی ڕانیە نیشـــاندە، یـــان ئەوەتا بۆ ماوەی سێ مانگ ئەندامێتیت هەڵدەپەسێرین.

هەر لەبەردەمی لیژنەکەدا، قەڵەم و کاغەز دەردێنم و دەستلەکارکێشانەوەی خۆم، لە یەکێتی قوتابیانی کوردســـتان و لە پارتیش، ڕادەســـتی ســـەرۆکی لیژنە دەکەم.

شوێنەکان جیاوازن، بەڵام بیرکردنەوەکان نا.

زەمەنـــەکان نۆ ســـاڵیان دەکەوێتە بەینـــەوە، بـــەڵام ڕووداوەکان، دەڵێی برالەی یەک درەختن.

هـــەر کە خەبـــەری ڕاپۆرتەکە دەبیســـتم، نامەیەکی (٣) ســـێ لاپەڕەیی دەنووســـم و ڕادەســـتی ناوەنـــدی کۆمەڵـــەی دەکـــەم. لـــە نامەکـــەدا، بەسەرســـوورمان و نیگەرانیەکی زۆرەوە دەپرســـم:

ئەی ئەگەر یەکێک لە کۆبوونەوەیەکی داخراوی گەڵ ســـکرتێری گشـــتی یەکێتیدا، نەتوانێ ڕای خۆی دەربڕێ، لە کوێی تر دەتوانێ دەریببڕێ؟!

ئەی ئەگەر ئێمە لەناو ئەم شاخ و داخانەدا، نەتوانین مافی ئازادی بیروڕا بەخۆمـــان ڕەوا ببینین، چۆن دەتوانین بانگەشـــەی ئەوەبکەین کە خەبات لە پێناوی ماف و ئازادییەکانی خەڵکی دیکەدا دەکەین؟!

له كۆتایی نامەكەمدا دەنووسم:

"بـەو عەقڵیەتـەی دەیەوێ، لەسـەر پێشـنیارێكی نـاو كۆبوونەوەیەكی داخراودا، من سزابدرێم، بەدڵنیاییەوە دەڵێم:

هەنگاوێكیـش عەقڵیەتی(١٠) سـاڵ لەوەوبەری ئەندامانـی ئەو پارتیەی تێنەپەڕانـدوە كـە ئێـوە بـە پارتێكی خێڵەكـی و كۆنەپەرسـتی دەزانن. بە ئاماژەیەكـی خـراپ و بەمایـەی نیگەرانیەكـی زۆری دەزانـم، ئێـوە لـەم (شۆڕشـە نوێیە)ی خۆتاندا، دەرفەت بەخەڵكی بچووك و هەڵپەرست بدەن، بەسەرشانی خەڵكی دیكەدا سەركەون."

له ئێوارەی دووەم ڕۆژی ڕادەسـتكردنی نامەكەمدا، نەوشیروان مستەفا دەبینـم. بۆ كورتە پیاسـەیەك، بانگم دەكاتە سـەربانی بـارەگای ناوەندی. لە باسـی ڕاپۆرتەكەدا پێمدەڵێ كە فەرامۆشـی كەم و سـەری خۆمی پێوە نەیەشـێنم... "سیاسـەت لەم وولاتەی ئێمەدا ئاوایـە، هەربیەكەو بۆ ئەویتر لەكەمینداية...بەتایبەتیش كە بزانن، شتێك لەتۆدا دەبێتە كۆسپ یان هەڕەشە لەسەر شوێنی ئەوان." ئەوە دەڵێ و بایی جگەرە داگیرساندنێك دەوەستێ... دواتر دەچێتە سەر ئەو بابەتەی خۆی دەیەوێ قسەی لەسەر بكا.

« حەزدەكەم یەك ئامۆژگاریت بكەم. تۆ شاعیری و ئێمە لەناو كۆمەڵەدا، تەنها یەك شـاعیرمان هەیە، بەڵام دەیان كادری سیاسـی و ڕێكخسـتنمان هـەن. بـەڕای من ئەكەی، تۆ هەر بەشـاعیری بمێنەرەوە و هەقت بەسـەر ناكۆكیەكانی بەینی ئێمەدا نەبێ. خۆت مەكە بەتەرەف لەگەڵ هیچ لایەكماندا. تۆ شـاعیری هەموومان بە... ئەمە بۆ خۆت و بۆ كەمەڵە و بۆ شۆڕشـیش باشترە... من ئەمەت لە تەجرەبەی خۆمەوە پێئەڵێم. من ئەگەر وەختی خۆی ئەو بیركردنەوەیەی ئێسـتام هەبووایە، هەر خەریكی كاری ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیات ئەبووم و توخنی سیاسەت نەئەكەوتم... ئەوە تازە بۆ من درەنگە، بەڵام بۆ تۆ هێشتا زووە.»

من ئەوەم وەك ئامۆژگارییەكی زۆر بەسوود وەرنەگرت... بۆیە زۆر بە متمانەیەكی بێماناوە گووتم:

- ئەگەر من كاری سیاسـەت نەكەم، بۆ بووم بە پێشـمەرگە! خۆ ئەگەر لێرە هەر خەریكی شـیعربم، ناوشارم باشـتربوو... لەوێ باشتر دەمتوانی پەرە بە توانای شیعریی و ڕۆشنبیریی خۆم بدەم.

دیاربــوو وەڵامەکــەی منی بەدڵنەبــوو، بۆیە بەجۆرێک لــە نیگەرانیەوە، ووتی:

ـ ئــارەزووی خۆتــە... من لەوە زیاتر هیچی تــرم نیە بیڵێم. ئەمەی وتوو بەرەو بارەگاکەی خۆیان، خودا حافیزی لێکردم.

ئــەو ڕۆی و بــەڵام مــن، زۆر درەنــگ تێگەیشــتم، ئــەو ڕاســت و من هەڵەبووم... مەبەســت هەرچیــەک بووبێ، دواجار مــن قازانجم لێدەکرد و ناکۆکــی و ململانێکانــی ناو کۆمەڵــەش ئەوەندە سیاســەتیان، لەبەرچاوان ڕەش نەدەکردم.

هێزەکانی ئێمە، ئەوەندەی ووزەی خۆیان، لە شەڕی ڕژێمدا دەخستەگەڕ، ئەوەنـدەش لە شـەڕەکانی دژی پارتی و نەیارەکانیتـر. هێزەکانی پارتیش لەبەر دژایەتیکردنی ئێمە، نەیاندەپرژایە سـەر شـەڕی ڕژێم. ئێمەو ئەوان، لەناو قوولایی دۆڵەکاندا و لە لاپاڵ و لە بەرزایی شـاخەکاندا، ملمان بەبەر ملی یەکتریەوە نابوو... کەپکێک بەدەستی هەر لایەکمانەوە با، لایەکەی دی وایدەزانـی، خوا لەو تاکە بەرزاییە بەولاوە، شـوێنێکی کەی، بۆ هەڵکردنی ئالای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ڕۆنەناوە.

ئـەوان، ئەوەی بە پێشـمەرگایەتی بۆیان نەدەکرا، لـە ڕێی ئەو مەفرەزە جاشانەوە دەیانکرد کە سەر بەوان بوون... بەشێک لەوانە، پێشتر چەکداری پارتـی بـوون، لـە کات و شـوێنی جیاجیـادا، دوای ئـەوەی زەفەریان لە پێشـمەرگەی تاقولۆقـی یەکێتی هێناوەو کوشـتوویانن، خۆیان ڕادەسـتی ڕژێـم کردۆتـەوە و بوونەتە جـاش... ئیدی جارێکی تر لەوێـوە، پەلاماری پێشـمەرگەی یەکێتیـان دەدایـەوە... نموونەی ئەوانەش لـە خەڵکانی وەک (قالە فەرەج و تەحسـین شاویس و عاسی)دا دەردەکەوت. هەر لە ئارامەوە تـا ژمارەیەکی زۆر، لە بەرپرس و فەرماندە و پێشـمەرگە، بەدەسـتی ئەو مەفرەزە جاشـانە شـەهیدکران. قسە لەسەر ئەوەش دەکرا کە پارتی لە ناو سلێمانیدا تۆڕێکیان بۆ کوشتنی خەڵکانی سەر بە یەکێتی درووستکردووە... شێرکۆ بیکەس دەیووت کە بەرنامەی هەوڵی کوشتنی ئەو، یەک لە کارەکانی ئەو تۆڕەبووە... یەکێتی لەناوشارەکاندا مەفرەزەی جاشی نەبوو، تا شەڕی بـە وەکالەتـی بـۆ بکەن، بـەڵام لیژنەی تیـرۆر هەبوو. هەر لە سـەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشەوە، تا چەند ساڵێکیش لە هەشتاکان، بەشێک لەو بەعسی و سەر بە بەعسیانەی لەناو شارەکاندا دەکوژران، هەر ئەو لیژنەی تیرۆرە پێی هەڵدەستان. هەر لەو سەردەمانەداو لە ساڵانی ١٩٨١ ـ ١٩٨٢دا، ژمارەیەک کەسایەتی ناو شاری سلێمانی کوژران.... بەشێک لەوانە، لە کۆنە بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول و لە باڵی ئەوسای مەلا مستەفای ناو پارتی دیموکراتی کوردستان بوون....

ئیتـر لـەوێ بەدواوە هەوڵـی سـڕینەوەی یەکتری، لەناو شـاخەوە، بۆ پاکتاوی سیاسی ناوشارەکان گوازرایەوە. دیاریدەی پاکتاوکردنی سیاسی،

لەســەر جیاوازیــی بیرورِا، لەســەردەمی حکومەتەکەی شــێخ مەحمودەوە دەســتپێدەکا، لەسەردەمی دەسەڵاتی مەلا مستەفادا تا ئاستێکی مەترسیدار هەڵدەکشێ، تەنانەت پەل بۆ تیرۆرکردنی شۆڕشگێرانی پارچەکانی دیکەش دەهاوێژێ[١٣٨]. لە سەردەمی حوکمی شێخ مەحمودا، جەمال عیرفان، لەسەر جیاوازی بیرکردنەوە، وەک یەکەم قوربانی تیرۆر، لەناو شــاری سلێمانیدا کوژرا.

جەمــال عیرفان، یەک لە منەوەر و کەســایەتیە رۆشــنبیری و بیرمەندو سیاســەتمەدارە دیارەکانــی ئــەو ســەردەمەبوو. ئەندامــی هەڵبژێردراوی (ئەنجوومەنی پارێزگای ســلێمانی) و، هزرێکی ســەربەخۆی ناو سیاسەتی کوردی بوو. ئەو کاتەی بەریتانیا و دەوڵەتی تورکی، هەوڵیاندەدا، کورد لە ململانێی دەســەڵاتخوازی خۆیاندا بەکاربێنن، ئــەو دژی هەردووکیان بوو. بەو بیروباوەڕە پێشــکەوتنخوازەش هەیبوو، مەلاو شێخ و ئاغاکانیش دژی بــوون. لــەو بەینەدا، لــە نێوان حوکمــی بەریتانی و هەژموونــی تورکی و دەســەڵاتی شێخ مەحمود و هەڕەشــە و فەتوای هێزە ئاینیەکەدا تیرۆرکرا. ئەگەرچی دەســەڵاتەکەی شــێخ مەحمود، زۆر هەوڵیدا تــۆزی تۆمەتی ئەو تاوانە، لە شانی خۆی بتەکێنێ، بەڵام ئەوسا و ئێستاش، بەرپرسیارێتی ئەو تاوانەی پێ لە ئەستۆی خۆی نەبۆوە.

جەمال عیرفان، وەک جەســتە لەناوبرا، بەڵام کەیســی تیرۆرکردنەکەی هەر بە زیندوویی مایەوە.

تیرۆرکردنــی جەمــال عیرفان، لە کۆمەڵــێ بابەتی ئەدەبــی و هونەریدا ڕەنگیان داوەتەوە. فوئادی مەجید میســری، لە ساڵی ١٩٨٠دا، شەست ساڵ لەدوای تیرۆرکردنی جەمال عیرفانەوە، شانۆنامەیەک ئامادە دەکاو، جەمال عیرفان دەکاتە بابەتی شانۆنامەکەی و ناوی دەنێ (ڕاپۆرت).

لەسەر ڕاپۆرت، هەندێک لەلای سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە، ڕاپۆرت لــە فوئــاد دەدەن و شــانۆنامەکەی بــە دژایەتیکردنی کۆمەڵــە و یەکێتی و شۆڕش لێکدەدەنەوە. لەگەڵ ئەو تۆمەتانەدا، تۆمەتی ئەوەشیان دەدایە پاڵ،

---

١٣٨ -لە ساڵانی ١٩٦٧ ـ ١٩٦٨دا، مەلا مستەفا، چەندین سەرکردە و کادیر و پیشمەرگەی کۆمیتەی ئینقلابی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی بەزیندوویی یان بە کوژراوی ڕادەستی ساواکی شا کرد: لەوانە(سلێمانی موعینی، خەلیلی مستەفا زادە، ئیسماعیلی شەریف زادە، سدیق هەنجیرە و موراد شیرێژ و زۆری تر).
لە ساڵی ١٩٧١شدا، هەردوو سکرتێری (پارتی دیموکراتی کوردستان ـ تورکیا)، (سەعید ئاڵچی و دکتۆر شڤان)یان کوشت.

گوایه لەسەر داوای حکومەت، دەیەوێت ڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی، هاوشێوەی کۆمەڵە درووست کات.

فوئادی مەجید میسری، لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا، ئەندامی کۆمەڵە دەبێ... لە دوای دامەزراندنی یەکێتیشەوە، لەسەر جیاوازی بیروڕا و بیرکردنەوە، لە کۆمەڵە دووردەکەوێتەوە. هەر ئەو جیاوازی بیرکردنەوەیەش بوو، لای هەندێک لە بەرپرسانی کۆمەڵە، فوئادی دەخستە ناو سەنگەری دوژمنەوە... ئەوەش وایکرد لە پایزی ١٩٨٢دا، فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکەن.

فوئاد، وەختێک بە بەرنامەی هەوڵی کوشتنەکەی خۆی دەزانێ... نامەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا دەنێرێ. لە نامەکەیدا دەنووسێ کە ئەوشتانەی لەسەری دەووترێن، لە دژایەتیکردنی کۆمەڵە و یەکێتی، هەر هەموویان شتی هەڵبەستراون و هیچ بنچینەیەکی ڕاستییان تێدا نیە... بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتە و بۆ نیشاندانی ئەستۆپاکی خۆشی، ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ، شۆڕش هەر جێیەک بۆ دادگایی کردنی دەستنیشانکات، ئامادەیە بێت و لەبەردەمی ئەودادگایەدا، بەرگری لە خۆی بکات... دواتر دادگاش هەر بڕیارێکیدا، بە کوشتنیشیەوە، پێیڕازی دەبێ.

پاشنیوەڕۆیەک بە درەنگەوە، لەگەڵ کاردۆدا، لە نۆرە دارهێنانی خۆماندا، بە هەورازەکەی پشتی بارەگای ناوەندی هەڵگەڕاین.

کاردۆ محەممەد و کاروانی براشی، زۆرنەبوو هاتبوونە بارەگای ناوەندی کۆمەڵە. هەردووکیان ئەندامی کۆمەڵە و دووپێشمەرگەی بەبیروباوەڕ و دڵسۆز و چالاک بوون. لەو پێشمەرگانە بوون کە حەزیان بە خوێندنەوە و خۆ پەروەردەکردن دەکرد. پێشتر لە بارەگای سکرتاریەتی مام جەلال پێشمەرگە بوون. لە گفتوگۆیەکی ناو پێشمەرگەکانی بارەگای سکرتاریەتدا، دژ بەخەتی گشتی هەندێ را دەردەبڕن... دواتر لای مام جەلال زمانیان لێدەدرێ و، مام جەلال لەسەر ئەو (توندگیرییەیان) لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکاو پێشیان دەڵێت کە شوێنێکی دیکە بۆ پێشمەرگایەتی خۆیان بدۆزنەوە... ئەوانیش بارەگای سکرتارییەت بە جێدێڵن و دێنە بارەگای ناوەندی. ئیدی لەوێوە و تا ئەمڕۆش، کاردۆ لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانی منە.

دارەکانمان بە کۆڵ و بەڕاکێشان بەناو بەفردا هێنایەوە بارەگا، لەو شوێنەدا کە تایبەت بوو بە چێشت و چالێنان، خەریکی کەڵەکەکردنیان بووین، پێشمەرگەیەک دوای سڵاوکردن پێی ووتم:

"کاک نەوشیروان دەیەوێ بتبینێ."

دوای سڵاو، نامەیەک لە بەینی پەڕەکانی کتێبە ئەستورەکەی بەردەمیەوە دەردێنێ و دەیداتە من.

کە لە خوێندنەوەی نامەکە دەبمەوە، دەیەوێ ڕای منیش لەسەر چۆنیەتی مامڵەکردن لەگەڵ فوئادی مەجید میسریدا وەرگرێ.

- مـن پێم وایە ئەوانەی لەسـەری دەوترێن، هـەر تۆمەتن و گومانی بێ بەڵگەن. پێشـم وایـە ئەگەر هیچ لەو تۆماتەنەی لەسـەری هەن ڕاسـتبان، ئامادەیـی خـۆی دەرنەدەبـڕی، لـە هەرجێیـەک ئێـوە بتانـەوێ، ئەو بۆ دادگایکردنی، بێتە ئەوێ.

- تۆ پێت وایە ئەوەی لەسەری ئەووترێ هەر گومانە؟!

- بەڵێ پێم وایە... خۆ ئەگەر بیروباوەڕی جیاوازیشـی لە کۆمەڵە هەبێ، تەنانـەت نارەزایـی و ڕەخنـەش، هەر نابێ بگاتە ئەوەی بیر لە کوشـتن و تەنانەت ئەزیەتدانیشی بکرێتەوە.

- ئەی بەڕای تۆ، چی بکەین باشە؟

- من پێم باشـە ئێوە نامەیەکی بۆ بنووسـن و دڵنیای کەنەوە لەوەی کە بیر لە کوشتنی ناکەنەوە و ڕێز لە توانای فیکری و نووسینی ئەو دەگرن... خراپیش نابێت، ئەگەر داوای ئەوەشـی لێبکەن کە ئەو توانایەی هەیەتی لە خزمەتی میللەتەکەیدا بەکاربێنێ. هەروا پێشـنیاریش دەکەم، پەیامێک بدەنە سـەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە، لەسەر جیاوازیی بیروڕا، بیر لە ئازاردانی کەس نەکرێتەوە.

من لە قسەکانی خۆم دەبمەوە... ئەو چەند چرکەیەک هیچ ناڵێ... نامەکە دەخاتەوە جێگەکەی خۆی و پێم دەڵێ:

سپاس بۆ پێشنیارەکەت... خۆشم هەر شتێکی وام لە مێشکابوو.

دواتـر زانیـم کە بۆ گەلاڵەکردنی ڕایەکی درووسـت، نامەکەی پیشـانی خەڵکـی دیکەش داوە. ئەوەی لەناو ئەو ڕایە دەربڕاوانەدا. لە هەمووان زیاتر تووشـی نیگەرانی و حەپەسانی کردم، ڕای یەک لە هاوڕێ نووسەرەکانمان بوو"با نە کوژرێ. من پێشنیاردەکەم لە بری کوشتن، جامێک تێزابی بەدەم و چاوا بکرێ، بۆ ئەوەی تا ئەمرێ، نەتوانێ لە ئاوێنەشدا، تەماشای خۆی کا."

## ٤٤

دیمەنـــی ئـــەو تێزاب بـــە دەموچاوکردنە، چەند شـــەوێکم پـــڕ لە خەونی ناخۆش دەکا... دەبۆرژێم و یەکێک بە خۆی و بە سەتڵە تیزابێکەوە ئامبازم دەبێت. ڕادەپەڕم... دەســـتم بە دەموچاومدا دێنم، تەڕ تەڕ بووە... کە دەزانم ئـــەو تەڕاییە تێزاب نیەو ئارەقەیە، ئاهێکم بە بـــەردا دێتەوە. دەبۆژێمەوە و داچڵەکانێکی تر، لە باوەشـــی خەوم دەردێنێ... ئەســـتێرەکانیش دەخەون و من هێشتا هەر بێدارم.

دایکـــم دەیگووت، هەتا لەو شـــوێنە دوورنەکەوییەوە، ئەو خەونانەش لە کۆڵت نابنەوە.

هەر کە ئازاد هەورامی، پێشـــنیاری ســـەفەری بەری مەرگەی بۆ کردم، ســـێ و دووەم لێنەکردو لەگەڵیدا بەڕێکەوتم. ئەو و من و دوو پێشـــمەرگەی تر، بووینە هاوڕێی ئەو مەفرەزە پێشـــمەرگەیەی بەرەو ئەوێ، خەریکبوون دەکوتنە ڕێ.

ئازاد، لەو ڕۆژەوە ببووە پێشـــمەرگە، کەســـوکاری خـــۆی نەدیبوو. لەو سەردەمەدا، حکومەت بە پێشمەرگەبوونی هەر کەسێکی زانیبا، کەسوکارەکەی دەگرتن و دەستیشـــی بەسەر سامان و مڵک و ماڵیاندا دەگرت. تەنانەت کە بەریش دەبوون، گوشار و ئەشکەنجەی دەروونیان لەسەر لانەدەچوو... ئەو حاڵەتە بۆ کەســـوکاری ئـــازاد و کەرکوکیەکانی دیکەش زۆر دژوارتربوو... زوڵم و ســـتەمی نەتەوایەتی، لەسەر کەرکوکیەکان لە ترۆپکیدابوو... لەگەڵ هەموو ئەوانەشـــدا، تارماییەکی بچووکی تێڕوانینی شـــۆڤێنیانەت لای ئازاد هەورامی نەدەدی.

ئازاد، سیاســـیەکی جیـــاواز، جیاوازتر لە زۆرینەی سیاســـییەکانی دی... سیاســـییەکی بە ئەخلاقی نەرمونیانی ڕاســـتگۆی مرۆڤ دۆســـت، سۆفی لە ئاکارو ڕۆمانسی لە ڕوانین و شۆڕشگێڕ لە کرداردا.

هێندە ناخی لە خۆشەویســـتی تژی بوو، کێڵگەکانی کوشـــتوبڕی و ڕق و کینـــە، چەندیش پان و بەرینبان، لە ئینســـانیەتی ئەمیان پێکەم نەدەکرایەوە. ئاخر یەکێک، خوا ڕۆحی پەپولەی بخاتە جەستەوە، ناکرێت وانەبێ.

ئـازاد، گێژەڵووکـەی سیاســەت لەگەڵ خۆیـدا ڕاپێچی نەکردبـا، ڕەنگە هونەرمەندێکـی دیـاری لێهەڵکەوتبـا. بـۆ هەر کوێیـەک چووبـا، کامێراو گیتارەکەی هاوڕێی بوون. کە هەڵویستێک، ڕەفتارێک یان قسەیەک ئەزیەتیان دابا، گیتارەکەی دەکردە باوەش و مەسـتی چەند ئاوازێکی ئارام بەخشـی دەکردین.

حـەوت هەشـت کاژێـر بەڕێـدا ڕۆشـتن، خەریکبـوو بڕسـتی[١٣٩] لەبەردەبڕین.

- وابزانم کورتە پشـوویەکمان پیویسـتە، من وا بـەوەی بەردەمی خۆم دەڵێم:

- هەمـووی چارەکێکـی تـر نابـا، دەگەینـە سـەر ڕۆخی زێیـە، ئەو وا وەڵامدەداتەوە.

بـە لەتردان، تا سـەر زێ خۆم بەکێـش دەکەم. ئەو پۆلە ئەسـتێرەیەی لە ئێوارەوە، خۆیان هەڵداوەتە ناو قوڵایی زێوە، هێشـتا لە نەرمە سـەما و مەلەی شەوانەی خۆیان نەکەوتوون.

تا نانی نیوەڕۆش لە (گەرمکان) نەخۆین، بە ئاسۆسدا هەڵنازنێن.

دەگەینـە سـەری ئاسـۆس و لە پاڵ پاشـماوەی، یەکێـک لە(قوللە)کانی پاسەوانانی مەملەکەتەکەی فەروخ پاشادا دەوەستین.

- گوێگرتـن لـە مۆسـیقا، تەنانەت لە بە شـاخا سـەرکەوتنیش، فریامان دەکـەوێ... مۆسـیقا هـەر بەتەنها خۆراکـی ڕوح نیە، خـۆراک و ووزەی جەستەشـە، نـەک هـەر بۆ مـرۆڤ، بـۆ درەخـت و ڕووەکیـش. زانایانی ڕووەکناسـی دەڵێن"ئـەو درەختانەی مۆسـیقایان بۆ لێدەدرێ، نشـونماو زیندوویەتیشیان زیاترە."

- بۆ سیاسیش؟!

- بۆ سیاسیەکان زیاتریش. ئەو سیاسیانەی گوێ لە مۆسیقا دەگرن، زۆر لەوانی تر، نەرمونیان و ئینسانی ترن.

- بەخوا کاک ئازاد، سیاسیەکانی ئێمە ئارامترین و ناسکترین مۆسیقاشیان بۆ لێدەی، هەر بەمارشی شەڕی تێدەگەن.

---

١٣٩ - بڕست: هێز، ووزە، تاقەت.

- ئەوەش باشە... مارشی شەڕیش هەر مۆسیقایە.

بەچیای ئاسۆسدا شۆڕدەبینەوە و بەدەم باسی مۆسیقا و ئەدەب و سیاسەتەوە دەگەینە ناو گوندی ئاوەژێ.

دوای ڕۆژێک لە چاوەڕوانی، کەسوکاری ئازاد، بە ئۆتۆمۆبیلەکەی پشتیوان[١٤٠] دەگەنە لامان.

لەو ڕۆژگارەدا، سەردانی ناوچە ئازادکراوەکان، بۆ کەسوکاری پێشمەرگە، ڕیسکێکی پڕ مەترسی بوو... حکومەت بە سەردانەکەیانی زانیبا، لە سزای زیندانیکردن سووکتری پێ ڕەوا نەدەبینین.

بۆ ئەوەی لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی کەرکوکەوە تووشی گومان نەبن، لە شەوێک زیاتر نەمانەوە. بۆ ماڵئاوایی و بەڕێکردنیان، تا دەری مەرگە لەگەڵیاندا چووین. مەرگە، گەرچی دێیەکی چکۆلەیە، بەڵام خاوەنی کەسایەتیەکی گەورەیە. مەرگە، بۆ خۆی مێژوویییەکە لە بەرگری...ئەو دەمەی سوپای ئیسلام، لەدوای خۆڕادەستکردنی خەڵکی زۆر شوێنی تردا، پەلاماری بەری مەرگەیاندا... مەرگەییەکان، بۆ خۆبەدەستەوەنەدانی گوندەکەیان، بۆ چەند مانگێک ڕووبەڕوویان بوونەوە. لەو شەڕو نەبەردانەدا، ژمارەیەکی ئەوەندە زۆریان لە ئەسحابان کوشت، هەتا ناوی (ئەسحابەکوژ) یان بەسەردابڕا. ئەگەرچی خەڵکی مەرگە، لە ئێستادا هەموویان موسڵمانن، بەڵام هەر شانازی بەو بەرگریەی خۆیان لە زیدو، بەو ئەسحابە کوژیەی خۆیانەوە دەکەن. ڕەنگە هەر ئەو شانازیکردنەش بێ، ئەو جیاوازییە زۆرەی لە نێوان گۆڕەکانی ئێرە و گۆڕەکانی دۆڵی ئەسحاباندا درووستکردبێ.

گۆڕی ئەسحابەکانی ئێرە، نەپەڕۆی سەوزو سپییان، بەسەر لق و پۆپی دار بەڕووەکانی سەریانەوە دەشەکێتەوەو نەکەسیش بۆ نزا و پاڕانەوە دەچێتە سەریان. گۆڕی کوژراوانی کوردیش، نە بەگۆڕ کافر دەناسرێن و نەکەسیش بەرد بارانیان دەکات.

کەسوکاری ئازاد گەڕانەوە، ئێمەش، بۆ شەوەکەی هەر لە مەرگەو

---

١٤٠- پشتیوانی مەمەنداغای فانی شاعیر، ئۆتۆمبیلێکی پێبوو، هاتووچۆی بەینی مەرگەو شاری دەکرد. هەر پێشمەرگەیەک، کارێکی لە ناوشار هەبا، ئەم بۆی جێبەجێ دەکرد، ئینجا هێنان و بردنی نامە با یان کەسوکارو هەر شتێکی کەش... پشتیوان جێی متمانەی هەموومان بوو.

لــە ماڵــی ئەحمەدی حاجی عەلــی (ئەحمــەد کادر) ماینەوە. ئــەو ماڵە، لەو ماڵــە کەمانە بوون کە لە خزمەتکردنی پێشــمەرگە ماندوو نەدەبوون، هەر کاتێک ڕووت لە ماڵیان کردبا، ڕۆژبا یان شەو، دەرگایان بە ڕووتا هەردەم ئاوەڵەبــوو. لە پێشــمەرگایەتیدا، بەو جۆرە ماڵانەمــان دەووت، بارەگاکانی پشتەوەی پێشمەرگە.

بەیانی زوو، هێشتا خۆر لە پشتەوە ڕا، باوەشی بە (کوڕیس) دا نەکردبوو، لە دەنگی تەقەی دۆشــکا و ڕەشــاش و لە زرمە و ناڵــەی هاوەن بەخەبەر هاتین.

بەپەلە خۆمان بەست... بەناو ڕەزو باخەکانی دۆڵی مەرگەدا، بەرەو ئەو ئاقارە ڕۆشتین کە دەنگی تەقەکانی لێوە دەهات.

"جەیش و جاش هێرشیان بۆ سەر گەورە قەڵا هێناوە[١٤١]."

ئەوە قســەی عەلــی مام ئەحمەد بــوو کە لەگەڵ چەند پێشــمەرگەیەکی تــری کەرتەکەیــدا، بەنەرمە غار، پێش ئێمەیان دایــەوە. عەلی، فەرماندەی یــەک لــە کەرتەکانی تیپی ٤٣ی ئاســۆس بوو. خــۆی و باوکی، بە چەکی خۆیانەوە، لە ســاڵەکانی سەرەتای شۆڕشەوە پێشمەرگەبوون. ئەو ڕۆژە، قەراربــوو ڕۆژی زەماوەندی عەلی بێ، لە مەمەنداوەوە بووکی بۆ دەهاتە ئاوەژێ. ئازاد و منیش، زۆر هەوڵمان لەگەڵیادا قەناعەتی پێبێنین تا بچێتە پێشوازی بووکێ و نەیەتە شەڕ، سوودی نەبوو. بۆ دڵنیاکردنەوەی ئێمەش، بەرلەوەی تەواو لێمان دوورکەوێتەوە، لەسەر کێشی (کە زۆرهات، قەواڵە بەتاڵە) ووتی:

- کە شەڕ بەری دەرکەی پێگرتی، زەماوەند بەتاڵە.

عەلی و پێشمەرگەکانی کەرتەکەی، لەناو ڕەوەزە بەردەکانی گەورە قەڵادا ون بوون... ئێمەش بەدوای ئەواندا، بن زنارێکمان[١٤٢] بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرشە، کردە سەنگەر.

هێشتا پەلاماری سەرباز و جاشەکان بۆ سەر گەورەقەڵا، بەتەواوەتی تێک نەشکابوو کە جارێکی کەش عەلی مام ئەحمەدمان بینینەوە. ئەمجارە چەند پێشــمەرگەیەک، بەباریکە ڕێیەکەی خوار ئێمەدا، بە برینداری بۆ پشتەوەی

---

١٤١- پێدەچێت ئەو ناوە، لەو قەڵایەوە هاتبێ کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی فەروخ پاشادا، بەلاپاڵی ئەو لووتکە شاخەوە درووستکراوە کە ئێستا پێدەوترێت گەورە قەڵا.
١٤٢ـ زنار: بەردی گەورەی شاخ: گابەرد.

بەرەی شـــەڕیان دەگواســـتەوە. ئـاوا بۆ دووەم جار، لەمـاوەی دوومانگدا، قەرار لەسەر وادە و ڕۆژی ژنهێنان دەدراو هەڵدەوەشایەوە.

ئەمجارە بەهۆی ئەم شەڕە و بریندار بوونیەوە... جاری پێشووش، بەهۆی شەڕێکی دیکەوە.

## ٤٥

خەریکبوو دەگەیشتینە سەری ئاسۆس کە چەند پەڵە هەورێکی تێری سپی، لە خۆرئاواوە پەیدابوون. هەر ئەوەندە بەودیوی ئاسۆسدا شۆڕبووینەوە، هەورەکان، دەلاقە شینایییەکیان لە ئاسماندا نەهێشت... لەگەڵ هەر هەنگاوێکی ئێمەشدا، چڕتر و نزمتر دەبوونەوە... هێندە نزم ببوونەوە، هەر ئەوەتا خۆیان لە تاوێرە بەردەکانی لاڕێ نەدەخشاند.

هێندەی نەبرد، ئاسمان کەوتە هەلاجیکردنی هەورەکان و لەگەڵ وەشاندنی هەر چەکەیەکدا[١٤٣]، هەزاران لۆکەی کلووە بەفر دەکەوتنە سەر زەوی. کلووەکان تا دەهات گەورەتر دەبوون... لەسەدان پۆلە پەپولەی سپی دەچوون، بەسەر سەری ئێمە و بەسەر لقوپۆپی ڕووتاوەی درەختەکاندا دەنیشتنەوە. تێکەڵبوونی ترپەی نەرمی بەسەریەکداکەوتنی کلووە بەفرەکان و خرمەخرمی بەسەر بەفرا ڕێکردنی ئێمەو، جارجارەش لە شەقەی باڵدانی سوێسکەیەکی بۆران پێچ و خشەی کەوتنە خوارەوەی چەند گەڵایەکی لە خەزان بە جێماو، دنیایەک ئاوازیان لێدەکەوێتەوە.

بۆ گوێگرتن لەو مۆسیقایەو، بۆ خۆ پاراستنیش لەو بەفربارینە، گاشە بەردێکی گەورە، لە شێوەی ئەشکەوتێکی چکۆلەدا، خۆی بۆ جێکردنەوەی هەر چوارمان نووشتاندبۆوە. قەدەرێک لەبن ئەو گاشەبەردەداماینەوە... لەوە زیاتر خۆمان گرخاندبا[١٤٤]، بەر لەوەی بگەینە ئاوەدانی، تاریکی، ڕێی پێ هەڵەدەکردین. بن تاشەبەرد جێدێڵین و بە هەنگاوی قورس قورس ڕێ دەبڕین. ئەگەر هەڵکردنی ئەو کزە با ساردە نەبا، ڕەنگە هێشتا چێژم لە جوانی بەفرەکە بینیبا. بایەکە هێندە ساردبوو، تەنانەت کلووە بەفرەکانیش لە سەرما، خۆیان دەخزاندە ناو لوت و گوێ و قۆڵی پاڵتۆو لۆچی جامادانەو گیرفان و ناو پێڵاوەکانیشمانەوە. لە تەوقی سەرمانەوە، تا بنی پێمان هەر بەفربوو... تاکە شتێک ئێمەی لە پەیکەرێکی بەفرین جیادەکردەوە، سوور سوور هەڵگەڕانی کوڵم و سەری لووت و نەرمایی گوێ و هالاوی هەناسەو ترووکەی چاو و جووڵەی قاچ و دەستمان بوو... ئەویش تا دەهات کزتردەبوو. پێڵاوەکانم ئەوەندە بەفریان تێچووبوو، دەتووت پێیەکانم لە

---

١٤٣. چەکە: کوتەکی هەلاجیکردن.

١٤٤. خۆ گرخاندن: خۆ ماتڵکردن، خۆ بەدواخستن.

قاڵبی ســەهۆڵ گیــراون. خۆ ئەگەر کەمێــک درەنگتر گەیشــتباینە ناو دێ، ڕەنگە هەر هەموومان لە پەل و پۆ کەوتباین... من بەر لە هەمووان.

لــەو کاتەدا بەفــر، خەریکبــوو ئێمەی دەقەســراند[١٤٥]، کۆمەڵێــک منداڵ، لــە قەراغــی دێ، یاریان پێدەکرد. هەندێک شــەڕە تۆپەڵ و هەندێک شــێرە بەفرینەیان درووســتدەکرد. ئەو بەفرەی ئێمە بەدەستیەوە زەلالەتمان بوو، بۆ ئەوان، ســەرچاوەی خۆشــی وچێژ وەرگرتنبوو. هەر کە ئێمەی بە بەفر داپۆشیویان بینی، وەک ئەوەی شێرە بەفرینەکانی خۆیان بە جووڵە کەوتبن، لە خۆشیاندا، دایانە قاقای پێکەنین و چەپڵە لێدان.

ئەو کاتەی گەیشــتینە بەردەم یەکەمین ماڵ، گۆت گۆت ببووم، پێیەکانم ئەوەندە تەزیبوون، لەوە زیاتر توانای بەپێوە ڕاگرتنی منیان نەمابوو. خاوەن مــاڵ ئێمە بــەم وەزعەوە دەبینێ، بــە فرماڵ فڕێــدەدا و دەرگای ژوورمان بۆدەخاتــە سەرپشــت... دووانمان لێرەو دووانەکەی ترمــان دەچنە ماڵێکی تــر... لرفەلرفی زۆپــای دار، ئاهێکمــان وەبەردا دێنێتــەوە. هێندە خۆم لە زۆپــا نزیک دەخەمەوە، هەر ئەوەتا لە باوەشــی ناگرم."گەرمی ئاگری بۆ بەفر زەدەی زۆر خراپە" سۆفی برایم بەدەم ساورمە[١٤٦] لە زۆپانانەوە، وا دەڵــێ و منیش هەندێک دوور دەکەومەوە. تا ســۆفی برایم، بەزەحمەتێکی زۆرەوە، گۆرەوییەکانمان لە پێ دادەکەنێ، پوورە نازێ، تەشتێکی گەورەی پڕ لە ئاوی گەرم، لەبەر دەممماندا دادەنێ.

"نابــێ هێندەش گــەرم بێ تەحەمولی نەکەی، دەنــا زەرەری لە قازانجی پتر دەبێ." لەو کاتەدا، بەســەری پەنجەی، گەرمیی ئاوەکە تا قیدەکاتەوە، ســۆفی برایــم وا دەڵێ. لە ڕاســتیدا، پێیەکانم هێندە ســڕبوون، ئاوەکە لە قوڵپەقوڵپی کوڵانیشدابێ، هەستێکی وای پێناکەم. هەتا پێیەکانمان خوێنیان تێنەزێتــەوە و پەنجــە پەڕیوەکانمــان نەکەونەوە جووڵە، ناهێڵن تەشــتەکە ئاوی گەرمی لێببڕێ.

هــەر ئەوەنــدە کەمێــک جووڵەمــان تێکــەوێ، ســۆفی برایــم، جلەکانی ســەرەوەمان دادەکەنــێ و... دوای گوشــینیان، بەبزمارەکانــی دیــواری ژوورەکەوە هەڵیاندەواسێ.

ماڵەکەی سۆفی برایم و پورە نازێ، هەر ئەو ژوورە و ژوورێکی دیکەو داڵانێک و کۆڵێتێکیش بۆ پەلەوەرو ماڵاتیان.

---

١٤٥ـ قەسرین: ڕقبوونەوە

١٤٦ـ ساورمە: داری وشک کە بۆ زۆپا و چێشت لێنان بەکاردێت.

ئــەو ژوورەی ئێمـــەی تێدابن، هەتا بڵێـی چکۆلەیە، بـەڵام فراوانی دڵی خاوەنەکانی، بۆ ئێمەی کردۆتە هۆڵێکی یەکجار گەورە. ژوورێکی ســادەی تەڕاوکراو... زۆپایەکی دار و دوو پارچە ڕایەخ و حەســیرێک و لالەیەک[147] کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەو نەخش و نیگارانەی کە شێی سالانی پێشوو بەسەر دیوارەکانەوە کێشاونی.

هەتــا بــە تەواوەتــی نەهاتینەوە ســەرخۆمان و ڕێو بانیــش نەکرانەوە، نەیانهێشت ماڵیان جێبێڵین. لەو سێ ڕۆژەی لایان بووین، لە ماڵی خۆشمان بایــن، هــەر ئاوا خزمــەت دەکراین. دەمێک بوو، نــە ژن و مێردی ئاوا لێک نزیک و نەخانە خوێی ئاوا میواندۆستم نەبینیبوون. لە میهرەبانیدا، زیاتر لە بــاوک و دایک دەچوون، تا خانەخوێ... لە بەینی خۆشــیاندا، زیاتر هاوڕێ بــوون تا ژن و مێرد. ئەو ڕۆژەش کە ســەبارەت بــە نهێنیی ئەو بەتینیەی پەیوەندی نێوانیانم لە سۆفی برایم پرسی، زۆر بە سادەیی ووتی:

"بەخــودای ئەمــن نازانم... هەر کەرەمــی خودا و هیمــەت و بەرەکەتی مامەڕەزای دەزانن. باشتەکیشت پێبڵێم، ئەمن و نازێ، چل و ئەوەندە ساڵەیە پێکەوەین، ڕۆژەکی لە ڕۆژان، لە گوڵیم کاڵتر پێنەگوتووە... هەموو ڕۆژێش شوکروسەنای خودای دەکەم کە ئەوەندە ئەمنی خۆشدەوێ، چاکترین ژنی ئەم دنیایەی بەنسیبی من کردووە."

بەو ســێ ڕۆژەی لایان ماینەوە، دارستانێک خۆشەویستیان لە دڵی مندا سەوزکرد. ئەو کاتەش زانیم(هەقە)[148] ن، ئەوەندەی تر خۆشم ویستن... ئاخر

١٤٧ـ لالە: جۆرێکە لە چرا، لامپا

١٤٨–هەقە: بەو کەسانە دەوترێت کە سەر بە بزوتنەوەی هەقەن. بزووتنەوەی هەقە، وەک ڕێبازێک لە ڕێبازەکانی نەقشبەندی، لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا، لەسەردەستی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دامەزراوە. سەرەتا وەک بزووتنەوەیەکی چاکسازیی دینی و کۆمەلایەتی دەرکەوتووە. دوای کۆچی دوایی شێخ عەبدلکەریم، مامەڕەزا، کۆمەڵەی هەقە بەشێوازێکی نوێ ڕێکدەخاتەوەو بنەرەتێکی ئایدیایی و کۆمەلایەتی و ئابوری و ئاکاریی بۆ دادەنێ و لە چوارچێوەی تەسکی سۆفیگەریی دەیهێنێتە دەرەوە. لەسەردەمی مامەڕەزادا، بزووتنەوەی هەقە وێڕای ڕۆڵە چاکسازیە دینی و کۆمەلایەتیەکەی، ڕەهەندێکی فکری و سیاسی و نیشتمانیش وەردەگرێ، ئەگەرچی تا ئێستا، هیچ بەڵگەیەک نیە، ئەم بزووتنەوەیە بە بزووتنەوەی سۆشیالیستیی جیهانیی ببەستێتەوە، بەلام بەهۆی:

* ئەو چەمکە کۆمۆنیزمیەی هەیبووە.
* ئەو دیدوناوەڕۆکە پێشکەوتووخوازییەی لە مەسەلەی یەکسانی و دادی کۆمەلایەتی و لە مەسەلەی ئافرەت و لەمەسەلە کۆمەلایەتیەکانی تردا هەیبووە.
* بەهۆی ئەو داکۆکیکردن و پاڵپشتیەی لە جوتیاران و زەحمەتکێشانی کردووە، دنیایەک

مـن هەر لە منداڵیەوە، جۆرێک لە هەسـت و سـۆزم بەرامبەر بە هەقەکان هەبوو... کە گەورەش بووم، ئەو هەست و سۆزە، لەگەڵمدا گەورەبوون.

دەشێ بەشێکی ئەو هەستەم پەیوەندی بە ئەزموونی منداڵیی‌و، بەشەکەی تریشـی پەیوەندی بەو بنەما و پرنسـیپانە هەبووبێ کە بزووتنەوەی هەقە لـە بەڕێوەبردنـی ژیانـی کۆمەڵایەتیدا پەیـڕەوی دەکـردن، بەتایبەتیش لە بوارەکانی، یەکسانی، سەربەستی ئافرەت، هەق پەرستی، کاری هەرەوەزی‌و ئابوری هاوبەش، بەشداری هەمووان لە تەگبیرو ڕا و درووستکردنی بڕیارو شـێوازی دیموکراتیانـەی بەڕێوەبـردن، مافـی ڕەنجـدەران و جوتیاران و پشـتگیریکردنیان لە ڕزگاربوون لە زوڵم و سـتەمی دەرەبەگایەتی. هەر ئەو خەسـڵەت و بنەمایەنەش بوون کـە لەلایەکەوە دوژمنی بـۆ زۆردەکردن و لەلایەکی تریشەوە وایدەکرد هەزاران جوتیار بچنە سەر ئەو ڕێبازە. سۆفی برایم و پورە نازێش لەو جوتیارانەی پشدەربوون کە لەگەڵ مەحمود ئاغای میراودەلیدا ئەو ڕێبازەیان هەڵبژاردبوو.

ئـەوەش کە پەیوەندی بـە ئەزموونی منداڵیمەوە هەبوو، ئەو هەسـت و خۆشەویستیە زۆرەبوو کە پوورە خازێ لە ناخی مندا چاندبووی.

پوورەخـازێ، لـە کۆتایـی پەنجاکانـی تەمەنیدایە، کەچـی توێژاڵێک لە دەردەسـەریەکانی ئەو تەمەنە بە ڕووخسـاریەوە نابینی. ئەگەر ئەو چەند تاڵـە سـپیانەی ناو قژ و برۆی نەبـن، دەتوانی تەمەنی بە (١٠) سـاڵێک لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی گەنجتر بخەملێنی.

پاسەکە لە بەردەمی ماڵی ئێمەدا ڕایدەگرێ... هەر ئەوەندە پوورە خازێ پێیەکـی دەخاتە سـەر زەوی، بەڕاکـردن، مژدەی هاتنی بەبـاوک و دایکم

---

دوژمنی بۆ درووستبووە. کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزی و حکومەتی عێراقی و شێخ و ئاغاو مەلاکانیش، لە دوژمنایەتیکردنیاندا، چوونەتە یەک بەرەوەو بەکافرو لادەر لە ئیسلام و بە کۆمۆنیست تۆمەتباریان کردوون.

هەر هەمووشیان، هەریەکەو بەشێوازی خۆی، پەلاماری بزووتنەوەی هەقەیان داوەو تەنگیان پێهەڵچنیوون. ڕابەرەکانیان هەر لە شێخ عەبدولکەریمەوە تا مامەڕەزاو حەمەسوریش، چەندین جار ڕووبەڕووی گرتن و ڕاودەونان و نەفیکردن و دەستبەسەرکردن بوونەتەوە.

لە بەرامبەر هەموو ئەو زوڵم و ستەمەشدا، هەقەکان، بۆ دەربڕینی نارەزاییەکانی خۆیان، هەمووجارێ ڕێی ئاشتیانە و ناتووندوتیژانەیان گرتۆتەبەر. هەر بۆیەش دەکرێ، بزووتنەوەی هەقە، بە یەکەمین بزووتنەوەی ئاشتیخوازو ناتووندتیژی، لە هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە قەڵەم بدرێ.

دەدەم... دەزانم ئەوانیش پوورە خازێیان چەند خۆشدەوێ و بەهاتنی چەند خۆشـحاڵ دەبـن... بە هەمووان دەفرە گڵێنەکان لە پاسـەکەی شـێخ عەلی دادەگرن و بەمدیو دەرگای حەوشەوە ڕیزیان دەکەن... ئەوان، پوورەخازێ بـۆ پشـوویەکی کـورت و پارووە نانێـک دەبەنـە ژووریّ و منیش بەدیار دەفـرە گڵێنەکانەوە ڕادەوەسـتم... گۆزە و دیزە و تەنووری لەگڵی سـوور درووسـتکراو... گڵی سـوور گۆندی تۆربە، گڵی هیچ شـوێنێکی دیکەی، بۆ درووستکردنی ئەو دەفرانە ناگاتێ. وەستایی و دەستڕەنگینی پوورە خازێش وایان لێدەکات، خەڵکی هەتا دەفری گڵێنی تۆربە و دەستکاری پوورە خازێ وەسـتابن، بەلای دەفری شـوێن و وەسـتای دیکەدا نەڕۆن. گەر هەر ئەو ڕۆژەش هەموو دەفرەکان ساغ بینەوە، ئەو هەر دوو سێ هەفتەیەک لامان دەمێنێتەوە... دووسێ هەفتە بۆ من لە دوو سێ کاژێر دەچن... ئەو شەوانەی ئـەو لامان دەمێنێتەوە، خۆشـترین کاتەکانی منداڵی مـن پێکدەهێنن... هەر کاتێکیش، یەکێک بێ ئاگا، یان بە ئەنقەسـت، تەقە لە شـتێک هەڵسێنێ، ئەو دادەچڵەکی و پڕ بەگەرووی هاواردەکا: "هەقە مامەڕەزا".

کـە جارجـارەش جوێنێکـی تێکـەڵ دەکا، ئەوەنـدەی تـر مـن دەخاتە تریقوهوڕێ. هەموو ئەو چیرۆک و بەسـەرهاتانەی لەسـەر هەقە باسـیان دەکا، مایەی چێژ وەرگرتن و سـەرنج ڕاکێشـانی زۆری منن. هەموو ئەو شتانە، بۆ ئەو بیرەوەری و ژیان بە بەرداکردنەوەی ڕابردوون و بۆ منیش حیکایەتی سەرسامکەر و ئەفسووناوی.

پوورەخـازێ، وەک خـۆی دەیـووت، لـە هەڕەتـی لاویەتیـدا دەبێ کە مامە ڕەزا دەگیرێ... سـەرەتا دەبرێتـە گرتووخانەی کەرکوک و دواتریش ڕەوانەی خواروی عێراق دەکرێ. هەر کە ئەو هەواڵە بڵاودەبێتەوە، ئەم و هەزاران هەقەی دیکە، دەسـتبەرداری ماڵ و مڵک و کاسـپی خۆیان دەبن... هەریەکـەو گونیەیەک لەبەردەکەن و قووڵەدارێک بەدەسـتەوە دەگرن و لە ڕێپێوانێکی ئاشـتیانەدا، بەرەو کەرکوک دەجمن[١٤٩]. سێ مانگان لەسەر ئەو ناڕەزاییـەی خۆیان بەردەوام دەبن، تا دواجار حکومەت ناچار دەکەن مامە ڕەزا ئازادکا.

کە وێنەی پوورەخازێ لە ناو پۆشاکی گونیەدا دێنمە بەرچاوی خۆم، لە پێکەنیندا خۆم بۆ ناگیرێ. باسـی تەکیەش، لەباسـی گونیە لەبەرکردنەکە زیاتـر سـەودای گوێگرتنـی دەکردم. من تەکیەی شـێخانم دیبوون... شـێخ بەخۆیو بە عەبایەکی ڕەشی پان و پۆڕ و دامێن بە تاڵی زەردچنراو، لەسەری سەرەوەی تەکیە دادەنیشێ... دەروێش و دیوانە، بەدەم دەفلێدان و زەرگ لە

١٤٩ـ دەجمن: دەجوولێن

خۆدانەوە، لەبەردەمیا هەڵدەپڕن و زیکرو هەیاهو دەکەن... دەروێشـەکان هەموو پیاون و تەنانەت تارمایی ئافرەتێکیشـیان لەناودا نابینی.

ئـەو تەکیەیەی پوورەخازێ باسـیدەکرد، لەگەڵ ئەوانەدا من بینیبوومن، هیچیـان لـە یەکترنەدەچـوو. ئـەوەی ئـەو باسـیدەکردن زیاتر لـە یانەی کۆمەڵایەتی دەچوون، تا تەکیەی باوی شێخان. وەک پوورەخازێ دەیگوت، پتـر لـە ٥٠ دێی هەقەنشـین هەبوون، لە هــەر دێیەک لەو دێیانــەدا، تەکیە هەبـوو، ئەگەر دێیەکیش زۆربەیان هەقە نەبان،ماڵێکیان دەکردە تەکیە. بۆ هەر تەکیەیەکیش سەر تەکیە هەبوو.

"هەموو شــەوێ لەوێ خڕدەبووینەوە، ژن و پیاو فەرقی نەبوو. هەموو وەکو یەک، بەشداری هەموو شتێکمان دەکرد. قسەو باسمان لەسەر هەموو شــتێکی دەکرد. هەر کێشەیەکیش هەبا، لەوێ باسدەکراو چارەسەرمان بۆ دەدۆزییــەوە. هەموو شــەوێکیش، ئیشــوکاری ڕۆژی دواییمان، بەگوێرەی توانا دابەشــدەکرد. لەدوایشدا، دەمانکردە قسەی خۆش و نوکتە و گۆرانیو هەڵپەڕکــێ... ئــای خودایە چ زەمانێکی خۆش بــوو. نەکەس درۆی دەکردو نــەدزی. کەس نەیدەگوت ئەوە ئی منەو ئەوە ئی تۆیە. ئەوەی هەبوو مڵکی تەکیەو، تەکیەش مڵکی هەموومان بوو. شێخیش، جوتیارێکی وەک ئێمەو لە ئێمەش زیاتری نەبوو.

لێرەدا کەمێک دەوەستا... هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشاو بە حەسرەتێکی زۆرەوە دەیووت، "حەیفێ مامەڕەزا زۆر زوو بەجێهێشــتین.. لە دوای مامە ڕەزای هیچی وەکو خۆی نەما، نەشێخ و نەتەکیە و نەهەقەش."

## ٤٦

ڕۆژانی کۆتایی ســەفەرەکەم، تووشــی ڕامــان و بەخۆداچوونەوەیەکی قوولــم دەکات. لە پەنجەرەی ماڵەکەی(ســۆفی برایم و پــووره نازێ) و لە کلاورۆژنــەی بیرەوەرییەکانــی (پووره خازێ)وە، تەماشــای بزووتنەوەی هەقــە دەکەم. لەناو ئەو بزووتنەوەیەشــدا پێگەی ئافــرەت، زیاتر لە هەموو مەسەلەیەکی تر بیروهۆشم بەخۆیەوە شەتەک دەدا. هەتا زیاتر لەو پێگەیە دەڕوانم، نیگەرانیم زیاتر دەبێ. نیگەرانیەکەشم لەو بەراوردکردنەوە دێ کە لە نێوان بزووتنەوەی هەقە و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا دەیکەم.

بزووتنەوەی هەقە، پەنجا ســاڵی ڕەبەق، بەر لە درووســتبوونی کۆمەڵە سەر هەڵدەدا... لە ناو ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیە دواکەوتووەی ناو دیهاتەکانی ناوچــەی ســورداش و دۆڵــی جافەتــی و دووکانی ئێســتاو ناحیەی میرزا ڕۆستەمی ئەوسا، لەپاڵ ئەو ئامرازە سەرەتاییانەی ئەوکاتەی بەرهەمهێناندا، گۆڕانکارییەکــی بنەڕەتی لە پەیوەندییەکانی نێوان ژن و پیاودا بەرپا دەکا... ژن لە ناو ئەو کلتووره دواکەوتووەی دەرەبەگایەتیدا، لە زۆرینەی کۆت و پێوەندە دینی و نەریتی و کۆمەلایەتییەکان ڕزگاردەکات.

* جاڕی یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا دەدات.

* ژن هاوشــانی پیــاو، بەشــداری هەمــوو چالاکیــە کۆمەلایەتــی و ئابوورییەکان دەکات.

* ژن چوون پیاو، بەشداری پرس و ڕاوتەگبیر و درووستکردنی بڕیار دەکات.

* ژن هاوتــای پیاو، بەشــداری هەڵبژاردنی ســەر تەکیــە دەکات، خۆی کاندید دەکاو بەدەنگی زۆرینەش بەسەر تەکیە هەڵدە بژێردرێ[١٥٠].

١٥٠- سەرتەکیە: بەڕێوبەری تەکیە. ئەو کەسە کە بۆتە سەرتەکیە، تەکیەی بەڕێوەبردووە... ئابوونەی مانگانەی کۆکردۆتەوە... خزمەتی تەکیەی کردووە... پێشوازی میوانی تەکیەی کردووە. سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی ناو تەکیەی کردووە... خەڵکی لە کاتی کۆبوونەوەکان ئاگادار کردۆتەوەو هەر ئیشوکارێکیش هەبووبێ، پێی ڕاگەیاندوون. سەرتەکیە بە هەڵبژاردن بووە و بەدەنگی زۆرینە دەرچووە. سەرتەکیەی کۆمەڵێک دێ ژن بوون، لەوانە: قۆمرغان، سێدەر، بۆگدو کانی ساردو... هتد.

* ژن لە هەڵبژاردنی هاوسەردا ئازادە.

* فرە ژنی ناجایز دەکرێ و شیربایی[151] و سوورانەش[152] قەدەغەدەکرێن.

* ئازاردانی مرۆڤ بەگشتی و ئافرەت بەتایبەتی حەرام دەکرێ.

بزووتنەوەی هەقە، ئەو گۆڕانکاریە گەورانە لەناو ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە جووتیاریە دواکەوتووەدا ئەنجامدەدا، کەچی کۆمەڵە، کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان، دوای پەنجا ساڵ و لەناو ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووتری شارو خوێندەواردا درووستدەبێ و هەنگاوێکیش پێگەی ئافرەت ناباتە پێشەوە. کۆمەڵە لە ماوەی ئەو ١٢ ساڵەی تەمەنیدا، نەک هەر بەرنامەیەکی بۆ بەرەوپێشەوەبردنی دۆخی ئافرەت نابێ، بەڵکو تاکە وتارێکیش سەبارەت بە مەسەلەی ئافرەت لە بڵاوکراوەکانیدا نابینرێ.

لەگەڵ گەڕانەوەمدا، ئەو نیگەرانی و بەراووردکردنانەم دەکەمە بابەتێک، لە کۆڕێکی بارەگای ناوەندی کۆمەڵەدا پێشکەشی دەکەم... دواتریش لەگەڵ ژمارەیەک لە ئەندامانی ناوەندی و سکرتێری کۆمەڵەشدا، قسەی لەسەردەکەم.

لەگەڵ هەر کامێکیان قسەدەکەی، دنیایەک پاساوت بۆ دێننەوە... پاساوی ئەوەی کە"هیچ جووڵانەوەیەکی ئافرەتان نیە... هیچ زەمینەیەکی مادی و کۆمەڵایەتی لەبار بۆ جووڵانەوەی ئافرەتان نیە... بۆیە ئێمە نابێ هیچ بکەین. ئەبێ چاوەڕێبین تا ئەو زەمینەیە درووست ئەبێ و ئافرەت تیا هۆشیارەو شەڕ لە پێناوی مافەکانی خۆیدا ئەکات... ئافرەتان، هۆشی کۆمەڵایەتی و تێگەیشتنیان، هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی پەی بەمافەکانی خۆیان ببەن، داوایان بکەن و هەوڵی بەدەستهێنانیان بدەن."

کە دەشڵێی، ئێوە نەبەرنامەیەکتان بۆ چارەسەری مەسەلەی ئافرەت هەیەو نە یاسایەکتان دەرکردووە، تەنانەت نە بابەتێکیشتان لەسەر ئەو مەسەلانە نووسیووە، ئەوان پێت دەڵێن کە:

"گۆڕانی پایەی کۆمەڵایەتی ژن، بە نووسنی ووتارێک، یان ئاماژەپێکردنی لەبەرنامەی ڕێکخراوێکدا، یان بەسەلماندنی لە دەرکردنی قانونێکدا چارەسەر

١٥١ ـ شیربایی: کاوێن: پارەی مارەیی. ئەو پارە یان ئەو مولکەیە، کە کەسوکار، لە بەشودانی کچەکەیاندا، لە ماڵی زاوای وەردەگرن.

١٥٢ ـ سوورانە: ئەو پارەیەیە کە لەبەرامبەر بەشودانی کچدا، دەدرا بە ئاغا.

ناکـریّ، بەڵکـو بە گۆڕانی بنچینــەی ئابووری و کۆمەڵایەتــی و فەرهەنگی کۆمەڵ دەبێت."

تۆ دەڵێی، ئێوە هیچ هەلومەرجێکتان بۆ بەشــداری ئافرەت لە شۆڕشــدا نەخوڵقانــد... ئەوان پێت دەڵێن،"ئەبێ هەلومەرج خۆی بڕەخســێ... ئەبێ بە پێــی واقعــی کۆمەڵایەتی و کەلتوری کۆمەڵگاکەمــان هەنگاو بنرێ، نەک بە پێی ویست و ئارەزووی خێرخوازانە یان شاعیرانە."

کە باســی مافی ئافرەتیشــیان لەگەڵدادەکەی، ئەگەر قسەکە هەر لە بەینی خۆماندابــێ، دەڵێــن"ژن هەر بۆ خزمەتی ماڵ و منــداڵ و بۆ چێژوەرگرتن و تێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکانی پیاو خوڵقاوە" ئەگەر قسەکەش بۆ نووسینبێ دەڵێن."دانان و سەپاندنی قانونی تایبەتی، دەربارەی پارێزگاری مافی ئافرەتان، ناتوانێ پایەی کۆمەڵایەتی ئافرەت بگۆڕێ. نە قانون و نەوەعزو ئامۆژگاری، لەبەردەم عورف و عاداتی کۆمەڵایەتیدا هیچیان پێناکرێ."

سیاسیەکانی ئێمە، بۆ هەر کارێک دەیکەن، شۆڕشگێڕانەبێ یان ڕادیکاڵانە، پاســاوی خۆیان هەیــە... ئەگەر بیانەوێ کارێک بکــەن دژ بە دابونەرێت و کلتوریشــبێ، دەبنە ئۆلترا[١٥٣] شۆڕشــگێڕ و دەڵێن،"ئەبێ نەریت و پەیوەندیە کۆنەکان تێکبشکێنین."

ئەگەر کارێکی نا شۆڕشگێڕانە و کۆنەپەرستانەش بکەن، چەندیش خۆیان بە شۆڕشــگێڕو پێشــکەوتووخواز بزانــن، دەبنە کۆنەپارێــزو دەڵێن"ئەبێ ڕێــز لە دابونەرێتــە کۆمەڵایەتیەکان بگرین." کە ئەو قســانەم گوێ لێدەبێ، باوەڕ بەو دەنگۆیەش دێنم کە لە یەکەمین کۆنفرانســی کۆمەڵەدا، درایە پاڵ سەرکردەیەکی کۆمەڵە. ئەو سەرکردەیە نە دەنگۆکەی پشتڕاستکردەوە، نە نکۆڵیشــی لێکرد... بە گوێرەی ئەو دەنگۆیە، ئەو ئەندامەی ناوەندی کۆمەڵە، نامەیەک بۆ ڕێکخستنەکانی ناوشار دەنێرێ... لەوێدا داوا لە ڕێکخستنی ناو شــارەکان دەکات کە هەندێک ئافرەتیان بۆ بنێرنە دەرەوە. هاتنە دەرەوەی ئــەو ئافرەتانە بۆ ئەوەنیە ببنە پێشــمەرگە یان دەزگایەکی پێشــمەرگایەتی پێویستی بە هەبوونیان بووبێ..بێنە دەرەوە." بۆ ئەوەی ببنە هاوسەری ئەو برادەرە سەرکردایەتیانەمان کە خەریکە وەختی ژنهێنانیان تێدەپەڕێ."

١٥٣. ئۆلترا: بەزیادەوە، زیاتر لە.

## ٤٧

ئەگەرچــی زۆرنەبوو لەبەری مەرگــە گەڕابوومەوە، بەڵام هەرکە ملازم عومەر پێیووتم، ئەوان بۆ ئەنجامدانی کارێک دەچنە ئەو ناوە و حەزدەکات منیش لە گەڵیاندا بچم، سێ و دووم لێنەکرد.

مۆڵەتێکی دوو مانگیم وەرگرت و لەگەڵیاندا کەوتمە ڕێ. ئەوان بۆ لێدانی لەشکری ئیسلامی دەچوون و منیش، بۆ خۆدزینەوە لە دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە. لە کۆنفرانســی یەک بەدواوە، خۆم لەســەرئەوە یەکلایی کردبووە کەچیتربەشــداری هیچ چالاکییەکی حیزبی نەکەم، لە کۆبوونەوەی شانەوە تا دەگاتە کۆنفرانس و کۆنگرەش.

عەســرێکی درەنــگ لە خــڕی نێوزەنگــەوە بەڕێکەوتین... ئــەو دەمەش گەیشــتینە قــەراغ زێی ســندۆڵان، شــەو ئەوەنــدەی بەبــەرەوە نەمابوو... کەمینــی جاشــەکانی نــاو گوندی گــردە ســپیان نەبووایــە، دوو کاژێریک زووتر دەگەیشــتین. بەختمان هەبوو، هێشــتا لە قەمچــی تفەنگدا نەبووین، سەگەکان دەستیان بەوەڕین و جاشەکان دەستیان بە تەقەکرد. وانەبایە، تا نەکەوتینایە ناو بازنەی ئاگربارانی جاشەکانەوە، بەخۆمان نەدەزانی... ئێمە نەماندەزانی جاشــەکانی ئەو شەوە، ســەر بەکام بەرەی جاشانن، ئاغاکان یان جووتیاران... بەڵام دەمانزانی سەر بە هەر کامیانبان، دەستیان لە ئێمە نەدەپاراست.

لــەو ســەردەمەدا لە قــەڵادزێ، حاڵەتێکــی نامــۆ هەبوو... چــۆن لەناو شۆڕشــدا، تیپــی جوتیــاران و ئەو تیپانــەش هەبوون کە بە تیپــی ئاغاکان ناســراوبوون، لەناو شاریشــدا، جاشــی جوتیاران و جاشــی ئاغاکانیش[١٥٤] هەبــوون. لەوەش نامۆتر، هاوکاری و هەماهەنگیەکی وورد، لە نێوان جاش و پێشمەرگەی هەرلایەکدا، لە دژی جاش و پێشمەرگەی لاکەی تردا هەبوو. کە مەفرەزە پێشمەرگەیەکی سەر بە تیپی جوتیاران، دەچوونە سەر جاشی ئاغاکان، جاشــە جوتیارەکان، هاوکاری و چاوســاغیان بــۆ دەکردن و، بە پێچەوانەشەوە.

---

١٥٤ـ هەروا مەفرەزەی جاشی سەر بەحسک و سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانیش هەبوون.

بــۆ ڕۆژی دواییــش، چالاکییەکــە هەر لایەکیــان کردبایان، لــە ڕادیۆی دەنگی شۆڕشــی عێراقەوە، وەک چالاکی هێزی پێشــمەرگەی کوردســتان بڵاودەکرایەوە.

ئــەو حاڵەتە، هــەر لە ناوچــەی قەڵادزێدا نەبوو، من بە چــاوی خۆم لە شوێنی دیکەشدا بینیبووم.

لەگەڵ عەبدولڕەحیمدا، لەبەردەمی تاکە دوکانەکەی مەرگەدا وەستابووین، مەحمود ســێدەری[155]، بەهەڵەداوان بەخۆی و پێشمەرگەکانی کەرتەکەیەوە، بە بەردەمی ئێمەدا تێپەڕین.

عەبدولڕەحیم ســەرتیپی ٤٣ی ئاســۆس و مەحمود سێدەریش،یەکێک لە فەرماندە ئازاکانی کەرتێکی ئەو تیپەبوو.

- ئەوە کاک مەحمود، بەرەو کوێ وا بەپەلە دەڕۆی؟!

- بۆ شەڕی بەینی جاف و شیلانان.

- ئەوە شــەڕی بەینی جاشــانە... جاف بن یان شیلانە، هەر جاشن... هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نیە.

- چۆن پەیوەندی نیە! ئەوان جاشیشبن هەر جافن... من لەسەر عەشیرەتی خۆم هەڵنەدەمێ، ئەدی لەسەر کێ هەڵدەمێ!!

- کاک مەحمود، من وەک ســەرتیپی ٤٣ی ئاسۆس پێت دەڵێم، نەخۆت و نە ئەو پێشمەرگانەش لەو شەڕەوە مەگلێنە.

- کــورە کاک عەبدولڕەحیــم ئەتۆ دەڵێی چی!! وەڵا مام جەلالیش پێم بڵێ مەڕۆ، هەر دەڕۆم.

حەتمەن ئەو، لەو ڕوانگەیەوە ئەوە دەڵێ کە حیزبیش وەک عەشیرەتێکی

---

١٥٥- مەحمود سێدەری، لە ساڵی ١٩٧٦وە دێتە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەوەو لە ساڵی ١٩٧٩دا بەخۆی و ٢٠ کەس لە خزم و کەسوکاری خۆی، بە چەکی خۆیانەوە، دەبنە پێشمەرگە. بەشداری ژمارەییەکی زۆر لە چالاکی و شەڕەکانی یەکێتی دەکات. لە ساڵی ١٩٨٧دا، خۆی و کوڕێکی و دوو پێشمەرگەی تر، لە هێرشێکی کیمیاویی هێزەکانی عێراقدا، شەهید دەبن. لە کاتی بەڕێوەچوونی پرۆسەی ئەنفالدا، سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سێدەر، بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن.

گەورە دەبینێ... مادام لای خەڵکی حیزبی، زاڵکردنی ئینتیمای حیزبی بەسەر ئینتیمـای نیشـتمانیدا ڕەوابێ، بـۆ لای ئەو زاڵکردنی ئینتیمای عەشـیرەت، بەسەر ئینتیمای حیزبی و نیشتمانیدا نارەوابێ.

شۆڕشـی ئەیلول، ئینتیمای عەشیرەت و ئینتیمای نیشتمانی، واتێکەڵاوی یەکدی کـرد، جیاکردنەوەیان ئاسـان نەبوو. یاخیبوونـی چەکداریی ئاغاو سـەرۆک عەشـیرەتەکان، لە دژی یاسـای چارەسـەری کشـتوکاڵ، کرایە شـۆڕش و خەباتی نیشتمانی. هێشـتا هەن ئەو شۆڕشەی ئێمەش، هەر بە درێژەکێشانی ئەو حاڵەتەی پێشوو دەزانن. ئەوەتا کوێخا مستەفای(دۆڵەبی)، بۆ دەربڕینی هاوسۆزی خۆی لەگەڵ شۆڕشدا:

"بەخودای ئێمەش هەموو وەک ئێوە، هەر لە ئەوەڵیەوە، لە دژی قانونی ئیسـلاحی زەراعـی[١٥٦] دەسـتمان دایـە تفەنگێ."، لـەو کاتەدا لەسـەربانی ماڵەکەیـان ، خەریکی خواردنی نانی ئێوارە بووین، کوێخا مسـتەفا وای بە ملازم عومەر گووت.

---

١٥٦ـ مەبەستی یاسای ژمارە ٣٠ چارەسەری کشتوکاڵە کە لە ١٩٥٨/٩/٣٠، بە قازانجی جوتیاران و بە زیانی ئاغاکان دەرچوو.

## ٤٨

ئەو بەیانییەی بەرە و خورخورە و یاخیان، بە شاخەکەی پشتی دۆڵەبیدا هەڵدەگەڕاین، هێشتا هەتاو، تاڵە تیشکەکانی خۆی، بەشانەی لق و پۆپی درەختی سەر یاڵەکەی بەردەممان دانەهێنابوو. ئەو وەختەش بۆ پشوویەکی کورت، لاماندایە ژێر سێبەری درەختێک، ملازم عومەر پێیی گووتم"من بۆ کاری سەرپەرشتیکردن و جێبەجێکردنی نەخشەی لێدانی لەشکری ئیسلامی هاتووم."

لەشکری ئیسلامی کورد، ڕێکخراوێکی سیاسی – سەربازیی بوو... لە شوباتی ١٩٨١دا، بەڕێنمایی و هاوکاری سەخییانەی کۆماری ئیسلامی ئێران، لەسەر دەستی(مەلا حوسەینی ماریونس، شێخ عەبدولقادری سۆتکە و عەباس شاهێن) دامەزرا، هیچ کام لە دامەزرێنەرەکان، ناوبانگ یان پاشخانێکی سیاسی وایان نەبوو تا لە ناو خەڵکدا ناسراوبن. ئەو ڕێکخراوە، لەبەرئەوەی هیچ پێوەرێکیان لەوەرگرتنی خەڵکدانەبوو، بۆیە هەموو کەسێکیان وەردەگرت. هەر لەسەرەتاشەوە، یەکێتی و لایەنە کوردیەکانی دیکەش، کادر و ئەندامی خۆیان خزاندە ناو ڕیزەکانیەوە.

ئەو هێزە، چونکە بەرنامەی شەڕکردنیان، دژی هێزەکانی حکومەت نەبوو، زیاتر بانگەشەیی و نمایشی بوون...هەروا چەک و پارەیەکی زۆرشیان لەبەردەستدا بوو، بۆیە لەماوەی کەمتر لە ساڵ و نیوێک، سەدان کەسیان، لە شاربازێڕ و دۆڵی جافەتی و چەمی ڕەزان و ناوچەی خاڵخاڵاندا دواکەوت. ئەو کاتەش یەکێتی، پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا، تووشی لێکترازان هات، پەرەسەندنی ئەو هێزەی، وەک مەترسیەکی ئێرانی لەسەرخۆی، کردە پاساوی پەلاماردانیان.

ئەو ڕێکخراوە، چونکە نەهێزێکی عەقائیدیان هەبوو، نە ئەزموونی شەڕیش، هەر بۆیە کە یەکێتی پەلاماریدان، لەماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا، کردنیە پۆڕی خوراو... دوای بەرگریەکی لاواز و خەسارەتی گیانی هەردوولا، هەموو بارەگاکانیان گیران و دەستیش بەسەر هەموو چەک و تەقەمەنیەکانیاندا گیرا.

لە دوای نەمانی هێزەکانی لەشکری ئیسلامیەوە، جگە لە هێزەکانی یەکێتی،

هیچ هێزێکی دیکە لە دۆڵی جافەتیدا نەمابوون. پێشتر و تا ساڵێک لەوەوبەریش، لە پاڵ پێشمەرگەی یەکێتیدا، پێشمەرگەی حسیکیش، جەولەیان بەو ناوەدا دەکرد. لە ئەنجامی ئەو سازان و لێکتێگەیشتنەی لە نێوان جەمالی عەلی باپیر(فەرماندەی هەرێمی چوار) و شێرکۆی شێخ عەلی(فەرماندەی هەرێمی ئەو ناوچەیەی حسیک)دا هەبوو، هیچ بەریەککەوتنێکی چەکداریی لە نێوانیاندا ڕوینەدا... ئەوە لە کاتێکدا، لە زۆر ناوچەی تردا شەڕوپێکدادان لە نێوان پێشمەرگەی هەردوولادا، بەشێوەیەکی پچڕپچڕیش بوو بێت بەردەوامبوو. ئەو هەڵوێستە نیشتمانیەی جەمال و ئەو دۆخەئارامەش کە لەناوچەکەیدا فەراهام بوو، لەبری ئەوەی ببێتە مایەی سپاس و ستایش و وەک نموونەیەکیش بۆ ناوچەکانی دیکە گوازرابایەوە، لای هەندێک لە کادر و سەرکردەکان بوو بە مایەی تۆمەتبارکردنی... تۆمەتبارکردنی بەوەی کە جەمال سازشی لەگەڵ حسیکدا کردووە و نایەوێت شەڕیان بکات. ڕاپۆرتەکانی بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵەش، بۆ ناوەندی و مەکتەبی سیاسی، ئەو تۆمەتانەی چڕتر دەکردەوە... تا کار گەیشتە ئەوەی، لە کۆبنەوەیەکی سێ قۆڵیی مەکتەبی سیاسیدا، مام جەلال، نەوشیروان مستەفا و فەریدوون عەبدلقادر، بڕیارێک بۆ لێدانی شێرکۆ دەردەکەن و جێبەجێکردنەکەشی بە مەلا بەختیار دەسپێرن.

مەلا بەختیار لەناوەڕاستی تەمووزی ١٩٨١دا، دەگاتە دۆڵی جافەتی و بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی و هەموو ئەو تۆمەت و قسەوقسەڵۆکانەش بە جەمال ڕادەگەیەنێ کە دراونەتە پاڵی... جەمالی عەلی باپیر، بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەو بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسیش، لە ژێر گوشاری دۆخێکی دەروونیی زۆر سەختدا، بۆ دواین دیداری خۆی و شێرکۆ دەڕوا. کە جەمال دەگاتە لای شێرکۆ، خۆر تازە خەریکە تاڵە تیشکەکانی خۆی، لە ئاوە کریستاڵیەکەی (کانیەڕەش)ی پشتی (سێکانیان) هەڵدەکێشێ. چەند دەستڕێژێک و خۆر بەپەلەتاڵەتیشکە سوورهەڵگەڕاوەکانی خۆی، لە خوێناوی ناو کانیەڕەش دەردەهێنێ.

پرۆسەی لەناوبردنی لەشکری ئیسلامی کۆتایی دێ و لێکۆڵینەوە لەو قسەو باسانەی لەسەر شرەخۆری و دزی و دیل کوشتن دەکرا دەستپێدەکات. لێکۆڵینەوەکان لە نێوەی ڕێدان و ملازم عومەر، بۆ بەشداریکردن لە دووەهەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا دەگەڕێتەوە خڕی نێوزەنگ ... هەر لەگەڵ نامەکەی ملازم عومەردا، پەیامێک بۆ گەڕانەوە و بەشداریکردنی کۆنفرانس بۆ منیش دێ... پەیامم بۆ دێ بەڵام من لەسەر بڕیاری بەشدارینەکردنی خۆم سوورم و تا کۆنفرانسیش تەواو نەبێت، بەری مەرگە جێناهێڵم.

# ٤٩

هێشــتا لەبــەری مەرگەبووم، نامەیەکی (ســامی شــۆڕش)م پێگەیشــت کە لە بری دەســتەی بەڕێوەبەری نوێی یەکێتیی نووســەرانی کوردســتان نووســیبووی. لەوێدا، باس لە کۆبونەوەی ((دەســتەی گشتی و هەڵبژاردنی شــەرعیانە و ئازادانەی دەستەی بەڕێوبەر)) دەکا... وەک مژدەش خەبەری هەڵبژاردنــەوەی خۆمم پێدەدا. لە کۆتایی نامەکەشــیدا ئومێد دەخوازێ کە من زوو بگەڕێمەوە نێوزەنگ و پێکەوە کاروبارەکانی یەکێتیی نووســەران ڕاپەڕێنین.

لە هاوینی ئەو ساڵەدا(١٩٨٢)، هیچ کام لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوبەری یەکێتیــی نووســەران لــە نێوزەنــگ نەبــوون. لــە کاتــی لــەوێ نەبوونــی ئێمەدا،ژمارەیەک نووسەر ڕیزەکانی سوپای عێراقی جێدەهێڵن و پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەن. لەوانە:

سامی شــۆڕش، جەوهەر کرمانج، سەعدوڵا پەرۆش و نەوزاد رفعەت... بەر لەوانیش و بە چەند مانگێک، محەمەد موکری، خەلیل دهۆکی، حەمەکەریم عارف و دوای ئەوانیش ئەحمەد عارف، گەیشتبوونە خڕی نیوزەنگ.

هەر کە ئەو برادەرانە دەگەنە نێوزەنگ، لەگەڵ ئەو نووسەرانەی تریشدا یەکدەگرنەوە... بێئەوەی چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئێمە (دەستەی بەڕێوەبەر) بکــەن، یــان تەنانــەت ئاگاداریشــمان بکەنــەوە، کۆبوونەوەی نووســەران ســازدەکەن.. لەو کۆبوونەوەیەدا، دەســتەی بەڕێوەبەر هەڵدەوەشێننەوە و دەســتەیەکی نوێ، لە جێی ئێمە هەڵدەبژێرن... لەو دەســتە نوێیەدا، جگە لە مــن، ئەوانی تــر محەممەد حەمەباقــی و ڕەفیق ســابیر و ئەحمەد دڵزار و محەممەد حوسەینیش (حاجی مەمۆ) لا دەدەن...

وەختێــک مــن گەڕامــەوە، محەممەد حەمــە باقی هەفتەیــەک بەر لە من گەڕابۆوە... ئەو، ئەو کارەی ئەمانی بە کودەتا ناودەبرد... داوای بە ناشەرعی ناســاندنی کۆبوونەوەکە و هەڵوەشاندنەوەی دەســتەی بەڕێوەبەری نوێی دەکرد... کە مەســەلەکە بۆ منیش ڕوونبۆوە، هەمان هەڵوێســتم وەرگرت و ئەندامێتی خۆم لەو دەستە نوێیەدا ڕەتکردەوە.

دوای گفتوگۆ و هاتوچۆیەکی زۆر، لەگەڵ ئەو برادەرانەدا، لەســەر ئەوە

ڕێکەوتین کە:

* دەستەی بەڕێوەبەری نوێ هەڵوەشێتەوە...

* دەســتەی بەڕێوەبەری پێشــوو، تابەســتنی کۆنگرە یان کۆبوونەوەی گشتی ئەندامان، درێژە بەکارەکانی خۆی بدا.

* کات وشوێنی کۆبوونەوەی گشتیش دیاربکرێ...

بەســەرداهاتنی شــەڕی یەکێتی، لە دژی هێزەکانی کۆماری ئیســلامی، کۆبوونەوە گشــتیەکەی بۆ کاتێکی نادیار دواخســت... بۆیە ئێمە "دەستەی بەڕێوەبەر"ی پێشوو تا ئەو کاتەی ئەو کۆبوونەوەیە دەبەسترێ، درێژەمان بەکاری خۆماندا.

کە من لە هاوینی ١٩٧٩دا بووم بە پێشمەرگە و تا چەند مانگێک دواتریش، ژمــارەی ئەوانەی کە پێشــتر ئەندامی یەکێتی نووســەرانی کوردبووین، لە ژمارەی پەنجەکانی یەک دەست تێنەدەپەڕی... ئەحمەد دڵزار، ڕەفیق سابیر، جەمیـل ڕەنجبەر، ناســر حەفید و من. لە پاڵ ئێمەشــدا، ژمارەیەکی تریش هەبوون کە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردنەبوون.

هەریەکــەو لای خۆمانەوە، ترســی ئەوەمان هەبــوو، بەهۆی کاروباری پێشــمەرگایەتی و نەمانــی دەرفەتــی بەرهــەم بڵاوکردنــەوە، لــە گۆڤار و ڕۆژنامە ڕەسمیەکاندا، لە نووسینی ئەدەبی دووربکەوینەوە... دوای چەندین دیدار و کۆبوونەوەیەک، گەیشــتنینە ئەو بڕوایــەی کە قەوارەیەکی ئەدەبی لە شــاخ، بۆ خۆمان درووســتکەین. دیدارەکانمان بەردەوام بوون و وردە وردە هاتنــە دەرەوەی نووســەرانی تریــش، توانــای درووســتکردنی ئەو قەوارەیەی زیاترکردین. دوای هەوڵێکی زۆر، لەدوایین مانگی ساڵی ١٩٨٠دا، بــە ئامادەبوونــی ژمارەیەک نووســەر، لــە بــارەگای دەزگای ڕاگەیاندندا، کۆبونەوەی دەستەی دەمەزرێنەرمان سازکرد.

لــەو کۆبونەوەیەدا، بڕیاری درووســتکردنی ڕێکخراوێکی ســەربەخۆی ئەدەبیماندا... ڕێکخراوێک کە هەموو نووسەرانی شاخ، بەهەموو جیاوازییەکی ئایدۆلــۆژی و حیزبیانەوە، لەســێبەری خۆیدا کۆکاتــەوە. ڕێکخراوەکەمان ناونا، کۆمەڵەی نووســەرانی کوردستان. هەر لەو کۆبونەوەیەشدا، بڕیاری دەرکردنــی گۆڤارێکــی وەرزیماندا... لە کۆتایشــدا دەســتەی بەڕێوەبەری

کۆمەڵەی نووســەرانی کوردستان و دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان، لە ڕێی دەنگدانەوە هەڵبژارد. دەســتەی بەڕیوەبەر، لــە: ئەحمەد دڵزار، ڕەفیق سابیر، حاجی مەمۆ، هەڤاڵ کوێستانی پێکهات... هەریەک لە:

ئەحمەد دڵزار، رفیق سابیر و هەڤاڵ کوێستانی بوونە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە(گۆڤــاری پێــروو). لە ڕێی بڵاوکردنــەوەی بەیاننامەیەکیشــەوە، دامەزراندنی (کۆمەڵەی نووسەرانی کوردستان)مان ڕاگەیاند.

هــەر لە کاتــی بەڕێوەچوونــی کۆبوونەوەکەدا، کۆبوونەوەی دەســتەی دامەزرێنــەر، بەیاننامەکەمان ئامادەکرد... لەو بەیاننامەیەدا، ڕۆڵ و خەباتی نووســەرانی کورد بە گشــتی و یەکێتی نووســەرانی کوردمان بە تایبەتی بەرز نرخاند... جەختیشــمان لەوە کردەوە کە ئێمە، کۆمەڵەی نووســەرانی کوردســتان، خۆمــان بــە بەدیلــی ئــەوان نازانیــن، بەڵکــو هاوخەبــات و پشتیوانیانین.

لە زســتانی ئەو ســاڵەدا، یەکەم ژمارەی گۆڤــاری (پێروو)مان دەرکرد. هەلبژاردنی (پێروو)[١٥٧] بۆ ناوی گۆڤارەکە لەسەر پێشنیاری من بوو.

بۆ بەهار، محەمــەدی حەمە باقی هاتە دەرەوە، بەوەرگرتنی ڕەزامەندی دەســتەی دامەزرێنــەر، ئەویــش خرایە دەســتەی بەڕێوەبەر و دەســتەی نووسەرانیشەوە.

دەبێ ئەوەش بڵێم، هاتنی ئەو، گەرموگوڕییەکی زیاتری بە ڕێکخراوەکەماندا، بــە تایبەتیش لــەوەدا کە ئەو پەیوەندیەکی باشــی لەگەڵ نووســەرانی ناو شارەکاندا هەبوو، هەروەها بە هۆی ئەوەش کە تازە هاتبووە دەرەوە. هەر لەو بەهارەشدا، حکومەت دەستیکردە جێبەجێکردنی ئەو یاسایەی سەبارەت بە یەکێتی نووسەران، ساڵێک لەوەوبەر دەریکردبوو.

یاساکە پەیوەندی بە درووستبوونی(یەکێتیی گشتی ئەدیب و نووسەرانی عێراق)ەوە هەبوو. بەگوێرەی ئەو یاسایە، یەکێتیی نووسەرانی کورد، وەک قەوارەیەکی کوردی ســەربەخۆ، شــەرعیەتی نەدەماو دەبووە بەشێک لەو یەکێتیە عێراقیە گشــتیە. وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەو هەنگاوەی حکومەت، ئێمەش ناوی کۆمەڵەی نووســەرانی کوردستانمان بە (یەکێتیی نووسەرانی

١٥٧ـ پێروو: سوورەیا، یان چل چرا. کۆمەڵە ئەستێرەیەکی وردن دووکاژێریک دوای خورئاوابوونەوە هەڵدێن.

کوردستان)[158] گۆڕی و ناوی گۆڤارەکەشمان لە پێرووەوە کردە(نووسەری کوردستان).

لە بەهاری ١٩٨١وە تا بەهاری ١٩٨٢، چوار ژمارەمان لە نووسەری کوردستان دەرکرد، لەگەڵ ژمارەیەک کۆمەڵە شیعر و بڵاوکراوەی تریشدا. یەک ژمارەی گۆڤارەکە، لە چاپخانەی حیزبی شیوعی و باقیەکەی لە چاپخانەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدا چاپکران. هێزی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەش، گواستنەوە و گەیاندنی گۆڤارەکانیان بۆ هەرێمەکان و بۆ ناوشارەکان، گرتە ئەستۆی خۆیان.

---

١٥٨-یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، لەماوەی ئەو (١٠) ساڵەی تەمەنیدا، ئەم بەرهەمانەی بڵاوکردۆتەوە:
- یەک ژمارە لە گۆڤاری پێروو.
- ١٩ ژمارە لە گۆڤاری نووسەری کوردستان.
- ١٥ ژمارە لە گۆڤاری(گزنگ)ی لقی کەرکوک.
- یەک ژمارە لە گۆڤاری(نووسەری نوێ)ی لقی هەولێر.
- ٥ ژمارە لە گۆڤاری(کەلتوور).
- دەیان کتێب لە کۆمەڵە شیعرو چیرۆک و ڕۆمان و لێکۆڵینەوەو بابەتی وەرگێڕاو.

## ٥٠

یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، هەم قەوارەکەی بۆ کۆکردنەوەی نووسەرانی شاخ گرنگ بوو، هەم بارەگاکەشی وەکماڵێک، بۆ حەوانەوەی ئەو نووسەرانەی لە هیچ دامودەزگایەکی پێشمەرگایەتیدا کاریان نەدەکرد. لە پاڵ نووسەراندا ژمارەیەک پێشمەرگەی هونەرمەندیش هەبوون. شێوەکار و شانۆکار و موسیقار و گۆرانی بێژیان تێدابوون.

ئەوان، چونکە تا ئەو کاتە بارەگای تایبەت بە خۆیان نەبوو، هەریەکەو لە بارەگایەکدا پێشمەرگەبوون...

هەر کە نووسەرێک یان هونەرمەندێک بەتازەیی پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکرد، تەواوێک دڵخۆش دەبووم. هاتنی ئەوانەم بەنیشانەیەک لە نیشانەکانی بەرەو پێشەوەچوون و گەشەکردنی شۆڕش دەزانی. هاتنە دەروەی هەر نووسەر و هونەرمەندێکم لا گرنگ بوو، بەڵام لەناو هەموویاندا، زیاتر بە مۆسیقار. دوورنیە ئەو هەستی نزیکیەم لە مۆسیقا و لە مۆسیقار، زیاتر پەیوەندی بە ئەزموونی منداڵیمەوە هەبێ. ئەو کاتەی لە قوتابخانەی سەرەتایی دەمخوێند، لە هەفتەیەکدا وانەیەکی مۆسیقامان هەبوو.

من ئەگەرچی نەدەنگم خۆش و نە کۆپلەیەکی بچووکی تێکست و نە ڕیتم و نە میلۆدیی هیچ گۆرانیەکیشم لەبەرنەبوو، بەڵام وانەی میوزکم لا خۆشترین وانەی هەفتەبوو.

ئێمە لە قوتابخانەی سەرەتایی چوارقورنە، بەختمان هەبوو کە مامۆستای وانەی میوزیکمان، میوزیکژەنانی وەک خالد سەرکار و فەرەنیس داود بوون. هەرجارێک بەخۆیان و بە ئامێری میوزیکەکانیانەوە دەهاتنە پۆلەوە، پۆلەکەمانیان لە پەلکە زێڕینەی ئاواز دەگرت... کە پەنجەیان بە ژێی ئامێرەکانیاندا دەهێنا، پۆلەکە پڕ دەبوو لە پەپوولە نۆتەو ئێمەی منداڵیان بەدوای ڕاوکردنی خۆیاندا، دەخستە سەما. ئیدی لەوێوە، من هۆگری مۆسیقا بووم.

ئەو کاتەش دەستم بە شیعرنووسین کرد، ئەو پەیوەندییە ئۆرگانیەی نێوان شیعر و مۆسیقا، ئەوەندەی تر مۆسیقایان ئاوێتەی ڕوحم کرد...

سەرباری هەموو ئەمانەش، لە ژیانی پێشمەرگەیاتیماندا، لە ڕێی ئەو ڕادیۆ چکۆلەی کە بە ملی خۆماندا دەکرد، لە هەر کات و شوێنێکدابایین، گۆرانی و میوزیکمان لەگەڵدابوون... گۆرانی و میوزیک ئەگەر بۆ خەڵکی ئاسایی پێویست بووبن، بۆ ئێمەی پێشمەرگە هەر بەڕاستی خۆراکی ڕۆح بوون.

ئەو مامۆستا میوزیکژەنانەمان نەبان، ڕەنگە ئێمەش وەک خەڵکانی ئەو سەردەمە، هەر کەسێک میوزیکی ژەنیبا، بەچاوەشمان زانیبا... کە منداڵبووم، خەڵکی ئاوا سەیری میوزیکژەنیان دەکرد. زەمەنێکی زۆر بەسەر ئەو ڕۆژگارەدا ڕەتیبوو، کەچی هێشتا هەبوون، بە هەمان تێڕوانینی خەڵکانی سەردەمی منداڵی ئێمەوە سەیری میوزیک و میوزیکژەنیان دەکرد.

مەجید خۆشناو، بە خۆی و کەمانچەیەکەوە لە دەڤەری هەولێرەوە بەرەو ناوچەی سەرکردایەتیی یەکێتی دێ لە ڕێگای هاتنیدا، تووشی سەید کاکەو هێزێکەی دێ... سەید کاکە، ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتی حسیک و فەرماندەی هەرێم بوو. زۆر هەوڵ لەگەڵ مەجید خۆشناوا دەدات لای ئەوان بمێنێتەوە، بەڵام فایدەی نابێ. وەختێک سەید کاکە دڵنیادەبێ لەوەی مەجید لای ئەوان نامێنێتەوە و دەچێتە لای یەکێتی، پێی دەڵێ: "مام جەلال هەر لە چاوەشانی کەمە، دەبڕۆ لای وان... ئەتوو هەر قابیل بەوانی."

بەدوای ڕووداوی سەید کاکە و مەجیدا، دلێر ئیبراهیم پەیوەندی بەهێزی بە پێشمەرگەوە کرد. دلێر ئیبراهیم ئەندامی تیپی میوزیکی سلێمانی بوو. تیپی میوزیکی سلێمانی لە حەفتاکانی سەدەی پێشوودا، وەرچەرخانێکی گەورەی لە میوزیک و لە میلۆدی و لە گۆرانی کوردیدا بەرپاکرد... وەرچەرخانێکی وا کە تێڕوانینی کۆمەڵگاشیان، سەبارەت بە میوزیکژەن و گۆرانیبێژ گۆڕی... لەو چالاکی و فیستیڤاڵانەی ئەو تیپە، لەسەر ئاستی کوردستان و هەموو عێراقیشدا، بەشدارییان تێداکرد، بە شارایەک[159] لە خەڵات و ستایشەوە دەگەڕانەوە.

ئەگەرچی ئەنوەر قەرەداغی، وەک پێشەنگی ئەو وەرچەرخانە تەماشا دەکرێ کە ئەو تیپە بەرپایکرد، بەڵام کۆمەڵێک میوزیکژەنی دیکەش، پشکیان لەو وەرچارخانەدا کەم نەبوو.. لەپاڵ خالد سەرکار و فرەنسیس داودو فەرەیدوون دارتاش و ولیەم یۆحنا و سەلاح ڕەوف... دلێر ئیبراهیمیش یەک لەو فیگەرانەی ئەو تیپەبوو. دلێر، هەر لە میانەی بەرهەمەکانی ئەو

١٥٩ـ شارا: کۆمەڵە مەڵۆیەک کە دەخرێنە سەریەک. مەڵۆ: باوەشێک لە گەنم و جۆ و مەرەزەی دووراوە.

تیپەدا، مۆسیقای(بەیتی ڕێزانکێ)ی دانا کە لەسەر ئاستی هەموو عێراقدا، پلەی یەکەمی بە دەستهێنا.

دلێر، لە شۆڕشی ئەیلولیشدا پێشمەرگە و ئەندامی تیپی مۆسیقای شۆڕش بوو... بۆ شەش حەوت ساڵێکیش، ئەندامی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەبوو لە پایزی ١٩٨٢دا بووبە پێشمەرگە... بەر لەویش بە ساڵێک، ئاراس ئیبراهیمی برای هاتبووە دەرێ. ئاراس، بە هاوکاری هیوا زەندی و چەند هونەرمەندێکی تر، تیپی مۆسیقای شەهید کارزانیان پێکهێنابوو. هەرچەندە تیپەکە شوێنی حەوانەوەی خۆیان هەبوو، بەڵام سەر بەدەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی بوو. بەهۆی ئەوەش ئەو کاتە ئەرسەلان بایز، بە وەکالەت لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندن بوو، بەرپرسی ڕاستەوخۆی تیپەکەش بوو.

دلێر، لەسەرەتادا دەیەوێ لە یەکێک لە تیپەکاندا ببێتە پێشمەرگە، لەسەر ویستی ناوەندیی کۆمەڵە، دەچێتە تیپی مۆسیقای شەهید کارزان و لەگەڵ ئەواندا دەست بەکاردەکات. دلێر، نایەوێ مۆسیقا بکاتە پاشکۆی حیزب و ئەرسەلانیش وەک بەرپرسی تیپەکە دەخالەت لە هەموو کارێکیاندا دەکا و دەیەوێ ئەوان بە فرمان و ڕێنمایی ئەو کاربکەن. لەسەر یەک لەو دەخالەتانە، ئارس و دلێر، لەگەڵ ئەرسەلاندا لێیان دەبێتە دەنگەدەنگ. ئەرسەلان لەسەر ئەو هاتنە دەنگەی ئەوان، داوا لە مەکتەبی عەسکەری دەکات، فەرمانی گرتنیان بۆ دەرکەن. مەکتەبی عەسکەریش لەسەر ئەو داوایە، دلێر و ئاراس بۆ زیندان دەنێرێ. عەلی شامار، بەرپرسی زیندان، لەبری زیندانیکردنیان، بە ڕێزەوە مامەڵیەیان لەگەڵدا دەکاو وەک میوانی خۆی، لە ژوورەکەی خۆیدا دایاندەنێ.

بیستنی ئەو هەواڵە، هەموومانی تووشی نیگەرانی و تووڕەیی کرد. هەر ئەو عەسرەی ئەو خەبەرەمان پێگەیشت، لەگەڵ محەمەدی حەمەباقی و محەمەد موکریدا، بە هەورازەکەی بەردەم بارەگاکەی نەوشیروان مستەفادا هەڵگەڕاین. لە ڕێگادا لەبەرامبەر ئەو هەڵسوکەوتەی ئەرسەلاندا، هەزار ڕەحمەتمان بۆ ڕەفتارەکەی سەید کاکە دەنارد کە بەو نەخوێندەواریەی خۆیەوە، ئەوەی لەگەڵ مەجیدا نەکردبوو.

هەر کە تووڕەیی و ناڕەزایی خۆمان لەو ڕەفتارە گەیاندە نەوشیروان مستەفا، یەکسەر فەرمانی ئازادکردنی بۆ دەرکردن... بۆ دڵنەوایی کردنیشیان، بانگی کردنە لای خۆی.

هەتا دلێر و ئاراس گەیشتن قەدەرێکیان پێچوو... من لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە

خەفەربــووم، نەمدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕێی هاتنی ئەوان بم. بە ناچاری بــۆ ئامادەکردنی خواردنی ئێوارە، گەڕامــەوە بارەگای ناوەندی. دوای من، دلێــر و ئاراس دەگەن و وردەکاری ڕووداوەکەی بۆ باس دەکەن... ئەویش تەلەفون هەڵدەگرێ و کۆمەڵێک قســەی زۆر توند بە ئەرســەلان دەڵێ... بە پیاوێکی بێ توانا و بێکەڵک ناویدەباو تەلەفونەکەی بەسەردا دادەخاتەوە. بۆ دڵدانــەوەی دلێریش، داوای لێدەکات کە هەر لە بارەگاکەی ئەودا بمێنێتەوە. دلێر کە لەو ســووکایەتیپێکردنەی ئەرسەلان، ئەوەندە نیگەران و ناڕەحەت بووە، دەڵێ:

- نە لێرە ئەمێنمەوەو نە مۆسیقاش بۆ یەکێتی ئەکەم.

- نایکەی مەیکە، شۆڕش بەبێ مامۆسیقاش ئەکرێ.

دلێر، هەڵدەســتێ و بەدڵی شکاوەوە ئەوێ جێدێڵێ. ئەوێ جێدێڵێ، بەڵام پێشــمەرگایەتی نــا. هەر ئــەو ئێوارەیەش، لەگەڵ پێشــمەرگەکانی تیپی ٤٧ پیرەمەگروندا، بەرەو شەڕگەکانی هێزی پشتیوان دەکەوێتەڕێ.

ســاڵێک دواتــر، لەگەڵ ئــاراس و کۆمەڵێــک هونەرمەندی تــری بواری میوزیکدا، ســەرلەنوێ تیپی مۆســیقای شــەهید کارزان دەبوژێننەوە... هەر لەماوەی ئەو ساڵەشــدا، کاســێتێک لە گۆرانی و ســروودی شۆڕشــگێڕانە بەرهەمدێنن... کاســێتێک، کە دڵنیام ڕای نەوشیروان مستەفایان، سەبارەت بە مۆسیقا و شۆڕش گۆڕیووە.

## ٥١

لێرەوە، هاوین تەنگی بە بەفری کوێســتانە سنوورییەکان هەڵچنیووە و خەریکە لە بەرزایی شاخ و لە نسرم و لە ناو کاو[١٦٠] و لە زەنوێرەکانشیان وەدەردەنێ. لەو لاشــەوە هێزەکانی کۆماری ئیســلامی ئێران، هێرشــێکی بەربڵاویان کردووتە ســەر ناوچەکانی ژێــر کۆنترۆڵی حیزبی دیموکرات... کار وابــڕوات بەدیوی ئێمەیاندا دەکەن. حیزبــی دیموکرات تا بە تەواوەتی نەکەوتنە ژێر گوشاری سوپای کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، بەینیان لەگەڵ یەکێتیــدا ئەوەندە بــاش نەبوو... بەین هەبــوو، بەڵام ســاردبوو... تەنانەت بــەو ڕۆڵــەش نارەحــەت بوون کــە مام جــەلال و یەکێتی، لەســـەرەتادا لە نێوەندگیری نێوان کۆماری ئیسلامی و هێزە کوردییەکانی ئێراندا دەیانبینی. بەین هێندە ســاردبوو، تەنانەت ئەو کاتەی قاسملو، دوای ڕووخانی شا، لە بەغــداوە، بەرەو ڕۆژهەلاتی کوردســتان، بەنزیکــی نێوزەنگدا ڕەتدەبێ، بۆ سڵاوکردنێکیش مام جەلال بەسەرناکاتەوە، ئەگەرچی ئەو ڕێیەی ئەو پێیدا ڕەتبــووە، تفەنگ هاوێژێکیــش، لەبارەگاکانی مام جەلال و ســەرکردایەتی یەکێتیەوە دوورنەبووە...

وەختێکیش، بۆ ماوەیەک دەسەلاتی ناوچە سنورییەکانیان کەوتە دەست، زۆرجار سەریەشــەیان بۆ ئەو پێشــمەرگانەی یەکێتی دروســت دەکرد کە بــە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵــی ئەواندا گوزەریان دەکــرد... ئەوەش دەوترا کە خودی قاســملو دەســتوری بە پێشــمەرگەکانی حیزبی دیموکرات داوە، کارئاســانی بــۆ پێشــمەرگەکانی یەکێتــی نەکــەن... خۆ ئەگەر ئــەوان ڕێی هاتووچۆیــان بۆ عیراق، بەناو ئێمەدا نەبا، ڕەنگە هەر ڕێشــیان نەدابا، ئێمە بەناوچەکانی ئەواندا هاتوچۆبکەین. لە هەموو ڕەتبوونێکماندا دەبوایە، بەرگەی هاتووچۆمــان پێبوایە... هەڵبەتە بەرگەی یەکێتیش دەیخوارد. جارێکیان مام جــەلال، لەناوزەنگەوە بەرەو سەردەشــت دەچێ، لەوکاتــەدا بەناو گوندی بەنوخەڵەفــدا تێدەپەڕێ، تووشــی مەفرەزەیەکی حیزبــی دیموکرات دەبێ... فەرماندەی مەفرەزەکە دەچێتە ســەر ڕێیان و داوای بەرگەیان لێدەکا... مام جەلال پەست دەبێ:

- مەگەر ئەتو نازانی من مام جەلالم؟!

١٦٠ - کاو: ئەو چالاییەیە کە لەناو شاخدا بەفری تێدا کۆدەبێتەوە.

- دەزانــم قوربــان، دەزانم بەلام دەســتوری حیزب وایــە، کەس ناتوانی بەبێ(بەرگەی تەڕەدود)[161] بەناو خاکی ئێرانیدا گوزەربکا.

مــام جەلال بە تووڕەییــەوە جانتاکەی دەکاتــەوە، کاغەزێک دەردێنێ و بەرگەیەکی هاتوچۆ بۆ خۆی دەنووســێ و مۆرێکی یەکێتی لێدەداو دەیداتە دەست کابرا... کابرا کە هیچ پەلپێکی نامێنێ، دەڵێ:

ئەوجا قوربان فەرموون بۆ کوێ دەچن ئازادن.

دوورنیــە ســاردیی ئــەو پەیوەندیــەی نێــوان هــەردوولا، بــۆ ئــەوە گەڕابێتــەوە کە ئەوان هــەم پەیوەندیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا باشــبوو، هەمیــش ئێمەیــان بەوە تۆمەتباردەکــرد کە پەیوەندیمان لەگــەڵ کۆمەڵە و ڕەوتەکەی شــێخ عزەدین حوســینی باشــەو هاوکارییان دەکەین.... ڕەنگە هەر ئەو بیرکردنەوەشیان وایلێکردبن، وەختێک بزووتنەوەی سۆشیالست، لــە یەکێتی جیابــووە، حیزبی دیموکرات و قاســملوش، ڕۆڵیان لە هاندان و لــە کۆمەکپێکردنی ئــەو بزوتنەوەیەدا هەبێت ئەو دۆخە تازەیەی هێرشــی کۆماری ئیســلامی درووســتی کرد، وا لە قاسملو دەکات، هانا بۆ یەکێتی و حیزبــە کوردییەکانی تر بێنێ. هەڵبەتە جگە لە قیادەی موەقەت کە بەقەولی خۆیان هاوکاری ســوپای پاسدارانی ئێرانیان دەکرد، حیزبەکانی تر، حزبی شــیوعی، حســک و پاســۆکیش، بەبیانووی جیاجیاوە، بەهانایانەوە ناچن. یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتان، لە کۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵی نێوان (مام جەلال و نەوشــیروان و قاســملو)دا، بەبێ گەڕانەوە بۆ مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی، بڕیاری ناردنی هێزیدا.

یەکێتی بڕیاری ناردنی هێزی داو یەکســەریش دەستی بەجێبەجێکردنی بڕیارەکــە کــرد... ئــەو هێــزەش کــە یەکێتــی بۆ پشــتیوانی لــە هێزەکانی حیزبی دیموکرات ناردی، ناونرا (هێزی پشــتیوان). ســەرەتا ملازم عومەر سەرپەرشتی ئەو هێزەی دەکرد... کە بەرەکانی شەڕ فراوانتربوون، یەکێتی زۆرینەی هێزەکانی خۆی ڕەوانەی ئەو بەرانە کرد... مام جەلال خۆیشــی، بۆ سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی نەبەردەکان، چووە دیوی ڕۆژهەلاتی کوردستان و بنکەی خۆی لە گوندی ساوان دانا...

یەکێتی، هەموو توانا مادی و مەعنەویەکانی خۆی خستە ئەو شەڕەوە... زۆرینەی پێشــمەرگەکانی لەبەرەکانی شــەڕدابوون و ڕادیۆکەشی، بەشی زۆری کاتــی پەخشــەکەی، بــۆ ئەو بابــەت و هەوالانە تەرخــان دەکرا کە

---

١٦١ـ بەرگەی تەردود: پسولەی هاتوچۆ

پەیوەندیان بەو شەڕەوە هەبوو....

نەوشـیروان مسـتەفا و فەرەیـدوون عەبدولقـادر، کۆمەڵێـک وتاریان لە ژێر ناوی"مەسـەلەی کورد یەک مەسـەلەیە یان چەند مەسـەلەیەک"دا نووسـی و ڕۆژانە لە ڕادیۆی دەنگی شۆڕشـی عێراقـەوە بڵاودەکرانەوە. تێکڕای وتارەکان بۆ پشـتیوانیکردن و بە نەتەوەیی نیشاندانی ئەو بڕیار و هەڵوێستەی یەکێتی بوو...

ئەو هەڵوێسـتە، لەسـەرەتادا حەماسـەتێکی بەهێزی لەناو پێشمەرگەدا خولقاند... زۆرینەی هەرە زۆری پێشـمەرگە و کادر و فەرماندە سیاسـیو سـەربازییەکان، لەگـەڵ ئـەو پشـتیوانیکردنەی حیزبـی دیموکراتدا بوون. بەرامبەر بەوەش، خەڵک هەبوون چ لە ناو سەرکردایەتی و چ لەناو کادرو پێشمەرگەشدا، ئەو هەڵوێستەیان بە ڕاست و درووست نەدەزانی و ئامانجی شاراوەیان، لەپشتی ئەو هەڵوێستە (نەتەوەی)یەوە دەبینی. من، یەکێک بووم لەوانە.

هەموو برادەرانی ئێمە، لە یەکێتی نووسەرانی کوردستان، ئەوانەی لەگەڵ یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتاندا بوون، بۆ دەربڕینی هەسـت و هاوسۆزی خۆیان لەو هەڵوێسـتەی یەکێتی، چووبوونە گوندی ساوان، ئەو شوێنەی کە مام جەلال بنکەی خۆی لێدانابوو. لە نزیک مام جەلالیشەوە، خانوێکی چۆڵیان بۆ خۆیان ئاوەدان کردبۆوە... ئەوان هەموو لەو خانووەدا بوون و محەمەدی حەمە باقیش لە بارەگاکەی مام جەلال... ئەوەش بەهۆی ئەو ساردیەوە بوو کە لەگەڵ ئەو نووسـەرانەدا هەیبوو. هەر لای مام جەلالیشەوە، نامەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا دەنێرێ... ئەویش بۆ خوێندنەوەی نامەکە پێشمەرگەیەک بە دوای مندا دەنێرێ. محەمەدی حەمە باقی لە نامەکەدا دەنووسێ:

"پێویستە ئێمە وەک یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، پشتیوانی تەواوی خۆمـان، لـەو هەڵوێسـتە نەتەوەیـی و نیشـتمانیەی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان دەربڕین." هەروەها نووسـیبووی کە ئەو بابەتەی لەگەڵ مام جەلالیشـدا باسـکردووەو ئەویـش زۆر پێیخـۆش بووەو بەهەڵوێسـتێکی جوامێرانـەو بەرپرسیارانەشـی لە قەڵەمـداوە. لە شـوێنێکیەی نامەکەدا، پێشـنیار بۆ نەوشـیروان مسـتەفادەکات، داوا لەمن کات بەیانێکی بەهێزو شایستە بەو هەڵوێستەی یەکێتی، بەناوی یەکێتی نووسەرانی کوردستانەوە بنووسم و لە (ڕادیۆی دەنگی شۆڕشی عێرق)یشدا بڵاویبکەمەوە.

لە کۆتایشدا دەنووسێ:"ئەگەر هەڤاڵ ئامادەی نووسینی ئەو بەیانە نەبوو،

تکام وایە کە جانابت بۆ مێژوو ببیەشایەت کە ئەمە هەڵوێستی منە."

هەر کە لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە، پێی ووتم:

- بەنووسینی ئەو بەیاننامەیە هەڵوێستێکی جوان ئەنوێنن.

- کاک نەوشیروان، داوی لێبوردن دەکەم، من جیا لەوەی لەگەڵ ئەم هەڵوێستەو ئەم شەڕەشدا نیم، دەرکردنی بەیانێکی لەوجۆرەش بەکارێکی درووست نازانم.

- بۆچی بە درووستی نازانی؟!

- لەبەردوو هۆ:

یەکەم: لە پێنج ئەندامی دەستەی بەڕێوبەر، سیانمان لێرە نین. من و کاکە حەمەش، ئەو مافەمان نیە بەناوی ئەوانیشەوە بەیانێکی لەو جۆرە بنووسین.

دووەم: ڕەنگە نووسینی ئەو بەیانە، یەکێتیی نووسەران تووشی لەتبوون کات... من ناتوانم ئەو بەرپرسیارێتیە بخەمە ئەستۆی خۆم.

من دەمزانی ئەو وەڵام و پاساوەی منی بەدڵ نیە، بەڵام هیچی نەوت... نامەکەی خستەوە ناو چەکمەجەی مێزە چکۆلەکەی بەردەمی و خۆی بە شتێکەوە مەشغوڵ کرد... دوای کەمێک بێدەنگی منیشماڵئاوایم کرد و گەڕامەوە بارەگای ناوەندی.

من تاکە نووسەربووم کە تا ئەو کاتە لە نێوزەنگ مابوومەوە و پشتیوانیم لەو هەڵوێستەی یەکێتیی نیشتمانی نەدەکرد و ناڕەزایی خۆشم لەو بابەتە نەدەشاردەوە.

هەر بۆ بەیانکردنی ئەو هەڵوێست و بۆچوونانەشم کە هەمبوون، نەک بۆ دەربڕینی پشتیوانی، دەبوایە منیش بچمە ئەوێ...

لەگەڵ ئەو هێزەدا کە بۆ ئاڵوگۆڕی هێزێکی تری یەکێتی لەسەر ڕۆشتنبوون، منیش چووم... نەوشیروان مستەفا و مەلا بەختیار و چەند بەرپرس و فەرماندەیەکی دیکەش لەگەڵ هێزەکەدا بوون...

ئەو کاتەی گەیشتینە ساوان، مام جەلال لە پێشوازی هێزەکەدا وەستابوو، چەند ووشەیەکی حەماسی و گوڕوتینبەخشی دەربڕی. دواتر ووتی، "ئێوە

هەمووتـــان میوانی منن، بەڵام لەبەر بچووکی جێگاکەم، تەنها دەتوانم چەند کەســێک لای خــۆم میوانــداری بکەم... بــا ئەوانەی تریش بەســـەر بنکە و بارەگاکانیکەدا بڵاوببنەوە"

یەکە یەکە ناوی ئەو بەرپرســـانەی هێنا کە دەیویست بیانباتە لای خۆی، وابــوو ناوی منیشـــی لەگەڵ ئەواندا هێنا.... کە گەیشـــتینە شـــوێنەکەی مام جــەلال، تەنها محەمەدی حەمەباقی و دانای ئەحمـــەد مەجید لەوێ بوون... مـــام جـــەلال دنیایەک تاریفی دانـــای کرد، وەک یەک لە شـــێرانی بەرەکانی شەڕیش ناوی هێنا...

نانی ئێوارە خورا، گفتوگۆ لەســـەر شـــەڕەکە و هەڵوێســـتەکەی یەکێتی دەســـتپێکرد....مام جەلال کە دەیزانی من هۆکاری دەرنەکردنی بەیانەکەی یەکێتی نووسەرانی کوردستان بووم، بۆ پشتیوانی لەو هەڵوێستە(نەتەوەییە) ی یەکێتـــی، ڕووی کـــردە من وتی، ئەرێ بۆ بەیانەکەی نووســـەران چیتان کرد؟

منیش ئەم پرســـیارە لاتاوەی[١٦٢] مام جەلالـــم، بۆدەربڕینی بۆچوونەکانی خۆم قۆستەوە، خەریکبوو سەنجەکانی خۆم دەربڕم:

"جـــارێ ڕاوەســـتێ"... مـــام جـــەلال وای بە مـــن گـــوت و ڕووی کردە دانیشتووانی ناو ژوورەکە:

- پێش ئەوەی، هەڤاڵ دەست بەڕەخنەکانی بکا، باشتەکی خۆشتان لەسەر ئەو پیاوەی بۆ بگێڕمەوە..

- ئینجا مامە چۆن دەزانی ڕەخنە دەگرێ. یەکێک وای ووت...

- دەزانم... جارێ لەوەی گەڕێ... پار ئەو وەختەی بوو، بۆ نانی نیوەڕۆیە، لەگەڵ هێرۆی، دەچووینە لای کاکە نەوەی... بەفرەکی زۆر باریبوو... دەبوایە بەکـــن بارەگای ناوەندیدا بڕۆین... لەوکاتەدا بەوێدارەتدەبووین، هەڤاڵم دی، لە دەرێ بوو... وابزانم خەفەرو شتی وابوو... نانی نیوەڕۆیەی حازردەکرد... بـــە هێرۆم گـــوت با بۆ چاخواردنەوەکـــی لادەینە لای هەڤاڵـــی... ژوورەکی چکۆلەی هەبوو... هەر دانیشتین و پێی گوتین"حەزتان لە چایە یان ماستاو، ماســـتێکی جوانمـــان هەیە." ... ئەمن بۆخۆم بەو بەفر و ســـەرمایەی حەزم لە چای بوو، بەڵام گوتم فەقیرە با بەو ســـەقەمەی تووشـــی ئاگرکردنەوەو چالێنانی نەکەم، بۆیە گووتم ماســـتاو ئاسانترە... واز لە چای بێنە، چالێنان

١٦٢ـ لاتاو: قسەی بە تویکڵ یان قسەی توانج ئامێز.

زەحمەتـــە، ماســـتاومان بـــۆ بکە.... لـــەو کاتەیدا خەریکبوو بچێ ماســـتاوی بێنـــێ، ڕووم لە هێرۆی کـــردو بە گاڵتەوە گوتم"ئینجا چ لەوەی خۆشـــترە، شـــاعیر ماســـتاوت بۆ بکا."...مەمنا[١٦٣] گوێی لە قســـەکەی من بوو، تۆزەکی پێچوو، هاتەوە... گوتی"دەبێ ببوورن، پێشـــمەرگەکان هەموو ماســـتەکەیان خواردووەو هیچ ماســـتمان نەماوە، چاتان بۆ لێدەنێم... ئەو چوو چامان بۆ لێنێ، هێرۆ گووتی"بەو ماســـتاوەی، ئەو بـــرادەرەی خۆمانم بیرکەوتەوە... دوێنـــێ تەلەفۆنی بۆ کردم... پێی خۆشـــە ڕۆژی جومعە، لەســـەرکانیەکەی پشتی مقەڕەکەی کاک نەوشیروان، دەعوەتمان کات... وابزانم کەباب و شتی واشـــمان بۆ ئەکات."... ئەمنیش گووتم ئینجا ئەوە کوا پەیوەندی بەماســـتاو کردنەوە هەیە... گووتی"با هەیەتی... باشـــە ئەو تا دوێنێ، لەو شـــارباژێڕە، هەر جوێنی بە ئێمە ئەدا، کەچی ئێستا ئەیەوێ دەعوەتمان کات."

ئەمنیش گووتم:

ئاخر خۆ ئەو برادەرەمان، هەر جنێوان نازانێ، ماستاویش دەزانێ...

ئینجا ئەو ڕۆژەش کە هەڤاڵ باسی ماستاوی کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم کە ماستاوەکەی هێنا، بەهێرۆی دەڵێم، ئەویش هەر ڕەخنەی نازانێ، ماستاویش دەزانێ... کەچی ماســـتاوەکەی بۆ نەکردین... ســـووریش دەمزانی ماستیان هەیـــە، بـــەڵام نەیکرد... بۆیە من پێم خۆشـــە گوێ لە ڕەخنەی ئەو کەســـانە بگرم کە ماستاو ناکەن... کەمێک وەستاو ئینجا ڕوویکردەوە من:

- ئێستا فەرموو قسەکانی خۆت بکە...

نایشـــارمەوە، ڕەنگـــە ئەو قســـانەی مام جـــەلال نەبوونایـــە، هەموو ئەو شـــتانەم نەگووتبان کە وتمن... قســـەکانی مام جەلال وایان لێکردم هیچ لە دڵـــی خۆمـــدا نەهێڵمەوە... هەر چەندە ئەوەشـــم لەبەرچاوبـــوو کە زۆربەی ســـەرکردەکان، شاباشـــیان لە ڕەخنە پێ خۆشـــترە... ئەوەم لە بەرچاوبوو کە ئامانجی ئاشـــکرای ئەو شـــەڕانەی ســـەرکردەکان هەڵیان دەگیرســـێنن، تـــەواو لە ئامانجە نهێنی و شـــاراوەکان جیـــاوازن... ئەگـــەر یەکێک بیەوێ بەردی ســـەرئەو ئامانجە شاراوانە هەڵداتەوە، بەر غەزەبی ئەو سەرکردانە دەکـــەوێ... ئەوانەم دەزانی، بەڵام هیچم نەهێشـــتەوە تا دوایی بەخۆم بڵێم، خۆزگە ئەمەشیانم وتبا... هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو سەرنجەکانی خۆم لەم خاڵانەدا خستە ڕوو:

---

١٦٣. مەمنا: توومەز.

* مــن دژی بەهاناوە هاتنــی حیزبی دیموکرات یان هەر هێزێکی دیکەی کوردی نیم، لە هەر شوێنێک بن، بەڵام ئەمە کاتێک مایەی قەناعەت پێهێنان دەبــێ کە ئێمە لە کوردســتانی خۆمانــدا، لە دژی هەمــوو لایەنەکانی دیکە لەشەڕدا نەبین....

* لەو ماوەی پێشــوودا، هەوڵێکی ئاشــتەوایی لە نێــوان ئێمە و قیادەی موەقەتەدا هەبوو، ئەم شەڕە ئەو دەرفەتەش لەناودەبات، بەتایبەتیش وەک خۆتــان دەڵێن، چەکدارانی قیادەی موەقەتە، شانبەشــانی پاســداران شــەڕ دەکەن.

* هێزەکانــی حیزبــی دیموکــرات، لە شــکاندان و زۆربــەی ناوچەکانی خۆیان لە دەســتداون، ڕوحیەتی بەرەنگاریبیان ئەگەر ماشــبێت لە ئاستێکی زۆر نزمدایە... پاســداران پەلاماری هەر کوێیەکیان دابێ، ئەمان ڕێگریەکی وایان نەکردووە و تەنانەت بەشــی شــەڕی پارتیزانیش پێشمەرگەیان تێدا بەجێنەهێشــتووە... هێزی پشتیوانی ئێمەش، ســەرباری هەموو ئازایەتی و قارەمانیەتیەکیان، ناتوانن لە بری هێزەکانی ئەوان شەڕ بکەن.

ئــەوەی ئێمــە دەیکەین، زیاتر لە ئەســتۆگرتنی بەشــێک لەو شکســتەی هێزەکانــی حیزبــی دیموکراتە و هیچیترنا. لەوەش زیاتر من ترســی ئەوەم هەیە، ئەمە کار بکاتە ســەردابەزینی ڕۆحیەتی، شەڕکردن لای پێشمەرگەی ئێمەش. شــکانی هێزەکانی ئێمە لەم شــەڕەدا، واتا زیاتر پێشڕەوی کردنی هێزەکانــی کۆماری ئیســلامی، بــە ئەندازەیەکی وا بارەگاکانــی ئێمەش لە نێوزەنگ و دەوروبەری بکەونە ژێر مەترسی پەلاماری هێزەکانی کۆماری ئیسلامیەوە...

* داوای لێبــوردن دەکەم کە دەڵێم، ئەم بڕیارە زیاتر بڕیارێکی عاتفی و حەماســیيە، تا بڕیاردان لەســــەر بنچینەی زانیاری و تاوتوێکردنی سیاسی دۆخەکە و هەڵسەنگاندنی ووردی ڕووداوەکان.

* ئەم شەڕە، سەرباری ئەوەی تێکچوونی پۆلێن کردنی ئەولەویاتەکانی شۆڕشــە، بــاری یەکێتیــش لەوە قورســـتردەکات کــە لە حاڵی حــازردا بە کۆڵیەوەیەتی.

* ئەگــەر هەســتی بەرپرســیاریتی و نەتەوەییــش ئەم هەڵوێســتەی بە یەکێتی وەرگرتبێ، ڕەنگە خەڵکی تر بەزەمینەسازیی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەتــی بەعســدا لێکیبدەنەوە... خۆ ئەگەر گفتوگۆکردن لەگەڵ بەعســدا، ئامانجیــش نەبووبــێ، ئەوا درێژەکێشــانی ئەم شــەڕە، دواجــار بەناچاری

ئێمــە بەرەو مێزی گفتوگۆ دەبات. ئێمە بەم شــەڕە(کارتی فشــاری ئێرانی) لەدەســتدەدەین.. بەوەش پێگەی حکومەتی عێراقی بەهێز و پێگەی خۆمان، لە حاڵەتی هەبوونی گفتوگۆدا لاواز دەکەین.

کەمن قســەم دەکرد، هەندێک دەیانویست قســەکانم پێببڕن و سەرنجی خۆیان دەرببڕن، مام جەلال دەیوەستاندن و دەیووت:

- پەلەمەکەن با ئەم قسەکانی خۆی بکا، ئەو دەمی هەرکەسە و چی هەیە بابیلێ...

بەنۆرە قسەکرا، مام جەلال ووتی:

- من لە دوای هەمووتان قسەی خۆم دەکەم...

نەوشــیروان مســتەفا، دژی بەشی هەرە زۆری ســەرنجەکانی من بوو، پاساوەکانیشی بۆ ئەو دژبوونەی:

* بەشــداری لەو شــەڕەدا، سەرباری هەڵوێســتی نەتەوایەتی، ئەرکێکی ئەخلاقی و شۆڕشگێڕانە و نەتەوەیشە.

* ئێران بەهەموو شــێوەیەک دژایەتی ئێمە ئەکا و کۆمەک و پشــتیوانی هێزە رکابەرەکانی ئێمە ئەکات و بە هەموو شێوەیەکیش هەوڵی خولْقاندن و قووڵکردنەوەی ناکۆکیی نێوان لایەنەکانی معارەزەی عێراقی ئەدات.

* بەبەرچاوی هەمووانەوە، ئێران هەوڵی درووستکردن و پڕچەککردنی زۆرێــک لــەو هێزانە ئەدات کە لە کوردســتاندا تەراتێن ئەکەن... دووســاڵ زیاترە ئێران دەســتی بەسەر وەجبەیەکی گەورەی چەکی یەکێتیدا گرتووە کە لەلایەن دۆســتاکانەوە بۆمان نێردراوە... سەرباری ئەو هەموو هەوڵەی خۆمان و ئەو دۆستانەشــمان، ئامادەنیە بمــان داتەوە... ئیتر چاوەڕێی چی لە ئێران بکرێ...

هەریــەک لــە ئامادەبوانیش ڕای خۆیان لەســەر ئەو بابەتــە دەربڕی ... هەبــوون پشــتگیریان لــە ڕاکانی من دەکرد و هەشــبوون دژبــوون. دوای هەمووان مام جەلال دەســتی بە قســان کرد. ســەرەتا کورتەیەکی لەســەر چۆنیەتی درووســتبوونی ئەو دۆخە باســکرد... واشی نیشاندا کە دۆخەکە بەســەرئەمانیدا ســەپاندوە، بەو هێزە زۆرەوە بەشداری ئەو شەڕە بکەن... ئینجا هاتە سەر قسەکانی من:

ـ من ناڵێم هیچ له بۆچوونەکانی هەڤاڵ ڕاست نین، بەڵام دەڵێم بەهۆی ئەوەی ئەم شاعیرە، بۆیە زۆربەی سەرنجەکانی، زیاتر هەر خەیاڵ و تەسەورن و لە ئەنجامی لێکدانەوەی زانستی و هەڵسەنگاندنی وردەوە درووست نەبوون...

دوای بەرپەرچدانەوەی زۆربەی سەرنجەکانی من، مام جەلال چووە سەر بابەتی دیکە، من و سامی شۆڕش هاتینە بەر هەیوانی ژوورەکە... من بۆ هەوا هەڵمژینێک و سامیش بۆ دووکەڵ بەبادانێک... بەدەم تەماشاکردنی کەڕەسیسەی[164] ئەو بەفرەی تازە خەریکی بارین بوو، سامی، دوای ئەوەی جگەرەیەکی پێکرد:

ـ هەڤاڵ گیان حەزدەکەم، لەسەر مەسەلەی دەرنەکردنی بەیانەکەو، لەسەر قسەکانی ئەو شەویشت، دوو سەرنجان دەربڕم.

ـ فەرموو

ـ ئەمن جارێ لەسەر مەسەلەی بەیان دەرنەکردنەکەی، پێم وایە شتەکی خراپت کردوە کەلەدەرکردنیدا ڕێگربووی...

ـ من پێم وایە باشم کرد، جگە لەوەش لام سەیرە کە یەکێتی و تەنانەت مام جەلال و کاک نەوشیروانیش داوایان لێنەکردوین، بەیانێکی لەو بابەتە دەرکەین، کەچی خۆمان بۆیان پێشنیاردەکەین...

ـ ئەوجا حیکمەتەکە لەوەیدایە، پێش ئەوەی ئەوان داوات لێبکەن، خۆت دەستپێشخەری بکەی...

مژێکی قووڵی لە جگەرەکەیدا... بەرلەوەی من هیچ بڵێم، دەستی بەقسان کردەوە...

ـ سەبارەت بەو قسانەی ئەو شەویشت... من ناڵێم بۆچوونەکانت وان یان وانین، بەڵام هەر پێویستی نەدەکرد، ڕایەکانت بەو شێوەیەی دەربڕی...

ـ بۆ؟! بە جۆرێک لەسەرسوورمانەوە ووتم...

ـ کوا لە ناو ئێمەدا ڕای جیاواز قبوڵدەکرێ.

---

١٦٤ - کەڕەسیسە: کلۆ بەفری زۆر زۆر ورد، کە زیاتر بەر لە بەچڕیی بارینی بەفر دەبارێ.

- ئینجا دەبێ لە ترسی ئەو قبوڵنەکردنە، زاری خۆمان بگرین هیچ نەڵێین.

- ئەمن ئاوای دەبینم... ئەوجا ئەتوش کەیفی خۆتە، بەڵام ئەمن ئەزموونی ژیــان و کاری سیاســی فێریــان کردووم، چەپڵــە بۆ ئەوانە لێـدەم کە لە سەرەوەن.

ســامی گەڕایــەوە بارەگاکــەی خۆیــان و منیــش چوومــەوە ژووری... ئەوشــەوە تا بەیانی هەر بەفرباری... بەیانی کە لە خەو هەســتاین، تا چاو بڕیدەکرد، لەسپێتی بەفر بەولاوە شتێکی دیکە نەدەبینرا.

مــام جــەلال، پاڵــی بەلاشــیپانەی دەرگاکەوە دابــوو... بــەدەم لەفکران ڕۆچوونەوە، لە بارستایی شەپەو[١٦٥] بەفرە باریوەکەی دەڕوانی...

بەخۆمــم ووت"ڕەنگە ئێســتا لە دڵــی خۆیدا بڵێ" ســوپاس بۆ جەنەراڵ بەفر[١٦٦]... ئەمجارەش بەهانامانەوە هات."

ژمارەیەک پێشــمەرگەی ســەرما کوڕکردووی هەڵلەرزیــو، بەبەردەمی مام جەلالدا ڕەتبوون... مام جەلال پێشــمەرگەکانی ناســیەوە، پێشمەرگەی دەستەکەی دانای ئەحمەد مەجیدبوون...

- ئــەوە چ دەکــەن لێــرە، مــام جەلال بــەدەم پریشــک هاویشــتنەوە، لە پێشمەرگەکانی پرسی...

- وەڵــڵا مامە، هێندە بەفر باریوە، ســەنگەرەکەمان لە بەفردا وون بووە، ناچار چۆڵمان کرد...

- ئەدی دۆشکەکەتان چ لێکرد؟ دانا لە کوێیە؟

---

١٦٥. شەپە: ئەو چینە بەفرانەیە کە لەئەنجامی ماڵینی بەفری سەرباندا دەکەونە سەریەک.

١٦٦. جەنەراڵ بەفر: ئەم دەستەواژەیە لە بنچینەدا، لە شەڕەکانی بەرگریی سوپای سۆڤێتیدا دژ بە پەلاماردەران بەکارهاتووە، ئەوەش لەوەدا کە لەکاتی پەلامارەکاندا بەفرێکی وازۆر باریووە کەڕێی لە پێشڕەویی لەشکری پەلامەردەران گرتووە. لەساڵی ١٩٧٨یشدا، سوپای عیراقی هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی، لە ناوچەکانی شێنێ و زەڵێ و نێوزەنگ، بارینی بەفرێکی ئەستور، لەکاتی هێرشەکەدا، شکستی بە هێرشەکە هێنا... ئیتر لەوێوە دەستەواژەی جەنەراڵ بەفر هاتە ناو فەرهەنگی شۆڕشی نوێوە.

- دۆشکەکەشمان لە سەنگەرەکەدا بەجێهێشتووە. کاک داناش لە دواوەیە.

مام جەلال، لەو وەڵامە شێتگیردەبێ و بەسەریاندا هاواردەکات:

- هەر پێشمەرگەیەک ، ئەگەر نووری چاویشم بێ، سەنگەر چۆڵکا و بەرەی شەڕێ بەجێبێڵێ... حسابی خائنی بۆدەکەم...

کەمێک دەوەستێ و ئینجا بەتۆنێکی نزمتر، بەڵام هێشتا تووڕە، دەڵێ:

بۆ وادەزانن ئەو نیشتمانە بە تەنها ئی منە... نیشتمان، نیشتمانی هەمووانە... شەڕیش بۆ نیشتمانی خۆتان دەکەن، بۆ منی ناکەن.

پێشمەرگەکە ویستی شتێک بڵێ، مام جەلال بواری نەدا:

- هەر ئێستا دەگەڕێنەوە... ئەو دۆشکەیە نەهێننەوە، سەری خۆتان و دانای نامەسئولیشتان، دەخەمە قەبری بابتانەوە... مام جەلال، وەک شەپۆلێک بەخێرایی خۆی بکێشێ بەکەناردا و بەهەمان خێراییش بگەڕێتەوە دوا، بەرەو ناوەوە وەرچەرخا.

ئەوەی بەدەمیاهات لە دژی دانا، تەخسیریی نەکرد... پێچەوانەی وەسفەکەی دوێنێی، بە پیاوێکی بێکەڵک و ترسنۆک و نابەرپرسی ناوبرد.

لە ترسی ئەو بورکانی هەڵچوون و تووڕەییەی مام جەلال، پێشمەرگەکان بەناچاری بەرەودواوە، بەهەمان شوێنپێ لەسەر بەفر بە جێماوەکانی خۆیاندا گەڕانەوە... خۆ ئەگەر زانیبایان، نیشتمان هەر لەکاتی شەڕ و مەترسیدا هی هەموانەو لەدوای سەرکەوتن، دەبێتە موڵکی توێژێک لە بەرپرس و دەوروبەرەکانیان، هەگیز نەیاندەتوانی بەو هەموو شەکەتی و برسیەتی و کەسیرەبوونەی[١٦٧] خۆیانەوە بەو هەورازە کووڕە بەفر داپۆشیوەدا هەڵزنێننەوە...

---

١٦٧ - کەسیرەبوو: لەسەرما نا تەزیوو.

جەنەڕاڵ بەفر، پێشڕەوییەکانی سوپای کۆماری ئیسلامیی ئێرانی وەستاند. هێزی پشتیوان گەڕانەوە شـوێنەکانی خۆیان... حیزبی دیموکراتیش، دوای لەدەستدانی ناوچەکانی ژێرکۆنترۆڵی خۆیان، دامودەزگاکانی سەرکردایەتیان بە دیوی عێراقدا کرد.

نانـی بەیانی دەخۆم و بەرەو بارەگای نەوشـیروان مسـتەفا بەشـوێن پێکانی ئەو پێشـمەرگەیەدا دەڕۆم کە لە پشت خۆیەوە، بەسەر بەفری نیوە چڕیوی[١٦٨] ئەو بەیانیەدا جێیان دەهێڵێ.

"ـ کوا لە نێو ئێمەدا ڕای جیاواز قبوڵدەکرێ!

ـ ئینجا دەبێ لە ترسـی ئەو قبوڵنەکردنە، زاری خۆمان ببەسـتین و هیچ نەڵێین.

ـ ئەمن ئاوای دەبینم... ئەوجا ئەتۆش کەیفی خۆتە"

گفتوگۆی ئەو شەوەی نێوان سامی و خۆم دەپچڕێنم... دوای لە دەرگادان، دەچمە ژوورەوە:

ـ بەیانیت باش کاک نەوشیروان.

ـ بەیانیت باش. ڕێگاکە نەیبەستبوو؟

ـ کەمێک بەستبووی، بەڵام خراپ نەبوو.

تا پێشمەرگەیەک دوو چامان بۆ دێنێ، کەمێک باسی بەفر و وەیشوومەی[١٦٩] زستان دەکات.

تایتڵی ڕاپۆرتێکی قەبەی سـەر مێزە بچکۆلەکـەی[١٧٠] بەردەمی، نیگاکان بەرەولای خۆی دەبات، (ڕاپۆرتی ستافی ڕادیۆی دەنگی شۆڕشی عێراق).

١٦٨- چڕیو: بەستوو

١٦٩ـ وەیشوومە: سەرمای سەختی زستان.

١٧٠ـ مێزی بچکۆلە: مێزێکی تەختەی بچکۆلەبوو کە لە پیشمەرگایەتیدا بە دانیشتنەوە شتمان لەسەر دەنووسی.

ماوەیەک بوو، قسەی زۆر لەسەر نزمیی ئاستی ڕادیۆ دەکرا. وایلێهاتبوو، لەبارەگاکانیشدا، جگە لە چالاکی پێشمەرگە، هیچ بابەتێکی تری ڕادیۆ گوێی لێنەدەگیرا. ڕەخنەی زۆر ئاڕاستەی ڕادیۆ دەکران. هەر هەموو ڕەخنەکانیش ڕوویان لە ئەرسەلان بایز بوو.

سەرەتا نەوشیروان مستەفا، ئەرسەلان بایزی وەک جێگری بەڕێوەبەری ڕادیـۆ دانـا... دواتـر کردیـە بەڕێوەبـەری ڕادیۆکە و بەرپرسـی دەزگای ڕاگەیاندنیش بەوەکالەت. کەچی ئەوەتا ئێستا ئەویش، یان ئەو لە هەمووان زیاتـر، لێـی کەوتۆتە تەقە... لە زۆر شـوێن و بۆنەشـدا، بە بێ کەڵک و بێ مسـتەوا نـاوی دەبا. دواجار بانگـی دەکاتە لای خـۆی و زۆر بە توندی دادەبەزێتە سـەری و بە فاشـیل و بێ توانا وەسفی دەکات. ناڕەزایی خۆی لـە شـێوازی بەڕێوەبردنـی ڕادیۆو، لە زۆریی سـتاف و کەمـی و لاوازی بەرهەمیان دەردەبڕێ.

ئەرسەلان دەگەڕێتەوە ڕادیۆ... بۆ بەرگری لە خۆکردن و بۆ درووستکردنی کۆدەنگی و تێوەگلانی هەموو سـتافی ڕادیۆ، کۆبوونەوەیەک سـازدەکات. دوای گفتوگۆ و ڕا و پێشـنیاری جۆراوجۆر، لەسـەر ئەوە سـاغ دەبنەوە کـە ڕاپۆرتێـک ئامادەکەن و هەر هەموویـان، ڕۆڵ و کارەکانی خۆیان لەو ڕاپۆرتەدا بخەنە ڕوو.

ڕەنگـە هەر ئێمرۆ یان دوێنـێ ئەو ڕاپۆرتەیان بۆ هێنابـێ... ڕاپۆرتێکی درێژی ٤٠ لاپەڕەیی. کە دەبینێ، من سـەرەنجم لەسەر ڕاپۆرتەکەیە، ڕووم تێدەکا و دەڵێ:

- یەکـێ ئەم ڕاپۆرتە ببینـێ و گوێی لە ڕادیۆکەیـان نەگرتبێ، وادەزانێ ئەمانە سـتافی ڕادیـۆی (BBC) ین. من ترسـی ئەوەم هەیـە، لەداهاتوودا خەڵـک بـێ و سـەیری ئەرشـیفی یەکێتی بکـەن و ئـەم ڕاپۆرتـە ببینن... وادەزانن، یەکێتی لەو سەردەمەدا، لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا، خاوەنی گەورەتریـن ڕادیۆبووە.. سـەیریکە، هەر یەکەیان چەندین ئیشـی بۆ خۆی نووسیووە... لەیەک کاتا، نووسەر و بەرنامەساز و ئامادەکار و هەواڵگر و بێژەریشن... بەشێوەیەکی وا، وەک کادری ئیزاعی و نووسەری گەورە دێنە بەرچاو. ئەمە لە کاتێکدا، هەموو ماوەی پەخشی ڕادیۆ، تەنها یەک سەعاتە، بە عەرەبی و کوردیشـەوە... ئەوەش مسـتەواکەیەتی کە پیاو شەرم ئەکات گوێی لێبگرێ.

ڕاپۆرتەکە دەخاتە ژێر مێزەکەی... جگەرەیەک دادەگیرسێنێ:

- ئەزانی بۆچی ناردوومە بەدواتا؟

- نەخێر، نازانم.

- بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە ڕاگەیاندن و ببیتە بەرپرسی ڕادیۆ.

بەرلـــەوەی هیـــچ بڵێم، لەدڵی خۆمـــدا ووتم، "مەگەر پێشـــتر لە ڕاگەیاندن نەبووم و هەر خۆتان نەتانگواستمەوە!"

- زۆر سپاست دەکەم. لە ڕاستیدا، من لە دەزگای ڕۆشنبیری مورتاحم و حەزناکەم بچمە ڕادیۆ.

- ئینجـــا خـــۆ بـــە مورتاحی بێت، منیش لێرە، لەم ئیشـــەی خـــۆم مورتاح نیم، بەڵام ئەشـــیکەم. مەســـەلەکە مورتاحی و نامورتاحی نیە... مەســـەلەکە پێویستیە. من تۆ بۆ ڕادیۆ بە پێویست ئەزانم.

- ئەگەر بتوانی یەکێکی تر بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپێری، ڕەنگە باشتر بێت لە چوونی من.

- ئەگەر یەکێکی تر هەبا، داوام لە تۆ نەئەکرد.

- مەگەر ئەرسەلان لەوێ نیە؟

- بەڵێ ئەرسەلان لەوێیە، هەربۆیەش ڕادیۆ ئەوەندە ئاستی نزمە.

من هیچ ناڵێم... ســـەرنجم بـــۆ دوور دەگوازمەوە. لەســـەر ئەوەی لەناو مێشکی خۆمدا، دەمهێنا و دەمبرد، دەڵێ:

- ئەزانم ئێستا لە دڵی خۆتا ئەڵێی، کە ئەمە ڕەئیتە لەسەر ئەرسەلان، ئەی بۆ کردت بە بەرپرسی ڕادیۆ... منیش پێت ئەڵێم، ئەوەم لەبەر دوو هۆکرد:

یەکەمیان، بۆ دژایەتیکردنی مامۆستا جافر. ئەو تا توانی، دژی ئێمە شتی کردو شتی نووسی.

دووەمیان، من ئەرسەلانم نەئەناسی... لەوە زیاتر لەسەریم نەئەزانی کە وەختی خۆی، دوو ســـێ ڕیپۆرتاژی نووســـیووە، بەڵام ئەم فەرەیدوونە و برادەرەکانی تریان، ئەوەندە مەدح و سەنایان کرد، منیشیان بەهەڵەدابرد.

لـــەو کاتـــەدا بیرم لەوەدەکـــردەوە کە دەبـــێ چەند پۆســـت و پلە درابن بـــە خەڵکانێک کەشـــیاوی ئەو پلەوپۆســـتانە نین... چەندیش لە پلەوپۆســـت

بێبەشکراون، لەبەرئەوەی کەسێک یان تەکەتولێکی بە پشتەوە نەبووە.

مژێکی قووڵ لە جگەرەکەی دەدا:

ـ لەگەڵ مام جەلالیشا قسەم کردووە... یان ڕادیۆکە دائەخەین، یان ناهێڵین بەو لاوازییە بمێنێتەوە.

من کێشەم لەگەڵ کاری ڕادیۆدا نەبوو... کۆمەڵێ برادەری باشیشم لەوێ بوون... ئەوەی بۆ من کێشەبوو، ئیشکردن بوو لەگەڵ ئەرسەلان... پێم وابوو لەگەڵ ئەودا تووشی کێشە دەبم، بۆیە حەزم بە چوونە ڕادیۆ نەدەکرد، بەڵام جەخت کردنەوەی ئەو، لەسەرچوونم و بەڵێندانی بەوەی کە هەموو پشتیوانیەکم لێدەکا، چ پشتیوانی شەخسی بێ و چ بە نووسین، هەرکەسێکیش داوابکەم، بۆ ڕادیۆی دەگوازنەوە. پاساوی نەچوونم نامێنێ... بە نابەدڵیەوە ڕازی دەبم.

هەندێ ناو بۆ گواستنەوە پێشنیاردەکەم، لەوانە: فەرید ئەسەسەرد و سەربەست حوسەین. لەگەڵ فەریدا، هەم لە دەزگای ڕاگەیاندن و هەم لە دەزگای کۆمەڵەشدا بەیەکەوە بوین. فەرید نووسەریکی بەتوانابوو، بەهەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەینووسی.

ـ کاک نەوشیروان، دەتوانم شتێک بڵێم؟

ـ بۆ ناتوانی، فەرموو.

ـ دەمەوێ ئەوە بڵێم کە من هیچ ناکۆکیەکی شەخسیم نە لەگەڵ ئەرسەلان و نە لەگەڵ کەسیتردا نیە... هەقیشم بەسەر هیچ ناکۆکی و ململانێیەکی ناو کۆمەڵەو یەکێتیشەوە نیە، هەر بۆیەش هیوادارم ناردنی من، بۆ لێدان و دژایەتی کردنی ئەرسەلان یان هیچ کەسێکی تر نەبێ.

ـ دڵنیابە بۆ ئەوە نیە... تەنها بۆ باشکردنی دۆخی ڕادیۆ و بەرزکردنەوەی ئاستیەتی.

بەر لەوەی ماڵئاوایی لێبکەم، ئەو هیوای سەرکەوتنم بۆ دەخوازێ و منیش بەڵێنی دەدەمێ، لەماوەی دوو هەفتەدا لە ڕادیۆ بم.

ئــەو بەفــرەی ئاگربڕی نێــوان هێزەکانــی کۆماری ئیســلامی و ئێمەیە، هێشتا زۆری ماوە بتوێتەوە... پارتی دیموکراتی کوردستان، بە هەماهەنگی لەگەڵ ســپای پاســداران، لە ناوەڕاســتی مانگی شــوباتدا، هێز دێننە سەر چیای جاسوســان. ئەوەی جێی سەرســووڕمانە، هەمووی (١٠) ڕۆژ نابێ، نۆزدە حیزب و ڕێکخراوی عێراقی، بەیەکێتی و پارتیشــەوە، لە تەڕابلوسی پایتەختی لیبیادا، ڕێکەوتننامەیەکیان مۆرکردووە... بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە، بەرەیەکی سیاسی – سەربازیی، لە نێوان هەموو ئەو لایەنانەدا پێکدەهێنرێ. بەرلەوەش:

* دەســتبەجێ و بــێ هیــچ مەرجێــک، شــەڕی نێــوان ئــەو لایەنانــە ڕادەگیرێ.

* ناکۆکیەکانــی نێوانیــان، بەڕێــگای ئاشــتیانە و دایەلۆگــی سیاســی چارەسەردەکرێن.

بۆ ئەوەی تووشی شەڕی نەخوازراو نەبین، بە گوێرەی ئەو بەرنامەیەی دانرابوو، دەست بە چۆڵکردنی بارەگاکان دەکرێ.

بــارەگاکان، یەک بەدوای یەکدا، بەرەو قووڵایــی دەگوازرێنەوە. ڕادیۆو ڕاگەیاندنیــش، دوو هەفتــە دەبــێ، چوونەتــە ناوچــەی (باوزێ)ی پشــتی قەڵادزێ.

کتێــب و پێخــەف و کەلوپەلەکانی ترمــان، لە دوو وڵاخــان باردەکەین. بەرلەوەی مامەندە، خۆی لەبەردەم ئاوێنەی تیشکی هەتاودا ببینێ، کەوتینە ڕێ. ڕۆژ و دانێــک ڕێمان لەبەرە. بەشــی هــەرە زۆری ڕێگاش، هەوراز و نشــێوی بەفر داپۆشــیوە. چەند کەوێک لەو ملەی پێشمانەوە، بێدەنگی ئەو بەیانیە دەشکێنن و دۆڵەکە پڕدەکەن لە ئاواز. نەواڵە[171] خوڕەکەی ناو دۆڵی تووژەڵە، لێفەیەکی ئەوەندە ئەســتووری بەفــری بەخۆیدا داوە، لە ژێریا بە حاڵ نووزەی دێ. هەرئەوەندە ئەو هەورازەمان بڕی، ئیدی پێ دەنێینە ناو خاکی ئێرانەوە.

---

١٧١ـ نەواڵ: ئەو جۆگە ئاوەی لە توانەوەی بەفر درووست دەبێ.

لــەو بەیانیــە زووەدا، هەورازیــش بەرزتر دەنوێنێ. ڕەنگی شــینکاڵی[١٧٢] بەفریش، ئەوەندەی تر هەیبەتی دەداتێ.

پێنــج پێشــمەرگە و وولاخدارێــک و دوو وولاخ، بــە هەڵێنانــەوەی هەنگاوەکانمــان، خرمەخرم لە بەفری ژێر پێمان هەڵدەســتێ. جارجارەش، پڕمەیەکــی لەنــاکاوی وولاخــەکان، ســەختی هــەورازی بەردەممــان بــە بیردەهێننەوە.

هەورازێک و دووان و دەی تر دەبڕین و (قەلەڕەشێ)مان لێدەردەکەوێ. قەلەڕەشێ، دوایین گوندی ئێرانە کە بەرەو ناوچەی قەلادزێ بڕۆی.

یەکەم شت لە دوورەوە دەیبینین، دووکەڵی لوولە سوپای ماڵە تا ناوقەد بەفرهاتووەکانە. ئێمە نزیک دەبینەوە و وورردە وورردە قەلەڕەشــێش، وەک پاپۆڕێکــی لەنگەرگرتــووی نــاو دەریایەکی ســپی بلووریــن دەردەکەوێ. ڕووخســاری بەفری ســەربەرزاییەکانی پشــتی دێ، لەبەر ئاوێنەی دوایین تاڵەتیشــەکانی خۆردا ئــاڵ دەنوێنێ. لەگــەڵ بانگی ئێــوارەدا، دەگەینە بەر دەرگای مزگەوتــی ئاوایــی. وولاخــدار، بارەکان بۆ بــن هەیوانی مزگەوت دادەگرێ، پووڵی خۆی لە باخەڵی دەنێ و خۆی بۆ گەڕانەوە سازدەکا.

- بۆ تا باوزێش لەگەڵمان نایەی.

- قەولن هەتا ئێرەبوو، ئەمە دەڵێ و خواحافیزیمان لێدەکات.

بۆ نانی ئێوارێ، خۆمان بەسەر چەند ماڵێکدا دابەشدەکەین. من بەرماڵی کاکــە مینــەی دەکــەوم. کاکە مینــە و ژنەکــەی و دوو منــداڵ. مینە، کاری وولاخــداری و کۆڵبەری دەکا. لەگەڵیدا ڕێکدەکەوم، ســبەینێ بارەکانمان تا باوزێ بۆ دەبا.

- چەند وولاخت هەن.

- خۆ باری بە وولاخی نابەم. بە کۆڵێی دەبەم.

- بۆ بەوولاخ نایانبەی؟

- ئەو نشــێوەی ئــەولای قەلەڕەشــێ، هێندە ڕژد[١٧٣] و خــزە، ئەوەندەش بەفری پێوەیە، هێستر دەبابەش بێ هەڵدەدێرێ.

---

١٧٢ـ شینکاڵ: بە ئاستەم شین

١٧٣ـ ڕژد: زۆر کووڕ، سەخت.

ـ ئاخر چۆن ئەو هەموو شمەکە بە کۆڵ دەبرێن؟

ـ خەموو نەبێ، ئەمن و دووسێ کۆڵبەری دی، هەموو شمەکانو بە کۆڵێ هەتا خوارێ بۆ دەبەین.

شـــەو بۆ خەوتـــن، دەگەڕێینەوە مزگـــەوت. بەیانـــی دوای هەتاوکەوتن، بەخۆمان و بەتانیەوە، بۆ نانی بەیانی، دەچینەوە ماڵی خانە خوێکانمان.

مینـــە، هێســـترەکەی کورتـــان کـــردووە و خەریکی ئالیک لـــە جۆڕک[174] کردنە.

ـ بەخوا کاکە مینە کارێکی باش دەکەی، هێســـترەکە بێنی باشـــترە... ئەو هەموو شتانە کوا بە کۆڵ دەگوازرێنەوە.

ـ بابە ئەتو باسی چ دەکەی؟ خۆ ئەمن هێستری بۆ تو کورتان ناکەم.

ـ ئەی بۆکێی کورتان دەکەی؟ مەگەر بڕیارنەبوو، بارەکانمان بۆ بەریت؟

ـ بابـــە ئەتـــو چ دەڵێـــی! ئەمن ماڵـــم کاول بووە... ئەو شـــۆ ژنـــم ڕەدوو کەوتووە و منداڵی بەسەردا بەجێهشتووم.

ـ ئینجا ئێستا دەتەوێ چ بکەی؟

ـ چ دەکـــەم... دەچـــم دەیهێنمـــەوە... دەزانـــم لـــە کوێیـــە... جارەکی دیش وایکردووەو هێناومەتەوە.

من دەمەوێ شـــتێک بڵێم و ئەو نایەوێ لەوە زیاتر وەختی خۆی لەگەڵ مندا بە فیڕۆدا. ڕێشمەی وڵاخەکەی شل دەکاو لەگەڵ هەچە هەچەدا، مل بە تەختاییەکەی بەرماڵانەوە دەنێ.

بیرکردنەوەیەکی ســـادە و سەلیمە. ژنەکەی ڕەدووی پیاوێک کەوتووە... دوو منداڵـــی بەســـەردا جێهێشـــتووە... ئەمیش بـــەو هەمـــوو ســـادەیی و ناهۆشـــیاریەی خۆیەوە، نەک هەر بیر لە ئازار پێگەیاندنی ناکاتەوە، ئەوەتا بەدوایدا دەچێ و دەیەوێ بیشیهێنێتەوە.

لـــەم ناوچەیە، کەلتـــوور و دابونەریتی کوردەواری، ئـــاوا مامەڵە لەگەڵ ڕەدووکەوتنـــدا دەکات، کەچـــی لە هەندێ شـــوێنی تر، لە کوشـــتن بەولاوە، ســـزایەکی ســـووکتر نابینن. تەنانەت هێزە شۆڕشگێڕو پێشکەوتخوازەکەی

١٧٤ - جۆڕک: توورەکە.

ئێمەش، هەر کوشتن بۆ ئەو حاڵەتانە، بە چارەسەر دەزانێ.

ئەی ئەوەنیە لە حاڵەتەکەی ڕێبوارچاوشیندا، هەر هەمان چارەسەریان هەڵبژارد. ڕێبوار، فەرماندەی مەفرەزەو یەک لە پێشمەرگە زۆر ئازاکانی گەرمیان بوو... لەسەر ئەوەی ژنێک هەڵدەگرێ، بە فەرمانی سەرکردایەتی و بەدەستی هاوڕێ فەرماندەکانی هەرێمەکەی خۆی، گوللەباران دەکرێ.

دوای ڕێبواریش، ئەو کوڕوکچەی لە ترسی هەڕەشەی عەشیرەت، پەنا بۆ (شۆڕش)دێنن. عەشیرەت هەڕەشە لە (شۆڕش) دەکا... ئەگەر هەردووکیان تەسلیم نەکات، چەکی جاشایەتی هەڵدەگرن. شۆڕش دەیتوانی لە نێوان داڵدەدان و ڕادەستکردنەوەدا، ڕێگایەکی تر هەڵبژێرێ، بەڵام نەیکرد... شۆڕش، لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی خۆیدا، بەسەرکردایەتی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕانیشەوە، بە هەنجەتی ئەوەی کێشەیەکی کۆمەلایەتیەو نایانەوێ تێیدا ببنە تەڕف، بڕیاری ڕادەستکردنەوەیان دەدەن. شۆڕڕش، سەر بۆ هەڕەشەی عەشیرەت نەوی دەکا و هەردووکیان ڕادەستی عەشیرەت دەکاتەوە. چەند کیلۆمەترێک لە خوار بارەگاکانی سەرکردایەتی و بە بەرچاوی دادگای شۆڕشەوە، پیاوە سمێڵ بابڕەکانی عەشیرەت، تا جەستەی هەردووکیان نەکردنە بێژنگ بەجێیان نەهێشتن.

خوا، لە چیرۆکی ئادەم و حەوادا، لەسەرجووت و بوون و شکاندنی فەرمانی خۆی، هەردووکیانی لە بەهەشت دەرکرد. خوا دەیتوانی، بیانکوژێ یان فڕێیانداتە ناو دۆزەخەوە، بەڵام واینەکرد... لە بەهەشت دەریکردن و دواتریش، ئادەمی کردە یەکەمین پێغەمبەری سەر زەمینی خۆی.

دەکرا ڕێبواریش لە پێشمەرگایەتی دەرکرێ و ئەوسا لەگەڵ دڵخوازەکەی خۆیدا، دەچوونە کوێ باچووبان، بەڵام نەیان کوشتبان... دەکرا لە حاڵەتی ئەو کوڕوکچەشدا، هەرشتێکی وایان کردبا، بەڵام بە کوشتیان نەدابان.

هەرچەند مینە، لەگەڵ سەرکردەکانی خۆماندا بەراوورد دەکەم، لەوان مرۆڤانە تری دەبینم. لای ئێمە ڕەدووکەوتن، تاوانەو کوشتن نەبێ چارەسەرێکی دیکەی بۆ شک نابەن.

لێرەش، لە وولاتی مینەدا، ڕەدووکەوتن شێوازێکە لە شێوازەکانی شووکردن و ژن هێنان[175]...تەنانەت ژنێک، وەک ئەوەی لە حاڵەتی مینەدا

١٧٥-جاران دیارەدەی ڕەدووکەوتن، لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا، شێوازی باوی شووکردن بووە. جۆرێک بووە لە مومارەسە کردنی مافی هەڵبژاردنی هاوسەر یان یاخی بوون بووە لەو بەشوودانەی کە دژی خواست و حەزەکانی ئافرەت بەڕێوەچووە.

هەیە، ئەگەر مێردومنداڵیشـــی هەبێ، یان دەهێنرێتەوە لای مێردومنداڵ، یان ئەوەتا پەنا بۆ مەسڵەت دەبرێ.

بۆ ئەوەی بەفری نشێوەکە، کەمێک بەریدا، تۆزێک بەدرەنگەوە، لە ئاوایی دەردەچیـن. ئاوایـی لە چاوانمان ونده‌بێ و هێشــتا خەبەرێک لە مینە نیە... ئیـدی نازانین کــە مینە دێتەوە، ژنەکەیشـــی لەگەڵ خۆیـدا دەهێنێتەوە یان ئەمجارە، بەتەنیا دێتەوەو ناچاری گرتنەبەری ڕێی مەسڵەت دەبێ.

---

ئەم دیاردەیە، هێشتا لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا، وەک دێهاتەکانی ناوچەکانی سەردەشت و خانێ و شێخان و شنگال، هەرماوەو وەک شێوازێک لە شێوازەکانی هاوسەرگیریش سەیر دەکرێ.
ئەم دیاردەیە، هەروا لە خۆڕا پەیدانەبووە... زادەی کۆمەڵێ هۆکارە، هەم دین و هەم کەلتور و هەم کۆمەڵگاش تێیدا بەشدارن. یاخی بوونە لەو زوڵم و ستەمانەی دین و کەلتور بەسەر ژنیاندا سەپاندوون:
- مارەبڕینی سەر بێشکە یان بە منداڵی.
- ژن بە ژن، بەتایبەتیش کە یەک لەو دوو ژنە یان هەر دووکیان پیاوەکەی خۆیانیان بەدڵ نەبێ.
- سێ بە گایی(لەو حاڵەتەدا لەبری دوو ژن و دوو پیاو، سێ ژن و سێ پیاو لە هاوسەرگیریەکەدا بەشداردەبن) .
- بەشوودانی نا بەدڵ.
- بەشوودان بە پیاوی پیر.
- هێشتنەوەی کچ و بەشوونەدانی.
- مارەبڕینی کچێک لە کوڕێک کە زۆر لە خۆی منداڵترە، بەتایبەتیش کە کچەکە توغیانی شووکردنیەتی و کوڕەکە هێشتا هەر منداڵە.
- ڕەفزکردنی کەسوکاری کچ لە بەشوودانی کچەکەیان بەو پیاوەی دێتە خوازبێنی.
- بێزاربوونی ژن لە مێردەکەی و دڵچوونی بە پیاوێکی دیکەدا.
هەرکام لەو خاڵانەی ئاماژەیان پێدرا، هۆکاری ڕەدووکەوتن یان هەڵگرتن بن، ناگاتە ئەوەی ژن یان پیاوی لەسەر بکوژرێ.
کەسوکاری ئافرەتە ڕەدووکەوتووەکە، چەندیش لەو هاوسەرگیریە ناڕازی بن، دواجار، هەردەبێ کێشەکە بە مەسڵەت چارەسەرکەن. ئاسانترینی ئەو مەسەڵەتانەش ئەوەیە کە ژنەکە بە هیچ پیاوێکەوە نەبەسترابێتەوە... تەنانەت لەو حاڵەتەشدا کە ژنەکە مێردومنداڵیشی هەیە، ژنەکە دەگەڕێتەوە لای مێردو منداڵی یان ئەوەتا بە مەسڵەت کۆتایی بەکێشەکەیان دێنن.

# ٥٤

یەکدوو خێمەو چەند کەپرێکی هەرچوارلا و سەر بەنایلۆن داپۆشراو، بارەگای ڕادیۆن لە باوزێ. بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستین، بەتانی و جلەکانمان ئەوەندە شێیان هەڵمژیوە، دەڵێی لە ئاو هەڵکێشراون... ئەو ڕۆژانەش هەتاوبێ. لەبەر هالاوی گەرمی، تا سێبەر بەسەر کەپرەکاندا نەکشێ، سەر بەژووریدا ناکەین. چەند ڕۆژێکی تر لێرە دەبین و دواتر دەگوازینەوە (سەرشیو)... ئەوێ هەم کەمێک قایمترەو، هەم بۆ پەخشی ڕادیۆش باشترە.

بەرنامەی چۆڵکردنی ناوچەکانی سەرکردایەتی بەردەوامە... هەر ڕۆژەی پێشمەرگەی بارەگایەک یان هێزێک دەگەنە لای ئێمە، یان بەلای ئێمەدا بەرەو خوارتر ڕەتدەبن. لەیەک لەو ڕۆژانەدا، نەوشیروان مستەفا، بەخۆی و هێزێکەیەوە، دێتە باوزێ. دەیەوێ لێرەوە، بەرەو ناوچەکانی خۆشناوەتی و هەولێر بڕوا. بۆ ئەو شەوەی لە باوەزێ دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی حەزی بە چارەی ئەرسەلان نایە، نایاتە ڕادیۆ و، دەبێتە میوانی ماڵی حاجی ئەحمەدی باوزێ.

لەگەڵ دووبرادەری تردا، دەچینە سەردانی. ماڵی حاجی ئەحمەد، بەبۆنەی هاتنی ئەمەوە، لە خەڵکی ئاوایی و لە فەرماندە و لە پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە جمەی دێ... قسە لەسەر زۆر بابەت دەکرێ... کەدێتە سەرباسی ڕادیۆ، ڕوودەکاتە من و دەڵێ:

ـ دەستتان خۆشبێ... ئێستا ڕادیۆ لە ڕادیۆی چەند هەفتەیەک لەمەوپێش ناچێ... ئەگەر بەم ووزە و نەفەسەی ئێستایەوە بەردەوام بێت، دەبێتە ڕادیۆیەکی جەماوەریی و گوێلێگیراو... باشتکرد هاتیتە ڕادیۆ.

کە باس دێتە سەر ژیانی لادێ، وەک ئەوەی هەموو ژیانی خۆی هەر لەناو لادێدا بەسەربردبێت دنیایەک زانیاریت، لەسەر ژیانی خەڵک و داب و نەریتی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەداتێ... هەرئەوەندەش بۆ پێکردنی جگەرەکەی دەوەستێ، فەرماندەیەک کە خەڵکی ناوچەکەیە، قسەکەی لە زاری وەردەگرێ دەڵێ:

ـ کاک نەوشیروان، نازانم ئەتو شەڕە (سە)[176]ت دیوە یان نا! بەخودای بەزمی شەڕە سەی، لە هەموو بەزمان خۆشترە، هیچ بەزمێکی دیکەی ناگەنێ.

تۆنی دەنگی کەمێک کزدەکات و درێژە بەقسەکانی دەدا:

ـ ئەگەر پێت خۆشە، دوو گۆڵە سەی چاکن هەن، ئێستا دەنێرم بیان هێنن، لەو گۆڕەی بەردمی ماڵی مام حاجی، تێکیان بەردەدەین...

ـ با بۆ فرسەتێکی تر بێ، وا وەڵامی فەرماندەکە دەداتەوە.

من لە تەنیشتیەوە دانیشتووم و بەدەنگێکی نزمیش بە من دەڵێ:

ـ لە وولاتان، خەڵکی بۆ دڵخۆشکردنی میوانەکانیان، تیپی مۆسیقا و سەما دێنن، لێرەش شەڕە سەگ بۆ ئێمە.

176ـ سە: سەگ: کسۆک

## ٥٥

کــە هاتمــە ڕادیۆ، نەخــۆم بەو هاتنــەم دڵخۆش بووم و نــە هەندێک لە هاوڕێکانم و نە ئەرسەلانیش.

مــن لە ترســی بەریەککەوتن لەگەڵ ئەرســەلان و، هاوڕێکانیشــم پێیان وابوو، باری لاری ئەرســەلان ڕاســتدەکەمەوە... ئەرســەلانیش پێی وابوو، نەوشــیروان مســتەفا منی بۆ دژایەتیکردنی ئەو ناردۆتــە ڕادیۆ. لای خۆم کاری من، نە ڕاســتکردنەوەی باری ئەرســەلانەو، نە دژایەتی کردنیشی. تا بــۆم بکرێ خۆم لە ململانێ و کێشــەی لابەلا دەپارێــزم. ئەوەندەی بتوانم هەوڵدەدەم وەختی خۆم بۆ خزمەت و باشــکردن و بەرەو پێشــەوەچوونی ڕادیۆ تەرخانکەم.

هەفتەی سێ چوار(ووتاری ڕۆژ) دەنووسم و چەند بەرنامەیەکیش ئامادە دەکەم. ئەو ڕۆژەش کە بارەگامان بردە (سەرشــیو)، دەســتم بە نووسینی وتارێکی پێنج ئەڵقەیی کرد. (قیادەی موەقەتە، لە نێوان ناکۆکی سەرەکی و لاوەکیدا) لە شوێنێکی وتارەکەدا، دەنووسم(جێگۆڕکێ پێکردنی ناکۆکیەکان، لــە نێــوان ســەرەکی و لاوەکیــدا، هەڵەیەکی کوشــندەیەو ڕەنگــە هەندێک جاریش، تا ســنوری خیانەت بڕوا.)، هەڵبەتە، من دەمویست بڵێم کە قیادەی موەقەتــە، هەڵەیەکی کوشــندە دەکات، بــەوەی جێگۆڕکێی بــە ناکۆکیەکان کــردووە... ململانێی خۆی لەگەڵ یەکێتیــدا، کە ناکۆکیەکی لاوەکیە، کردۆتە ناکۆکی ســەرەکی. چەند نموونەیەکیشــم لەســەر ئەو جێگۆڕکــێ پێکردنە هێنابۆوە، یەک لە نموونەکان، ململانێی نێوان باڵی مەکتەبی سیاســی پارتی دیموکراتی کوردســتان و باڵی مەلا مســتەفا، بوو. لەو نموونەیەدا ئاماژەم بەوەدابــوو کە چۆن ئــەو باڵە، باڵی جەلالیــەکان، دوای تێکچوونیان لەگەڵ مەلا مســتەفادا، ناکۆکی ســەرەکیی شۆڕشــی کوردیان کــە لەگەڵ ڕژێمی عێراقــدا بــوو، بۆ ناکۆکی لاوەکی گــۆڕی و ناکۆکی خۆشــیان لەگەڵ مەلا مســتەفادا، کردە ســەرەکی. بەمەش هەم خۆیان تووشی هەڵدێرکردو، هەم شۆڕشی کوردیشیان، تووشی لەتبوون و زەرەر و زیانی زۆر کرد. ئەگەر جەلالیەکان لەســەر هەقیش بووبن و مەلا مســتەفاش لەسەر ناهەقی، هەر نەدەبوایە جێگۆڕکێ بە ململانێکانیان بکەن.

لەسەر بابەتی ئاماژەدان بە جەلالیەکان، لەگەڵ ئەرسەلاندا، تووشی یەکەم بەرکەوتــن هاتم... ئەو پێــی وابوو، لە ئاماژەدانم بە جەلالیەکان، جۆرێک لە ســووکایەتی و ســەرکۆنەکردنی تێدایە و نەدەبوایە، ئەوانــم وەک نموونە هێنابایــەوە. ئەو پێــی وابوو، ئەمە مام جەلال و هەندێکی تر لە ســەرکردە کۆنــە جەلالیەکان تووڕەدەکات و سەریەشــەش بۆ هەموومان درووســت دەکات.

لەو کاتەشــەوە بۆ سەرشــیو هاتبوویــن، لە مام جەلال و نەوشــیروان مستەفاش دووربووین... بۆیە ئەگەر ڕێنمایی یان زانیارییەکیان بۆ هەباین، لەهەر جێیەکبان، لە ڕێی بێتەلەوە پەیوەندیان لەگەڵدا دەکردین.

وابزانم ســێ ئەڵقەی ئەو وتارەمان بڵاوکردبوونەوە کەوا ڕێکەوت قسە لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا بکەم... ئەو وتارەکەی زۆر لاباشبوو، تەنانەت پێشنیاری ئەوەشی بۆکردم لە شێوەی نامیلکەیەکدا چاپیکەین.

هەر ئەو ڕۆژە، حەمەســەعید حەسەنیش لەگەڵمدا هاتە ژووری دەزگای پەیوەندیکردنەکەوە. حەمە ســەعید، چەند ڕۆژێک بوو گەیشتبووە بارەگای کەرتی پارێزگاریی ڕادیۆ. کە هاتبوو، لە شارەوە دەستنووسی کتێبێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو... بەتەمابوو لای ئێمە چاپیکات... بۆ ڕووخسەتی لە چاپدانی، وەک خۆی دەیووت، "حەزدەکەم بەر لەچاپدانی کتێبەکەم، کۆپیەکی بۆ کاک نەوشــیروان بنێرم و ڕەزامەندی ئەویشی لەسەر وەرگرم." کە پەیامەکەی حەمەسەعیدم پێدا، لە وەڵامدا وتی:

«ســڵاوی منــی پێبگەیەنــە و بەهاتنەدەرەوەی خۆشــحاڵم. ســەبارەت بەبینینی دەستنووسەکەشــی، پێی بڵێ کە هیچ پێویست ناکا نە من و نەهیچ کەســێکیتر ببینێــ... خۆ ئێمــە حکومەتی بەعس نین تا ڕەقابەمان لەســەر نووســین و نووسەر هەبێت...بزانە چەند نووســخەی ئەوێ بۆی چاپکەن.. هەروەک بڵاوکراوەکانی خۆشــتان بۆی بگەیەننە ناو خەڵک و پێشــمەرگەو ناو شارەکانیش.»[177]

---

١٧٧ـ کاک نەوشیروان لە لاپەرە ٣١٠ کتێبی(پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن)دا، دەڵێ «ئەرسەلان بەبێ تەل لەمنی پرسی، حەمەسەعید نامیلکەیەکی هێناوە بۆی چاپکەین، بیکەین یان نا؟ منیش بێئەوەی بزانم یان بپرسم ناوەرۆکەکەی چیتێدایە، یان ئەرسەلان بۆم باسبکا، بەگوێرەی دابینکردنی سەرەتای((نان و ئازادی)) بۆ نووسەرانی کورد، وتم بڵاوی بکەنەوە؟ تومەز ئەرسەلان خۆشیی ئەو جۆرە نووسینانەی پێخۆشبوو... ئەو وای نووسیوە بەڵام لە ڕاستیدا ئەرسەلان پەیوەندی بەو بابەتەوە نەبوو.

ئیدی دوای ئەو ڕێپێدانە، پێویست نەبوو کەسمان دەستنووسەکەی حەمە سەعید بخوێنینەوە. کتێبەکە چاپ و بڵاوکرایەوە... من هێشتا بۆ خۆم، هەتا هەڵلای لەسەر درووستنەبوو نەمخوێندبووە.

حەمە سەعید لەو کتێبەیدا، لە ڕێی باسکردنی مەسەلەی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی نووســەرانیی کــورد، لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، هێرشــی توندی کردۆتە ســەر کۆمەڵێک نووســەر... تۆمەتی بەکرێگیراویی و جاسوســی و جاشــایەتی و خزمەتکاریی بەعســی داوەتە پاڵیان. ئــەوەی مایەی نیگەرانی بوو، زۆربەی هەرە زۆری ئەو نووسەرانەی بەر پەلامارەکەی حەمە سەعید کەوتبوون، ئەو نووســەرانەبوون کە لەبەرەی شۆڕش و بەرەنگاریدابوون و پەیوەندی ڕاستەوخۆشــیان لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە و لەگەڵ یەکێتیی نووسەرانی کوردستاندا هەبوو. زۆر لەو نووسەرانە، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردستاندا (لەشاخ) بە ناوی خوازراوەوە بەرهەمیان بڵاودەکردەوە. لەوەش زیاتر، ئەو نووســەرانە بەتایبەتیش، شێرکۆ بێکەس، ڕەووف بێگەرد، مستەفا ساڵح کەریم و محەمەد نوری تۆفیق و زۆری تر، لە کاتی درووستبوونی ئەو تەنگژانەی نێوان یەکێتیی نووسەرانی کورد و یەکێتی گشتی ئەدیبانی عێراق، بەر لە وەرگرتنی هەر هەڵوێستێکیان، پەیوەندیان بە سەرکردایەتی یەکێتی و بە یەکێتیی نووسەرانی کوردستانیشەوە کردووە و بە تەگبیروڕا هەنگاوی دواتریان ناوە. هەر بۆیەش کتێبەکەی حەمە سەعید، ئەو نووســەرانەی زۆر نیگــەران و تووڕەکرد، ناچاریشــیکردن بە کتێبێک وەڵامێکی توندی حەمە ســەعید بدەنەوە. بە مەبەســتی ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی درابووە پاڵ نووســەرانی دۆستی شۆڕش، نەوشیروان مستەفا، پێشەکی بۆ کتێبەکەیان نووسی و بە پێشمەرگەی گومناو و بە نووسەرانی ڕاستەقینەی بەرەنگارییو بەرەی گەلی تاریفکردن.

هــەر ئەوەنــدە پێمان نایە مانگــی نیســانەوە، وردە وردە لێرە و لەوێ ئاڵۆزی و پێکدادان، لە نێوان هێزەکانی یەکێتی و لایەنەکانی (جودا) دەستیان پێکرد... زۆری نەبرد شــەڕەکان، وەک ئاگری لە زەبەند بەربووی بەردەم ڕەشەبا، بەخێرایی کۆمەڵێ شوێنی تەنیەوە. هێزەکانی جود، لە ناوچەکانی دۆڵــی باڵەیان، خۆشــناوەتی، دۆڵی خەلەکان، شــارباژێڕ و هەورامانیش، پەلامــاری هێــز و بارەگاکانــی یەکێتیاندا. لــە دۆڵی خەلەکان، شــەماڵ و سەرباز(ســەرتیپ و جێگری تیپی ۹۳ کۆســرەت) و چەند پێشمەرگەیەکی تر، بەدەســتی مەفرەزەیەکی حیزبی شــیوعی کوژران. بارەگای مەڵبەندی چواری یەکێتی، لە (بالیسان)، لەلایەن هێزێکی(جود)ەوە گیرا... شەڕ هەموو ئەو شــوێنانەی گرتەوە، کە هێزەکانی جود دەیانتوانی دەســتیان بیانگاتێ.

ســەرکردایەتی یەکێتــی، گەیشــتە ئــەو قەناعەتەی کە ئەگــەر پەلاماری ســەرکردایەتی جود لە ناوچەی (قرناقاو و پشتئاشــان) نەدرێ، ئەوا (جود) بەخێرایی ئەڵقەی گەمارۆی خۆی بۆ سەر سەرکردایەتی و هێزەکانی دیکەی یەکێتی تەواو تەسک دەکاتەوە.

بــۆ لەباربردنی ئــەو بەرنامەیەی جود، یەکێتی، لە کۆتایی نیســانی ئەو ساڵەدا، (۱۹۸۳)، هێزەکانی خۆی بە فەرماندەیی نەوشیروان مستەفا، بەرەو قرناقــاو پشتئاشــان جوولاند. مام جەلال لە بەڕێکردنــی یەک لەو هێزانەدا، لە گوندی شــێنێ، وتارێکی حەماســەت خولقێن و ئاگرینیــدا... لەو وتارەدا مــام جەلال، دوای بە خائین ناوزەدکردنی(ســەرانی قیادە موقەتەو جووجە ڕەســوڵیەکان و تەحریفیەکان)[۱۷۸]، داوا لە هێزی پێشمەرگەدەکات، ڕەحمیان پێنەکەن... دەستیان لێنەپارێزن و پەرێزیان پاک بێ.

لەبەرە بەیانی ۳۱ی نیســاندا، هێزەکانی یەکێتی، لە ســێ لاوە پەلاماری بارەگاکانی ســەرکردایەتی جودیاندا. لە مــاوەی کەمتر لە دوو ڕۆژدا، هەر هەموو بارەگاکانی ســەرکردایەتی حیزبی شــیوعی و حســک و پاسۆک و ئــەو بارەگایانــەش پارتی لەوێ هەیبوون گیران. لــەو هەموو هێزەی جود، تەنهــا ئەوانە نەبێ، بە قەندیلدا بەرەو دیوی ئێران دەرباز بوون، ئەوانی تر

۱۷۸- لە جووجە ڕەسوڵیەکاندا، مەبەستی لە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بوو، لە تەحریفیەکانیشدا، مەبەستی لە حیزبی شیوعیی عیراق بوو.

هـــەر هەموویان یـــان بەدیلگیران یان کوژران. لەپاڵ کوژراوەکانی ئەواندا، دوو لە پەرپرسانی (پەکەکە)ش کە لەو کاتەدا لەوێبوون کوژران. ژمارەی بریندار و کوژراوی هەردوولا، خۆی لە چوار ســەد کەس دەدا. ژمارەی هــەرە زۆری کــوژراو و بریندار و دیل، هی بــەرەی جود و لەناو بەرەی جودیشــدا، هــی حیزبی شــیوعی عێراقی بــوون. لەنــاو گیراوەکاندا، مەلا ئەحمــەدی بانــی خێڵانی، ئەندامــی مەکتەبی سیاســی و کەریم ئەحمەدی جێگری ســکرتێری حیزبی شیوعی عێراقیشــیان تێدابوون... هەردووکیان برانــە نێوزەنــگ... لــەوێ، ڕێکەوتننامەیەک لە نێوان مام جــەلال و ئەواندا، لەبری یەکێتی و حیزبی شــیوعی عێراقــی واژۆکراو لە ڕادیۆی یەکیەتیەوە بڵاوکرایەوە... بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتننامەیە، دەبوایە:

دەمودەست، شەڕی نێوان هێزەکانی یەکێتی و هێزەکانی حیزبی شیوعی ڕاگیرێــن ... هێزەکانی هەردوولا بگەڕێنــەوە ناوچەکانی چالاکیی خۆیان ... هەر هەموو دیلەکانیش ئازاد بکرێن.

بەدوای بڵاوکردنەوەی دەقی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا، سەرکردایەتی حیزبی شیوعی، لە ڕێی بەیاننامەیەکەوە، ڕێکەوتنەکەیان ڕەتکردەوە.

جیــا لــەو ڕێکەوتنــە و بەرلــەوەش، مــەلا بەختیــار و بەهادیــن نوری، ڕێکەوتنێکیــان لــە ســنوری مەڵبەنــدی یەکــدا واژۆ کردبــوو. بەپێــی ئەو ڕێکەوتننامەیــەی ئەوان، هێزەکانی هــەردوولا، لەژێر هەرباروودۆخێکدا، دژ بەیەکدی شەڕناکەن.

لەســەر ئەو هەڵوێســتە، مەلا بەختیارکە بەرپرســی مەڵبەندی یەک بوو، لەلایەن ســەرکردایەتی یەکێتیەوە ســزادرا و دواتریش لەبەرپرسی مەڵبەند لادرا. بەهادیــن نوریش، لەلایەن ســەرکردایەتی حیزبەکەی خۆیەوە ســزا درا.

من لەبەرخوردی ســەرکردایەتی، بەرامبەر بــەو ڕێکەوتنەی نێوان مەلا بەختیــار و بەهادیــن نــوری، زۆرنیگــەران بــووم. نیگەرانیەکەمــم لە ڕێی نامەیەکــەوە، گەیانــدە مەکتەبی سیاســی. نیگەرانیەکەی من زیاتر لەســەر ئەوەبوو، جیا لەوەی کە بەهادین نوری دژی ئەو پەلامارە وەســتایەوە کە (جود) کردییە ســەر یەکێتی و ڕەفزی ئەوەشــی کرد بەشــداری تێدا بکات، کەچی ســەرکردایەتی یەکێتی، هیچ لەو هەڵوێســت و ڕابردووەی بەهادین نوری لەبەرچاو نەگرتبوو کە لە ناو حیزبی شیوعیدا، سەبارەت بە مەسەلەی کورد هەیبووە. دەبوایە ســەرکردایەتی یەکێتی ئەوەی لەبەرچاو بووایە کە

بەهادین نـوری، ئەندازیاری پەیماننامەی سـاڵی ١٩٥٣ی حیزبی شـیوعی عێراقیە. ئەو پەیماننامەیەی هەر بە ناوە حیزبیەکەی بەهادین نوریشەوە بە (میساقی باسم)[١٧٩] ناسرا. لەو میساقەدا حیزبی شیوعی، کورد وەک نەتەوە دەناسـێنێ... وەک نەتەوەش، مافی بڕیاردانی چارەنووسـی پێڕەوادەبینێ، بە مافی جیابوونەوە و دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆشـەوە. ئەوە لە کاتێکدا، تا ئەو کاتە، کورد لە دید و لە ئەدەبیاتی حیزبی شـیوعیدا، لەکەمە نەتـەوە زیاترنەبوو، هەر وەک کەمە نەتەوەش، باسـی لـە مافەکانی کورد کردووە.

لە کۆتایی نامەکەشدا نووسیبووم:

"دەکرا ئەو ڕێکەوتنەی نێوان ئەوانیشـتان، وەک بەشێک لەو ڕێکەوتنەی نێوان خۆتان و کەریم ئەحمەد و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی حساب کردبا... لـەوەش زیاتـر، دەکرا ئـەو ڕێکەوتنەی نێوان ئەوانتـان، وەک دەلیلی ئەوە نیشـاندابا کە یەکێتی دەستپێشـخەری شـەڕی ناوخۆ نیەو لە هەر شوێنێ پەلامارنەدرێ و شەڕی پێ نەفرۆشرێ، شەڕ ناکات."

ئۆپەراسیۆنی گرتنی قرناقاو و پشتئاشان کۆتایی هات.

یەکێتـی هەمـوو ئـەو ناوچانـەی کۆنترۆڵکـردەوە کـە هێزەکانی جود گرتبوویانن، یان جموجووڵیان تێدا دەکردن.

پاساوی سەرکردایەتی یەکێتی بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنە، کە لە ژێر ناوی(تۆڵە بەسەبرە، ئەمما بەزەبرە)دا بەڕێوەچوو ئەوەبوو:

لەوکاتـەدا پێشـمەرگەکانی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان، دەیانەوێ لوولـەی هەمـوو تفەنگەکانیان، ئاڕاسـتەی هێـز و دامودەزگاکانی ڕژێمی بەعس کەن و پەرە بەچالاکیەکانی خۆیان بدەن، ئەوان، بەرەی جود، پیلان دژی یەکێتـی دەگێڕن، گەلە کۆمەکێی لێدەکەن و لە پشـتەوەڕا، خەنجەری ژەهـراوی لێدەدەن و ناهێڵن یەکێتی بەئەرکە نیشـتمانیە پیرۆزەکەی خۆی هەستێ.

ئەوانیـش، بەرەی جود، یەکێتـی بەوە تاوانباردەکەن کە دەیەوێ لە ڕێی

---

١٧٩ـ بەهادین نوری، لەسەر ئەو میساقە، هەر لە هەمان ساڵدا، لەلایەن دەوڵەتی عێراقیەوە گیراو درایە دادگا. دادگاش لەسەر داننان بە مافی جیابوونەوەو بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کوردا، حوکمی ئیعدامی بەسەردا سەپاند. دواتر حوکمەکە بە زیندانیکردنی هەتاهەتایی گۆڕا.

شــەڕی لایەنە کوردییەکانــەوە، خۆی لە حکومــەت نزیکخاتەوەو خۆی بۆ حکومــەت، وەک تاکــە هێزی شــەڕکەر و بــێ ڕکابەر بخاتــە ڕوو. بۆ ئەم تۆمەتەشــیان، پشتیان بەو قســەیەی سەدام دەبەســت کە بەو دواییانە، لە کۆبوونەوەیەکــی فراواندا، لەگەڵ کۆمەڵێ کەســایەتی کوردیدا کردبووی... لەو کۆبوونەوەیەدا، یەکێک لە بەشداران، داوا لە سەدام حوسەین دەکات کە "مەرحەمەت بنوێنێ و بۆ کۆتایی هێنان بەشــەڕ و ئاژاوە، لەگەڵ چەکدارە کوردەکاندا" بکەوێتە گفتوگۆوە. سەدام حوسەینیش لەوەڵامدا دەڵێ:

- ئەوانە کۆمەڵێک تاقم و لایەنی جیاجیان، نازانین لەگەڵ کامیاندا گفتوگۆ بکەین.

چەنــد ڕۆژێک دوای تەواوبوونی ئۆپەراســیۆنەکە، هێــزەکان هەریەکەو بەرەو شــوێنی خۆیان گەڕانەوە. بەو هێزەدا کە گەڕایەوە ناوچەکەی ئێمە، باری چەند هێســترێکیان لەو کتێب و نامە و دۆکیومێنت و نووســراوانە بۆ ناردین کە لەو شــەڕەدا گیرابوون. زۆرینەی ئەو شــتانەش، لە بارەگاکانی حیزبی شیوعیدا، دەستیان بەسەرداگیرابوو.

ئێمــە لــە کاتــی خــۆ ئامادەکــردن بــۆ شــەڕو، لەکاتــی بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیۆنەکەشــدا، پشــتمان بــەو زانیاریانــە دەبەســت کــە لەلایــەن سەرکردایەتیەوە، لەسەر ئەو لایەنانە، پێمان دەدران.

زانیارییــەکان زەخیرەی نووســینی ئاگرین و حەماســەت خوڵقێنیان، بۆ هاندان و جووڵاندنی هەستی پێشمەرگەو، بۆ ڕەوایی دان بە هەڵوێستەکانی یەکێتــی دەدایــێ. گومانــم نیــە، لایەنەکانــی دیکــەش، هەمــان مێتودیــان پەیڕەوکردووە.

تەنانــەت ئەگەر بەڵگــەی حاشــاهەڵنەگریش لەســەر تاوانباریی ئەوان لای ســەرکردایەتی هەبووبــن بــەڵام ئەوەی مــن لەتەواوی ئــەو نامە و دۆکیومێنت و نووســراوانەدا خوێندمنەوە، ئەو زانیاریانەیان پشتڕاست نە دەکــردەوە کــە پێمان درابوون، ئەوەش بۆ من مایــەی ئازارێکی ویژدانی زۆربــوو، بە تایبەتیش کە من نووســەری زۆرینەی وتارە سیاســیەکانی ئەو کاتانە بووم. لە هەمووشی ئازاراویتر، ئەو سیاسەتی (پەرێز پاکی)یەی فەرماندەکانی ئۆپەراسیۆن و ئەو چیرۆکە ویژدان ڕووشــێنانەبوون کە لە دەمی چەند هاوڕێیەکی بەشــداربووی ئەو شەڕانەوە، لەسەر شڕەخۆری و دیل کوشتن دەمبیستن. لەناو هەمووشیاندا، دیمەنی ئەو چەکدارەی:

لەنــاو چاڵێکــەوە، فانیلــە ســپیە چڵــک زەردکردووەکــەی ژێــرەوەی، بەسەرنووکی نێزەی تفەنگەکەیەوە بەرزکردەوە. بە ئاڵای تەسلیم بوونەکەیدا دیاربوو، چۆن لە ترسانا دەلەرزێ.

"تفەنگەکــەت فڕێدە بەردەمی چاڵەکــە." فەرماندەکەمان بە دەنگێکی گڕ، بەســەریدا هــاواردەکا. تفەنگ و ئاڵا دەکەونە ســەر زەوی. بە زەحمەتێکی زۆرەوە، خۆی پێدەخرێتە سەر ئەژنۆ شلبووەکانی... ئەسمەرێکی باریکەلە، بەدوو چاوی ڕەشــی پڕ لە پاڕانەوەو ســواڵی بەزەییەوە، بە یەک بەیەکمانا دەڕوانێ... فەرماندە، پرســیاری لێدەکاو، ئەویش بە قورگێکی ووشــک و بە تێکەڵەیەک لە عەرەبی و کوردیەکی شکستە وەڵام دەداتەوە. فەرماندە، وەک ئەوەی سەرکەوتنی خۆی لە تێکشکاندنی ئەودا، بگەیەنێتە لووتکە، دەڵێ:

- مادام وایە، تۆ بە دوو مادە تاوانباریت... هەم عەرەبی داگیرکەر و هەم شیوعی تەحریفیشت.

فەرمانــدە، بەرلەوەی بەدەســتی خۆی مەخزەنێک لە جەســتەیدا خاڵیکا، بەســەر ئامازەیان بۆدەکا، کەلوپەلــە بەکەڵکهاتووەکانی لــە نێوان خۆیاندا دابەشــکەن. بەڕێســای چــی بــە کەڵکی کــێ دێ، شــتەکان لــە ناوخۆیاندا بەشدەکەن،

یەکێک قەمسەڵەکەی، یەکێک سەعاتەکەی، یەکێک تەپلە و نیتاق و یەکێکی کەش جووتە پێڵاوە نیوداشتەکەی.

دیمەنێک گومان دەخاتە ســەر مرۆڤ بوونم و هێڵنجی شۆڕشــگێڕیەتیم پێدەدا... ئیدی لەوێ بەدواوە، پاساوێک بۆ نووسینی هیچ شتێک نادۆزمەوە، ڕەوایی بە کوشتنی مرۆڤ و بەشەڕی نێوان ئێمەو ئەوان بدا.

شــەڕی جــود تەواو دەبــێ و ناوەندی کۆمەڵــە، ســاخور[١٨٠]ی پەڵە دار بەڕووەکەی خوار بارەگاکانی ئێمە، دەکەنە بنکەی کاتیی خۆیان.

مامۆســتا جەمال تایەر، ئەندامــی ناوەندی کۆمەڵە، بەرپرســی دەزگای ڕێکخستن و بارەگای ناوەندیە. چەند ڕۆژێک بەر لە (٦/١٠)، داوام لێدەکات، بۆ ڕۆژی دامەزراندنی کۆمەڵە، وتارێکی بۆ بنووســم. وتارەکە دەنووســم. لە ئێــوارەی بەڕێوەچوونی ئاهەنگــی یادی دامەزراندنــی کۆمەڵەدا، لەگەڵ چەند برادەرێکی تــردا، دەچینە بارەگای ناوەندی. هەرکە بەژووردەکەوین، مامۆســتا جەمال، (ناســری ڕەزازی) بە ئێمەو، ئێمەش بە ناسر دەناسێنێ. ناســر، هەڵدەستێتە ســەرپێیان و باوەشــێکی توون و گەرمم پێدا دەکا، بە حەماسەتێکی زۆرەوە ڕوو دەکاتە دانیشتوانی ژوورەکە:

"ئەو شیعرە ئاگرینانەی ئەوان، ملی ڕێی پێشمەرگایەتیان بەئێمە گرت."

هێشتا هەر بە پێوەین کە ناسر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

"ئــەو ڕۆژەی گوێــم لــەو نــەوارە شــیعریەی[١٨١] بــوو، بۆ مــن هێندە حەماســەت خولقێن بوو، لە خۆشــیاندا نەمدەزانی چ بکەم. خۆم بۆ نەگیراو دەســتەوچێ، بەخۆم و بەنەواریەوە، چوومە لای (نەجمەی غولامی) و پێم گــووت، "وەرە و گــوێ لەوانەوارەی بگرەو لە دوایەشــدا خۆت خڕکەوە و دەبینە پێشمەرگە."

من دەمێک بوو، یەک لە گوێگرە جدیەکانی گۆرانیەکانی ڕەزازی بووم... دیداریشــی بەو شــێوەیە، بۆ من ســەرپرایزێکی خۆش بوو... ناسرێش بۆ بەشداربکردن لە بەڕێوەچوونی یادی کۆمەڵەدا، داوەت کرابوو.

ناســری ڕەزازی، هــەر لەســەرەتای دەرکەوتنیدا، بۆ ئێمــەی کوردانی باشــوور، وەک دەنگێکــی کامڵ کەوتــەڕوو. هەر زوو ئێمەی بە ســتایڵ و

١٨٠ـ ساخور: ڕووتەنی ناو لێرەوار کە هەتاوی بەردەکەوێ.

١٨١–نەوار: کاسێت. ژمارەیەک لەو شیعرانەی لە دووەمین میهرەجانی شیعری کوردیدا خوێنرابوونەوە، خرابوونە سەر کاسێتێک و گەیانرابوونە ناو شۆڕش و لەوێشەوە گەیشتبوونە ڕۆژهەلاتی کوردستان و شوێنی تریش.

بەئەدای جیاوازی خۆی ئاشـناکرد. ناسـر، گۆرانی ڕیتمی خاوی وتبێ یان خێـرا، مەقامی وتبێ یـان گۆرانی هەڵپەڕکێ، گۆرانی خـۆی وتبێ یان هی خەڵکی تر، ستایلی جیاوازی خۆی داونەتێ.

ناسـر بەو پاشـخانە ڕۆشـنبیریە هونەرییەی لەسـەری وەستاوە، زۆر شارەزایانە مامڵەی لەگەڵ تێکست و میلۆدی و میوزیکدا کردووە. لەووتنەوەی گۆرانـی هەندێ هونەرمەندی تریشـدا، هەر گۆرانیەکانـی نەووتوونەتەوە، بەڵکو جوانکاری و گۆڕانکاریشـی بەسـەردا هێناون، بە چەشنێکی وا هەم شـێوازی جیاوازی داونەتێو، هەمیش زیندووی کردوونەتەوەو، بە نەوەی نوێشی ئاشنا کردوون.

ناسـر، لـەو بۆنەیـەی دامەزراندنی کۆمەڵەشـدا، بەو چەنـد گۆرانی و سروودەی پێشکەشی کردن، ئاهەنگەکەی بردە فەزایەکی ترەوە. بۆ خەوتنی شـەویش، هەر لەگەڵ مندا هاتەوە... تا درەنگانێکی شـەو، باسـی شـیعر و گۆرانی و سیاسەتمان کرد.

پێشـتر، لە ڕێی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە، ئاشنای دوان و دیـداری زۆرێک لـە گۆرانبێژانی کورد ببووم، بـەڵام هیچیانم بەو توانا ڕۆشنبیرییەی ڕەزای نەدیبوو.

بەر لە بینینی ناسـر، ئـەوەی لەناو گۆرانیبێـژە دیارەکانداو لە نزیکەوە دیبوومن، تەنها مامۆستا تایەر تۆفیق بوو، ئەویش ئەو کاتەبوو کە لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم (ساڵی ١٩٧٥). ئەو ڕۆژە، بۆ نوێکردنەوەی ساڵانەی ئۆتۆمبیلەکەمـان، لـە فەرمانگـەی بەڕێوەبەرایەتـی پۆلیسـی هاتووچـۆی هەولێربووم.

دەوام خەریکـە بـەرەو کۆتایی دەچێ و کارەکانـی منیش لەگەڵیدا. هەر ئەوەندەم ماوە پارەکە ڕادەستکەم و ساڵانەکە وەرگرمەوەو تەواو. ژووری ژمێریار لە قاتی سەرەوەیە... بەڕاکردن بە قادرمەکاندا سەردەکەوم. دەرگای ژوور دەکەمەوە، بەدیمەنی پشـت مێزی مامۆسـتا تایـەر تۆفیق، دنیایەک خۆشـحاڵ دەبم. دوای سـڵاوێکی گەرم و پیشاندانی ڕێزێکی زۆر، وەسڵی پارەدان و پارەکە دەخەمە سەر مێزەکەی بەردەم مامۆستا.

- دەوام نەمایە، بڕۆ سپەینێ وەرەوە.

- مامۆستا گیان، دەزانم زۆرماندووی، بەڵام من لە چوارقورنەوە هاتووم... زۆر مەمنون دەبم ئەگەر پارەکەم لێوەرگری و وەسڵەکەم بۆ ببڕیت... با بۆ

ئەو تۆزە ئیشە، ئیمشەو لە هەولێر نەمێنمەوە.

ـ پێم گوتی دەوام نەمایە. شەویش لە هەولێرێ دەمێنیەوە، نامێنیەوە موشکیلەی خۆتە.

بە نائومێدی و بە دڵێکی شکاوەوە، دەسکی دەرگا دەسووڕێنم و دەمەوێ بچمە دەرێ. پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەی جامانە بەسەر، خۆی بە ژووریدا دەکا. مامۆستا لەبەری هەڵدەستێ و فەرمووفەرمووی دانیشتنی لێدەکا. کابرا وەسڵی پارە دانەکەی وەردەگرێ و دەچێتە دەرەوە.

بەو خەیاڵەوە، مادام ئیشی ئەوی کرد، ڕەنگە ئیشەکەی منیش بکا، دەگەڕێمەوە بەردەمی و بە ئەدەبەوە، پێی دەڵێم:

ـ مامۆستا گیان، بەڵکو ئیشەکەی منیش ڕاهی کەی و تووشی مانەوەی شەو نەبم.

ـ چم پێ گوتی... پێم نەگوتی دەوام نەمایەو دەبێ سپەینێ بێیەوە.

ـ مامۆستا گیان، خۆ بۆ ئیشی ئەو بەڕێزەش دەوام نەمابوو.

ـ لەوە قسان زیاتر نەکەی. دەوام مایە نەمایە، مشکیلەی تو نیە، ئەو دۆستمە... دەوام هەبێ یان نەبێ لۆی دەکەم. لێرەش نەبێ، دەچمە مارێیان.

بەدەنگێکی جیاواز لەو دەنگەی لە ڕێی گۆرانیەکانیەوە، پێی ئاشنابووم:

ـ ئەوجا لەوە زێترم ماندی مەکە و هەتا توورەش نەبووم، بڕۆ دەرێ.

نەوا لەوە زیاتری توورەکەم و کاری بەیانیش لە خۆم ئاڵۆزترکەم، بەبێدەنگی ژوورەکەی بە جێدەهێڵم. لە ترسی ئەوە نەبێ، بەیانی دووبارە ئیشم تێی دەکەوێتەوە، پێی دەڵێم:

"شەرت بێ قەت جارێکی تر گوێ لە گۆرانیەکانت نەگرمەوە."

ئەو ڕووداوە وایلێکردم، ئارەزووی بینینی گۆرانبێژانم نەمێنێ. دیداری ناسری ڕەزازی، لەو ڕایەی ژێوان[١٨٢] کردمەوە... بینینی دواتری نەجمەدینی

١٨٢- ژێوان: پەشیمان

غولامیش، ژیوانتریشی کردمەوە.

سـالێک دواتریش، مەزهەری خالقیم ناسی. بەر لەوەی بیناسم، زیاتر لە هەر گۆرانبێژێکی تر، گوێم لە گۆرانیەکانی ئەو دەگرت. ستایلی خالقی لای من، لە ستایلی هیچ گۆرانی بێژێکیتر ناچێ. نەک هەر ئەوە، گۆرانیەکانیشی، هیچیـان لـەوی تریان ناچن... کەچـی هەر ئەوەندە گوێت لـە یەکەم کۆپلە میوزیکی گۆرانیەکی بێ، یەکسـەر دەزانی ئەوە سـتایلی خالقییە... ستایلێک کە هەم نوێگەری و هەم ڕەسەنایەتیشـی لە خۆیدا پاراسـتووە... سـتایلێک ناچێتەوە سەر هیچ ڕێبازێکی تر، ڕێبازی مەزهەری خالقی نەبێ.

خالقـی، چ لـە ڕووی دەنگ و ئـەداوە، چ لە ڕووی میوزیـک و میلۆدی و هەڵبژاردنـی تێکستیشـەوە، لە هەمـوو گۆرانبێژێکی تر جیـاوازە... هەر ئـەو جیاوەزیەش، گۆرانیەکانی بردۆتە ئاسـتێکی باڵاوە... ئاسـتێک، لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەنیشدا، زەمەنی گۆرانیەکانی ئەو تێناپەڕێ.

ناهەقی نابێ ئەگەر بڵێم، بەشـێکی ئەو ئاست باڵاییە، بۆ میوزیک ژەن و ئاوازدانەرانی وەک(یوسف زەمانی، موجتەبای میرزادە و حەسەنی کامکار) دەگەڕێتـەوە... هـەر ئەوان بوون، دیوە شـاراوەکانی ئـەو دەنگە ناوازەی خالقییان دۆزییەوەو بە ئێمەی گوێگریان ئاشنا کرد.

لەسەردەمی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و حکومەتدا، ئەو کاتەی بارەگاکانمان لـە بەرگەڵووبـوون، خالقـی ئێرانی بەجێهێشـت و بەهـۆی خزمایەتییەوە، لەگەڵ ماڵی ئیبراهیم ئەحمەددا، بووبە میوانی یەکێتی... بەتەمای سـەفەری بەریتانیابوو. ئەو مووەدەتەی چاوەڕێی تەواوبوونی فیزەی دەکرد، لای ئێمە مایەوە... شەوشـەوەش، دوای تەواوبوونم، لە نووسـینی وتار و شتەکانی دیکەی ڕۆژانە، دەهاتە ژوورەکەم... زۆرتر گوێمان لە میوزیک دەگرت، یان باسـی بەسەرهاتێک لە بەسـەرهاتەکانی خۆی و ئێرانی دەکرد. بەرلەوەش سـەفەری دەرەوە بکا، داوای نووسـینی دوو پارچە هۆنراوەی لێکردم بۆ ئەوەی بیانکاتە گۆرانی... ئەدرەسی لەندەنیشی دامێ، تا کەی نوسیمن بۆی ڕەوانەکـەم. پـڕ بەدڵ حەزم دەکرد، بەو دەنگە سـازگارەی ئـەو، گوێم لە هەست و سۆزە شیعریەکانی خۆم بێ، بەڵام وا ڕێکنەکەوت بیان نووسم... ڕەنگە هۆکارەکەشـی ئەوەبێ کە من قەت شـیعرم لەسەر داوا نەنووسیوە. هـەر لە هەمان ژووردواو سـاڵێک دواتر، یەک لە فەرماندە سـەربازییەکان، داوای لە شێرکۆ بێکەس کرد، شیعرێکی لەسەر فلانە داستانە بۆ بنووسێ... ئەویش لە وەڵامدا ووتی: "کاکە من خەیات نیم، شاعیرم."

بەدەم نووسینی ووتارێکەوە، گوێم لە گۆرانیەکانی خالقی گرتووە. خالقی دێتە ژووریێ... هەر لەگەڵ بیستنی دەنگی خۆیدا دەڵێ:

- بوەخشە، دەکرێ نەوارێکی تر بنێیتە بان زەبتەکە[183]؟

- بۆ کاک مەزهەر، مەگەر تۆ حەزت لە دەنگی خۆت نیە؟!

- مەســەلەکە خــۆش هاتن نیە... ترســی ئەوەم هەس، ئیســا یەکێک لەو ڕەفیقانەی مەقەڕ، بێتە ناو و لە دڵ خۆیا بێژێ "تواشــا تواشا، چەنێ ئاشق سەدای خۆیەسی."

کاســێتەکەم گۆڕی و کاســێتی کۆمەڵە گۆرانیەکی عومەر دزەییم خستە سەری:

- دەنگی عومەر دەزەییت پێ چۆنە؟

- نایەتە فکرم بەر لەوە ئەو ناوەم ژنەفتبێ[184].

هەرچەندە ڕاکەی خالقیم، لەسەر عومەر دزەیی لا سەیربوو، بەڵام هیچم نەووت. لام سەیربوو چونکە ئەو کاتە، گۆرانبێژمان ئەوەندە زۆرنەبوون... یەکێکیش یەک دوو گۆرانی بۆ ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن تۆمارکردبا، بە ئاسانی دەناسرا.

باســەکەمان لەســەر عومەر دزەیی لاداو هاتینەســەر باســی حەســەن زیرەک.

- وێــڕای قوتابخانەیــی بوون و لووتکەیی حەســەن زیــرەک لە گۆرانی کوردییــدا، بەڵام هەندێک گۆرانی لاوازیشــی هەن... بەتایبەتیش ئەوانەی لە ئاهەنگــی ماڵاندا وتوونــی... خۆزگە ئەو جۆرە گۆرانیانــەی نەدەووتن، من ڕای خۆم ئاوا لەســەر حەســەن زیــرەک دەربڕی... کەچــی خالقی ڕایەکی تەواو پێچەوانەی ڕایەکەی منی هەبوو:

- مــن کارمەنــدی دەوڵەت بووم. هەرگــز ئحتیاجم نەوگە لــە ڕێی ئاواز خۆندنمۆ، پووڵی زیندەگیم پەیاکەم. بۆ کەسێکی وەک من کە هقوق[185]خۆری دەوڵەتم، ناشــێ بچم لە مەراســیمی ماڵانا ئاواز بخوێنم. ئەمما بە نیســبەت

---

١٨٣-زەبت: تەسجیل یان ڕیکۆرد.

١٨٤ـ ژنەفتن: بیستن.

١٨٥-هقوق: موچە

حەســـەن زیرەکیەوە، مەسەلەکە فەرقی هەس، ئەو نەهقوق خۆری دەوڵەت بــوو، نە هیچ مەنبــەع و دەرامەدێکی بوو، تا زیندەگی خۆی پێ بچەرخێنێ. هەزار ئاوازی زۆر خاسیشـــی وتبا، یەک قڕانـــی نەئەکرد بۆی. ئەگەر ئەو لەو مەراســیم گەلە و لەو شــوێنانەدا ئاوازی نەوتبا و پووڵی بۆ زیندەگی خۆی پەیانەکردایە، ئەشــیا بڕوا یان کاری کشــاوەرزیی بکا یان کارگەری. جا ئەو وەقتیچە، نە هەر ئاوازی خاس، شــایەد ئاوازی خراوشـــی بۆ ئیجرا نەکرایە.

بەیانـی نەدابـوو، زرمـەی بـەر زەوی کەوتنـی چەنـد گوللەتۆپێـک، بەملاو ئەولاماندا، هەواڵی دەسـتپێکردنی هێرشـی زەمینیـان پێراگەیاندین، خڕبوونەوەی ئەو چەند ڕۆژەی سەرباز و جاشێکی زۆر لە پشتی قەڵادزێوە، ئامادەییەکی دەروونیان دابووینێ.

پێشمەرگەکانی تیپی ٤٣ی جوتیاران، بەهاوکاریی هەندێک هێزی دیکەش، بەدرێژایی بەرزاییەکانی گردە بێناز، بەریان بە هێرشـەکە گرتبوو. بۆ چەند ڕۆژێـک شـەڕێکی قورس بەڕێوەچـوو. بارەگای ئێمە و ئـەو بارەگایانەی دیکـەش کە چەنـد کیلۆمەترێک لە پشـتی بەرەی پێشـەوەی شـەڕبوون، بەردەوام قەسـفی تۆپ و کاتیۆشـایان لەسـەربوو. ئەو ماڵانەی لەو ناوە دەژیان، بەهۆی بۆردوومانی بەردەوام و ڕۆژانەوە، هەر لە تاریک و ڕوونی بەیانیەوە، ماڵەکانیان جێدەهێشـت و پەنایان بۆ ناو ئەشکەوت و پاڵ گاشە بەردی چیاکەی پشتمانەوە دەبرد.

عەبدوڵڵا مەحمود، فەرماندەی یەک لە کەرتەکانی تیپی جوتیاران، بەهۆی برینداریی‌یەکی پێشـووتریەوە، لە پشتەوەی بەرەی شـەڕدا، بەرپرسیارێتی دابینکردنی پێداویسـتیەکانی بەرەی شـەڕی پێسـپێردرابوو... لە بنکەکەی خۆیـەوە کـە هەمووی چەند سـەد مەترێک لـە ئێمەوە دووربـوو، لە ڕێی دەزگایەکـی بێتەلەوە، لەگەڵ پێشـمەرگەکانی بەرەی شـەڕ، بـەردەوام لە پەیوەندیدابـوو. بێتەلەکـەی عەبدوڵـڵا مەحمـود بۆ ئێمەش، سـەرچاوەی هەواڵەکانـی بەرەی شـەڕبوو. کە لەڕێی بێتەلەکەوە قسـەی دەکرد، هێندە بەدەنگی بەرز دەدوا، ئێمە لە شـوێنەکانی خۆمانەوە، بە ئاسانی گوێمان لە هەموو قسـەکان دەبوو. ئەوکاتانەش کە هانی پێشمەرگەکانی بەرەی شەڕی دەداو ورەی وەبەردەنان، ئەوەندەی تر دەنگی لێهەڵدەبڕێ.

- بە قوربانوبم لێیان دەن... مەهێڵن بستەکی بێنە پێشێ... ئەگەر شتەکیشو دەوێ، هەتا ئەلعان بۆتان ڕەوانکەم.

- بڕەکن فیشـەکان بۆ بنێرە، خەریکە فیشـەکن لێدەبڕێن، پێشـمەرگەی سەر بێتەلی بەرەی پێشەوەی شەڕ وادەڵێ.

- بەوخودایەی، هەرچی کاروانچی و قاچاخچی هەن، لە ترسی قەسفێ، بەوناوەیدا نایەن... فیشەک بۆ دەرمانیش چنگ ناکەوێ، عەبدوڵڵا مەحمود ئاوا وەڵامدەداتەوە.

- دەباشە نانین بۆ بنێرە، نان... خەریکە بۆ نانیش بەزەیقەتێ[186] دەکەوین.

- ئنجا بۆ ژن لێرە ماون هەتا نانیمان بۆ بکەن... بەخودای نان بە گوللەش پەیدا نابێ.

عەبدوڵڵا مەحمود، ئیستێکی بۆ دەکا، ئنجا بەدەنگێکی کزترەوە دەڵێ:

بێجگە لە نان و فیشەکی، هەر شتەکی دیکەو بوێ، هەر ئێستا بۆو ڕەواندەکەم...

نەمانی نان و فیشەک، لەو قوڵەی لای ئێمەوە، باروبنەی بە ئێمەش پێچایەوە... چەند وولاخێکمان بەکرێگرت و بەچەند وەجبەیەک، بەرەو بەرگەڵوو کەوتینە ڕێ.

سەرشیومان بەجێهێشت، بەڵام دیمەنێک لەگەڵماهات و تا ساڵانێکی زۆریش، دیواری زاکیرەی جێنەهێشتم.

هێشتا خۆر چەند گوریسێکی ماوە ئاوابێ... بەمەبەستی دانانی هێڵی بەرگری دووەم، بەکر پیرۆت و دەستەکەی، لەدووری کیلۆمەترێکەوە، بە هەورازەکەی ئەوبەری ئێمەدا هەڵدەگەڕێن.

لەو ڕۆژەوە ڕژێم، دێهاتە سنوورییەکانی ڕاگواستووە، ملیۆنان مینی، لە شوێنەکانی ئەواندا چاندوە. هەرتاوناتاوە، مینێک لەبن پێی ڕێبوارێک، پێشمەرگەیەک، شوانێک، یان لەبن پێی ئاژەڵێکدا دەتەقێتەوە.

لەوکاتەدا بەکر پیرۆت و دەستەکەی، بەهەورازەکەدا هەڵدەگەڕێن، مامۆستا حەیدەر و من، لە خوار کەپرو خێمەکانی خۆمانەوە، بەدەم قسەکردنەوە پیاسەدەکەین.

مامۆستا حەیدەر خەڵکی خانەقینە، پێشمەرگەیەکی سپیتاڵەی[187] قژ نیوە ڕووتاوەی هێمن و گورج و گۆڵ و ڕووخۆش و دەم بە خەندە. سەرەتا کە

١٨٦- زەیقەت: سەخڵتی، تەنگاوی.

١٨٧- سپیتاڵە: ڕەنگێک لە نیوان سپی و ئەسمەردا.

له ١٩٨٠دا بوو به پێشمەرگە، لەگەڵ چەند مامۆستایەکی تری پێشمەرگەدا، قوتابخانەیەکیان، بۆ منداڵانی گوندی شێنێ کردەوە... دواتر وەک کادرێکی هونەریی، هاتە بەشی چاپەمەنیەکانی دەزگای ڕاگەیاندن... لەوێش بە هەمان دڵسۆزی و چالاکیەوە، کارەکانی خۆی ڕادەپەڕاند.

ئەوان لە بەهەوراز هەڵگەڕاندا بەردەوامن و، مامۆستا حەیدەرو منیش، لە پیاسەکردن دەوەستین و سێرە[١٨٨] لە هەنگاوەکانی ئەوان دەگرین.

بەکر پیرۆت، چەند مەترێک لە پێش پێشمەرگەکانی دیکەوە، بەسەر بەردە لە زەوی چەقیوەکاندا بازدەدا... گونیەیەکی پڕ لە بەرد، لە ڕێی پەتێکی درێژەوە، بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ.

پێشمەرگەکان، یەک بەدوای یەکداو چەند مەترێک دوور لەیەکتری، هەنگاوی وورد وورد دەنێن. دووکەڵێکی شین و زرمەیەک دڵمان دادەخورپێنێ... ئەو پێشمەرگەیەی چەند مەترێک دوور، لە دوای فەردە بەردەکەوە ڕێدەکا، لەگەڵ ئەو گوززە تەپوتۆز و دووکەڵەدا بەهەوادا دەچێ.

مامۆستا حەیدەر ڕادەکاو منیش بەدوایدا. هێشتا دووکەڵ ئاسمانی ئەو ناوەی بەرنەداوە، ئێمە دەگەینە لایان. مامۆستا حەیدەر، پێشمەرگە بریندارەکە بە کۆڵی خۆیا دەداو تا خەستەخانە ڕاناوەستێ.

من دڵنیام، ئەو ڕۆژە مامۆستا حەیدەر نەبا، مەحاڵ بوو ئەو مینە نەفرەتیە، هەر بە پەڕاندنی لاقێکی ئەو پێشمەرگەیە کۆڵیدابا.

دوو ساڵ و چەند مانگێک دواتر و دوای لێدانی ئاڵای شۆڕش، بۆمبێک لەسەر ئەو پردە دەتەقێتەوە کە ئەمبەروئەوبەری بەر گەڵووی بەیەکەوە دەبەست. ئەگەر نەوشیروان مستەفا و دکتۆر فوئاد مەعسوم و پێشمەرگەکانی تر، چەند چرکەیەک زووتر نەپەڕیبانەوە، بۆمبەکە بەواندا دەتەقییەوە.

هەر بەدوای تەقینەوەکەدا، دوو پێشمەرگە، (عیماد)ی برای مامۆستا حەیدەر دەبینن کە لەناو دارەکانی دەوروبەری پردەکەوە، بەڕاکردن دێتە دەرێ. لەوێوە چاوی گومان، دەچێتە سەر عیماد. لیژنەیەک کە بەسەرپەرشتی جەبار فەرمان بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە پێکدەهێنرێت، لێکۆڵینەوە لەگەڵ عیمادیدا دەکات... دواتر عیماد دەخرێتە ژێر چاودێرییەوە و هەر لە دەزگای چاپخانەدا کە خۆشی هەر لەوێ پێشمەرگەیە، وەک

١٨٨- سێرە: قەرەوڵ ، جاسوسی سەر لولەی تفەنگ

دەستبەسـەر دەیهێڵنەوە... تا شـەوێک فرسـەت دێنـێ و ڕادەکا... بەمەش تۆمەتەکە لەسەر خۆی دەکاتە بەڵگە.

"هەر چیت کردووە نەیەیتەوە. خۆت بەدەستەوە دەی ئەتکوژن."

مامۆسـتا حەیدەر، لەو نامەیەدا کە دەیەوێ بەدایکی(عیدان)[189]دا بینێرێ، وا بۆ براکەی دەنووسێ.

لەسەر ئەو نامەیە، مامۆستا حەیدەر دەگیرێ و دەخرێتە زیندانەوە. نامەکە لە دیدی سـەرکردایەتیدا، لەسـەری دەبێتە بەڵگەو پێویست بە لێکۆڵینەوەو دانپیانـان و دادگاییکـردن ناکا. ئەو کارەی مامۆسـتا حەیدەر کردوویەتی، تەنانەت بەپێی (یاسای سـزاکان)[190]ی عیراقییش، هیچ سزایەک نایگرێتەوە. ئەم یاسـایە مامۆستا حەیدەر لە سـزای هەر تاوانێ دەپارێزێ کە براکەی پێی هەسـتاوە، کەچی لەیاسـای ناوشـاخی ئێمەدا، مامۆستا حەیدەر وەک تاوانبار و خائین مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

بەتڵێکی شەو ڕاکشاوە[191]، مانگ تۆزێکە سەری تاڵە ئاوریشمیەکانی خۆی، لە قۆزاخەی شەو دەرهێناوە. کلیلی ناو کیلۆنی دەرگای ژووری زیندانەکەی مامۆستا حەیدەر دەچەرخێ... دەستەکانی لە پشتەوەڕا دەبەستنەوە... چەند سـەد مەترێـک لە زیندانـی دووردەخەنەوە... بە پـاڵ گابەردێکی گەورەوە ڕایدەگرن... هەر چواریان میلی تفەنگەکانیان دەهێننەوە:

- دوا ڕاسپاردەت؟

- زەحمـەت نەبێ ئەتوانن لەبـەردەم ئەم بەردە گەورەیـە بمگوازنەوە... ئەترسم لە کاتی گوللە بارانکردنمدا، گوللەکان بەر بەردەکە کەون و بەرەو خۆتان هەڵبزنەوە و زامارتان کەن.

---

١٨٩- عیدان لە دەستەکەی جەبار فەرماندا پێشمەرگەبوو. هەر لەو ڕۆژانەدا، دایکی دێتە سەردانی و حەیدەریش بەودا نامەیەک بۆ براکەی دەنێرێ. بەرلەوەی نامەکە بڕوا دەکەوێتە دەست جەبار فەرمان و ئەویش دەیداتە سەرووی خۆی.

١٩٠- بەپێی ماددەی ٢٧٢ی (یاسای سزاکان)ی عێراقیش بێت ئەم نابێت سزا بدرێت. بە گوێرەی ئەو ماددەیە، ئەو کەسە سزادەدرێت کە دەبێتە هۆی ڕاکردنی یان داڵدەدانی تۆمەتبارێک و دەشزانێ کە ئەو تۆمەتبارە، فەرمانی لە سێدارەدان یان زیندانی کردنی کاتی یان هەتاهەتایەی لەسەرە، یان تۆمەتبارە بە تاوانێک، کەسزاکەی لە سێدارەدانە، بەڵام حوکمی ئەو ماددەیە، باوک و دایک، خوشک و برا، ژن و منداڵی تۆمەتبار ناگرێتەوە.

١٩١- بەتڵێکی شەو ڕاکشاوە: بەشێکی شەو تێپەڕیووە.

- چی تر؟

- تکاشــتان لێئەکەم، با لە ڕادیۆ بە خائن ناونەبرێم... با باوک و دایکم لە ناو خەڵکا، بە باوک و دایکی خائینێک نەناسرێن.

پێشــمەرگەکان، هەســتەکانی خۆیــان لــە گا بەردەکەی پشــتی حەیدەر ڕەقتردەکەن... قۆنداغی تفەنگەکانیان بە شانیانەوە دەنووسێنن... بەر لەوەی پەنجەیــان لە پەلەپیتکەی تفنگەکانیــان توندترکەن، مانگ بۆ ئەوەی نەبێتە شاهیدی ئەنجامدانی تاوانێکی ئاوا گەورە، خۆی هەڵدەداتە پشتی لووتکەی شاخە قووچی بەرگەڵووەوە.

ئیدی لەوســاوە تا ئێســتاش، هــەر جارێک بەو دۆڵــەدا ڕەتببم، تارمایی مامۆســتا حەیــدەر دەبینم، لاشــەیەکی خوێناوی بە کۆڵــی خۆیا داوە و بە هەناســەبڕکێ و بــە شــەقاوی گەورە گــەورەوە، بەهەورازەکــەی بەردەم خەستەخانەدا هەڵدەگەڕێ.

## ٥٩

سەرشیومان جێهێشت و بە نیازبووین تا (وڵاخلوو)، یەک تەکان بڕۆین بۆ پشـــوویەکی کورتیش نەوەســـتین... وڵاخدارەکان ملیان بۆ ویستی ئێمە نەدا. ئێمە پەلەی گەیشتن و ئەوانیش لە خەمی وڵاخەکانی خۆیاندا بوون.

"وڵاخیـــش ڕووحلەبەرە، ئەگەر ئیســـراحەتەکی پێ نەکـــەی، ڕەنگە لەبن ئەو بارە قورســـەیدا بپســـێ." وڵاخدارێکیان وای وت. ناچار من و پشتیوان (ئەندازیاری ڕادیۆ)، ملمان بۆ فەرمانی ئەواندا و لەو شوێنەدا دۆڵی سەفرە تەواودەبێ بارمان خستن.

"تەبیعەتـــی هێســـتری وایە، هەتـــا کورتانی لێ نەکەیـــەوەو بڕەکی خۆی لەنـــاو خۆڵێدا نەگەوزێنێ، ئیســـراحەتێ نـــاکا." کاروانچیەکەی تریان، دوای ئەوەی کورتانەکانی لە هێسترەکان کردەوە، وای ووت.

ئـــەوان خەریکـــی ئالیکدانـــی هێســـترەکانن و ئێمـــەش چیلکـــەو چاڵمان خڕکردۆتەوەو کەتریە ڕەشـــمان خستۆتە ســـەر ئاگر. ئێمە یەکی چایەک و ئەوانیش هەریەکەی دە پانزە چایان خواردەوە.

"بـــۆ کاروانچیـــان، هیـــچ شـــتەک بەقەد چای خـــۆش نیە... چا شـــەرابی کاروانچیانـــە" کاروانچیەکیـــان، لەو کاتـــەدا دوایەمین چـــای فڕدەکرد، وای ووت.

هێشتا کەتریەکەمان لەسەر ئاگر لانەدابوو، مەدحەت و پێشمەرگەیەکیتر پێمان گەیشتنەوە.

مەدحەت کاکەیی، هونەرمەندی شێوەکاری دیارو ناسراو، ساڵ و نیوێک زیاتربوو، پەیوەندی بەڕیزەکانی پێشمەرگەوە کردبوو. بۆ چەند مانگێک لە بارەگای ناوەندی کۆمەڵەدا پێکەوەبووین.

هەتا بڵێی دڵپاک و ڕووح ســـووک و ســـادە و بێ فیز. هەر بۆیەش کەس نەبـــوو، لەو بـــارەگا زۆر گەورەیەیەی ئێمەدا خۆشـــی نـــەوێ... ئەوکاتەش باســـی چۆنیەتی بەجێهێشتنی ڕیزەکانی سوپای عێراقی دەکرد، ئەوەندەیتر خۆشت دەویست.

"هەر لە ئیسپانیا گەڕامەوە، ڕاپێچی سەربازییان کردم. نەگبەتیەکە لەو کاتەوە دەستپێکرد کە فەوجەکەمانیان بۆ بەرەکانی پێشەوەی شەڕ نقڵ کرد. ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە شوێنەکەی خۆمان. نێوان سەربازگەکەی ئێمە و هێزەکانی ئێرانی، لە چەند کیلۆمەترێک زیاترنەبوو. یانزەی شەو نۆبە حەرەسیاتی من بوو. هێندە شەکەت بووم، بەزەحمەت خۆم بە پێوە ڕادەگرت. هەمووی چەند مەترێک لە خێمەکەی خۆمانەوە دووربووم... هێندە تاریک بوو، خێمەکەی خۆشمانم نەدەدی. لە ترسی قەسفی ئێرانی، تەنانەت جگەرەکێشانیش قەدەغەبوو.

هەر ئەوەندەم خۆش بوو، تا قەسفی ئێرانیەکان دەستیپێکرد... قەسف ئەوەندە خەست بوو، بواری سەردەرهێنانیشی نەدەدا. بەهەزار شەڕەشەق، خۆم گەیاندە پاڵ ساتری[١٩٢] دەوری سەربازگەکە. بەدرێژایی ئەوشەوە، هەر گوللەتۆپ بوو، زرمەی لە زەوی هەڵدەستاند. وەختێک تۆپباران ڕاوەستا، دنیا تەواو ڕووناک داهاتبوو. تۆپباران وەستاو دڵی منیش خەریک بوو لەگەڵیا دەوەستا. کوڕە خۆ من بە دیوی ئێرانیەکاندا، خۆم داوەتە پاڵ ساتر. ئیتر هەر ئەو شەوە تێگەیشتم سەربازی ئیشی من نیە... هەر ئەوەندەش فرسەتێکم دەستکەوت هەڵاتم."

مەدحەت، ئەوەندەی پێکەوەبووین هەر خەریکی نیگارکێشان بوو. هەر کە تابلۆیەکی تازەشی تەواودەکرد، بۆ ماوەیەک بە دیواری هۆڵی بارەگاکەوە هەڵیدەواسی و حەزیدەکرد سەرنجی خەڵکی لەسەر کارەکانی خۆی بزانێ. مەدحەت، لە تابلۆکانیدا وێنەی ئەو شتانەی نەدەکێشا کە بە چاوی ڕووتی ئێمە دەبینران... ئەو، وێنەی ئەو شتانەی دەکێشا کە چاوی ڕامان و خەیاڵی خۆی پەی پێدەبردن. بۆیە پێشمەرگەکان، لە تابلۆکانی حاڵی نەدەبوون... ئەو زمانەیان نەدەزانی کەمەدحەت حیکایەتەکانی پشتی تا بلۆکانی خۆی پێدەگێڕانەوە.

پێشمەرگەکان، تەنها ئەو هێڵە ڕەش و سپیانەیان دەدی کە بەناو یەکداچووبوون... هێما و ڕەمزەکانی ناو هێڵەکانیان بۆ لێکنەدەدرایەوە... ئەوان لە تابلۆکانی مەدحەت حاڵی نەدەبوون، بەڵام دەیانزانی حیکایەتەکانی پشت تابلۆکان، باس لە ژیان و خەباتی ئەوان دەکات، هەر بۆیەش بە چاوی ڕێزو پێزانینەوە، تەماشای تابلۆکانیان دەکرد.

چەند ڕۆژێک دوای گەیشتنی، لەسەر داوای ئەو، پێکەوە سەردانی هەریەک لە مام جەلال و نەوشیروان مستەمان کرد.

١٩٢. ساتر: ئەو کۆمەڵە گڵەیە کە بەدەوری سەربازگە یان ڕەبیەدا هەڵدەدرێتەوە..

مەدحەت، ئەلبومێکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. ئەلبومەکە، کۆمەڵێک وێنــەی گرتبووەخــۆی... وێنــەی کارە هونەرییەکانــی خــۆی، وێنەی ئەو پێشانگایانەی لە ئیسپانیا کردبونیەوە، وێنەی هەندێک شێوەکاری ئەوروپی کە سەردانی پێشانگاکانی ئەمیان کردبوو.

ئەلبومەکەی هەڵگرت و سەرەتا سەری مام جەلالماندا. هەرچەند دەمزانی ســتایلی هونەریی مەدحەت، ســتایلێک نیە مام جەلال حەزی لێبکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، جۆرێک لەسەرسامی بەرامبەر بە کارەکانی ناو ئەلبومەکە نیشــاندەدا. بــۆ مام جەلال گرنگ نەبــوو چێژ لەو کارانــە وەرگرێ یان نا، تاسەرســامی بۆی نیشــاندا... بــۆ ئەو، ئەوە گرنگ بوو کــە هونەرمەندێکی شــێوەکاری ناســراو، لــە ژێــر ئــاڵای یەکێتیــی نیشــتمانیی کوردســتاندا پێشمەرگەیە.

بەرلەوەش هەســتین، مام جەلال بەڵێنی بە مەدحەتدا، هەر پێویســتیەکی هونەریی هەبێت، یارمەتی دەدەن.

ئەو کاتەش نەوشیروان مســتەفا، بەدیقەتەوە، لاپەڕەکانی ئەلبوومەکەی هەڵدەدایەوە، مەدحەت پەلەی بوو، باری سەرنجی ئەویش بزانێ، بەتایبەتیش کــە ئەو، هەم لــە ئەوروپا ژیاوەو هەمیش لەمام جەلال زیاتر ســەروکاری لەگەڵ ئەدەب و هونەردا هەیە.

"ڕەنگــە ئەو کارانەی تۆ، بۆ خەڵک و شــوێنی خــۆی گرنگبن، بەڵام کوا لێرە پێشمەرگە لەو شێوازە هونەرییە تێئەگا."

ڕەنگە ئەو کۆمێنتە نەبووایە، کەمێک درەنگتر ماڵئاواییمان کردبا.

"ســەیرە، وادەزانن شــۆڕش هەر بە تەق و تۆق ئەکرێ... ئاخر شۆڕش چۆن ئاوا ئەکرێ! شۆڕشــێک حســاب بۆ هونەر نەکا، بۆ مرۆڤیشــی ناکا." مەدحەت لە ڕێگای گەڕانەوەدا و لە بەرخۆیەوە، وایووت.

مەدحەت پێی وابوو، بۆ شــۆڕش، چەکی هونەریش شان لەشانی تفەنگ دەدا. ئــەو، لــە شۆڕشــدا، هونــەری بە چەکــی خۆیدەزانی... هــەر بۆیەش ئەوەندەی پێشــمەرگەبوو، بــەلای تفەنگدا نەدەچــوو... هەرکاتێکیش، نۆرە ئێشکگریی شەوانەی ئەوبا، تفەنگی لە ئێشکگرەکەی پێش خۆی وەردەگرت... هەر کاتێکیش، لە نۆرە ئێشــکگرییەکەی ئەمدا، کەســێک بۆ بارەگاکەی ئێمە هاتبا، لەبری ئەوەی وەک هەر ئێشــکگرێکی دیکە، پڕ بەگەرووی لە کابرای خوڕیبــا."زەلالالالام کێێێێی؟"، بەدەنگێکی ناســک و ئارام دەیووت:"حەیاتم

کێـی؟" هەرئەوەنـدەش کابـرا وتبـای «خۆمانیـن»، ئیدی لەنـاوی نهێنی شەویشـی نەدەپرسـی و فەرمووی هاتنە ناو بارەگای لێدەکرد... چەندیش هەوڵمان لەگەڵیادا، "حەیاتم کێی؟" بگۆڕێ بە "زەلام کێی؟" ئێستا و ئەوساش بەگوێی نەکردین.

دوای ئـەوەی وڵاخەکان کەمێک حەسـانەوە، بارەکانمان بارکردەوەو تا وڵاخلوو نەوەسـتاین. لەوێشـەوە، کەلوپەلەکانمان خسـتە ناو عەرەبانەی ترەکتۆرێکـەوە، ئـاوا بـۆ یەکەمجـار دوای چەندیـن سـاڵ، پێیەکانمان لە ڕێکردندا، لە زەوی بڕان.

وەختێـک، کەلوپەلەکانمان لـە ترەکتۆرەکە دادەگرت، مـەلای مزگەوتی سەرگەڵوو، بانگی عەسرێی لە بڵندگۆی مزگەوتەوە پەخش دەکرد.

جاران، لە قۆناغی مێرمنداڵی و هەرزەکاریمدا، تاساڵی یەکەمی خوێندنی زانکۆشم، هەر ئەوەندە گوێم لە دەنگی بانگ بوایە، لە هەرجێیەک بام، خۆم دەگەیاندە مزگەوتێ. نوێژی جەماعەت و ناو مزگەوتێ، چەندین قات خێری نوێـژی دیکەی هەبێ، چۆن لەدەسـت خۆمی دەدەم. ئەو سـەردەمەی من نوێـژم دەکرد، بەدەگمەن گەنجانت دەبینین، سـەریان بخەنە سـەربەرماڵ. نـەک هەر هاوتەمەنـی من، گەورەش ئەوەندە گوێیان بـە نوێژو بە نوێژی جەماعەت و ناومزگەوت نەدەدا... لە هاویناندا، هەر ئەوەندە وەختی چوونە سـەرتووتنان دەهات، لە ناحیەیەکی گـەورەی وەک چوارقوڕنەدا، زۆرجار مەلا بەلەقەلەق، چل کەسی بۆ نوێژی جومعە پێخڕدەکرایەوە.

ئێسـتاش زەردەخەنەی ئـەو ڕۆژەی (مـەلا)م لەبەرچاوانە کە وەختێک منـی لـە ناو نوێژکەرانی تاکـە ڕیزی نوێژی هەینیدا بینـی... لە دڵی خۆمدا دەمووت دەبێت ئێستا، چەند ڕەحمەت بۆ باوکم بنێرێ و چەند دوعای زوو چاکبوونەوەشـی بـۆ بکات. ئاخر هەر دوعـای چاکبوونەوەش، منی تەمەن هەشـت نۆ سـاڵانیان بردە ناومزگەوتەوە. ئێسـتاش وەک ئەوسا لە بیرمە، لە پۆلی سـێ یان چواری سـەرەتایی بووم کە باوکم تووشی نەخۆشیەکی یەکجار سـەخت هـات. هەر بەتەواوەتـی کەنەفت و کەلەلابـوو[193] هەرچی دکتـۆر و حەکیـم و برینپێچـی ئەو نـاوە هەبوو، هێنامانە سـەری و هەر چـاک نەبۆوە. گووتبایـان دکتۆرێکی باش لە فلانەجـێ هەیە، خزمەکانمان دەیانگەیاندە لای... هەمووجارێکیش، بە کیسـەیەکی گەورەی پڕ لە دەرمان دەهاتەوە... هێندە حەب و دەرمانی خواردبوو، نەک هەر خۆی، ماڵەکەشمان بۆنـی دەرمانی گرتبوو. ئەو هەموو حەب و دەرمانەشـی دەخوارد، کەچی

١٩٣ـ کەلەلا: زۆر نەخۆش تا ئاستی لە جوڵەکەوتن.

ڕۆژ بــە ڕۆژ تەندروســتی بەرەوخراپتر دەچــوو. گووتیان دکتۆرێکی زۆر باش لە بەغدا هەیە، مام حوسێن ـ حوسێنی ماماغا ـ بردیە لای ئەو دکتۆرە بەناوبانگەی بەغدا.

"باشــترە بیبەنــەوە... بــا ئــەو چەنــد ڕۆژە کەمــەی ماوەیەتــی، لــە ناو ماڵومنداڵەکــەی خۆیــدا بەســەربەرێت." دکتۆرەکــە وای بە مام حوســێن گووتبوو

هەمــوو کــەس دەیزانی باوکــم دەمرێ، من نەبێ. من دڵــم دنیایەک بەو دەرمان نەنووســینەی دکتۆرەکەی بەغدا خۆشــبوو... ئەوەم بە نیشــانەی چاکبوونەوەی باوکم دەزانی. پێچەوانەی چاوەڕوانیی من، باوکم تا دەهات باریــی تەندروســتی ڕوو لە خراپی زیاتربوو... تــا وایلێهات چاوەکانی بە قووڵداچــوون و ئێســکەکانی ڕوومەتــی تەواو دەرپەڕین و ڕەنگیشــی لە بەهــێ زەردتــر هەڵگەڕا. هێندە بنێســا[194] بــوو، تاقەتی تێــدا نەمابوو... بە یارمەتــی دایــک و کاکم نەبان، توانای خۆجووڵاندیشــی نەمابوو. پشــتی لــە دەرمان و دکتۆر کردوو خۆی ڕادەســتی خــودا و دوعای چاکەکاران کرد. هەرچی دەهات نزای بۆ دەکرد... ناخۆشــترینی ئەو دوعایانەش لای مــن "خــوا ڕەحمی پێبــکات."... ئاخر مــن دەمزانی ئەو دوعایــە، تەنها بۆ ئەوانــە دەکرێ کە دەســت لە چاکبوونەوەیان دەشــۆرێ. لەناو یەکێک لە دوعاکەرەکانــدا، گوێم لێبوو پیرەژنێک دەیگوت: "عیلاجی دەردەداری هەر لە دەستی خوایدایە و دکتۆر و مکتۆر هیچیان لە دەستنایە."... یەکێکی تر لەو لاوە گووتی "ئاخر دوعاش ئەگەر نوێژکەر نەیکا، گیرا نابێ."... کەمێک وەســتاو وەک ئەوەی ڕووی قســەکەی لە من بێ، درێژەیدایە و گووتی: " خــودا گوێ لە دوعای هەموو کەســێکی دەگرێ، بــەڵام دوعای منداڵان لە هی گەوران، زووتر گیرادەبێ."... ئەو هێشــتا دەیویســت شــتی زیاتر بڵێ کــە مــن لە مــاڵ دەرپەڕیمە دەرێ... هاتمە دەرێ و هــەر بە ڕاکردن هەتا ژووری فەقێکانی مزگەوتێ ڕانەوەســتام. ئەو ڕۆژە هەتا خۆم فێری نزاو نوێــژان نەکــرد، نەگەڕامــەوە ماڵــێ.

هەمــووی چەند مانگێک بەســەر دوعــا و نوێژکردنی منــدا ڕەتنەبوون، باوکم هەســتایەوە ســەرپێیان. یەک دوومانگی دیکەو، وەک گوێزی ساغی لێهاتەوە. خۆ ڕەنگە من دوعا و نوێژشم نەکردبان، باوکم هەر چاکببایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دنیایەک دڵم بەو دوعا و نوێژانەی خۆم خۆشبوو.

ئەوکاتانــەی مــن نوێــژم دەکرد، نوێژکــردن، بە تایبەتیش بــۆ گەنجان،

١٩٤- بنێسابوو: بەهۆی نەخۆشییەوە لەڕ و لاواز ببوو.

نیشـــانەی دەســـت و دەم و داوێن پاکی بوو. ئەوکاتە دیانەت وەک ئێســـتا نەبوو. نازانم سیاســـەت وای لە دین کرد، یان ئەوکاتە، دیوە سیاســـیەکەی دینمان نەدیبوو.

هەموو ڕۆژێ ، پێنج جاران لە حوزوری خوادا دەوەستام.

وای کـــە وێنـــەی خەیاڵیـــی خوا، لە زەینی ئەوکاتەی مندا، چ ســـیحر و چ جوانیەکـــی هەبوو. وێنەیەک پڕپڕ لە میهرەبانی و مرۆڤ دۆســـتی و نەرم و نیانی و خۆشەویستی. هەر ئەوەندەش دەستم بە خوێندنەوەی کتێبە دینیەکان کرد، هەر لە قورئان و فەرموودەوە، تا دەگاتە مێژووی ئیسلام، هەمووشتێک لـــە نـــاخ و لە ڕۆحی مندا گـــۆڕان. هەر چەندەم دەکرد و دەکۆشـــا، ئەو وێنە جوانەی خوا لای من هەیبوو، لەگەڵ ئەو وێنەیەدا نەداهاتەوە کە ئەو کتێبانە نیشانیاندام.

ئاخـــر چـــۆن دەبـــێ خـــوا، بەوهەمـــوو خۆشەویســـتی و میهرەبانـــی و لێبوردەیـــی و بەزەییـــەوە، فەرمان بە کوشـــتنی مـــرۆڤ و بەتاڵانکردن و داگیرکردنی وڵاتان و بەســـەبایا گرتنی ژنان بدا... لەســـەر هیچ نا، لەسەر ئـــەوەی بیروباوەڕیان جیاوازە... مەگـــەر هەرخوا خۆی، ئێمەی بە جیاواز لە یەکتری درووســـت نەکردووە!

دین، وێنەیەکی دیکەی خودای نیشـــانی منـــدا... هەر بۆیەش، بۆ بەجوان هێشـــتنەوەی وێنەی خودا، چیدی لە کڵاوڕۆژنەی دینەوە، بەدوای تیرۆژی نوری خودادا نەگەڕام.

بەرگەڵوو، هەمووی ٣-٤ کیلۆمەترێک، لەڕەبیەکانی سـەر زنجیرە چیای چەرماوەنـدو، ٤-٥ کیلۆمەتریـش، لەسـەربازگەی شـەدەڵەوە دووربـوو. سـەرباری ئەو نزیکیەشـی لـە دوژمنـەوە، هەڵکەوتـە تۆپۆگرافیەکەی، لە شوێنەکانی پێشوومان زیاتر، هەستی ئەمان و دڵنیایی دەداینێ.

ئەو چەند خانووە قوڕەی دامێنی دۆڵەکەمان ئاوەدانکردنەوە کە لە دوای لێدانی لەشکری ئیسلامیەوە، بە چۆڵی مابوونەوە.

گۆڕایی قەدپاڵی شـاخە قووچیشـمان، بۆ کەرتی پارێزگاری و شـوێنی پەخشی ڕادیۆ هەڵبژارد.

باریکـە ڕێیەکـی پێچاوپێچ، بەنـاو گەلییەکی کووڕی بەدارسـتان چڕ و بەلووتکـە شـاخی بەرز بـەرز دەورەگیـراو، بەرگەڵوو بەسـەرگەڵووەوە دەبەسـتێتەوە. لەو ناوەڕاسـتی ئەو باریکە ڕێیەدا، پـردە دارینەیەک، وەک ئەوەی لە ڕەشبەڵەکێکی بەجۆشدابێ، دەستێکی لە دەستی ئەمبەری چەم و دەستەکەی تریشی لە دەستی ئەوبەری چەمدایە... بەدەم مۆسیقای خووڕەو قەڵبـەزەی چەمەوە، لەگەڵ پەڕینەوەی هـەر ڕێبوارێکدا، جالەکان[١٩٥] نەرمە سەماو لەرزەیەکی بۆ دەکەن.

لە ناوەڕاست و بە دەستەچەپی ئەو باریکەڕێیەشدا، ئەشکەوتێکی چکۆلە، بیرەوەرییەکانـی بەهائولای لەناوخۆیدا هەڵگرتووە. بەهائولا، دامەزرێنەری ئایینی بەهائی [١٩٦] ، لە ناوەڕاسـتی سەدەی نۆزدەیەمدا، لە ئێران دەگیرێ و

١٩٥ـ جالە: دارو تەختەی ڕایەڵەکراوی سەر پرد.

١٩٦- ئایینی بەهائی، بە نوێترین ئایینە گەورەکانی دنیا لە قەڵەم دەدرێ. هەروا بە خێراترین ئایینی گەشەکردووی ئەو سەدو هەفتا ساڵەی دوایی دادەنرێ. ئایینی بەهائی، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، لە ئێران سەری هەڵداوەو لە ئێستادا، ژمارەیان بە ٨ – ١٠ ملیۆن دەخەملێنرێ.... لە ٢٠٠ وولاتی دنیادا هەن.(کتێبی ئەقدەس) کتێبی پیرۆزی بەهائیەکانە. پرنسیپە بنچینەییەکانی ئەم ئایینە کە لەو کتێبەدا خراوەنە ڕوو، بریتین لە:

یەکێتی خودا، یەکێتی دین و یەکێتی مرۆڤەکان.

خوا، خولقێنەری هەموو کەون و بوونەوەرێکە. خوا سەرچاوەی هەموو ئاینە گەورەکانە. ئایینی یەهودی، کریستیان، زەردەشتی، ئیسلام، بودایی و کریشنەیی، هەر هەموویان

دواتــر بۆ دەرەوەی ئێران نەفی دەکرێ. لەوێوە تا ئەو ڕۆژەی کۆچیدوایی دەکا، هەموو ژیانی لە تاراوگەو لە دەستبەســەریدا بەســەردەبا. ساڵانێک لە بەغداو، چەند ساڵێک لە تورکیا، ساڵانێکی زۆرتریش لە فەلەستین. هەر لــەو ســاڵانەدا کە لە بەغدا دەبێــت، لە نیســـانی ١٨٥٤دا، بەدزییەوە بەغدا جێدێڵێ و ڕوو لە چیاکانی کوردستان دەکات. بۆ دوو ساڵ، ئەو ئەشکەوتە دەکاتــە خەڵووەتگەی خــۆی... هەر لەناو ئەو ئەشــکەوتەدا، ژمارەیەک لە کتێبــە ئاینیە گرنگەکانی دەنووســێ. هەر بۆیەش ئەو ئەشــکەوتە، یەک لە شــوێنە پیرۆزەکانی بەهائیەکانی دنیایە. هەر ئەوەندەش کەوتیە سەرووی ئەشــکەوتەوە، ڕێــک لەو شــوێنەدا کــە باریکە ڕێیەکە بەلای ڕاســتدا پێچ دەکاتەوە، درەختە گەڵا ڕەونەقدارەکان لە پێشــوازیتا وەستاون. کە بەناو ڕیــزە دارەکانــدا ڕەتدەبی، بۆنی عەتــری گەڵاکان، ناخت پــڕ لە بەرامەی جۆراوجــۆر دەکــەن. من تا ئــەو کاتەی بەپاڵ ئەو دارانــەدا و بەو باریکە ڕێیــەدا هەڵنەگــەڕام، نەمدەزانی بۆنی گەڵای هیچ درەختێ، لە بۆنی گەڵای درەختێکی دیکە ناچێ. بەر لەوەی بووکی ئاواییش تارا لەسەر ڕووی خۆی لادا، پەڵــە ڕەزی قەدپاڵــی بەرزاییەکانــی دەوری دێ، وێنەیەکت لە جوانی بەهەشت دەدەنێ. بەدەم چاوپڕکردن لە جوانیی دیمەن و، گوێ ڕادێران بۆ مۆســیقای لەرینەوەی گەڵای سپیدارکانی ئەملاوئەولای ڕێ، لەگەڵ باوەش پێداکردنی ئەو هەوا فێنکەی لەسەری پیرەمەگروونەوە، بەلا شانی هەلاج و دابانا دێتەخوارێ، دەگەیتە بەردەم، یەکەم ڕیزە ماڵی سەرگەڵوو.

---

ئایینی یەک خودان... خوا ئەو ئایینانەی لەسەردەمی جیاجیادا، بەگوێرەی سروشت و پێداویستیەکانی ئەو سەردەمانە، لە ڕێی پێغەمبەرانەوە، بۆ مرۆڤایەتی ناردووە. هەر بۆیەش، مرۆڤەکان بە هەموو جیاوازییەکانیانەوە، یەکسانن و، خودا فەزڵی هیچ ئایین و هیچ کەس و قەومێک، بەسەر ئەوانی تردا نادا.

بەهائیەکان بروای تەواویان بەوە هەیە کە دەبێ:

- ژن و پیاو یەکسان بن.
- ئاشتی لە هەموو جیهاندا بەرقەراربێ.
- دادی کۆمەڵایەتی جێی نابەرامبەریەکانی ناو کۆمەڵ بگرێتەوە.
- جیاوازی نێوان زۆر دەوڵەمەندیی و زۆر هەژاریی کەمبکرێتەوە.

بەهائیەکان، کارکردن و خزمەتکردنی کۆمەڵگا، بە شێوەیەک لە شێوەکانی خوداپەرستی دەزانن.

لە ئایینی بەهائیدا، خورافیات و موعجیزەی پێغەمبەران و فرشتەو جنۆکە وجوودیان نیە. بەهەشت و جەهەنەمیش تەنها و جودێکی ڕوحیان هەیەو، نزیکی و دووریی مرۆڤەکان لە خودا بەیان دەکەن، دەنا هیچ وجوودێکی فیزیکیان نیە.

ریزه ماڵێک که پشتاوپشــت، پیشـەی ئاسنگەرییان بۆ ماوەتەوە. هەرچی پێداویستی جووتیارانی ئەو ناوچەیەو زۆر شوێنی تریش هەیە، لە ئامێر و کەرەسەی کشتوکاڵی، وەک داس، تەوراس، بیور، پیشک، تەشوێ، چەکوش، پێمەڕڕە، گاســن، ســوژن کاش[197]، شیشــی توتن پێوەکردن و تا مقاش و مقەڵەیش، لەو دێیەداو بەدەســتی ئاسنگەرانی ســەرگەڵوو دابین دەکرێن. چەند شــەقاوێک واوەتر، ئەو دووســێ دووکانە دێنە بەردەمت کە وێڕای کۆکردنــەوەی قەرەباڵغــی ئێوارانی دێ، هەموو پێداویســتیەکانی خەڵک و ئێمەشیان تێدا چنگ دەکەوێ. سەرگەڵوو، هەر بۆ خۆی دێیەکی زیندووە... هاتنی ئێمەو بەر لە ئێمەش، لێرەبوونی بارەگاکانی مەڵبەندی دوو، جووڵەو ژیانــی زیاتریــان داوەتێ... هەر بۆیــەش، هەبوونــی ئەنجوومەنی ئاوایی لەســەرگەڵوودا، لە چاو هەر دێیەکی تردا، گرنگیەکی زۆری هەیە.

ســەرووی ســاڵێک دەبــوو، ئەنجوومەنی ئاواییــەکان، لــە زۆر دێهاتی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا پێکهێنرابوون... یەکەم ئەنجوومەنیش کە دامــەزرا، ئەنجوومەنی ئاوایی ســەرگەڵووبوو. ڕەنگە ئەوپێشــەنگیەش لەبەرئەوە بووبێ کە سەرگەڵوو، قەت دەسەڵاتی ئاغاو دەرەبەگی بەخۆیەوە نەدیــوەو، ژیانی خەڵکی هەر لــە ڕێی کاری زبــارەوە[198] ڕێکخراوە. هەروا لەبەر ئەوەش، پێشنیاری دروســتکردنی ئەو ئەنجوومەنانە، لەلایەن شێخ عوســمانی شێخ حەســنی ســەرگەڵوو[199]ەوە، خرابووە بەردەم مام جەلال.

---

١٩٧ـ کاش: شیشی گۆشتبرژاندن.

١٩٨ـ زبارە: هەرەوەز.

١٩٩ – وەک مام جەلال دەیگووت، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا، لەسەر پێشنیاری ئەم، کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، بڕیاری دروستکردنی ئەنجوومەنی گوندەکانیاندا. لە ژمارەیەک گوندا و لە ڕێی هەڵبژاردن یان دەستنیشانکردنەوە، ئەو ئەنجوومەنانە دامەزران. ئەو ئەنجوومەنانە، کاروباری خەڵکی ئەو گوندانەیان بەڕێوەدەبرد کە لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش دابوون.

. ئەنجوومەنی ئاواییەکان، ئەزموونێکی سەرەتایی دیموکراسی بوون... کاری سەرەکیان، بەڕێوەبردن و ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکانی خەڵک و چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانیان بوو. لەپاڵ ئەمەشدا، ئاسانکاریی زۆریشیان بۆ پێشمەرگەو بۆ دامودەزگاکانی شۆڕش دەکرد... ئەندامانی ئەنجوومەن، لە سەرەتادا بەشێوەیەکی دیموکراتیانە و لە ڕێی دەنگدانەوە هەڵدەبژێردران... دواتر وورده وورده بەرپرسانی سیاسی و پێشمەرگەیی، دەستیان خستە ناو کاروبارەکانیان و تەنانەت ناو هەڵبژاردنەکانیشیانەوە.

لە هەندێ شوێن، بەرپرسەکان خۆیان لستی کاندیدەکانیان ئامادە دەکرد... لە هەندێ شوێنی تر، هەر خۆشیان ئەندامەکانیان دەستنیشان دەکرد. ئەوەی وەک ڕەخنە ئاراستەی ئەو ئەزموونە دیموکراتیەی ئەو ئەنجوومەنانە دەکرا:

. نەبوونی پەیڕەوێکی ناوخۆ کە ئەرک و ماف و دەسەڵاتەکانی ئەندامانی ئەنجوومەن و

مام جەلالیش بەگەڕانەوە بۆ ئەزموونی ئەنجوومەنی گوندەکانی سەردەمی شۆڕشی ئەیلول، پێشنیارەکەی لاباش دەبێ و دەیخاتە بەردەم سەرکردایەتی یەکێتی... سەر کردایەتیش ڕەزامەندی لەسەر درووستکردنیان دەردەبڕێ.

تا ئــەو کاتەش ئێمە هاتینە بەرگەڵوو، ئەنجوومەنی ئاوایی ســەرگەڵوو، هــەر کارا و چالاک بوو... لە دۆزینەوەی شــوێنی بارەگاو دامەزراندنماندا، هاوکاری باشیان کردین.

ئەو ڕۆژەی گەیشــتینە بەرگەڵوو، دوای پشوویەکی کورت و بەرلەوەش خۆر کڵافەی تیشکەکانی هەڵکاتەوە، لەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەندا، چوومە سەرگەڵوو. چوونەکەم، بۆ سەردانی هەندێ هاوڕێم بوو، بەتایبەتیش شێخ محەمەد و دکتۆر فایەق.

شــێخ محەمــەدی ســەرگەڵوو، ئەو کاتــە ئەندامی مەڵبەند و بەرپرســی کاروباری کۆمەڵایەتی بوو... دکتۆر فایەقیش، تاکە دکتۆری خەســتەخانەی شۆڕش بوو لەسەر گەڵوو.

فایەق و من، لە پۆلی شەشــی ئامادەییەوە هاوڕێ بووین. هەردووکمان، لە زیرەکترین قوتابیەکانی پۆلی شەشــی ئامادەیی هەڵکەوت بووین. باوکی فایەق، حەمە گوڵپی، یەک لە پێشمەرگە ئازاکانی شۆرشی ئەیلوول بوو. لە ســەرەتای شۆڕشــدا و لە کاتی بەرگرتن بە هێرشــێکی سوپای عێراقی، لە چەمی زەڵم، دوای ئەوەی فیشــەکی پێنامێنێ، بەخەنجەر هەڵدەکوتێتە سەر دەبابەیەک... لەو کاتەدا ئامبازی ســەربازی سەر دۆشکەی دەبابەکە دەبێ، دەبابەیەکی تر لە دواوە شەهیدی دەکات. هەر ئەو کاتەی ناسیم، شتێک لەو بێباکی و حەماسەت و سەرکێشیی حەمە گوڵپیم لە فایەقدا دەبینی.

---

ژمارەو وادەی کارکردنیان دیاری بکات.

- تێکڕای ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنانە پیاوبوون... ژن نەک هەر ئەندام نەبوون، بەڵکو لە پرۆسەی دەنگدانیشدا بەشدارنەبوون. ئەوە لە کاتێکدا چل ساڵ لەوەوبەر، هەر لە دێهاتەکانی دەوروبەری سەرگەڵووداو، لەسەردەمی پەرەسەندنی ئەزموونی بزووتنەوەی هەقەدا، ژن نەک هەر بەشداری دەنگدانی کردوە، بەڵکو بەسەرتەکیەش هەڵبژێردراوە. دواجار، لە ئەنجامی دەستێوەردانی حیزبی و، نەبوونی تێگەیشتن و هۆشیاریی پێوست، لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو ئەنجوومەنانەداو، نەبوونی هێزێکی مادیش، بۆ سەپاندنی ئەو بڕیارانەی دەریاندەکردن و هۆکاری دیکەش، وایانکرد ئەنجوومەنی ئاواییەکان، نەتوانن ئەو ئەزموونە سەرەتاییە دیموکراسیە بپارێزن و لەوە زیاتر درێژەی پێبدەن.

خەسـتەخانە کەوتبـووە دەرەوەی دێ. لەوکاتەدا، بـەلای مزگەوتەکەدا، بەرەو خەسـتەخانە دەچووم، دکتۆر فایەق و دووپێشمەرگەش، بەرەو ناو دێ دەهاتن. هێشتا بەتەواوەتی سلاو و چاکوچۆنیمان نەکردبوو، بەدەنگێکی پڕلە ناسۆرەوە پێی ووتم"لە کاتێکی خراپدا هاتی... ئەوە کلیلی خەستەخانە... بچۆ جارێ لەوێ ئیسـراحەت کە، تابزانین من چیم بەسەر دێ." هێشتا من هیچم نەوتووە، ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت.

- ئەگەر بشلێی ئەی بۆ خۆت بۆ کوێ دەچی... ئەوەتا ئەو دوو پێشمەرگە بەڕێزە، بۆ زیندانم دەبەن.

- «یانی چی؟!» خەستەخانەیەک، یەک تاکە دکتۆری هەبێ و ئەویش ئاوا بەرنـە زینـدان!! لە دڵی خۆمدا وام بەخۆم ووت. بەرلەوەی لە هۆکاری ئەو حاڵەتە بپرسم، ووتم:

- ئـەی ئەگەر تـۆ بەرنە زیندان، کێ لە جێی تۆ چارەسـەری نەخۆش و بریندار دەکات؟

- دکتۆر عەلی بچکۆل.

عەلـی بچکـۆل، دکتۆرنەبـوو، ئـەو خوێندەواریە کەمەی هەشـیبوو، لە زیندانی بەعسـدا فێری ببوو. ئەندامی سـەرکردایەتی کۆمەڵەو بەرپرسـی مەڵبەنـدی دووی یەکێتـی بـوو... لەسـەر مەسـەلەیەکی پەیوەندیـدار بە کاروباری خەسـتەخانەوە، لەگەڵ دکتۆر فایەقدا لێکهەڵدەبەزنەوە، قسەیەک لەم و قسـەیەک لەو، دەبێتە دەنگەدەنگ و دەمەقاڵێیان. لە شـوێنێکدا، عەلی بچکۆل لەقسەیەکی دکتۆر فایەق هەڵدەچێ و پێی دەڵێ:

- لەوە زیاتر قسەبکەی، لەبەرچاوی خەڵکی ئەم دێیە، دەتکەم بە سینەما.

- منیـش دەتکـەم بە تەلەفزیـۆن، دکتۆر فایەق وا وەلامـی عەلی بچکۆل دەداتەوە.

لەو کاتەدا کە من خەریکی هێنان و بردنی ئەو هاوکێشـە لاسەنگەبووم، دکتۆر فایەق ووتی:

- هەڤـاڵ، تـۆ لەوەگـەڕێ، پێم بڵێ، کامیـان خەڵک زیاتر سـەیری دەکا، سینەما یان تەلەفزیۆن؟

ئەگەرچــی، ئــەو کاتە کێشــەی ســینەما و تەلەفزیۆنەکــەم نەدەزانی و لەڕاستیدا هەر پرسیارەکەشم لا سەیربوو، بەڵام وەک وەڵامێک ووتم:

- دیارە تەلەفزیۆن.

مــن ئــەوەم ووت و دکتــۆر فایەق، ســەرباری ئەو حاڵــەی تێدابوو، بە هەموو هێزی خۆیەوە، دایە قاقای پێکەنین و ووتی:

- کەواتە من براوەم.

لەو کاتەوە هاتینە بەرگەڵوو، گۆڕانێکی دیار، بەســەر ژیان و گوزەرانی خۆمان و، گۆڕانی زیاتریش بەســەر چۆنایەتــی و چەندایەتی بەرنامەکانی ڕادیۆداهات. لەو ماوەیەدا، ڕادیۆ بووبە ڕادیۆیەکی جەماوەریی و خەڵکێکی زۆر لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، لە شاروشاخ، گوێیان لێدەگرت.

مــن خۆم کە هاتمە ڕادیۆ، وەک هەمــوو ئەوانەی پێش من لەوێ بوون، هیچ شــارەزاییەکم لە ڕادیۆدا نەبوو. مەبەســتم لایەنە میدیاییەکەیەتی نەک لایەنی تر.

لەهاتنــە دەرەوەمــەوە تا ئەو کاتــەش هەر لە ڕاگەیاندنــدا کارم کردوە. ئەو شــتانەش کە تا ئەو کاتە دەمنووسین، هەر بۆ ئەو ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوانە بوون کە لە شاخ دەرماندەکردن... بەڵام دیارە نووسین بۆ ڕادیۆ، لە نووســین بۆ گۆڤــارو ڕۆژنامە زۆر جیاوازە. لەگەڵ ئەو جیاوازیەشــدا. بەرچاوم ڕوون بوو کە:

* ئەوەی بۆ ڕادیۆ دەنووسرێ، دەبێ بەزمانێکی سادەو شەفاف و هەست بزوێن دەرببڕدرێ... زمانێکی بێ گرێ و گۆڵ و ڕاستەوخۆ. زمانێک، لەگەڵ گوێ لێبوونیدا، ســەرباری خشەخشــی تەشــویش، دەبێ گوێگر بە ئاسانی لێی حاڵی بێت.

* بە شــێوازێکی وا بنووســرێ، کاریگەریی قووڵ و ڕاستەوخۆ، لەسەر گوێگر دانێ.

* بەشــێوەیەکی ڕاســتگۆیانە، بــە دیقــەت و هاوســەنگیەوە، هــەواڵ و زانیارییەکان بۆ خەڵک بگوازێتەوە.

* بابەتــەکان، پەیوەندیــان بــە ژیان و خواســت و موعاناتــی ڕۆژانەی خەڵکەوە هەبێ.

* ڕای گشــتی بۆ ئەو مەســەلە و بابەتانە درووســتکات کە دەیانخەینە ڕوو.

لەپاڵ ئەو بەرچاوڕوونیەی من و لەبەرچاوگرتنی ئەو بنەما سەرەکیانەدا، کۆمەڵێک هۆکاری تریش، ڕۆڵیان لە باشکردنی ئاست و لەبەرەوپێشەوەچوونی ڕادیۆدا هەبوو، لەوانە:

* نزیکبوونەوەمان لە شارەکان، بەتایبەتیش لە شاری سلێمانی کە هەمووی پەنجا کیلۆمەترێک دوور دەبوو. ئەو نزیکیەش وایدەکرد، زانیاری و هەواڵی گەرماوگەرممان پێبگەن و کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاریشمان ئاسانتر لە جاران دەستکەون.

* هەبوونی چەند هاوڕێیەک، لەناو ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شارەکاندا، کە لە ڕێی پەیوەندی شەخسیەوە ڕۆڵی پەیامنێریان، لە ناردنی هەواڵ و زانیاریدا دەبینی.

* نزیکی و پەیوەندی بەردەوام و ڕاستەوخۆمان، لەگەڵ سەرکردایەتیدا، بەتایبەتیش لەگەڵ مام جەلال و نەوشیروان مستەفادا. ئەمەش وایدەکرد، ڕێنمایی و زانیاری ورد و گرنگمان لەبەردەستدابن.

* هەڵبەتە لە پاڵ ئەمانەشدا، بەپێزی و زیندوویی نووسین و بەرنامەکان و، کاریگەریی دەنگی بێژەرەکان، بەتایبەتیش دەنگی زوڵاڵی فەرهاد سەنگاوی و هیمەت و ماندووبوونی زۆری ئەندازیار و تەکنیکارەکان، بەتایبەتیش پشتیوان و ڕەنجە و ڕێبوار، ڕۆڵی خۆیان هەبوو. گرنگی کاری ئەندازیارەکان لەوەدابوو کە بەرنامەکانی ڕادیۆیان، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا بڵاودەکردەوە و زیرەکانەش پەخشەکەیان لەو تەشویشە لادەدا کە ڕژێم بەردەوام دەیخستە سەر شەپۆلەکانی بڵاوکردنەوە.

هەر لەوماوەیەشدابوو، کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی، لە ناوچەی خۆشناوەتی بەڕێوەچوو. لەو کۆبوونەوەیەدا:

* بڕیاردرا ناوی ڕادیۆ، لە (دەنگی شۆڕشی عێراق)وە بۆ (دەنگی گەلی کوردستان) بگۆڕدرێ.

* دروشمی(دیموکراسی بۆ عێراق و مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کوردستان) جێی دروشمی(دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان)ی گرتەوە.

* دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کرا بە مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. ئەرسەلان بایز بە

بەرپــرس و هەریــەک لــە یوســف زۆزانی و منیــش بە ئەندامــی مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندن هەڵبژێردراین. بەو پێیەش مەکتەبی ڕاگەیاندن، لەبەشی چاپەمەنیــەکان و لە ڕادیۆ پێکدەهات، یەکێکمان (لە من و یوســف زۆزانی) دەبووینە بەرپرســی چاپەمەنیەکان و ئەوی تریشــمان دەبووە بەرپرســی ڕادیۆ. ئەگەرچی ئەو کاتە، قورسایی نووسینەکانی رادیۆ لەسەر من بوو، مەبەســتم لەو نووسینانەیە کە بە زاراوەی سۆرانی دەنووسران[٢٠٠]، بەڵام ئەرسەلان حەزی دەکرد، من بچمە بەشی چاپەمەنیەکان و یوسف زۆزانیش لــە ڕادیۆ بمێنێتەوە... بیانووەکەش ئەوەبوو کە مادام من سەرنووســەری (ڕێبازی نوێ)م و ڕێبازی نوێش، ســەربە بەشــی چاپەمەنیەکانە، باشترە مــن لــە چاپەمەنیەکانبم. من ئەوەم قبوڵ نەکــرد. دواتریش کە لەگەڵ مام جەلال و نەوشیروان مستەفاشدا قسەم کرد، ئەوانیش ڕایان وابوو کە من وەک بەرپرســی ڕادیۆ بمێنمەوە.

ئیتر بەو شێوەیە، هەرسێکمان هەر لە ڕادیۆ ماینەوە و کارەکانمان وەک مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندن بەڕێوەدەبردن.

من ئەندامی مەکتەبی ڕاگەیاندبام یان نەبام، هەر بەهەمان ووزەو تواناوە کارەکانــی خۆمــم دەکــردن. ئەوکاتە هەم زۆربــەی ووتارە سیاســیەکانم دەنووســین و هــەم ئەرکــی نووســین و ئامادەکردنی چەنــد بەرنامەیەکی هەفتانەشم لە ئەستۆبوو، وەک بەرنامەی لە سەنگەری ئەدەبەوە، سەردانێکی دێهاتە ڕاگوێزراوەکان و بەرنامەی فەرهەنگی سیاسیی.

شێرکۆ بێکەس کە دواتر و لە ساڵی ١٩٨٥دا هاتە ڕادیۆو ماوەیەکی زۆر پێکەوە لە یەک ژووردا دەژیاین، لە لاپەڕەی ١٥٤ کتێبی ٩٥٥ دەقیقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەسدا، دەڵێ:

---

٢٠٠- ئەرسەلان و من، بۆ بەشە سۆرانیەکەی ڕادیۆمان دەنووسی. یوسف زۆزانی، هەم بۆ کرمانجی سەروو، هەمیش بۆ عەرەبی. فەرید ئەسەسەرد، بۆ بەشی زمانی عەرەبی. ئەبو شەهاب(فائز یونس) کە خۆی هەر عەرەب بوو، بۆ بەشی عەرەبی دەنووسی. ئازاد چالاک، هەم بێژەری زمانی عەرەبی بوو، هەمیش بەشداری لە نووسینە عەرەبیەکاندا دەکرد. سەربەست حسێن، بەرنامەیەکی ئامادە دەکرد و جارجارەش شتی دەنووسی. فەرهاد سەنگاوی و فەرهادی مەلا ڕەسوڵ، بێژەری بەشی سۆرانی بوون و هەواڵیان ئامادەدەکرد و نووسین بەرنامەشیان هەبوو. هەریەک لە (زێرەڤان و خالد دۆسکی)یش، بێژەری شێوەزمانی کرمانجی بوون.

"مـــن ماوەیەکی زۆر لەگەڵ هەڤاڵ لەو ژوورە مامەوە، هەڤاڵ ئەوکاتانە، یەکێک بوو لە نووســـەرە هـــەرە چالاکەکانی ئەو ڕۆژانەی ئیســـتگەکە. من باوەڕم وایە، ئەگەر لەو ماوەیەدا ۲۰۰ دووسەد ووتار نووسرابێت، سەدی زیاتر(هەڤاڵ کوێستانی) نووسیوویەتی."

ئـــەو وتارە سیاســـیانەی بۆ ڕادیۆ دەمنووســـین، لە نێوان دوو بۆ ســـێ لاپـــەڕەی فولســـکاب دەبوون. جارهەبـــوو هەندێک لەو ووتارانـــە، بە چەند ئەڵقەیـــەک بڵاودەکرانەوە، دواتریش لە شـــێوەی نامیلکەدا، چاپ و بڵاومان دەکردنەوە. یەکێک لەو وتارانە، وتارێکی پێنج ئەڵقەیی بوو، لەسەر ئەدەبی بەرەنگاری و هەڵوێســـتی نووســـەران کە دژ بە بڕیاری هەڵوەشـــاندنەوەی یەکێتی نووسەرانی کورد وەستابوونەوە.

دەبـــێ ئـــەوەش بڵێـــم، ئەو ووتـــارە و هەموو ئـــەو نووســـینانەی تریش کـــە لە ڕادیـــو و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیشـــدا بڵاومـــان دەکردنەوە، ناوی خۆمانیان لەســـەر نەبوو، هەر بەناوی یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتانەوە بڵاودەکرانەوە.

## ٦٢

"لە تاریک و ڕوونی دوێنێ بەیانیدا، سەربازێکی زۆر، دەوری هەردوو ئۆردووگای بەحرکە و قوشتەپەیان گرت.

خەڵکی ناو ئەو دوو ئۆردووگایە، هەر لەو ساڵەدا(١٩٧٨) کە سیاسەتی ڕاگواستنی دێهاتە سنوورییەکانی تێدا بەڕێوەچوو، لە دێهاتەکانی ناوچەی بارزانەوە هێنرابوون. وەک لە دواییدا زانیمان، ئەو هێزە تایبەتیە، سەر بەگاردی کۆماری بوون... هەر ئەو شەوەش لە بەغداوە، بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە جووڵێندرابوون.

لە ماوەی چەند کاژێرێکی کەمدا، منداڵی لێدەرکەی، نێرینەیان لەو دوو ئۆردووگایەدا نەهێشتووەو هەر هەموویان بەرەوشوێنی نادیار ڕاپێچ کردوون. تا ئێستاش کەس نازانێ بۆ کوێ براون و لەسەرچی ئەو تاوانەیان دەرهەق کراوە. ئێستا جگە لە ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە، ئەوەی پێی بڵێی نێرینە، لەو دوو ئۆردووگایەدا نەماوە..."

ئەمە بەشێکە لەو ڕاپۆرتە هەواڵەی، مامۆستا (ئاواز ڕەسوڵ)[٢٠١]، پەیامنێری نهێنیمان لەناو شارەوە، بۆی ناردووین.

گەرچی هۆکاری ئەنجامدانی ئەو تاوانەمان لا ڕوون نەبوو، بەڵام بەدووریشمان نەدەزانی، پەیوەندی بە ئۆپەراسیۆنی گرتنی ناوچەی حاجی هۆمەرانەوە هەبێ... ئەو ئۆپەراسیۆنە هاوبەشەی نێوان سپای پاسدارانی ئێرانی و هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە ژێر ناوی (نەسری یەک و نەسری دوو)دا لە ناوچەی حاجی هۆمەران بەڕێوەچوو، پاساوی جینۆسایدی بارزانیەکانی ئەو دوو ئۆردوگایەی دایە دەستی ڕژێمی عێراق.

---

٢٠١ - مامۆستا ئاواز ڕەسوڵ، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی مەرگەو ئەندامی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەبوو. یەک لەو ژنە چالاک و نەترس و دڵسۆزانە بوو کەسەرباری کاروبارەکانی ڕێکخستنی، یەک لە پەیامنێرە چالاکە نهێنیەکانی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانیش بوو، لەو ماوەی کارکردنی من لە ڕادیۆدا، چەندین ڕاپۆرت و هەواڵی ووردو گرنگی بۆ ناردین.

ئێمــە، هەر لەســەرەتای ڕاگواســتنی خەڵکــی دێهاتە ســنوورییەکان و خڕکردنەوەیــان لــە نــاو ئــۆردووگا زۆرە ملێکاندا، دەمــان ووت،" ڕژێم دەیەوێ، کەی ویستی، خەڵکی ناو ئەو ئۆردووگا زۆرە ملێیانە، وەک بارمتە بەکاربێنێ." ئەنجامدانی ئەو تاوانەشمان، هەر بە بەشێک لەو سیاسەتی بە بارمتە گرتنە دەزانی. پێشمانوابوو، ڕژێم دەیەوێ بەوکارەی گوشار بخاتە سەر پارتی و لەو چالاکی و ئۆپەراسیۆنە هاوبەشانەی بوەستێنێ کە لەگەڵ ئەرتەش و سپای پاسدارانی ئێرانیدا ئەنجامیدەدان.

بۆ چەند هەفتەیەک، چارەنووســی ئەو هەشــت هەزار بارزانیە سڤیلانە، بەنادیاری مایەوە... تا ئەو ڕۆژەی، مانگێک دواتر، سەدام حوسەین، لەسەر تەلەفزیۆن ووتی:"ڕەوانەی جەهەننەممان کردن."

ئــەو تاوانەی کە دەرهەق بەمانکرا، تەنها بەهۆی بارزانیبوونیانەوە بوو، هیچی تر نا... دەنا وەک دەوترا ئەوان لەگەڵ ماڵی مەلا مســتەفادا، کۆک و تەباش نەبوون، تا بگاتە ئەوەی پەیوەندیان بەو ئۆپەراســیۆنە هاوبەشــەی پارتی و ئێرانەوە هەبێت.

بەدرێژایــی خەباتــی چەکداریــی میللەتی کــورد، دژ بە رژێمــە یەک لە دوای یەکەکانــی عێــراق، هیــچ کام لەو رژێمانە، تاوانی ئــاوا گەورەیان دژ بەگەلەکەمان ئەنجام نەدابوو.

کارەســاتێکی مرۆیــی گــەورە، بەهەمــوو پێــوەرەکان، لە ئاســتی هەر کارەساتێکی تری گەورەی جیهانیدا بوو کە بەسەر نەتەوەیەک هاتبێ، کەچی یەک تاکە وولاتی دنیاش، بە دیموکراتی و سۆشیالســتیەوە، بە ئیسلامی و بــە دینەکانی دیکەوە، بۆ یــەک چرکەش، پێڵــووە داخراوەکانی چاویان، لە ئاستیدا نەکردەوە.

جیهان، لەبەرامبەر ئەو کارەساتە نەتەوەییەی ئێمەدا خەوت و، ئێمەش، بە یەکێتی و بە پارتیشەوە، سەری خۆمان بردە ناو قاپێلکەوە[٢٠٢] و هیچی وامان بــۆ بەخەبەرهێنانەوەیان نەکرد... بەرۆکی هیــچ وولات و هیچ دەزگایەکی نێونەتەوەییمــان ڕانەوەشــاند... لە فرمێســک هەڵڕشــتن بەولاوە، شــتێکی دیکەمــان بۆیان نەکرد. ئــەوەی ئێمە لە ڕێی ڕاگەیاندنــەوە کردمان، بەقەد ئەوەی ڕژێمی بەعسمان، لە ئەنجامدانی ئەو وەحشەتگەرییە تاوانباردەکرد، بەقەد ئەوەو زیاتریش، هەوڵمان دەدا بەرپرسیارێتی ئەو تراژیدیایە، بخەینە ئەســتۆی سەرانی پارتی و ماڵی بارزانی. ئێمە دەمانووت، "ئەگەر پارتی لە

٢٠٢- قاپێلک: قاوغی کیسەڵ و هێلکەشەیتانۆکەو هتد.

داگیرکردنی حاجی هۆمەراندا، دەستی سپای ئێرانی نەگرتبایە و چاوساغی بۆ پاسداران نەکردایە، ڕەنگە ئەو بیانووە دەست سەدام حوسەین نەوکەوتایە، تاوانێک بەو قەوارەیە دژ بە میللەتەکەمان ئەنجامبدات."

هەر بۆ زیاتر دەرخستنی وابەستەیی سەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، هەموو ئەو چالاکی و شەڕە هاوبەشانەی نێوان پارتی و هێزەکانی کۆماری ئیسلامیمان وەبیر خەڵک دەهێنایەوە کە دژ بە شۆڕشگێڕانی نەتەوەکەمان، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا و لەو چەند ساڵی ڕابردوودا ئەنجامیان دابوون.

ئێمە، ئەو کارەی پارتیمان، بە خیانەتی نیشتمانی لە قەڵەم دەدا... بەبیریشماندا نەدەهات کە ڕەنگە ڕۆژێک بێت، ئێمەش وەک ئەوان، ئۆپەراسیۆنی هاوبەش لەگەڵ سپای پاسدارانی ئێرانیدا، دژی سپای عێراقی و لە سەر خاکی خۆماندا ئەنجامبدەین... نەبیرمان لەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانە دەکردەوەو، نە لەو کارەساتانەش کە بەدوای ئەو جۆرە چالاکیە هاوبەشانەشدا دەهاتن. ئێمە ئاوا مامەڵەمان لەگەڵ ئەو تراژیدیایەدا دەکردو، لەولاشەوە پارتی، ئەوەندەی لە رادیۆکەیانەوە دەمانبیست، وەک ئەوەی هەنگوینی لە کلۆرەداردا دۆزیبێتەوە، هەوڵی خۆی لەوەدا چڕکردبۆوە کە ئەو کارەساتەی بەسەر بارزانیەکانی ئەو دوو ئۆردووگایەدا هاتبوو، بۆ خۆی و بۆ ماڵی بارزانی بکاتە دەسکەوتی سیاسی و حیزبی. هەندێک لە ئێمە وامان بیردەکردەوە کە ڕەنگە دەمێکبێ، ئەمان چاوەڕێی ڕوودانی کارەساتێکی لەو جۆرەبن، تا هەر هیچ نەبێ لیستێکی درێژ، درێژتر لە لیستی ئەو کاتەی شەهیدانی ئێمە، بۆ خۆیان درووستکەن.

ئێمە، شانازیمان بەدرێژیی لیستی شەهیدانی خۆمانەوە دەکردو، تانەشمان لەوان دەدا، کە لە دوای شۆڕشی گوڵانیانەوە، بۆ یەک جاریش، ڕووبەڕووی سوپای عێراقی نەبوونەتەوەو تاکە بەردێکی کوردستانیان بەخوێنی شەهیدێکیان سوور نەکردووە.

ئێمەو ئەوانیش، ئەوەندەی سەرقاڵی دیوی دەرەوەی تراژیدیاکە بووین، نیو ئەوەندە دیوی ناوەوەیمان نەدەبینی... ئەوەندەی لە خەمی وەبەرهێنانی سیاسیدا بووین، نیو ئەوەندەش هەستیاریی مرۆییمان بەرامبەر بەو تراژیدیایە نەجووڵا.

چ کارەساتە سیاسەت لە ڕوانگەی وەبەرهێنانەوە، مامەڵە لەگەڵ کارەساتی تراژیدیی هاووڵاتیانی خۆیدا بکا.

## ٦٣

وتــاری چەنــد ڕۆژێکــم نووســی و، بەرنامــەی دووهەفتــەی ڕادیۆم ئامادەکردن و لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەدا بەڕێکەوتم کە بەرەو خۆشناوەتی دەچــوون. چەنــد مانگێک بــوو، بارەگاکانی ســەرکردایەتی لــە نێوزەنگ نەمابــوونوبــەرەوخــوارەوەهاتبــوون.

بــارەگای مام جــەلال و ژمارەیەک بارەگای تریــش، هاتبوونە ناوچەی خۆشــناوەتی. تا ئەو کاتەش ســەرکردایەتی، لەناو پێشــمەرگەدا، هەر بە" سەرەوە" ناوی دەهات.

پێشــمەرگەیەک، لە ڕێگادا تووشــی دلێری ســەید مەجید دەبــێ و، لێی دەپرسێ:

- ئەوە کاک دلێر بەرەو کوێ دەچی؟

- ئەچم بۆ سەرەوە.

- کام سەرەوە!! خۆ ئێستا سەرکردایەتی لە سەرەوە نەماوە و هاتوونەتە خوارەوە.

- کاکە مام جەلال لەبنی بیریشدابێ، من هەر ئەوێ بەسەرەوە ئەزانم.

ئەو ڕۆژە، منیش لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەدا، بەرەو سەرەوە بەڕێکەوتین. کەڵکمان لە تاریکی بەر لە هەڵاتنی مانگ وەرگرت و، دەشــتاییەکەی نێوان ڕەبیەکانی (قەرەســرد) و ســەربازگەی (بنگرد)مان بەکەمتــر لە نیو کاژێر بڕی. کاتێک مانگ لەپشتی ئاسۆسەوە، سەری دەرهێنا، ئێمە قەدەرێک بوو، بــۆ نانخواردن، بەســەر چەند ماڵێکــی گوندی(خۆشــاو)دا، دابەش ببووین. خۆشــاو، بەبەری مەرگەوە، لەســەر ڕۆخی دەریاچــەی دووکانەو، لەوێوە دەبێ بەسواری بەلەم بپەڕیەوە ئەو بەری دەریاچەکە و لەوێشەوە، بەبناری چیای کۆسرەتدا بەرەو ناوچەی خۆشناوەتی.

تا ئێمە پشوویەکماندا، بەلەمەوانەکانیش ئامادەبوون.

"ئەگەر ئەو پشووە بایەی نەدەهات، بەخودای بەچارەگێک کەمتریش، لە

پاشاوی[٢٠٣](میرزا ڕۆستەم)ی دەبووین." یەک لە بە لەمەوانەکان وایگووت.

میـرزا ڕۆسـتەم، یەک لە دێیە هــەرێ کۆنەکانی بناری کۆسـرەت بوو. مێـژووی نیشـتەجێبوون لەو دێیــەدا، زۆر پێش مێژووی هاتنی ئیسـلامە بۆ کوردسـتان. تەنانەت تا ئێسـتاش، ئاسـەواری کەلوپەل و سوالەت[٢٠٤] و دەفـری کۆن، لــە هەڵکۆڵینی شـوێنەکانی وەک (گردی سـەرخمە، ئاڵیاوە، دووگردکان) و جێی دیکەشدا دەدۆزرێنەوە. خەڵکی میرزا ڕۆستەم، لەکاتی هاتنـی لەشـکری موسـڵمانە عەرەبەکاندا، هیـچ بەرەنگارییەکیـان دژ بەو لەشـکرە نەنواندوە. هەر لەگەڵ نزیکبوونەوەی لەشکری موسڵماناندا، ئاڵای خۆڕادەسـتکردن و موسڵمان بوونیان هەڵکردووە... قەدیمیەکان دەیانگوت، میرزا ڕۆسـتەمیەکان، ئەوەیان نە لە ترسـنۆکی و نە لــە باوەڕبوونیش بە ئیسـلام کردووە... ئاخر خۆ ئەو خەڵکە نەزمانی عەرەبیان زانیوە و نە بەر لەوەش تاکە موسـڵمانێکیان دیوە، تاشتێک لەسەر ئیسلام بزانن و باوەڕی پێبێنن... موسڵمانبوونیان تەنها بۆ ڕێگرتن لەشەڕوکوشتار و تاڵانبوونی[٢٠٥] بۆ خۆلادانیش لەدانی سەرانە و باج و خەراج بووە.

ئێسـتا لە پاشـاوی ئەو شـوێنەدا وەسـتاوین کە پێی دەووتـرێ میرزا ڕۆسـتەم... شـوێنێک، لقی تاکــە درەختێکی تیادا نابینی، مەلــی بیرەوەرییە منداڵییەکانی منی لەسەر هەڵنیشێ.

٢٧ سـاڵ لەمەوبەر، لەناو یەکێک لە خانووە قوڕەکانی ئەم شـوێنەدا لە دایکبووم. نەساڵ و نەمانگ و نە ڕۆژی لە دایکبوونەکەشم وەک ئەوەنین کە لە تەسکەرەکەمدا نووسراون... هەر من نا، هەموو ئەوانەش لەو سەردەمەدا لــە دایکبوون، هەروابوون... هەر بۆیــەش، ڕۆژی لە دایکبوونی هەموومان یەکی حەوتە.

"وەک ئێستا لە بیرمە، ئەو شەوەی خودا ئەتوی پێداین، هەر لە ئێوارێوە باران دەستیپێکرد و تا عەسری ڕۆژی دوایی خۆشی نەکردەوە. خەڵکی لە خۆشـیاندا، لە خۆشی پەڵەدانێ، لاقیان بەر ئەرزی نەدەکەوت... سێ ڕۆژان دوای ئــەوە، بابـت لە شــاری هاتەوە." دایکم سـەبارەت بــەکات و ڕۆژی لەدایکبوونی من وایدەگووت.

---

٢٠٣ ـ پاشاو: چوونە ناوەوەی قەراغی دەریاچەیە کە ئاوی دەریاچەی تیا پەنگ دەخواتەوە.

٢٠٤ـ سوالەت: پارچەی شکاوی دەفری گڵین.

٢٠٥ـ تاڵانبوون: وێرانبوون، خاپووربوون.

باوکم، بۆ جێبەجێکردنی مامەڵەی سەفەری حەج، لە کاتی لە دایکبوونی مندا لە سلێمانی دەبێ... ڕۆژێک دوای هێنانەوەی تەرمی شێخ مەحمود، بۆ سلێمانی، ئەویش دەگەڕێتەوە میرزا ڕۆستەم.

بەو حسابەبێ، دەبێ ڕۆژی لە دایکبوونی من بکەوێتە یەک ڕۆژ بەر لەوەی تەرمی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بهێنرێتەوە. کۆچیدوایی شێخ مەحمود، هەم ڕۆژ و هەم ساڵی لەدایکبوونیان بۆ ساغکردمەوە. ئیدی لەوێ بەدواوە، وازم لە (٧/١) هێناو (١٠/١٠)م کردە ڕۆژی لە دایکبوونی خۆم. هەر بۆ دڵنیابوونی زیاتریش، گەڕامەوە سەر ئەو پەساپۆرتەی کە باوکم سەفەری یەکەمین حەجی پێکردبوو. ئاخر باوکم، سێ جاران چووە بووە حەج... جاری یەکەم، وەک لە پەساپۆرتەکەیدا دەردەکەوت لە ساڵی ١٩٥٦دابووە.

"چ سەفەرێکی زەحمەتبوو، بەچوون و هاتنەوە و لە سێ چوار مانگانمان زیاتر پێچوو بەشێکی بەسواری وولاخ و حوشتر و بەشێکی بەسواری ئۆتۆمبیل و بەشێکی هەرە زۆریشی بەسەر پشتی پاپۆڕەوە بووین. لەو سەفەرەیدا، دووکەسمان لە ناو پاپۆڕەکەیدا لێمردن.

پاپۆڕ، ئەوێ دەمێ، ساردخانە و شتی وایان تێدانەبوو، هەتا مردووی تێدا هەڵگرن... هێنایانن، هەر یەکەو پارچە ئاسنێکی قورسیان بە لاقیانەوە بەست و فڕێیان دانە بنی دەریاوە." باوکم سەبارەت بەو سەفەرەی وایدە گووت.

٢٤ ساڵ لەمەوبەر، بەهەمان دەستووری مردووی جارانی سەرپشتی پاپۆڕ، میرزاڕۆستەمشیان، هەڵدایە بنی دەریاچەی تازەی درووستکراوی بەنداوی دوکانەوە.

ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵانە، ئەوەتا لەسەر پشتی بەلەمێکەوە، بازدەدەمە سەرخاکی ئەو شوێنەی کە ٢٤ ساڵە نەمدیوە. ڕەنگە بۆ زۆربەی خەڵک، پاش ئەو هەموو دابڕانە، گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان، دنیایەک یادگاری و بیرەوەرییان لا زیندووکاتەوە... کەچی من، هەر چەندی دەکەم و دەکۆشم، شتێکی ئەو زێدەی خۆمم بیرنایاتەوە. ئاخر کوا کولەکەی کاڵی سەری چکۆلەی منداڵێکی سێ ساڵانە، جێی هیچ دەنکە بیرەوەرییەکی تیا دەبێتەوە!

ئەو بیرەوەریانەش سەبارەت بەم شوێنە هەمن، هیچی هی خۆم نین.... هەر هەمووی ئەو بیرەوەریانەی باوک و دایکمن کە شەوانە لە بەینی خۆیاندا یان لەگەڵ خزمەکانماندا، بەدیار فانۆسی پرتەپرتکەری سەر تەنکەیەکی بەتاڵی ڕۆنەوە، دوای ڕاگواستنیان و تا ساڵانێکی زۆر، بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. ئەوەندە ئەو شتانەم گوێ لێ دەبوون، خۆشم دەبوومە بەشێک لێیان.

که باوکم باسی ناعور و جۆگه هەڵبەستن و کانی و ئاوی ئەوێی دەکرد... که باســی میوەجاتی باخەکانی دەم زێیەو باسی کێڵگەی پەمووی ڕەنێی[٢٠٦] دەکرد، ماڵەکەمان لەبەرچاوم، لە باخچە هەڵواسراوەکانی بابل دەچوو.

که دایکم باســی نێرگزەجاڕی بناری کۆســرەت و گوڵاڵەسوورەی بانو قەبران و، باسی بەرامەی گوڵەباغەکانی ئەملاوئەولای ڕێی سەراوێی دەکرد، ماڵەکەمان لەبەرچاوم، لە شووشە عەترێکی سەر واڵا دەچوو.

وای که گێڕانەوەی ئەو بیرەوەریانەیان، چ گوڵە وێنەیەکی ئەفســوناویی میرزاڕۆســتەمیان، خســتبووە ناو ئینجانــەی خەیاڵی منداڵی منــەوە... ئەو وێنەیــەی ئەوان ئەوســا بــۆ منیان کێشــابوو، لەگەڵ ئــەم وێنەیەی من لە مشەوەدا دەیبینم، دنیایەک لە یەکتر جیاوازن. ئەو وێنەیەی من لە مشەوەدا، لەبەر تریفەی ســپی مانگی هاویندا، لە پاشــماوەی میرزاڕۆستەمی دەبینم، هیچی لە وێنەکەی ئەوان ناچێ.

ئــەوەی لەم وێنەیەدا دەیبینم، تەنهــا کێل و تاتەبەردی بیرازی گۆڕە گڵ لەسەر لاچووەکانی (بانو قەبران) و بناغە پانە بەردینەکەی قشڵەی جارانی سەرباسکی ئەو بەری ماڵانن. بۆ چەند خولەکێک، مات و بێدەنگ دەبم... بە نائومێدیەکی زۆرەوە ســەرنجی ئەو ووردە شــەپۆلە دەم بە کەفانە دەدەم کە خۆیان لە تاتەبەردی گۆڕەکان و لە بەردی بناغەی قشڵە هەڵدەسوون و شڵپ و هوڕێکی غەمگین درووست دەکەن. سەرنج دەدەم و لەبەرخۆشمەوە دەڵێم:

"ئەرێ ئەم شەپۆلانە بۆ وادەکەن ... مەگەر شتێک لەم دێیەدا ماوە، ئاوی ئەم دەریاچەیە، بیەوێ لەگەڵ خۆیدا ڕایماڵێ!"

تــا ئەم دیمەنەم نەبینی، نەمدەزانی بۆچی باوکم، ســەرباری ئەو هەموو عەشــقە زۆرەی بۆ ئەم شوێنە هەیبوو، کەچی لە دوای ڕاگواستنیانەوە، بۆ تەنها جارێکیش، سەرێکی ئەم ناوەی نەدایەوە.

ئێســتا، لەمشــەوەدا تێدەگەم... تێدەگەم کە باوکم نەیویستووە، ئەو وێنە ڕەنگاوڕەنگەی لەناو هزری خۆیدا هەڵیگرتووە، بەو وێنە بێ ڕەنگەی بگۆڕێ کە من ئێستاکە دەیبینم.

وێنەی ناو هزری باوکم، وێنەی میرزارۆســتەمی پێش ڕاگواستنە... ئەو میرزا ڕۆســتەمەی دوای درووستکردنی بەنداوی دوکان، چون کەشتیەکی

٢٠٦- ڕەن: زەویی بەپیتی دەم زێ.

گەورەی تێکشـکاو، نقومـی بنی دەریاچەی دوکان بوو، بـەڵام بەر لەوەی نغرۆبـێ خەڵکی میرزاڕۆسـتەم و هەموو ئەو دێهاتانـەش کە ئاوی دوکان دایدەپۆشـین، بۆ شـوێنی دیکە گوازرانەوە. بەشێک بۆ چوارقورنە، بەشێک بـۆ سەنگەسـەر و ئەوانی دیش، بۆ بەکرەجـۆ و هەندێ جێی تر. بیرم دێ، ئـەو کاتە، بەو خەڵکانەی بەهۆی ئاوی دوکانـەوە ڕاگوێزرابوون، دەووترا (بەحراوی).

"هێشتا بەشێکی کەلوپەلەکانمان، هەر بەسەرپشتی لۆریە وەبوون، خەڵکی لە ڕانیە و لە قەڵادزێ و لە کۆیە و تەنانەت لە سلێمانیشەوە، دەستە دەستە بۆ تەماشاکردنی ئێمە دەهاتن. دەهاتن و هەر بەڕاستیش وایاندەزانی ئێمەی بەحـراوی، لەناو بەحرەوە هێنراوین... حەتمەن بەرلەوەی ئێمە ببینن، لە دڵی خۆیانـدا گووتوویانـە، خودایە دەبێ بەحراوی چ جـۆرە گیانلەبەرێکبن... کە دەشـیاندیتین، ئەمن بەو گوێیانەی خۆم، گوێم لێبـوو، بەیەکتریان دەگووت، کوڕە خۆ ئەوانەش هەر وەک ئێمە بنیادەمن... ئەدی بۆ پێیان دەڵێن بەحراوی!" دایکم ئاوا باسی بەحراوی بوونی خۆمانی بۆ دەکردم.

منیش و بەحراوییەکانی دیکەش، تا مودەتێکی زۆر، هەر کەسێکی غەیرە پێی ووتباین"بەحراوی" تەواوێک پێی قەڵس دەبووین.

بـاوک و دایکـم و میرزاڕۆسـتەمیەکانی دیکـەش، وەختێـک باسـی میرزارۆسـتەمیان دەکـرد، ئەوەنـدە بـە پیرۆزیـەوە ناویـان دەهێنا، هەر ئەوەتا لە کاتی نوێژکردندا ڕوویان تێنەدەکرد. هەر شـوێنێک و هەرشتێکی جوانیشـیان، لە هەرجێیەک دیبایە، پێیانوابوو شتێک لە میرزاڕۆستەمەکەی ئەوانی تیایە.

ئێمـە و ژمارەیەکـی زۆر ماڵـی تـر، گوازرابووینـەوە چوارقورنـە... چوارقورنە، ناحیەیەک بوو لە نوێ بنیاتنرا. خانووەکان لەلایەن کۆمپانیایەکی ئینگلیزییەوە، بە شێوەیەکی نیمچە هاوچەرخ درووستکرابوون... خانووەکان، هەر هەموویان لەیەکدەچوون، دوو حەوشە، یەکی پێشەوە و یەکی پشتەوە... سـێ ژووری بەچوار، حەمامێک، ژوورێکی گەورەتـر لە ژوورەکانی نووستن بۆ تاقەتکردنی[٢٠٧] ئالیک و ئیستەبڵێکی گەورەش بۆ ماڵات. گەرچی ئەو خانووانە، چەند قاتێکیش، لە خانوەکانی پێشوویان خۆشتربوون، بەڵام مـادام لە خانووەکانی میرزاڕۆسـتەمیان نەدەچوون، ئەوەندە دەسـکاریان دەکردن، هەتا سیمایەکی خانووەکانی ئەوێیان نەدابانێ، وازیان لێنەدەهێنان. ئاخر ئەوان کـە نەیاندەتوانی خۆیان لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریە نوێیەدا ڕابێن،

٢٠٧. تاقەتکردن: هەڵگرتن بەمەبەستی پاراستن.

هەولێاندەدا، گۆڕانکاریەکان لەگەڵ خۆیاندا بگونجێنن. سەرەتا لە پەنجەرەی ژوورەکانەوە دەستیان پێکرد. ژووری دانیشتن و خەوتنەکان، پەنجەرەی گەورەیان تێدابوون... ئەمان هاتن بەبلۆک و چیمەنتۆ، پەنجەرەکانیان ئەوەندە بچووک کردەوە، هەر بەقەد ئەو لاواچە[٢٠٨] شوشە تێگیراوانەیان لێدەهێشتنەوە کە لە ماڵەکانی میرزا ڕۆستەمدا هەیانبوون. ئەو ژوورەی کە بۆ حەمام و توالێت دانرابوو، گونجەکانیان دەردەهێنران و دەکرانە کولانەی مریشکان... بەدیوی دەرەوەی یەکێک لە ژوورەکانی نووستندا، کۆلێتێکیان بەناوی ژووری سەرشۆرکەوە[٢٠٩] دروستدەکرد و شتی تریش...

ئیدی ئاوا، کەس نەمابوو لە ماڵە نوێیەکەی خۆیدا، جێی ماڵەکەی جارانی میرزاڕۆستەمی نەکاتەوە.

زۆرینەی خەڵکەکە ئاوایان کرد... کەچی مامەغای حەمەدی مامەغا، هەر بەوەندە سووکنایی نەهات... ئەوەتا ئەم، بەتاقی تەنیا هاتۆتەوەو، لەسەر باسکی پشتەوەی پاشاوەکە، میرزاڕۆستەمێکی بۆ خۆی، لەیەک تاقەماڵ بنیاتناوە. میرزاڕۆستەمێکی یەک ماڵی!!

جار هەیە درەختێک بەتەنیا، سەوزایی باخێکت دەداتێ...

جار هەیە گوڵێک بەتەنیا، بەرامەی گوڵستانێکت دەداتێ...

جار هەیە تاقە ئەستێرەیەکی ئاسمانیش، هەستی ڕۆشنایی هەموو ئەستێرەی ڕێی کاکێشانت دەداتێ.

ئەوەتا لەم شەوەشدا، تاقە ماڵەکەی مامەغا، هەستی دێیەک و بەقەد دێیەک، نان و نوامان دەداتێ. ئەمشەو بۆ ئێمەو، شەوانی دیکەش بۆ پێشمەرگەی تر، تاقەماڵەکەی مامەغا، میرزاڕۆستەمێکە بۆ خۆی.

لە ژێر سایەی ماڵە میواندۆستەکەی مامەغادا ڕاکشاوم و لەدڵی خۆشمدا دەڵێم:

"ئەوکاتەی شۆڕش سەردەکەوێ، دەبێ سەرکردە (بەوەفا، دادپەروەر، یەکسانخواز و ناسپڵەکانی) ئێمە بەچ تەرازوویەک، ماندووبوون و قوربانیدانی خەڵکانی وەک مامەغا بکێشن"[٢١٠].

٢٠٨ـ لاواچ: پەنجەرەی زۆر بچووک.

٢٠٩ـ سەرشۆرک: ژوورێکی بچکۆلەیە کە بۆ خۆشتن و جلشتن بەکاردێت.

٢١٠- مامەغا، لەساڵی (٢٠١٦)کۆچی دواییکرد، ئەوەی بەڕاکەڕاکی ڕۆژانەی خۆی، بژێوی خێزانەکەی پەیدای نەکردبا، نەیبوو... نە سەرکردەیەک بە سەریکردەوەو نە لە

## ٦٤

باخەکانی خوار گوندی (خەتێ)مان، دوای دوو شەو و ڕۆژان، لە بە پێ ڕۆشتن لێدەردەکەون. مندالّبووم ناوی خەتێم بیستبوو. مەلای خەتێ کارێکی واینەکردووە، کەس هەبێ ناوی ئەو گوندەی بەرگوێ نەکەوتبێ. مەلای خەتێ، لە پەلاماردانی عوسمانیەکان بۆ سەر ئیمارەتی سۆران، ئەوەی بۆ سولّتانی عوسمانی کرد کە بە سوپا و بەچەکی زۆر نەدەکرا. عوسمانیەکان، بۆ لەناوبردنی ئەو ئیمارەتە کوردییە، بەسوپا و بە چەک و تەقەمەنیەکی زۆرەوە دێن. دێن و دەشزانن بەهۆی ئازایەتیی جەنگاوەرانی ئیمارەت و بەهۆی سەختی و عاسێیی ناوچەکەوە، ناتوانن زەفەر لە هێزەکەی پاشای کۆرە بێنن... بۆیە پەنا بۆ بەرچەکی ئایین دەبەن... ئەو چەکەی مەلا محەمەدی خەتێ، دژ بە نەتەوەکەی خۆی دەیخاتە خزمەتیانەوە. مەلا، لەو کاتەدا کە پێگەیەکی دینی و کۆمەلاّیەتی بەهێزی لەناو قەلّمڕەوی پاشای کۆرەدا دەبێ، فەتوا بەدناوەکەی دەردەکا:

"هەر کەسێک لە دژی سوپای خەلیفەی موسلّمانان بچتەشەڕێ، تەلاّقی لە ژنەکەی خۆی دەکەوێ و، لە دینش وەردەگەڕێ."

فەتوا دەبێتە پەتایەکی درمی کوشندەو، بەناو سپای پاشای کۆرەدا بلاّودەبێتەوە. چەکدارەکان دەگەڕێنەوە ناو مالّ وخێزانی خۆیان و سەنگەرەکان چۆلّدەکەن. پاشای کۆرە کە خۆی لەبەردەمی هێرشی سوپای عوسمانیەکاندا، تەنیا دەبینێتەوە، بەناچاری خۆی ڕادەست دەکات. سەرباری ئەو هەموو بەلّێن و پەیمانەی لەلایەن سەدری ئەعزەمەوە[٢١١] پێی دەدرێ، دوای ئەوەی دەگوازرێتەوە بۆ ئەستەمبولّ، لەدار دەدرێ.

خەلّکی دێهاتەکانی ئەو ناوچەیە، تا ئێستاش هەر بەدین و ئەهلی مزگەوتن.

بەناو خەتێدا، بەرەو بارەگای مام جەلال هەلّدەگەڕێین. ڕێکەوتی هەر

---

پرسەکەشیدا کەسیانم دی.

٢١١ـ سەدری ئەعزەم: واتە سەرەک وەزیرانی سولّتانی عوسمانی، ئەو پۆستە لە دوای سولّتانەوە، بالاّترین پۆست بووە... مۆری سولّتان لای ئەم بووە و دەسەلاّتی ڕەهای هەبووە... دانان و لادانیشی تەنها لەدەستی سولّتاندابووە.

ژنێک دەکەین، هەر لەگەڵ بینینی ئێمەدا، خێرا بەو پەڕۆیەی کە لەشـیوەی پەچەدایە و بە سەر سەریەوەیەتی، دەموچاوی خۆی دادەپۆشێ.

لــە دێ ڕەتدەبیــن و دەگەینــە بەردەم بــارەگای مام جــەلال. خێمەکەی مــام جەلال و ئەو شــوێنەش کە بــۆ بینینی میــوان و کۆبوونەوەی داناوە، بەســێبەری کۆمەڵە دارگوێزێک داپۆشــراون. بەملا و ئەولاشــدا، ســایەی کۆمەڵێ دارهەنار، بۆتە کەپری پێشمەرگەی کەرتەکانی پاراستن.

سڵاودەکەین و لەگەڵ وەڵامی سڵاوەکەماندا دەڵێ:

"لــەوە ئاســانتر نیــە میوانی درەنــگ وەختت بێ و بۆ خۆشــت داوەتی نانخواردن بێ."

ســەرەتا، پرسـیاری بارودۆخی پێشمەگە لە ملازم عومەر دەکا. ئەویش ڕووماڵێکی ووردی دەخاتە بەردەم. خۆیشی لەسەر هەمان بابەت و هەندێ بابەتی تریش، کۆمەڵێک زانیاریمان دەداتێ... دواتر لە من دەپرسێ: " لەناو ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵەدا، چۆن باسی کۆنفرانسی یەکێتیی شۆڕشگێڕان دەکرێ!"

هەمووی چەند هەفتەیەکە یەکێتیی شۆڕشـگێڕان، یەکەمین کۆنفرانســی خۆی بەستووە. ئەو گفتوگۆیانەی لە ئەیلولی ساڵی ١٩٨٢وەوە، بەمەبەستی یەکگرتنی خەتی گشــتی و بزووتنەوەی سۆشیالســتی کوردستان،دەستیان پێکردبوو، بەو کۆنفرانسە گەیشت کە هەر لە گوندی خەتێ، لە ١٩٨٢/٨/٢٣دا بەســترا. یەکێتیی شۆڕشــگێڕان، هەر لەسەر بناغەی بەرنامە و بۆچوون و دنیابینیەکانی یەکێتیی نیشــتمانیی کوردستان دامەزراو هیچ هێڵێکی فیکری دیاریکــراوی نەبوو... ئامانجی کۆکردنەوەی خەڵکی ســەربەهەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگا بوو. لەو کۆنفرانسەدا، مام جەلال بەسکرتێری یەکێتی شۆڕشگێڕان هەڵبژێردرا... هەریەک لە دکتۆر پێشەوا تاڵەبانی، دکتۆر فوئاد مەعســوم، عومەر دەبابــە، دکتۆر کەمال فوئاد، دکتۆر عومەر شــێخموس، دکتۆر خدرمەعسوم، عەلی حەوێز، سەید مەجید حوسەین مورسل زەمان، نــازم عومەر، جەمــال ئاغاو عومەر عەزیــز، بە ئەندامی ســەرکردایەتی و عەبدوڵــڵا عومەر و ڕەوف عوســمانیش، بە ئەندامی یــەدەک هەڵبژێردران. لەوەڵامی پرسیارەکەی مام جەلالدا، ووتم:

"ئەوەنــدەی مــن ئاگام لێبــێ، ئەندامان و کادران و ســەرکردایەتیەکانی کۆمەڵــەش، ئــەو یەکگرتنەیان پێخۆشــە... لەبــەر هیچ نەبــێ، لەبەرئەوەی لێــرە بەدواوە، چیتر خەتی گشــتی و بزووتنــەوە، دوو ئەوەندەی کۆمەڵە،

نوێنەریــان لەناو دامودەزگاکانی یەکێتییدا نابــێ... ڕەنگە ئەوەش لە ڕووی چۆنایەتیــەوە، بۆ یەکێتیش بەچاکە بشــکێتەوە... ئەوەنــدەی من بزانم تاکە شتێک کە کۆمەڵە حەزیان نەدەکرد، ئەوەیە کە ئێوە ببنە سکرتێری یەکێتیی شۆڕشــگێڕان... ئەوان حەزیان پێی دەکرد، ئێوە بەیەک مەســافە، لە نێوان کۆمەڵەو شۆڕشگێڕاندا وەستابان..."

من هێشتا دەمەوێ هەندێ شتی تر بڵێم، مام جەلال قسەکانم پێدەبڕێ:

"بۆچــی هەر ئەندامێکی کۆمەڵەکــەی ئێوە، هەقی ئەوەی هەبێ، خۆی بۆ ســەرکردایەتی و بۆ سکرتێری کۆمەڵەش تەرشیح کا، بەلام من ئەو هەقەم نەبێ؟!"

کەمێک دەوەستێ و ئینجا بە تۆنێکی بەرزترەوە دەڵێ:

"هەق بە هیچ کەسێک نادەم، لە مومارەسەکردنی هەقی خۆمدا، دەخالەت بکات!"

مام جەلال ئەو پۆســتە بەهەقی خۆی دەزانێ و باسکردنیشی نارەحەتی دەکات، بۆیە من لەوە زیاتر نەگەڕامەوە سەر ئەو بابەتە.

زۆرنابا، سەرکردایەتی کۆمەڵە داوا لە مام جەلال دەکەن، مادام سکرتێری یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتانە، دەبێ واز لە پۆستی ســکرتێری یەکێتیی شۆڕشــگێڕان بێنێ... لەحاڵەتــی ڕازی نەبوونی مام جەلال بەو داوایە، دوو بژاردەی دەخەنە بەردەم:

بژاردەی یەکەم: یەکێتی کۆنگرە ببەستێ و سکرتێری یەکێتی، بە دەنگی زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرە هەڵبژێردرێ.

بژاردەی دووەم: پۆستی سکرتێری گشتی یەکێتی، هەر شەش مانگ یان هەر دوانزە مانگ جارێک، لە نێوان کۆمەڵەو شۆڕشگێڕاندا، دەستاو دەستی پێبکرێ.

لە ئەنجامی ئەو گوشارەی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا، مام جەلال وازی لە پۆستی سکرتێری یەکێتیی شۆڕشگێڕان هێنا.

کەهاتینــە سەرباســی دەزگای ڕاگەیانــدن، ئەویــش هــەر هەمــان ڕای نەوشیروان مستەفای هەبوو کەمن لە ئێزگەدا بمێنمەوە.

وەختــێ نانــی نیوەڕۆ نزیک دەبێتەوە، مام جــەلال، ملازم عومەر و من، لەگەڵ خۆیدا بۆ داوەتی ماڵی کوێخای خەتێ دەبا. کوێخا وەک نەریتی ئەو ناوچەیە، لە میواندارییی مام جەلالدا، هەرچی ڕیش سپی و پیاوماقووڵی ئەو دێیە یە، بانگی کردوون. یەکێک لەوانەی لە پێشــوازیدا وەستاوە، گەنجێکی ٢٥ ســاڵەی ڕیشــدارە. من دەزانم مام جەلال چەند ڕقی لە ڕیشە. چیرۆکی ڕق لە ڕیشبوونەوەکەیشــیم، چەند جارێک لە خۆی بیســتووە. ڕوودەکاتە پیاوە ڕیشدارەکەو بەجۆرێک لە سوعبەتەوە پێی دەڵێ:

- ئەرێ ڕۆڵە ئەو ڕیشە چیە... بۆ نایتاشی؟!

- وەڵڵا مامە کەیفم پێدێ.

- ڕیش چ جوانیەکی تێدایە، هەتا کەیفت پێیبێ!

پیاوێکی تەمەن پەنجا سەڵەی ڕیش ماشوبرنج، لەو لاوە هەڵدەداتێ:

- خۆ مام جەلال ئەتووش وەختی خۆی، ڕدێنت[٢١٢] هەبوو.

مــام جەلال لە خۆتێهەڵقورتاندنی ئەو پیاوە قەڵس دەبێ، بەڵام هەوڵدەدا قەڵسیەکەی خۆی دەرنەبڕێ:

- ڕاســت دەکەی وابوو، بەڵام ئەو کاتە دکتۆر کەمال، ئەو ڕایەی لەسەر ڕیــش نەبــوو. ئنجــا ئە من بۆ خــۆم، ئەوەندە بەڕیش ســەغڵەت نیم، بەڵام برادەرێکم هەیە، ناوی دکتۆر کەمال فوئادە، ڕقی دنیای لە ڕیشە.

لەبەردڵی ڕیش سپییەکانش دەڵێ:

بەڵام هەقی بەسەر ڕیشی سپیەوە نیە... باشتێکتان لەسەر ئەو مەسەلەی ڕیشە و دکتۆر کەمالی بۆ بگێڕمەوە:

"ساڵێکیان لەگەڵ دکتۆر کەمالی، ئامادەی کۆنفرانسێکی جیهانیی بووین، کە پەیوەندی بە مافی گەلان و ئەو شتانەوە هەبوو. ئێمە لەناو هۆڵی کۆنفرانس دانیشــتبووین، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشــانەی ڕیشــدار هاتە ژوورێ. هەر کــە دکتۆر کەمــال کابرای دی، بەمنی گوت:"ئەو پیــاوە زۆر کەرە." ئەمنیش گووتــم ئاخــر بــە چ هەقێکی وادەڵێــی... زۆر بە پیاوێکی نەجیــب و ماقووڵ دێتــە بەرچاوی من." گوتی:"ئەتوو غەڵەتی." من زیاتر لەســەری نەڕۆشــتم. کۆنفرانس دەستپێکرد... زۆر خەڵک هەستانە سەر سەکۆی و قسەی خۆیان

٢١٢ـ ڕدێن: ڕیش

کـرد. هــەر ئەوەندەمانزانی نۆرەی کابــرای لەمەڕ[٢١٣] خۆمان هــات... کابرا چووە پشــتی مایکرۆفۆنی و دەســتی بەقســان کرد... قســەی زۆرجوان و ڕێکوپێکی کردن. لە شــوێنێکدا زۆر بە باشــە باسی مەسەلەی کوردی کرد. ڕووم لــە دکتۆر کەمالی کرد و پێم گــووت، نەم گووت ئەو پیاوە، پیاوێکی نەجیبە! دکتۆر کەمال گووتی: "ئێستاش هەر دەڵێم کەرە."

زانیم فایدەی نیە، لەگەڵی پێدانەچووم. زۆری نەبرد، وەختی قســەکردنی کابرای تەواوبوو... کەچی ئەو هەر قسەی کرد... دووسێ جارانیان ئینزارکرد، کۆتایی بەقســەکانی بێنێ، ئەو هەر درێژەی دایە... وایلێهات خەڵکی کردیانە بۆڵەبــۆڵ و هەندێک وەک نارەزایی دەربڕیــن، لە هۆڵەکەی چوونە دەرێ... کە ئەوەم دی، زانیم دکتۆر کەمال داشــی ســوارە، بۆیە سەرم بردەوە ناو قاپێلکــی خــۆم و نقەم لە خۆم بڕی... لە خواشــم دەویســت دکتۆر کەمال، هیچی کە نەڵێ، بەڵام هەر گوتیی... "پێم نەووتی ئەو پیاوە کەرە!"

کوێخا، وەختی ئامادەبوونی خواردنی ڕاگەیاند. سفرە هات و بەدرێژایی ســێبەری ســاباتەکە، ســفرەی نایلۆن ڕاخرا. گەنجێک کــە خەریکی دانانی قاپوقاچاغ و خواردن بوو، بەسەر سفرەکەدا دەهات و دەچوو.

- ئــەرێ ڕۆڵــە، بۆ بەســەر ئــەو ســفرەیدا، دێودەچــی... ئەتو ناترســی گۆرەویەکانت پیس ببن؟!

- گێ مەدێ مامە، دوایە خێزانم لۆم دەشوا.

- ڕۆڵە ئەتو دەبا، ڕیشــت هەبا، مام جــەلال بەتۆنێکی زۆر تورەوە، وای پێووت.

---

٢١٣- لەمەڕ: شتێک کە پێشتر پەیوەندی بەکەسێکەوە هەبووبێ. هەندێک بەهەڵە لەبری سەبارەت بە کاریدێنن.

## ٦٥

مودەتێـک بە دێهاتەکانی ئەو ناوەدا سـووڕاینەوە و بۆ دوایین شـەوی مانەوەمـان، گەڕاینەوە بارەگای نەوشـیروان مسـتەفا کە لـە قوتابخانەی گوندی(تۆتمـێ)دا بـوو. چاوەڕێیـن نانـی بەیانـی بخۆیـن و بکەوینە ڕێ. غەڵبەغەڵبێکـی زۆر، حەوشـەی قوتابخانـە پڕدەکات، پێشـمەرگەیەک دێتە بـەردەرگاو دەڵـێ: "کاک نەوشـیروان، ئـەم ژن و پیاوانـە دەیانەوێت تۆ ببینن."

پێڵاوەکانی بەسەرپێوەدەکاو، تا لای ژن و پیاوە شینگێڕەکان ڕاناوەستێ. هەرئەوەندە پێیان دەڵێ، "هەرکەسـێک خیانەت لە شۆڕش بکا، باوکیشمان بێ، نابێ چاوەڕێی سزای لەوە کەمتر بکا."

پیـاوەکان ئاگریـان لێدەبارێـت و ژنەکانیـش، دەدەنە پرمـەی گریان و بەچەپۆکان بەسـەری خۆیاندا دەکێشن. ئەو دەگەڕێتەوە ژوورەکەی خۆی، چەند پێشـمەرگەیەکیش، ژن و پیاوەکان بە پـاڵ دەبەنە ئەودیوی دەرگای حەوشەی قوتابخانەکە.

دیمەنەکـە دەمتاسـێنێ... چەندیش دەکەم و دەپرسـم شـتێکی وا حاڵی نابم.

ماڵئاویی دەکەین و ملی هەمان ڕێگا دەگرینەوە کە ١٠ ڕۆژێک لەوەوبەر پێیداهاتبووین.

تـا نەگەیشـتینەوە بەرگەڵـو، نەمزانی ئـەو ژن و پیاوانەی ئـەو ڕۆژە، کەسوکاری (وریای وەستا وەهاب)بوون.

وریا، بەرلەوەی ببێتە پێشمەرگە، ئەندامێکی جەربەزە و چالاکی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵە و بەرپرسی لیژنەی تیرۆری ناوشار بوو.

وریا دەیگووت، هیچ کارێکی تیرۆرکردنی ئەنجامنەداوە، ئەگەر بە نامەی فەرمیی سەرەوەی خۆی داوای لێنەکرابێت.

لە هاوینی ١٩٨١دا و لەڕێی نامەیەکی فەرمی و بە مۆری سەرکردایەتیی

ناوخۆی کۆمەڵەوە، فەرمانی کوشتنی چەند کەسێک، ڕادەستی وریای وەستا وەهاب دەکرێ. لە پایزی ئەو ساڵەدا، عەبدولی سوران، سەدیق ئەمین، نوری حەمە عەلی، شــەفیق عەبدولفەتاح چەلەبی(شەفیق ئاغا) و ژمارەیەکی تر، لە ناو شــاری ســلێمانیدا کوژران. ئەوانە، نە بەعسی بوون و نە لەبەعسیشەوە نزیکبوون... هەر ئەوەبوو، کۆنە پارتی و لە شۆڕشــی ئەیلولیشــدا بەرپرس بوون.

کوشــتنی ئەوانە، نارەزاییەکی زۆری لێکەوتەوە و پەنجەی تۆمەتیش بۆ یەکێتیی ڕادەکێشرا. یەکێتی لە ترسی لەکەداربوونی ناوی خۆی، بێبەریبوونی خــۆی لــە ئەنجامدانی ئــەو کارە ڕاگەیاند. مام جــەلال بەیانێکی توندی بۆ ئیدانەکردنی ئەو کارە نووسی و کارەکەشی بە تاوان و قوربانیەکانیشی بە شــەهید ناوبردن. لەوەش زیاتر، هەڕەشەی ئەوەشی کرد، ئەگەر دەرکەوێ ئــەو کارە دەســتی یەکێتــی تێدایە، ئەوا ئەو دەســت لە کاردەکێشــێتەوە و کوردستانیش بە جێدێڵێ.

وریا، دەبێتە پێشمەرگە و دواتر دەبێتە ئەندامی کەرتێکی ڕێکخستنی ئەو ڕێکخراوەی جەبار فرمان بەرپرسیەتی. سەرکردایەتی، بۆ ڕادەستکردنەوەی نامەکان، وریا بەگیروگاز دێنن. ئەوان داوای ڕادەســتکردنەوەی نامەکان لە وریــا دەکەن و، ئەویش مل بــەو داوایە نادات. ئــەوان پێیانوایە ئەگەر ئەو نامانــە بکەونە دەســتی نەیــاران، وەک بەڵگە لەدژیــان بەکاردێنن. وریاش پێــی وایە، ئەگەر نامەکان ڕادەســتکاتەوە، بۆ لادانی ئەو بەرپرســیاریەتیە لەســەرخۆیان، بەتاوانی ئەو کوشتنانە دەیکوژن... بەو ناوەشەوە نەیکوژن، هەر ناهێڵن وەک بەڵگەیەکی زیندوو بمێنێ.

وریــا پێی وایە، پاراســتنی ئــەو نامانە لەلای خــۆی، دەبێتە قەڵغان و لە تەوری دەستی ئەوانی دەپارێزێ... ئەو پێی وایە و ناشزانێ ڕیسکی پاراستنی هەقیقەتێکی مەترســیدار، لەســەر بە تاوانباردەرچوونی ئەوان، لە ڕیســکی ڕادەستکردنەوەی نامەکان کوشندەترە... ڕیسکێک کە دواجار دەبێتە فەرمانی کوشتن و ئەرکی جێبەجێکردنەکەشی بە هاوڕێ و هاوسەنگەرەکانی خۆی دەســپێردرێ. وریا نەیدەزانی وەک فێردریک نیچە دەڵێ "ئەو کەســەی بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەژدیهادا بجەنگێ، دواجار خۆشی دەبێتە ئەژدیها."

وریا کوژرا و، بکوژەکان هێندە بەدڕندانە کوشتیان ئەگەر وریا مەسیحیش با، داوای لە خوا نەدەکرد، بکوژەکانی ببەخشێ... ئەگەر بکوژەکانی مەسیح نەیانزانیبێ چیدەکەن، ئەوا بکوژەکانی وریا دەیانزانی.

## ٦٦

که ئێمە لە سـەرەتای تشرینی یەکەمی ١٩٨٣دا، ناوچەی خۆشناوەتیمان بەجێهێشت، بێتواتە هێشتا قەڵای حوکمڕانیی ئەنوەربەگ بوو.

بێتواتە، گوندێک لەبن ساباتی سەوزاییدا... مێرگێک لە باوەشی شاخێکی بڵندا. لە زستاندا، خۆی بە بەفر دادەپۆشێ... لە هاویندا، دەبێتە کوێستانێکی بچکۆلانـە. بێتواتـە، هەمـووی ١٠ – ١٥ کیلۆمەتـر، لە ئێمـەوە دوورنابێ، کەچی:

نـە لە زسـتانا، بۆ شـەڕەتۆپەڵ و خلیسـکانێی سـەر بەفـر دەچین، نە لـە هاوینیشـدا، بـۆ خۆ دزینـەوە لە قرچـە قرچی گەرمای چلـە، خۆی بۆ دەکوتین.

من منداڵبووم، بێتواتە مەڵبەندی دەسەڵات و چاوگەی ترس و دڵەڕاوکێی خەڵکی دەڤەری بێتوێن و خۆشناوەتی و دۆڵی خەلەکان و بناری کۆسرەت بوو.

- ئەو ڕۆژە، بە قەپ لە قوڕگگرتن، یەکێکیان کوشتووە.

- ڕۆژێکی کە، دوو کەسـیان، لەسـەر لووتکەی شیشـارەوە، هەڵداوەتە خوارێ.

- ئـەدی بۆ باسـی عەبـاس و عومەر و مەلا فاتیح و عەزیز و مامۆسـتا حەسەن ناکەی، لە نیوەی شەودا بردیانن... سێ ڕۆژ دواتر، تەرمەکانیان لە بەستی قایمقامدا[٢١٤] دۆزرانەوە.

هـەر ڕۆژەی چیرۆکێک لەو جـۆرە چیرۆکانە لە بێتواتەوە دەگاتە گوێی خەڵکی.

بەیانـی ئازار دەردەچـێ و بێتواتە دەبێتە بارەگای بەتالیۆن. بە فەرمانی فەرماندەی بەتالیۆن:

---

٢١٤- بەستی قایمقام: چەمێکە لەنێوان چوارقوڕنە و بێتواتەدا. زستانان و بەهاران ئاوای زۆری پیدادەڕواو هاوینانیش بەستێکی وشکوبرنگ.

* هەرچی زەکات و سـەرانەی جـاران بە ئاغاکان دراوە، لێرە بەدواوە، بۆ بارەگای بەتالیۆنی دێنن.

* کـە پەزەکانـی عەلی شـەعبانی فەرمانەدەی بەتالیۆنیـش، لە ئەنجامی لـەوەڕی نـاو پووش و پـەلاش و دڕک و دالـی پاییزاندا، نووسـەکە[٢١٥] لە خوریەکانیانـەوە دەئالـێ، ئەرکـی هەمووتانـە، بەنۆرە بێن و پـەزەکان لە نووسەکە پاکەنەوە.

مـن لـە پۆلی سـێی ناوەندی بووم، لەگـەڵ ژمارەیەک خەڵکـی تردا، لە بەیانیـەوە تا ئێوارە، هەر نووسـەکەمان لە مەڕەکان کـردەوە... کە ئێوارە دەسـتمان لـە نووسـەکە لێکردنـەوە هەڵگرت، هـەردوو دەسـتم، خوێنی تێهەڵچەقینی نووسەکەیان لێدەچۆڕا.

دەورانـی حوکمڕانی عەلـی شـەعبان تەواودەبێ، دەورانی دەسـەڵاتی ئەنوەربەگ دەستپێدەکات.

لە یەکێک لە ڕۆژەکانی بەهاری ١٩٨٣دا، مینێک لە ژێر پێچکەی ئۆتۆمبیلی یـەک لە کوڕەکانی ئەنوەربەگدا دەتەقێتـەوە و هەر لە جێدا دەیکوژێ. هەر ئـەو کاتە، چەکدارەکانی ئەنوەربەگ، هەڵدەکوتنە سـەر کوێخا ڕەسـوڵ و بەبەرچـاوی بارەگای بەعس و ئەمنەکانی ناوشـاری ڕانیەوە، قۆڵبەسـتی دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا، بەرەو بێتواتەی دەهێنن.

کوێخـا ڕەسـوڵ، یـەک لـە کەسـایەتیە نیشـتمانپەروەر و بەڕێزەکانی بێتواتەیە... بەهۆی جیاوازیی کەسایەتی و هەڵوێستیەوە، لەگەڵ ئەنوەربەگدا هەڵناکاو، وەک باوکی پێشـمەرگەیەکیش، بۆ خۆلادان، لەگڕیشـە و گێچەڵی ئەنوەربەگ،ماڵی دەباتە ڕانیە و، لەوێ خۆی بەدووکانێکی چکۆلەوە خەریک دەکا.

چەکـدارەکان، لـە نیـوەی ڕێـگادا، کوێخا ڕەسـوڵ لـە ئۆتۆمبیلەکەیان دێننەخـوارێ و، تا بێتواتە بە دوای ئۆتۆمبیلدا ڕادیدەکێشـن. تا دەیگەیەننە بێتواتــە، نەک هەرجلەکانی، هەموو ئازای جەستەشـی زیواڵ زیواڵ دەبێ... بەوەش دڵیان ئاوناخواتەوە، لەو شـوێنەدا کە چوار هەزارو سـەد سـاڵێک لەوەوبـەر، نەمـرود، مەنجەنیقێـک بـۆ ئیبراهیم دادەخـات، ئەمانیش چەند کیلۆمەترێـک بـەولاوە، تەرمـی کوێخـا ڕەسـوڵ دەخەنە سـەر کۆمەڵێک

٢١٥- نووسەکە: تووێکی دڕکاوی گیایەکە بە خوری وموی بزنەوە دەلکێ.

چیلکەودار، دەبەیەک بەنزینی پێدادەکەن... ژنە ئامۆزایەکی کوێخا ڕەسـوڵ دێنن و بەزەبری لوولەی تفەنگ، ناچاری دەکەن، بە دەسـتی خۆی ئاگر لە جەستەی کوێخا ڕەسوڵی ئامۆزای خۆی بەربدا.

ئەو تاوانە، ویژدانی هەموو کەسێکی ئەو دەڤەرەی هەژاند... هەر بۆیەش وەختێک پێشـمەرگە پەلامـاری بێتواتەیاندا، پشـتیوانی هەموو خەڵکی ئەو ناوەیان لەگەڵدابوو، بە خەڵکی ئەو گوندانەشـەوە کە ئەنوەربەگ، لەوچەند مانگەی ڕابردوودا، بەزۆر چەکی جاشایەتی پێهەڵگرتبوون.

لەو چالاکیەدا، پتر لە دوو هەزار چەکی قورس و سووک و تەقەمەنیەکی زۆریش دەکەوێتە دەستی پێشمەرگە.

ئەو چالاکیە تا ئەو کاتە، گەورەترین سـەرکەوتنی پێشمەرگەبوو بەسەر هێزەکانـی دوژمنـدا و دەنگدانەوەیەکی گەورەشـی لەنـاو خەڵک و هێزی پێشمەرگەدا درووستکرد.

سـەرباری ئەوەش، پێگەی یەکێتیشـی لەناو خەڵک و لەباری سیاسی و سەربازیشەوە، بۆ هەر هەنگاوێکی دواتر قایمترکرد.

ئەوەی ئاوێنەی ئەو سـەرکەوتنەی کەمێک لێڵ کـرد، ڕەفتاری نابەجێی هەندێ فەرماندە و پێشمەرگەی نابەرپرس بوو.

هێشـتا جاشـەکان لە شـکان و هەڵاتندابوون، لەبری ئەوەی لە ئەگەری هێرشـی پێچەوانەدا، سـەنگەرەکان قایم بکرێن، ڕاوڕووت و ماڵ تاڵانکردن دەسـتپێکرد، بەماڵی ئەو ئەندامانەی ڕێکخسـتنی نهێنی ناو بێتواتەشـەوە کە لە دارشـتن و جێبەجێکردنی نەخشـەی ئەو سـەرکەوتنەدا بەشـداریی کاریگەریان هەبوو.

لەو تاڵان و بڕۆیەدا:

* دەرگای داخراوی ماڵان شـکێنران... هەرچیەک لەو ماڵانەدا بوو، بەر شاڵاوی تاڵانکردن کەوت.

* دەیان ڕەز و باخ سووتێنران.

* ژمارەیەکی زۆری خانوو، ئاگریان تێبەردرا.

* مریشک و مانگا و بزن و مەڕ و وڵاخەبەرزش بران.

* فەرش و یەخچاڵ، بە کۆڵ بۆ پشتەوەی بەرەی شەڕ گوازرانەوە.

* چەک وتەقەمەنییەکی زۆر وەلانرا.

* ژمارەیەک دیل کوژران... بەشــێک لەو دیلانە ئەو خەڵکانەبوون کە بە زۆر چەکی جاشایەتیان پێکرابووە شان.

لەوەش ناخۆشــتر، هەموو ئەو فەرماندە و پێشــمەرگانەی لەو کارانەدا بەشداربوون، نە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کرا و نەسزاش دران.

## ٦٧

دەنگدانەوەی سەرکەوتنەکەی بێتواتە بەردەوامە و دەنگۆی جیابوونەوە دەستپێدەکات. برایم جەلال، دەنگۆی جیابوونەوەی مەلا بەختیار و سالارعەزیز و ئەوان، دەگەیەنێتە ناوەندی کۆمەڵە و مام جەلال.

مەلا بەختیار، بەرپرسی مەڵبەندی یەکە و بارەگای مەڵبەندیش لە گوندی (حاجی مامەند)ی شارباژێڕە. لە دوای کۆنفرانسی کۆمەڵەوە، ئەو ناوچەیە و بەتایبەتیش گوندی حاجی مامەند و (پارەزان)، بونەتە مەڵبەندی کۆبونەوەی زۆرێک لەو فەرماندە و بەرپرس و کادیر و پێشمەرگانەی کێشەی فکرییان لەگەڵ کۆمەڵەدا هەبوو یان لە سیاسەت و دەسەڵاتەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە نارازیبوون. لەپاڵ ئەمانیشدا، ژمارەیەک خەڵکی دیکەش هەبوون، یان بڕوایان بە کۆمەڵە نەمابوو، یان تاقەتیان لە پێشمەرگایەتی چووبوو...

ئەو کۆڕوکۆبوونەوە فیکری و سیاسیانەی لەوێ بەڕێوە دەچوون، دەنگۆی خۆڕێکخستن و جیابوونەوەیان لێدەکەوتەوە.

ملازم عومەر، ئەگەرچی بەهۆی ملاملانێکانی ناو کۆمەڵە و هاوڕێیەتی زۆریشی لەگەڵ مەلا بەختیار و سالار عەزیز و ئەواندا، لای هەندێک، لەسەر ئەو بەرەیە حساب دەکرا، بەڵام ئەوەندەی من دەمناسی، پەیوەندیەکی وای بەو کێشە فیکری و سیاسی و کەسییانەی نێوان ئەو دوو بەرەیەوە نەبوو... لە هەمانکاتیشدا پەیوەندی لەگەڵ مام جەلال و نەوشیروان مستەفاشدا زۆرخۆش بوو.

ملازم عومەر، نەک هەر لەگەڵ مل لەبەرملنانی ناوخۆی کۆمەڵە و یەکێتی نیە، جیا لە مەلا بەختیار و سالار عەزیز و ئەوانی دیش، بڕوای بەشەڕی لایەنەکانی دیکەش نیە، ئەوەندەی من ئاگام لێیە، هەتا توانیویەتی، بەشداری و سەرپەرشتی هیچ لەو شەڕە ناوخۆییانەی نەکردووە. تەنانەت بەشداری شەڕی قڕناقاو پشتئاشانیشی نەکرد و دەیگوت"من نامەوێت لە مێژوودا بە شێوعی کوژ ناوببرێم."

دەنگـۆی جیابوونـەوە، مـلازم عومەر نیگەرانـدەکا، دەیـەوێ هەرچی زووە بگاتە شـارباژێر و ئـەو برادەرانەی ئەوێ، لەهـەر بیرکردنەوەیەکی جیابوونەوە، ئەگەر هەیانبێ پەشیمان کاتەوە.

مـلازم عومـەر، کـە دەیزانی منیش سـەبارەت بـەو بابەتانـە، هەمان هەڵوێست و بیرکردنەوەی ئەوم، هەیە و، لە هەمان کاتیشدا، هاورێیەتیەکی نزیکم لەگەڵ مەلا بەختیار و زۆربەی ئەوانی کەشدا هەیە، دەیەوێ منیش بـۆ ئەو سـەفەرە لەگەڵ خۆیدا بـەرێ. زۆر نەبوو لە سـەفەری ناوچەی خۆشـناوەتی گەڕابوومەوە، بۆیە بۆ من نەدەلوا، بۆ مودەتێکی دیکەش لە ڕادیۆ دووربکەومەوە... سەفەرەکەم لە نووسینی نامەیەکدا کورتدەکەمەوە. بەڕلەوەش بێتە لای من، سەردانی ئازاد هەورامی کردبوو... هەمان هەوڵی لەگـەڵ ئەویشـا دابـوو، دیاربوو ئەویش لـە ڕێی نووسـینی نامەیەکەوە، بیـروڕا و بۆچوون و سـەرنجەکانی خۆی بـۆ دەربڕیبوون. من نامەکەی ئـەوم نەدی، بـەڵام دەمزانی چـۆن بیردەکاتەوە. لەوەوپێـش، زۆرجاران لەسـەر ئـەو بابەتە و زۆربابەتی دیکەش، قسـەی زۆرمـان کردبوون ... مـن دەمزانی ئەویش لە زۆر سیاسـەت و هەڵوێسـتی کۆمەڵـە و یەکێتی نیگـەران و ناڕازیە... بەڵام دەشـمزانی، نیگەرانیەکانـی چەندیش زۆربن، ناگەنـە ئەوەی بۆ جیابوونەوە یـان درووسـتکردنی ڕێکخراوێکی جیا لە کۆمەڵە، پاسـاوێک ببینێ...

کە من لەسەفەری بەری مەرگە گەڕامەوە، هەمووی چەند ڕۆژێک بەسەر کۆتایهاتنی کارەکانی دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا ڕەتببوو... بەر لەوەی هیچ لەو هاورێیانەی تر ببینم کە دەمویست لە دەمی ئەوانەوە، دیوی ناوەی ڕووداوەکانـی نـاو کۆنفرانس بژنەڤم ئازاد هەورامیـم دی. بینینی ئەو، بەر لـە بینینی ئەوانی تر، ڕێکەوتێکی باشـبوو بۆ مـن. ئاخر ئەو، بابەتیانەتر لە هەمووان، بەسەرهاتەکانی ناو کۆنفرانسم دەخاتە بەر دەست.

"بەختـت هەبوو لێرە نەبـووی، دەنا تۆش لەو کۆبوونەوەیەدا بەشـدار دەبـووی... کۆنفرانس بە پێی ئەو نەخشـەیە بەڕێوەچوو کە برادەرانی باڵا دەسـت کێشـابوویان... ئەوەش برادەرەکانی ئێمەی تەواو بـێ ئومێد کرد... هەر بۆیەش، لە دوایین شـەوی کۆنفرانسـدا، کۆبوونەوەیـەک ڕێکخرا. هەر یەک لە ملازم عومەر، مەلا بەختیار، سـالار عەزیز، بەکری حاجی سـەفەر، شـێخ عەلی، مامۆستا پشـکۆ، حاجی مەمۆ و من بەشداربووین. لەوێدا باس لەوەکرا کە ئەگەر کار وابڕوا، کاک نەوشیروان، بە پشتیوانی گروپی زیندان و بەموبارەکەی مام جەلال، هەر هەموومان دەردەپەڕێنن و کۆنترۆلی کۆمەڵە بەتەواوەتی ئەخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە... ئەو کاتە کۆمەڵە بەو ئاڕاستەیەدا

ئەبەن کە خۆیان هەر لە سەرەتاوە بەرنامەیان بۆ داناوە... ئیتر ئەبێ دەست لــە ئایدیۆلۆژیــا و ناوەڕۆکە چینایەتیەکەی کۆمەڵە بشـۆین و ئەو توێژەڵە چینایەتیەشــی نامێنێ کە هەیەتی. ئەوان ترســی ئەوەیان هەیە کە تا بەستنی کۆنفرانســێکی تر، هــەر هەموویان پەراوێــز بخرێن و دەنــگ و ڕەنگیان لە سەرکردایەتی کۆمەڵە و لە درووستکردنی بڕیاردا نەمێنێ." کەمێک وەستاو ئینجا بە تۆنێکی غەمگینەوە، درێژەی بەقســەکانی خۆیدا: "من لە نیگەرانی و ناڕەزاییەکانیان تێئەگەم و تا ئەندازەیەکیش، ناهەقییان ناگرم، بەڵام ترسی من لەوەدایە کە ئەو نیگەرانیانەی ئەو برادەرانە هەیانە، بیانگەیەنێتە شوێنێکی وا کە خۆڕێکخستن و جیابوونەوە بە چارەسەر بزانن... زۆر قسە لەسەر ئەو شــتانە کرا، قسەکان بە ئاقارێکدا ئەڕۆیشــتن، منیان تەواو بێتاقەت کرد، تا وایلێهات چیتر تەحەمولی دانیشــتنم نەماو، هەر وەک ناڕەزایی دەربڕینیش، کۆبوونەوەکەم بەجێهێشت."

دوای کەمێک بێدەنگی، ئەمجارە بە تۆنێکی کەمێک نزیک لە هەڵچوونەوە، ووتی:

"ئاخــر چ شــتێکی فیکــری و سیاســی مــن بــە شــێخ عەلــی و حاجی مەمۆو فلان و فیســارەوە دەبەســتێ!! ڕاســتە من لە هەندێ سیاســەت و هەڵوێســت و بیرکردنەوەی کاک نەوشــیروان ناڕازیم... هەرشتێکیشــم بە هەڵەوناڕاســت زانیبێ، لە بەرامبەریــدا بێدەنگ نەبووم، بەڵام قەت ئەوە و بیرکردنــەوەی جیا، پاڵ بەمنەوە نانێن، بیر لە ڕێکخســتنی جیا بکەمەوە.... ئەو برادەرانە سەیرن، وا دەزانن کە تۆ لە هاوڕێیەتیدا لە مان نزیکتری و فەزڵی هاوڕێیەتی ئەمان ئەدەی بەســەر هاوڕێیەتی ئەوانی تردا، ئیتر ئەبێ لە سیاسەت و شتەکانی تریشدا، هەر لە گەڵیاندا بیت."

هــەر بۆیــەش وا مەزەندە دەکــەم، ئــەو بیروبۆچونانەی لــە نامەکەیدا دەربڕیبڕیون، لەوانەی من بەتەمای نووسینیانم زۆر نزیکبن.

ئیــدی لەو هەڵوێســتەی بەدواوە، ئــەو هێڵە جیاکەرەوەیــەم دەبینی کە دەکەوتە نێوان ئەم و هەردوو بەرەی ڕکابەری ناو کۆمەڵەوە.

بەرلــەوەی نامەکــەم بپێچمەوە و تێپی تێوە بئاڵێنــم، بۆ ملازم عومەری دەخوێنمەوە.

دوای ســەلام و کــەلام، بۆچوونەکانی خۆم لە شــێوەی چەنــد خاڵێکدا دەخەمە ڕوو:

* باوەڕناکەم، ئێوە بیر لە جیابوونەوە بکەنەوە. من پێم وایە ئەو شتانەی سەبارەت بەجیابوونەوە، لەسەر ئێوە دەووترێن، لە گفتوگۆی چەند کەسێکی ناو بارەگاکان، بەتایبەتیش بارەگاکانی پاڕەزان تێناپەڕێ.

ئەو دەنگۆیانە، ڕاستبن یان نا، هەر بۆ خۆی خڕبوونەوەی ئەو هەموو خەڵکە نارازیە، لەناو ئەو بارەگایانەی لای ئێوەدا، گومانەکانی دژەکانتان لەسەر تۆختر دەکاتەوە.

* خۆ ئەگەر لای هەندێکیش نیەتێکی لەو جۆرە هەبێ، هەم کۆمەڵە زیان دەکا و هەم یەکێتیش، بەڵام لەوانیش زیاتر، ئەوانە زیاندەکەن کە بڕیاری جیابوونەوە دەدەن. ئەگەر هەر لە نزیکی خۆمانەوە سەیرکەین، هەموو ئەو لایەنانەی جیابوونەتەوە، چەندیش پاساوی فیکری و سیاسی و شتی تریان هەبووبێ، چەندیش لەسەرەتادا، بەهێز دەرکەوتبن، دواجار توانای بەردەوام بوونیان نەماوە... یان لەبەریەک هەڵوەشاونەتەوە، یان گەڕاونەتەوە ناو حیزبی دایک، یانیش چوونەتە بەرەی دژەوە. دیارترین ئەو نموونانەش، جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانە لەو باڵەی مەلا مستەفا ڕابەرایەتی دەکرد.

* یەکێتی بەگشتی و کۆمەڵەش بەتایبەتی، بەو هەموو ڕێکخستن و پێشمەرگەو پەیوەندی و ئیمکانیاتەی هەیانە، هێشتا ئەوەنین، خەونی گەورەیان پێوە ببینرێ. ئینجا وەرەو ڕێکخراوێکیش لەوان جیاببێتەوە!!

* ئەگەر ئێوە بەرنامەی جیابوونەوەتان هەبێ، یەکێتی هەروا بەسووک و ئاسانی وازتان لێناهێنێ. هێشتا کفنی جیابوونەوەی بزووتنەوە(باڵی ڕەسوڵ مامەند) زەرد نەببوو، ئێوە، سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵەش، هەموو لە دوای ئەو جیابوونەوەیە، پەنجەی پەشیمانیتان دەگەست. پەشیمان بوون لەوەی کە لەبری ڕێدان بەوەی بەئاسانی لە یەکێتی بچنە دەرەوەو هێزی پێشمەرگە دوولەت کەن، لە ڕەگوڕیشەوە هەڵتان نەکێشان. دڵنیابن ئەوەی لەگەڵ ئەواندا نەکرا و بە هەڵەیەکی کوشندە لە قەڵەم درا، ئەو هەڵەیە لەگەڵ ئێوەدا، دووبارە نابێتەوە.

* مام جەلال بۆ خۆی بەتایبەتی و هەندێک لە سەرکردەکانی کۆمەڵەش، شارەزایی و ئەزموونی زۆریان لە ململانێ و تێکشکاندنی نەیارو ڕکابەرەکانیاندا هەیە... لەوەش زیاتر، لە بەگژداچوونەوەی نەیارەکانیاندا و لە بەکارهێنانی هەر ئامراز و لە گرتنەبەری هەر ڕێگایەکدا دوودڵ نابن.

* ئێوە جیاببنەوە، وەک هێزێکی سەربەخۆ، چانسی مانەوەو

بەردەوامبوونتــان لەبەردەمــدا نیە. دواجار و بەناچــاری، دەخزێنە ناو ئەو بەرەیەوە، کە ساڵەهایە، خۆشتان بە بەرەی کۆنە پەرستی و دژە شۆڕشیان دەزانن.

* ناڵێــم لەنــاو یەکێتی و کۆمەڵەدا نارەزایی نیــە... بەڵێ هەیەو زۆریش هەیــە... بەڵام ئەونارەزاییانــە، زۆربەیان بنەمای فیکری و سیاســیان نیە... هەن هۆکاری خودی و شەخسیان هەیەو بە دوای کوێرە ڕێیەکدا دەگەڕێن بیانباتەوە سەر شارێی دەسەڵات، هەشن هەر خۆیان تاقەتی پێشمەرگایەتیان نەماوەو، بەدوای دەریچە و بەهانەیەکدا دەگەڕێن، بۆ تەســلیم بوونەوە بێ یــان بۆ چوونە هەنــدەران. حەتمەن ئەو جۆرە خەڵکانــە، ئەوەندەی بۆیان بکرێ، بەئاراستەی جیابوونەوەدا هانتان دەدەن.

* زۆرێک لەو فەرماندە ســەربازی و تەنانەت کادیرە سیاســیانەش کە ئێوە حسابیان لەسەردەکەن، لە کاتی بڕیاری جدی و یەکلاکەرەوەدا، لەگەڵ ئێوەدا نامێنن.

* تــۆ وەک هــەر کەســێک و، وەک خۆشــت، هەقــت هەیە، خــەون بە رابەرایەتیکردنی کۆمەڵەو یەکیەتیشــەوە ببینی و پێتوابێ، لە مام جەلال و نەوشیروان مســتەفاش، باشــتر ئیدارەی کۆمەڵە و یەکێتی دەدەی...بەڵام هــەر ماف بــە تەنیا، ئەو خەونانەت بۆ دەســتەبەر نــاکات... ئەوە کات و ئەزموون و توانا و لێهاتوویی و ســەبر و تەحەمولی زۆری دەوێ. ئەگەر تەماشای ئەزموونی مام جەلال و ئیبراهیم ئەحمەد کەین، ئیبراهیم ئەحمەد کەســی یەکەمی ناو باڵی مەکتەبی سیاســی پارتی بوو. مام جەلال کەســی یەکەم نەبوو، بەڵام لە هەمووان دیارتر و چالاک تر و کاریگەرتربوو... هەر بۆیەش، باڵی مەکتەبی سیاسی بە جەلالی ناسرا نەک ئیبراهیمی. ڕەنگە مام جــەلال هەر لە ســەرەتای جیابوونەوەیاندا لە باڵی مەلا مســتەفا، توانیبای خۆی بکاتە کەسی یەکەم، بەڵام واینەکرد. ڕەنگە ئەگەر وایکردبا، نەیتوانیبا، ببێتە ئەو مام جەلالەی ئێستا هەیە.

سەدام حوسەین، زۆر پێش ساڵی ١٩٧٩ دەیتوانی، ئەحمەد حەسەن بەکر لەسەرۆکایەتی حیزب و دەوڵەت لاداو، خۆی بچێتە شوێنی ئەو... دەیتوانی ئەوەبکا، بەڵام نەیکرد... نەیکرد و یانزە ساڵی ڕەبەقیش چاوەڕێی کرد.

نامەکەم بۆ مەلا بەختیار، بەوە کۆتایی پێهێنا:

هیوادارم هەموو ئەو قسانەی سەبارەت بە جیابوونەوەی ئێوە دەکرێن، هیچ ڕاســتیەکیان تێدا نەبێ. خۆ ئەگەر خوانەکردە، ئەو قسانە ڕاستبن و لە

ئەنجامدا جیابوونەوە ڕوویدا، دەبێ ئەوە بزانی کە بەرپرسیارێتی سەرەکی، لەو جیابوونەوەیەدا، دەکەوێتە ئەستۆی تۆ. ئەوە دەڵێم و قەناعەتی تەواویشم بەوە هەیە کە هیچ کەسێک لەوانەی دەنگۆی هەوڵی جیابوونەوەیان لەسەرە، هەر لە (سـالار عەزیز و مامۆسـتا جافر و شـێخ عەلی)ەوە، تا ئەوانی تر، چەندیش پاساوی بەهێزیان هەبێ، بەبێ تۆ، ئەو کارە ئەنجام نادەن.

بەبـڕوای من، هەر ئەو بەرپرسـیاریەتیەش لێتدەخوازێ، تەنانەت ئەگەر غایلەیەکـی بچووکی جیابوونەوەش بـە خەیاڵتدا گوزەری کردبێ، هەقە بۆ بەرژەوەندیی خۆت و کۆمەڵە و یەکێتی وازی لێبێنی.

## ٦٨

ئـــەو ڕێگایـــەی دوو مانگێـــک لەمەوبەر، بە دوو شـــەو و بە دوو ڕۆژان، بەپێیان بڕیمان، ئەوەتا ئیمڕۆ بەسواری ئەم ئۆتۆمبیلە سەربازییە، تەنانەت دوو کاژێریشـــی نەخایانـــد. خۆ ئەگەر ئـــەو تۆزە لادانەی نـــاو چوارقوڕنە نەبا، زۆر لەوە کەمتریشـــمان پێدەچوو. ئەو ئۆتۆمبیلە ســـەربازییەی ئێستا لەناویدایـن، هەر دەتوانێ تا ئەو شـــوێنەمان بەرێ... کەسنوری پێشمەرگە دەســـتپێدەکات... لـــەوێ بەدواوە، دەبێ بەو ئۆتۆمبێلـــە مەدەنییە، بڕۆین کە ئەوەتا بۆ بەکرێگرتنی لە چوارقوڕنە لاماندااوە.

هەر ئەوەندەمان خۆشە تا چەند کەسێک دەمناسنەوە... لەماوەی ئەو چەند خولەکە کەمەدا، خەڵکێکی ئەوەندە زۆرمان لێ کۆدەبێتەوە، ئۆتۆمبێلەکەمان دەرفەتی جوولەی نامێنێ... خەڵکەکە تامەزرۆی بیســـتنی هەواڵی دروســـتی مفاوەزاتـــن... مـــام جەلال و وەفدی یاوەری، هەمـــووی دوو ڕۆژە لە بەغدا گەڕاونەوە... ئەوان گەڕاونەوە بەڵام جگە لە دەنگۆ، هیچ زانیارییەک لەسەر گفتوگۆ و ئاکامی ســـەردانی وەفدەکەی یەکێتی بڵاونەکراوەتەوە... تەنانەت ئێمەش لە ڕاگەیاندن، لەوە زیاتر نازانین کە خەڵکی بیستویەتی.

هەر لەناو ئۆتۆمبێلەکەوە، چەند قســـەیەکی گشتی بۆ خەڵکە وروژاوەکە دەکەیـــن. هـــەروا دێ و ئاپۆرای خەڵک زیـــاد دەکا... خەریکە قەرەباڵغییەکە شـــێوەی خۆپیشـــاندان لەخـــۆ دەگرێـــت. تۆمارگەکـــەی بەرامبەرمـــان، لـــە بڵندگۆکانیەوە ســـرودی هەســـتبزوێن و نیشتمانی پەخشـــدەکا... ئەو چەند جاشـــەی لەســـەر فولکەکە وەســـتاون و بە ترس و دڕدۆنگیـــەوە دەڕواننە دیمەنـــی ئێمـــە و ئاپـــۆرای خەڵـــک، لە ترســـی ئـــەوەی نەوا حەشـــامەتەکە حەماسەتی زیاتر بیانگرێ و پەلاماریان دەن، ملیان نەوی دەکەن و، خۆیان لەناو کۆڵانی پشتی مزگەوتەکەدا وندەکەن.

هەتاکـــو دێ، خڕبوونـــەوەی خەڵکەکـــە بـــەرەو زیادبـــوون دەچـــێ ... هەریەکەو دەیەوێ دڕ بە خەڵکەکەکانی پێش خۆی بدا تا لە نزیکەوە گوێی لە قســـەکانی ئێمە بێ... ئەو ئەفســـەرە عەرەبە هەواڵگریانەی ئیسکۆرتی[٢١٦] ئێمـــەن، لە قســـەکانی نێـــوان ئێمـــەو خەڵکەکـــە تێناگـــەن... حاڵینەبوون و دڵەڕاوکـــێ بـــە جووڵە و دەموچاویانـــەوە دیارە... هەڵبەتە لـــە ژیانی ئێمە

٢١٦- ئیسکۆرت: حیمایە، پاسەوان

دەترســن... دەترســن ها ئێســتا ها تۆزێکی تر خەڵکەکە پەلامارماندەن و ئەوانیش نەتوانن ســەلامەتی ئێمە بپارێزن... وادەزانن ئەو خەڵکەش وەک خۆیــان ئێمــە بە (موخەڕیــب) دەزانن و بەتەمای ئازاردانمانــن... یەکێکیان خــۆی لە ئۆتۆمبێلەکە فڕێدەداتە خوارەوە و بە دەمانچەی هەڵکێشــراوەوە، بە عەرەبی هاوار لە خەڵکەکە دەکات:

«سەلامەتی ئەمان لە ئەســتۆی ئێمەدایە ... دوورکەونەوە... ڕێگامان بۆ چۆڵکەن با بڕۆین.»

کە هەڕەشــەی ئەمیان سودی نابێ، ئەفســەرەکەی تریان بە شڵەژانێکی زۆرترەوە، هەر لە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، میلی کلاشــینکۆفەکەی رادەکێشێ و بە دەنگێکی لەوەی پێشوو زبرتر، هەر بە عەرەبی هاوار دەکا:

«ئەگەر هەر ئێستا نەکشێنەوە، دەستڕێژتان لێدەکەم.»

ئەفســەرە هەواڵگرییــەکان، هەر بە راســتی دەترســێن و وادەزانن ئەو قەرەباڵغییە مەترسی بۆ سەر ژیانی ئێمە دروستکردووە.

"کــوڕە تەقــەی چی لە خەڵــک دەکەن!! وازیــان لێبێنن.. ئــەم خەڵکە بۆ پێشوازی ئێمە و بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی خۆیان وا دەکەن".

کــە ئەمــە بە ئەفســەرەکان دەڵێــم، ئەوەندەی تــر واقیــان وڕ دەمێنێ... چاوەکانیــان لەنێوان ئێمە و خەڵکەکەدا دێــن و دەچن... باوەڕ بە گوێ و بە چاوەکانی خۆیان ناکەن..

"یانی چی خەڵک بە بینینی ئێوە خۆشحاڵە؟!"، یەکێکیان لەبەرخۆیەوە وا دەڵێ.

بۆ ئەوەی شتێکی نەخوازراو نەقەومێ، تکا لە خەڵکەکە دەکەین، ڕێگامان بدەنێ، بڕۆین... بەو هیوایەی کە لەوسەر گەڕاینەوە، هەواڵی راست و دروستیان بــۆ بهێنینەوە، خەڵکەکە کەمێک ئارام دەبنــەوە. هەرئەوەندە، ئۆتۆمبێلەکە لە قەرەباڵغییەکە دەربازی دەبێ. یەک لە ئەفسەرەکان ڕوودەکاتە من:

- تۆ کوڕی مام جەلالی؟!

– نەخێر، من کوڕی مام جەلال نیم.

- ئەی ئەگەر کوڕی ئەو نیت، بۆ خەڵک ئەوەندە بایەختان پێدەدات؟!

بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەک بەوە بدەم کە من خۆجێیم و هەموویان دەمناسن، دەڵێم:

- ئاخر ئێوە نازانن خەڵک چەند پێشمەرگەی خۆشدەوێ... نەک هەر ئێمە، هەر پێشمەرگەیەکی تر ببینن، لەوە زیاتری بۆ دەکەن.

ئێستا لە ئاقاری بێتواتە ڕەتبووین و گەیشتوینەتە ئەو خاڵەی کە ئەفسەرە هەواڵگرییەکان، چیتر ناتوانن لەگەڵماندا بێن... لێرە بەدواوە ناوچەی ئازادە و چیدی خزمەتی ئەوانمان پێویست نابێ. خودا حافیزیان لێدەکەین... بەو ئۆتۆمبێلە مەدەنیەی گرتومانە، دوای کەمتر لە چارەکێک لە زیخان دادەبەزین.

چ گەشتێکی کورتو ئاسان بوو.

کە دوێنێ مام جەلال، لە ڕێی دەزگای بێتەلەوە، پێی گووتم: "بەیانی ئەم کاتانە، تۆ و یوسف لای من دەبن." باوەڕم نەدەکرد... "ئاخر چۆن بەو ماوە کەمە دەگەینە لای تۆ." لە دڵی خۆمدا وام بە خۆم وت. چەند قسەیەکی تری مام جەلال لەو دڵەڕاوکێیەی دەرهێنام:

" بەیانی زوو، تۆو یوسف، دەچنە سەربازگەی شەدەڵە، لەوێ هەموو شتێک تەرتیب کراوە، سبەی بۆ نیوەڕۆ بەسەلامەتی دەگەنە لای من... ئێستا پێویست ناکا باسی هیچتان بۆ بکەم، کە بەیانی هاتن هەموو ئەو شتانەتان بۆ باس دەکەم کە پێویستە بیزانن."

ئەوەتا بەم بەیانییە زووە، لەسەر قسەکەی مام جەلال، بەرەو سەربازگەی شەدەڵە، بە هەورازەکەی دابانـدا هەڵدەگەڕێین... ئەوەش شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە و ئەو مەفرەزە پێشمەرگەیەی، بە خۆیان و سەربازە دیلەکانەوە، هێواش هێواش لە پێشمانەوە بە پێچەکانی داباندا هەڵدەگەڕێن. ڕادەستکردنەوەی ئەو دیلانە نیشاندان و ئاماژەیەکی نیەتپاکی یەکێتیە لەبەرامبەر حکومەتدا. تۆزێکی تر دەگەینە سەری دابان، بەردەم ئەو ڕەبیانەی کە وەک ڕموزن چەندین ساڵە بەسەر ئەو لوتکانەوە هەڵتۆقیون. هەستێکی زۆر سەیر دامدەگرێت... هەستێکی تێکەڵ... کە سەربازەکانی بەردەم ڕەبیەکان دەمانبینن، دەبێ بەرخوردیان لەگەڵماندا چۆن بێ... تا دوێنێ گوللەمان بەیەکترەوە دەنا، ئەوەتا ئەمڕۆش دەستی ئاشتیو سڵاویان بۆ بەرز دەکەینەوە... ئیدی وایە گفتوگۆش شێوازێکی دیکەی شەڕە، بەڵام بە فۆرمێکی مەدەنیانە.

بەهـۆی خاویـی هەنگاونانی دیلەکانەوە، زۆری دەویّ تا گەینە سـەری زینووی دابان. یەکەم دیدارمان لەگەڵ حکومەتدا لە ڕێی ئەو سەربازانەوەیە کە بۆ بینینی ئێمە لەبەردەم ڕەبیەی سـەر ڕێگاکە وەسـتاون. بایی ئەوەی هەریەکەو چەند قومە ئاوێک بخۆینەوە دەوەستین... دواتر بە نشێوەکەدا شۆڕ دەبینەوە... سەربازگەکە دەردەکەویّ و زۆر نابا دەگەینە ئەویّ. ژمارەیەک ئەفسـەرو بەرپـرس، لە پێشـوازی ئێمەدا، لـە دەروازەی سـەربازگەکەدا وەستاون...هەندێکیان چەند مەترێک بەپیرمانەوە دێن.. باوەشمان پێدا دەکەن، ئەملاو ئەولای یەکدی ماچدەکەین... چواریان خۆیانمان پێدەناسێنن:

- عەقید ئیحسان ئەلدیری، بەرپرسی دەزگای هەواڵگریی کەرکوک.

- رائید عەبد عەلی، بەرپرسی هەواڵگریی سەربازیی سلێمانی.

- عەمید فالح عەبدولئەمیر، فەرماندەی فەوجی شەدەڵە.

- ئەفسەرێکی دیکەش کە ناویم بیر نەماوە. ئێمەش:

- شـێخ عەبدولکەریـم، ئەندامی مەڵبەنـدی دووی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان.

- یوسـف زۆزانـی، ئەندامـی دەزگای راگەیاندنی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان.

- هەڤاڵ کوێسـتانی، ئەندامـی دەزگای راگەیاندنی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان.

- فەرمانـدەی ئـەو پێشـمەرگانەش کە بـۆ رادەسـتکردنەوەی دیلەکان هاتبوون.

ئەوەی لەم دیمەنەدا مایەی سەرسوڕمانی منە، بەو گەرمیە پێشوازیی لە ئێمە دەکریّ و بەو ساردیەش لە سەربازە دیلەکان... نەک هەر فەرماندەکان، تەنانەت سەربازەکانیش، هیچ ڕێزێک بەرامبەریان نیشان نادەن.

لای ئێمە ئەگەر پێشـمەرگەیەکی دیل بە ئازادکراوی بگەڕێتەوە ناومان، ئەوەنـدە لەباوەشـی دەکەین‌و ئەملاولای ماچدەکەین، هەر مەپرسـە.. ئێمە ئاواین و ئەمانەش ئاوان... تەنانەت ئامادەی تەوقەیەکی ساردیش نین لەگەڵ دیلە هاوپیشەکانی خۆیاندا.

رووده‌كه‌مه‌ یوسف زۆزانی، به‌جۆرێک له‌ سه‌رسامیه‌وه‌ ده‌ڵێم:

- ئه‌رێ مامه‌ڵه‌ی ئه‌مانه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌و دیلانه‌دا، بۆ ئاوایه‌؟

. ئاخر ئه‌مانه‌، وه‌كو ترسنۆک و به‌زیو ته‌ماشای دیله‌كانی خۆیان ده‌كه‌ن... له‌وه‌ش زیاتر، ئیحتیماله‌، گومانی شتی تریشیان لێبكه‌ن... هه‌رئه‌وه‌نده‌ش له‌ ئێمــه‌ دابڕان، ده‌یانخه‌نه‌ زیندانه‌وه‌، تــا لێكۆڵینه‌وه‌ی وردیان له‌گه‌ڵدا نه‌كه‌ن، نایانگێڕنه‌وه‌ وه‌حده‌كانی خۆیان.

دیله‌كان راده‌ست ده‌كرێن... پێشمه‌رگه‌كان ده‌برێنه‌ كانتینی[٢١٧] سه‌ربازه‌كان... ئێمه‌و فه‌رمانده‌كانی ئه‌وانیش، به‌ده‌م هه‌ندێ موجامه‌له‌ی به‌تاڵه‌وه‌ به‌ره‌و ئه‌و هۆڵه‌ ده‌چین كه‌ نانی به‌یانیان، بۆ ئێمه‌ تێدا ئاماده‌ كردوه‌.

هه‌رچــی خواردنــی به‌یانیانه‌ و ئێمه‌ له‌و چه‌ند ســاڵه‌ی پێشــمه‌رگایه‌تیدا له‌ خه‌ویشــدا نه‌ماندیون، لێره‌ به‌ســه‌ر ئه‌و مێزه‌ گه‌وره‌یه‌وه‌، به‌شــێوه‌یه‌كی ســه‌رنجڕاكێش دانراون... چه‌ند له‌گه‌نێک كه‌لله‌و پاچه‌، په‌نیری جۆراو جۆر، قه‌یماغ و ماســتو كــه‌ره‌، گوێزو زه‌یتونو هێلكه‌و هه‌نگوین، هه‌شــت بوتڵ ئاوو هه‌شت په‌رداخی پڕ له‌ ئاوی پرته‌قاڵ.

به‌و ریزبه‌ندیه‌ی ئێمه‌یان به‌ســه‌ر كورسیه‌كانی ده‌وری مێزه‌كه‌دا داناوه‌، من كه‌وتومه‌ته‌ به‌رامبه‌ر عه‌قید ئیحسان... ئه‌و له‌ هه‌موان زیاتر موجامه‌له‌مان ده‌كات... بــه‌ر لــه‌وه‌ی فه‌رمــووی قاوه‌ڵتیمان لێبكه‌ن، كه‌ســێک به‌ كامێرای ڤیدیۆیی دێته‌ ژوورێ و ده‌ست به‌ وێنه‌گرتن ده‌كا... عه‌قید ئیحسان ده‌یه‌وێ بــه‌ چه‌ند كۆمێنتێكی نوكته‌ ئامێز، جه‌وه‌كــه‌ بۆ وێنه‌گرتن پێكه‌نیناوی كات... رووده‌كاته‌ هه‌مووان و به‌ جۆرێک له‌ ته‌وسه‌وه‌ ده‌ڵێ:

- ئێوه‌ی پێشــمه‌رگه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی هیچ پله‌ و نیشــانێک به‌ســه‌ر شان و قۆڵتانه‌وه‌ نییه‌، بۆ ئێمه‌ ئاسان نابێ، بزانین كێ چییه‌... ئه‌ری به‌ڕاست چۆن به‌رپرس له‌ پێشمه‌رگه‌یه‌كی ئاسایی جیاده‌كرێته‌وه‌؟!

شێخ عه‌بدولكه‌ریم وه‌ڵامی پرسیاره‌كه‌ ده‌گرێته‌ ئه‌ستۆی خۆی:

. ئاخــر ئێمــه‌ هه‌موومــان یه‌كتری ده‌ناســین، هه‌موو كــه‌س ده‌زانێ كێ چییه‌و چی نیه‌.

عه‌قید ئیحســان، حه‌ز ناكا وه‌ڵامه‌كه‌ ئه‌وه‌نده‌ جدی بێ، بۆیه‌ به‌ جۆرێک له‌ لاقرتێوه‌ ده‌ڵێ:

٢١٧ - كانتین: حانوت

- بەڕاستی من وامدەزانی لەڕێی تەزبیحەکانتانەوە پلەبەندیتان دەردەکەوێ.

بێ ئەوەی هێشتا کەسمان هیچ بڵێین، ئەو بە پەنجەکانی دەستی ڕاستی، ئاماژە بۆ تەزبیحە قەزوانە درێژەکەی دەستی شێخ عەبدولکەریم دەکا.

- من وامدەزانی ئەوەی تەزبیحەکەی درێژتر بێ، بەرپرسیارێتیەکەی زیاترە.

ئەم لاتاوەی عەقید ئیحسان، هەموو ئەوانەی بە تەنیشت ئەمەوە دانیشتون، دەخاتە قاقای پێکەنین... بەری ئێمە بێدەنگەو منیش خۆم بۆ ناگیرێو هەڵدەدەمێ:

- ڕەنگە ئەوەی تۆ دەیڵێی وابێ... ئێوە ئەزموون و مێژووتان لەگەڵ تەزبیحدا زۆرترە.

وەک ئەوەی جامێک ئاوی سارد بەسەری هەر یەکێکیاندا بکەی، سەیرێکی یەکتری دەکەن و لە قاقا لێدان دەوەستن...

عەقید ئیحسان، بۆ ئەوەی دەستپێشخەریەکە هەر لەدەستی خۆیدا بمێنێتەوە، کۆمێنتەکەی من زۆر ئاسایی وەردەگرێت... لانی کەم وا نیشاندەدا ئاسایی وەریگرتووە... بەزەردەخەنەیەکی ماناداراوە سەیرم دەکا، وەک ئەوەی بڵێ "با بۆت لەناو دوو نانی گەرمدا بێت." ئینجا دەڵێ:

- حەزم لە وەڵامی ئاوایە.

فەرموی نانخواردنمان لێدەکەن... عەقید ئیحسان ڕوودەکاتە من:

- ڕەنگە دەمێک بێ پاچەت نەخواردبێ!

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بکا، بەو چەتاڵە گەورەیەی بەسەر لەگەنی[218] پاچەکەوەیە، پارچەیەک زمان هەڵدەگرێو دەیخاتە سەر قاپەکەی من.

بە بزەیەکی شەیتانانەشەوە دەڵێ:

- فەرموو، تۆ ئیعلامیت، ڕەنگە زمان بۆتۆ زۆر بەکەڵک بێ.

- سپاست دەکەم... هەرچەندە من ئەهلی قەڵەمم بەڵام لە ڕاستیدا

---

٢١٨ ـ لەگەن: قاپ، زیاتر بە قاپی گەورە دەوترێت.

زمانیشم زۆر پێویستە.

ئـەم دایالۆگەی نێوان من و ئەو جارێکی تر دەنگی پێکەنین لە ریزەکەی ئەوانـدا بـەرز دەکاتەوە... بەرلـەوەی لێگەڕێم پێکەنینەکەیـان زیاتر درێژە بکێشێ، دەڵێم:

- سـوپاس بـۆ هەڵبژاردنەکـەی تۆ، تـۆ خزمەتت کـردمو دەبێ منیش بەگوێرەی دابو نەریتی کوردەواری خزمەتت بکەمەوە.

بە هەمان چەتاڵی سـەر پاچەکە، پارچەیەک مۆخ دەخەمە سەر قاپەکەی بەردەمیو بەجۆرێک لەخۆ رازیبوونەوە دەڵێم:

- فەرموو جەنابی عەقید، حەتمەن ئەمەش بۆ تۆ پێویستە.

ئـەم لاتـاوە، پێکەنینەکەی لەبەری ئەوانەوە بۆ بەری ئێمە گواسـتەوە... عەقید ئیحسان کە چاوەڕێی ئەمە نەبوو، دەڵێ:

- بەڵام من بە جدیم نەبوو، هەر حەزم کرد گاڵتەت لەگەڵدا بکەم.

. دەی چیبکەین، ئێمەی کورد واین، هەموو شتێک بە جدی وەردەگرین.

لێرەوە کەمتر خەریکی قسەو، زۆرتر خەریکی خواردن دەبین... نانخواردن تەواو دەبێ... بۆ چا و شیرینی خواردن، دەبرێینە سەر مێزێکی تر... عەقید ئیحسان، سەبارەت بەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ یەکێتیدا دەستیان پێکردوە، هەندێک باسـی نیەتباشـی و جدیەتی حکومەت دەکات... بەر لە هەستانیش رومانتێدەکات:

- ئێمە بە دیدیارتان خۆشـحاڵ بووین، مام جەلال ئێمەی راسـپاردبوو، ئێوە بەسـەلامەتی بگەیەنینە لای ئەو... هەر بۆیە ئیمڕۆ، من و بەڕێز عەبد هاتوینەتە ئێرە... بەر لەماڵئاوایش هەریەک لە عەقید ئیحسان و رائید عەبد عەلی، ژمارەی تەلەفۆنی خۆیان بە یوسف زۆزانی و من دەدەن:

- چاوەڕێتانیـن لـە نزیکتریـن دەرفەتـدا ببنـە میوانمـان، تـا خزمەتی شایستەترتان بکەین.

سـواری ئۆتۆمبیلەکـە دەبیـن... بەیارمەتی دوو ئەفسـەری هەواڵگری، بـەرەو زیخان، بۆ یەکەمجار دوای ئەو هەموو سـاڵانەی پێشـمەرگایەتی، بەسەر جادەی قیرو بەسواری ئۆتۆمبیل ڕێدەبڕین.

هێشــتا نەبۆتــە دووی پاشــنیوەڕۆ، لەبەردەمــی گۆڕەپانەکــەی زیخان دادەبەزین. بەرامبەرمان، بینایەکی یەک تەبەقەی درێژە، نازانم قوتابخانەیە یان شــتی تر... ژوورەکانی ئەو بینایە، لەلایەن ئەندامانی ســەرکردایەتی و فەرماندە ســەربازیەکان و پێشمەرگە پاســەوانەکانیانەوە پڕ کراونەتەوە... بــارەگای مــام جەلال لــەو تاکــە خانوەدایــە کــە دەکەوێتە دەســتەچەپی گۆڕەپانەکەو بەرامبەر بە بیناکەیە.

خەڵکێکی زۆر لەهەموو شوێنێکەوە هاتوون‌و رژاونەتە ناو ئەو گۆڕەپانە... هەرهەموویان بۆ بیستنی تازەترین هەواڵەکانی گفتوگۆ هاتوون... خۆ ئەگەر مام جەلالیش هەندێ قسەیان بۆ بکا، ئەوە دنیایەک پێی دڵخۆش دەبن.

ئەگــەر چاکوچۆنی بــرادەران و بینینی هەندێ خەڵکی ناســیاو نەبوایە، ئێستا لای مام جەلال دەبووین. لەپڕ هەموو سەرەکان بەرەو بارەگاکەی مام جەلال وەردەســوڕێن... دڵنیام مام جەلال، بە بینینی ئەو هەموو حەشاماتە زۆرە ئۆخژنێک[٢١٩] بە دڵیدا دێ... ڕەنگە هەر ئەمەش هانیدا هەندێک قسەیان بــۆ بکا... لەناو ئەو هەمــوو قەرەباڵغیە زۆرەدا، عەلــی نەبی، دەکەوێتە ناو قەرەوڵی[٢٢٠] قەناســی دیدی مام جەلالەوە... مــام جەلال، بە تۆنێکی یەکجار توڕەئامێزەوە، بانگی عەلی نەبی دەکا:

- هەر ئێستا ئەو سەیارەیەی تەسلیمی کاک شەوکەتی دەکەی.

- مامە ئاخر بۆ خۆنن پێویستە.

- ئەمن پێت دەڵێم تەسلیمی کاک شەوکەتی کە...

کــە عەلی نەبی هیچ ئامادەییەک بۆ رادەســتکردنی ئۆتۆمبیلەکە نیشــان نــادا، مام جــەلال ئەوەندەی تر دەهری دەبێ... هاوار لە شــەوکەتی حاجی موشیر دەکا:

- شەوکەت، هەر ئێستا ئەو سەگبابەی چەک دەکەی و بۆ زیندانی دەبەی.

---

٢١٩. ئۆخژن: خۆشی.

٢٢٠ـ قەرەوڵ: سێرە، جاسوسی سەر لولەی تفەنگ

شەوکەت، چەند هەنگاوێک لە عەلی نەبی دەچێتە پێشەوە.

عەلـی نەبیەک تا ئێسـتا لەبەرکەس داینەهێنابێ، لێرەش دەسـتبەرداری شەهامەت و غیرەتی خۆی نابێ... ڕوودەکاتە شەوکەت و پێی دەڵێ:

- پیاو نییە ئەمن چەک کات.

شەوکەت لەجێی خۆی دەوەستێ... مام جەلال لە عەلی نەبی دێتە پێشەوەو چون گەواڵە هەوری بەهار، عەلی نەبی بەر هەورەتریشقەی جوێنان دەدا... عەلـی نەبـی لە ناوەوەی خۆیدا، لـە حەژمەتاندا خەریکـە دەکوڵێ بەڵام لە بەرامبەر هەڕەشـە و جوێنەکانی مام جەلالدا هیچ ناڵێ... مام جەلال، بەوە، ئەوەندەی تر شێتگیر و تیزۆ[٢٢١] دەبێ... دەمانچەکەی لە کیفەکەی لاکەلەکەی دەردەهێنـێ و بـەڕوی عەلـی نەبیدا هەڵیدەکێشـێ... دوو جـاران گوللەی دەخاتەبـەرو فڕێیان دەداتـەوە... عەلی نەبی هیـچ کاردانەوەیەک بەرامبەر بەو ڕەفتارەی مام جەلال نانوێنێ:

- مام جەلال، ئەتو بشـمکوژی دەنگێ ناکەم... بەڵام ئەمن نە سـەیارەی تەسلیمی شەوکەتی دەکەم و نە چەکیش بۆ پیاوی وەک وی دادەنێم.

مـام جەلال لە هەڵچوونیدا بەردەوامە، هەموو سـەرکردەکانی یەکێتیش لەوێـن و، وەک باقـی خەڵکەکـە، بێ ئـەوەی هیچ بکەن، یان هیـچ بڵێن، بە چاوی ئەبڵەقەوە، تەماشای ئەو دیمەنە دراماتیکیو بارگاویە دەکەن... لەناو هەموویاندا، تەنها ئازاد هەورامی دێ و دەکەوێتە نێوانی مام جەلال و عەلی نەبییەوە... کەمێک مام جەلال دووردەخاتەوە و دەگەڕێتەوە لای عەلی نەبی... تکای لێدەکات قسـەی مام جەلال نەشکێنێ و چەکەکەی دانێ... عەلی نەبی، هەرچەندە وەک هەر پێشـمەرگەیەکی تر، چەکدانـان بە ئیهانەیەکی گەورە دەزانێ، بەڵام چەکەکەی تەسـلیمی ئازاد هەورامـی دەکا. ئازاد هەورامیو عەلـی نەبی، بە سـواری ئـەو ئۆتۆمبێلەی گێچەڵەکەی لەسـەرە، لە زیخان دووردەکەونەوە.

عەلـی نەبـی و تیپەکەی، سـێ هەفتە لەوەوبـەر، ئـەو ئۆتۆمبیلەیان لە فەرمانگەیەکی حکومی، رفاندوە و بۆ ئیشـوکاری تیپەکەی خۆیان، بەکاری دێنن... شـەوکەتی حاجی موشـیر کە پلەی بەرپرسیارێتی پێشمەرگەیی لە عەلی نەبی باڵاترە، ویسـتویەتی ئۆتۆمبێلەکە بۆخۆی بەرێ... عەلی نەبیش، داخوازیەکەی جێبەجێ ناکاو، ئەوەتا ئەو بەزمەی لەسەر قەوما.

---

٢٢١ - تیزۆدەبێ: عەسەبی دەبێ.

بێدەنگیەک باڵ بەسـەر گۆرەپانەکەدا دەکێشێ... مام جەلال دەگەڕێتەوە ژوورەکەی خۆی... خەڵکەکەش بە نائومێدیەوە بڵاوەی لێدەکەن... یوسفو من، لەگەڵ ئەو برادەرە پێشـمەرگانەی لێرەن، بەقسانەوە مەشغوڵ دەبین... چاوەڕێین مام جەلال کەمێک سارد ببێتەوەو بەدواماندا بنێرێ... ئێمە هاتووین ئەو زانیاری و ڕێنماییانەی لێوەرگرین کە بۆ ڕاگەیاندن پێویسـتمانن، ئیدی دوای ئەوە کارمان لێرە نامێنێ.

کاژێـر و نیوێک دواتر، مام جەلال لە ژوورەکـەی خۆیدا بەخێرهاتنمان دەکات... ئـەو ئاگـری تووڕەیی و هەڵچوونەی لـە دەرەوە، لە ناکاو کڵپەی سـەند، خەریکە لە پریشـکدان دەکەوێ... وەک خۆی دەڵـێ، هەموو جارێ کـە حاڵەتێکـی لـەو جـۆرە ڕوودەدا، تووشـی سەریەشـەیەکی قـورس دەبـێ... کاژێرێـک زیاتـری دەوێ هەتا ئەو سەریەشـەیە بەریـدەدا... مام جـەلال، بەو تووڕەبوونە، ئەگـەر بتوانم بڵێم ناڕەوایانەی، سـەرباری ئەو دۆخە دەروونییـەی هەمووجارێ بۆ خۆی درووسـتدەکات، جاریش هەیە پێشـمەرگەی ئازای بەتەسـلیم بوونەوە داوە. ئەو دەیەوێ پاسـاو بۆ ئەو شتانە بێنێتەوە کە ڕوویاندا، ئێمەش ناڕەحەتی و دڵتەنگی خۆمان بەرامبەر بـەو ڕوداوە دەردەبڕین و بـە حاڵەتێکی نەخوازراوی لـە قەڵەم دەدەین... بـە تایبەتیـش کە ئەو هەموو خەڵکە، بـۆ بینینی مام جەلال و بۆ وەرگرتنی هەندێک هـەواڵو زانیاری هاتبوون... دواجاریش، ئۆتۆمبێلێک ئەوە ناهێنێ، کێشەی ئاوای لەسەر بخولقێ... ئۆتۆمبیل لای عەلی نەبی بێ یان شەوکەتی حاجی موشیر، شتێکی وا لە بابەتەکە ناگۆڕێ.

مام جەلال وەک ئەوەی بزانێ، زێدە هەڵچوونەکەی لەسەر ئەو ئۆتۆمبێلە لەجێی خۆیدا نەبوو:

– توڕەبوونەکەی من، لەسەر سەیارەی نەبوو... لەسەر ئەو شڕەخۆریو تاڵانیانـە بوو کە لـە گرتنی بێتواتـەدا کردیان... ئێوە نازانـن، ئەوانە چۆن ئەو سـەرکەوتنە گەورەیەیان ناشـیرن کرد... پیاو شـەرمێ دەکا بڵێ ئەمن پێشـمەرگەم... مـن خاوەنی ئـەو هێزەم بۆیـە ناچارم مفـاوەزەی لەگەڵ حکومەتیدا بکەم. ئەوانە چی ناشیرن نەما نەیکەن... لەبری ئەوەی هێزەکانیان لەناو بێتواتەدا قایم کەن، خەریکی تاڵانو بڕۆی بوون... تەسەورکەن، عەلی نەبی سەلاجەی بەکۆڵێ خۆیداداوە و بردویەتی.

ئەو قسـەیەی مـام جەلال، دیمەنی ئەو ڕۆژەی عەلـی نەبیم دهێنێتەوە بەرچـاو کـە بەخـۆی و چەنـد پێشـمەرگەیەکی کەرتەکەیـەوە، لە(پیرانە

ڕەشــە)ی پشتی شاخی کێوە ڕەشەوە، عومەری سەید عەلییان[٢٢٢]، بە کۆڵ گەیانــدە نێوزەنگ... ئاخر پیاوێک ئاوا دڵســۆز و خۆبەخش بێ، قەت قەت کاری لــەو جــۆرە نــاکات.

مام جەلال، ئەوەندە بە حیدەت قســان دەکا، قورگی وشــک هەڵهاتووە... قومێک لە پەرداخە ئاوەکەی سەر مێزە بچکۆلەکەی بەردەمی دەدا... منیش ئەو تۆزە ئیستە، بە دەرفەت دەزانم بۆ ئەوەی دوو سێ قسان بکەم:

- مەســەلەی تالانــی و دزی و راوڕووت و ماڵســوتاندن، هەرکەســێک کردبێتی، کارێکی دزێوەو هەقی لێپرســینەوە و سزادانی هەیە... بەڵام عەلی نەبی، پیاوێکی ئازا و خۆنەویســتە... تالان‌و دزی کاری خەڵکی ترســنۆک‌و شــڕەخۆرە، نەک پیاوی وەک عەلی نەبی... جگە لەوە، ئەو شوێنانەی عەلی نەبی تێدا ژیاوەو دەژیا، نە قەت کارەبای هەبووەو نە ســەلاجەش... ئەگەر لەبری سەلاجە، فەرش و ناوماڵیان گوتبا بەهەرحاڵ، بەڵام عەلی نەبی چی لە سەلاجە دەکا، تا بیبا... من باوەڕم وایە ناحەزەکانی عەلی نەبی، ئەوانەی بەڕاســتی خۆیان شــڕەخۆرن‌و ئازایەتی ئەویان تێدا نیە، ئەو شتانەیان بۆ هەڵبەستووە... دەنا عەلی نەبی کەسێک نییە، کاری وای لێبوەشێتەوە.

مــام جەلال برۆکانی لێکدەنــێ، بە جۆرێک لە هەڵچوونــەوە ڕوودەکاتە من:

- نــا وا نیــە... تــۆ کــە ئاگات لــە هیچ نییــە، مەبە بــە محامــی خۆڕایی کەسیش.

مــن بێدەنگ دەبــم‌و، هەندێ قســەی خێری یوســف زۆزانیش دۆخەکە کەمێک ئارام دەکاتەوە.

مــام جەلال، پاکەتێک لــە چەکمەجەی مێزەکەی دەردێنــێ... جگەرەیەک دادەگیرسێنێ و چەند مژێکی خێرای لێدەداو ئنجا بە تۆنێکی کەمێک ئارامەوە ڕوومان تێدەکاتەوە:

---

٢٢٢ـ لە ١٨ نۆڤێمبەری ١٩٨٠دا، ئەو هێزەی لە سەرکردایەتیەوە بەرە و ناوچەکانی هەولێر بەڕێوەبوون، لەناوچەی پیرانە ڕەشە، کەوتنە بەر پەلاماری چەند کۆپتەرێکی جەنگی... لە ئەنجامی ئەو پەلامارەدا ٩ پێشمەرگە شەهیدو ١٢ش برینداربوون. عومەری سەید عەلی یەکێک لەو بریندارانە بوو... ئەوەندە بەسەختی برینداربوو، مەترسیی مردنی لێدەکرا... پشتی وەک بێژنگی لێهاتبوو... بڕبڕەی پشتی، لە چەند شوێنێکەوە پێکرابوو... هەردووقاچی لە کار کەوتبوون... عەلی نەبی و هاوڕێکانی بە کۆڵ گەیاندیانە ناو زەنگ و لەوێشەوە ڕەوانەی دەرەوەکرا.

- با واز لەو قسانە بێنین‌و بێینە سەر مەوزوعەکەی خۆمان... ئێستا ئێوە پێمبڵێن، خەڵک چ لەسەر گفتوگۆی نێوان ئێمە و میری دەڵێن؟

یوسـف زۆزانی، دەستپێشخەری دەکاو رووداوەکەی چوارقوڕنە، وەک بەڵگەیەک لەسـەر حەماسەت‌و پشتیوانی خەڵک لە یەکێتی و لە گفتوگۆ، بۆ مام جەلال دەگێڕێتەوە.

دواتر مام جەلال ڕوودەکاتە من، منیش دەڵێم:

- هێشتا خەڵکی زۆرمان نەدیوە... ئەوەندەش گوێم لە پێشمەرگە بووبێ، بەگشـتی زۆریان پێخۆشە... "ئاخر پێشمەرگە، بارودۆخی شەڕکردن دژی هەمووولایـەک، ماندووی کردووەو هەرچۆنێک بێت گۆڕینی ئەم دۆخەی بە دۆخێکی باشـتر پێخۆشـە... بەتایبەتیش دۆخێک هەندێ ئارامی‌و پشـووی بداتێ." لە دڵی خۆمدا وا دەڵێم.

کەمێک دەوەستم‌و دەکەومەوە قسەکردن:

- سەبارەت بە رای خەڵکیش، پێرێ، وابزانم رۆژێک دوای ئەوەی ئێوە لە بەغدا گەڕابوونەوە، خاڵە مینەی (ئاوەژێ)م دی... وێڕای دەربڕینی خۆشحاڵی خۆی، لـە بەڕێوەچووی گفتوگۆو هیواخواستنیشـی بە سـەرکەوتنی، پێی وتم: "ئەمن پێمباشبوو لەبری ئەوەی وەفدی یەکێتی بچێتە بەغدایە، وەفدی حکومەتی هاتبایە ناوچەی پێشـمەرگەی... دەبوایە مام جەلال، هەتا وەختی ئیمزاکردنـی بەیان، نەچووبایە بەغدایە... ئەمن بام لەجیاتی وی، هەتا بەیان نەخوێندرابایەوە، شەڕم رانەدەگرت."

مام جەلال، لە کاتی قسەکانی مندا، کۆمەڵێک تێبینی لەسەر دەفتەرەکەی بەردەمی خۆی دەنووسێ، کە دەشبینێ من لە قسەکردن وەستاوم:

- ئـەوەی ئەو قسـانەی کـردوون، پیاوێکی ئاقـڵ و دنیادیدەیـە... بەڵام ئەوەی سیاسـەت ناکات، ئەوە نابینێ کە سیاسییەکان دەیبینن... سەرباری ئەوەش، ئەوانەی بە دەوری مێزی گفتوگۆوە دادەنیشـن، ئەوەندەی هێزیان لەسـەر ئەرزی واقع هەیە، ئەوەندە لە قسەکانیاندا نییە، هێزی ڕاستەقینەی ئـەوان، ئـەو هێزەیە لە دەرەوەی ژووری گفتوگـۆ هەیانە، نەک لە ژووری گفتوگۆدا. ئێمە دەبێ حەجمی خۆمان بزانین... دەبێ ئەوەش بزانین ئێمە لە حکومەت زیاتر پێویسـتیمان بە گفتوگۆیە... لە هەموو دنیاشـدا کە گفتوگۆ لەنێوان حکومەت‌و شۆڕشـدا کراوە، عادەتەن هەر لە پایتەختی ئەو وڵاتانە بووە نەک شـوێنی تر... بۆ مەسەلەی شـەڕ راگرتنیش، چۆن دەبێ ئێمە لە

بەغدا بین و لەگەڵ حکومەتدا لەسەر مێزی گفتوگۆ دانیشین‌و پێشمەرگە و سـوپاش لەشەڕی دژ بە یەکدیدا بن... سەبارەت بە چوونە بەغدای خۆشم، با بە راشـکاوی ئەوەتان پێبڵێم، کە من ئەسـڵەن لەگەڵ گفتوگۆدا نەبووم‌و پێشـم وانەبووە سەدام حوسەین، ئامادەیی ئەوەی تێدابووبێ هیچ بە کورد بـدات... تەنانەت من پێموابووە، ئەوەی حکومـەت لە لاوازیدا دەمانداتێ، لە بەهێزبوونەوەیدا، لێماندەسـتێنێتەوە... ئەوە رای مـن بوو، بەڵام رای کاکە نـەوە و برادەرانی تری سـەرکردایەتی، ئەوەبوو کە ئەگـەر حکومەت لەو کاتە لاوازەیدا هیچ نەدا، کە لەو شەڕە نەجاتی دەبێ، هەموو هێزی خۆی بۆ لێدانی ئێمە تەرخان دەکا... مادام هەموو لەگەڵ گفتوگۆدان، منیش ملکەچی بڕیـاری زۆرینەم... بۆ مەسـەلەی چوونە بەغداشـم، ویسـتی خۆم نەبوو، ئـەوە هـەم داوای برادەرانی خۆمـان‌و هەمیش مەرجـی حکومەت بوو بۆ پێشـوازیکردن لە وەفدەکەی یەکێتی... بـۆ بەیان ئیمزاکردنیش، با پێتانبڵێم، سـەدام زۆر بەپەلەبـوو لـەوەی هەمـوو ئەو شـتانەی تا ئێرە لەسـەری رێککەوتوویـن، ئیمزا کەیـن‌و لە رادیۆو رۆژنامـە و تەلەفزیۆنەوە بڵاویان کەینـەوە... ئـەوە رای ئەو بوو، بـەڵام ئەمن بە بیانووی ئـەوەی، کە بەبێ وەرگرتنی رای برادەرانی سەرکردایەتی خۆمان، دەسەڵاتی ئیمزاکردنم نیە، مەسـەلەی بەیانەکەمان دواخسـت... بەڵام لە حەقیقەتدا، پێشـئەوەی بچینە بەغدایە، سـەرکردایەتی دەسەڵاتی ئیمزاکردنی هەر رێککەوتنێکیان دابوینێ کـە لەگەڵ بەغدادا پێی بگەیـن، بەڵام من ئەوەم نەکـرد... بەرلەوەی بچینە بەغدایەش، بەو برادەرانەی خۆمانم گوتبوو، من دەستیشم لە بندا ببڕنەوە، هیـچ رێککەوتنێک لەگەڵ بەعسـدا ئیمزا ناکەم[٢٢٣]... ئێسـتا ئێوە رەنگە بڵێن، ئەی مادام وایە بۆ دەچووی... چووم، چونکە ئەوە هەم مەرجی ئەوان بوو، هەم برادەرانی خۆشـمان بەزۆر ناردیانم... حەز دەکەم شـتێکی کەشـتان پێبڵێم، سـەدام ئامادەیە هەمـوو داخوازیەکانی ئێمە جێبەجـێ بکات... تاکە شـتێک کە نایـکات ئەوەیـە کەرکوک بێتە سـەر ناوچەی حوکمـی زاتی... سەدام گووتی: "ئەمن تەماشای تۆماری گفتوگۆکانم کردووەو لەسەر هەموو شـتەکان موافیقم، کەرکوکـی لێدەرچێ... ناڵێم کەرکوک شـارێکی کوردی

٢٢٣- بەرای من هۆکارێکی سەرەکی ناڕازیبوونی مام جەلال ئەوەبوو, ئەو دەترسا بەم گفتوگۆیە, لیبیاو سوریا کە تا ئەوکاتە دوو تاکە دەوڵەتی عەرەبی‌و دونیا بوون کە یارمەتی یەکێتیان دەداو رێی کردنەوەی بارەگایان لەوڵاتی خۆیاندا پێدابوون, پشت بکەنە یەکێتی‌و کۆمەکەکانی لیببڕن‌و بارەگاکانیان داخەن. هەرواش بوو, لەگەڵ دەستپێکردنی گفتوگۆدا کۆمەکیان بڕی‌و بارەگاکانیان داخست. دوای کۆتاییهاتنی گفتوگۆ, کە وەفدی یەکێتی سەردانی, بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکان سەردانی لیبیاو سوریایان کرد, هەردوولایان پێیانوتن, کە ئەمان دژی گفتوگۆ نین, بەڵام نیگەرانن لەوەی کە هیچ پرس‌و رایەکیان پێنەکراوە.

نییە و ناشـلێم شـارێکی عەرەبیە، بەڵام مانەوەی بە شـارێکی عێراقی، بۆ هەموومان، بە کورد و عەرەبەوە باشترە...

لە قسەکانی مام جەلالدا ئەوەم خوێندەوە کە ئەو قەناعەتی وایە، سەدام حسـێن لە هەموو ئەوانەی ئەم لە بەغدا بینیونی، نەرمترەو دەیەوێ لەگەڵ یەکێتیدا رێکبکەوێ، بۆ پاڵپشـتی ئەو قەناعەتەشـی، ئەو قسەیەی سەدامی گێڕایـەوە کـە پێـی وتبوو: "تۆ بـەم کارەتو بـەم هاتنەتو بـەم هەنگاوە ئازایانەیەت لەم کاتەدا، دوو چاکەت لەگەڵ ئێمەدا کردووە، چاکەیەک لەگەڵ عێراق و چاکەیەکیش لەگەڵ حزبدا... دڵنیاشـت دەکەمەوە کە بەرامبەر بەو چاکانەی ئێوە لەگەڵ ئێمەتاندا کردووە، شـتێکتان بۆ دەکەم تۆ لەبەردەمی هەموو کوردا سـەربەرز بیـتو کوردیش زۆر دڵخۆش بێـت." مام جەلال کۆتایی قسەکانی بەوە هێنا: "دەتوانم بڵێم، مەبدەئیەن لەسەر هەموو شتێک رێککەوتووین، ئەگەر کارەکان بەو سـفتی و بێ گرێ و گۆڵییەی ئێسـتاوە برۆن، بە قازانجی یەکێتی و کورد و عێراقیش تەواو دەبێ."

لەو شوێنەدا، دواین نیگەرانیەکانی خاڵە مینەی ئاوەژێم بیرکەوتەوە:

- ئەی بۆ مەسەلەی چەککردنی جاشەکان چی کراوە؟

ـ ئـەوان ئامـادەن لەگـەڵ ئیمزاکردنـی بەیانـی رێککەوتنەکـەدا، جاش هەڵوەشێننەوە... ئەوان دەڵێن: "ئێمە جاشمان بۆ شەڕی ئێوە دروستکردووە... لەگـەڵ ئێـوەدا شـەڕمان نەمێنـێ، جاشـمان بـۆ چییـە!... هەرهەموویان هەڵدەوەشێنینەوە."

قومێکی تر لە پەرداخە ئاوەکەی بەردەمی دەدا:

ـ بەرلەوەی من قسەی تر بکەم، ئێوە هیچ پرسیارێکتان هەیە؟

- لە راسـتیدا من دوو پرسیارم هەن... پرسیاری یەکەمم ئەوەیە، ترسی ئەوە نیە لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیەو رێککەوتن لەگەڵ حکومەتدا، ئەزموونی شـەڕی باڵـی مەکتەبـی سیاسـی و باڵی مەلا مسـتەفا دووبـارە ببێتەوە؟ پرسـیاری دووەمیشـم ئەوەیە، ئایا ئێوە هیچ پرۆژەیەکتان لەگەڵ خۆتاندا بردبوو تا بیکەنە بناغەی گفتوگۆ لەسەرکردن؟

ـ بـۆ وەڵامی پرسـیاری یەکەمـت دەڵێم، ئێمە هەمـوو هەوڵێک دەدەین، بۆ ئەوەی هەموو لایەنەکانی دیکەش بەشـداری گفتوگۆ پێبکەین... ئەوەش نەکرێ، ئەگەر ئێمە بتوانین داخوازیەکانی خەڵکی کوردسـتان بەدەستبێنین،

ئەودەمی کەس بەدوای هیچ لایەنێکیکە ناکەوێت کە دژی بەرژەوەندیەکانی خەڵکی کوردستـــان بوەستێتەوە... بۆ وەڵامی پرسیاری دووەمیشت، جارێ ئێمـــەو ئەوان هیچمـــان ئیمزا نەکردوە تا پێویســـت بە پرۆژە بـــکات... لێرە بەدواوە، پرۆژەش ئامادە دەکەین.

هەرچەندە وەڵامەکەی مام جەلال مایەی قەناعەت پێهێنانی من نییە، بەڵام هیچ ناڵێم... ئاخر خۆ ئەمە یەکەم هەوڵی گفتوگۆی یەکێتی نییە لەگەڵ میریدا، تا لە بێئەزموونیەوە ئەوەیان کردبێ، من دەزانم یەکێتی هەر لە ســـەرەتاوە گفتوگۆی بە جدی وەرگرتوەو وەک ستراتیژی کارکردنی خۆیشی مامەڵەی لەگەڵدا کردوە... ئەوە دەزانم، بەڵام هەســـت بە پێویســـتی قسەکردنی زیاتر لەوبارەیەوە ناکەم.

بەرلەوەی دیدارەکەمان کۆتایی بێ، مام جەلال بە چەند خاڵێک ژمارەیەک ڕێنمایـــی و بەرچاوڕوونیمـــان، ســـەبارەت بـــە کاری ڕاگەیانـــدن لە ماوەی گفتوگۆدا، دەداتێ:

* باسی چارەسەری ئاشتیانەی مەسەلەی کوردو، باسی بایەخی خەباتی سیاسی بکەین... مفاوەزاتیش وەک شێوەیەک لە شێوەکانی خەبات، لە پێناو هێنانەدی داخوازیەکانی خەڵکدا بۆ رای گشتی روونکەینەوە.

* هانـــی لایەنە کوردیەکانی دیکە بدەین، بۆ ئەوەی ئەوانیش بەشـــداری گفتوگۆی یەکێتی و حکومەت بکەن... بە بەشـــداریی هەمووان، زەمینەیەکی گونجاوتر بۆ داخوازییەکانی خەڵکی کوردســـتان دروســـتدەبێت... بەمەش، هەم پێگەی یەکێتی بەهێزتر دەبێ‌و، هەمیش دەنگی وەفدی کوردی لە بەغدا، دلێرترو بیستراوتر دەبێ.

* باسی گرنگی بەشداریی کورد بکەین لە ناوەندی بڕیاری سیاسیدا لە عێراق.

* کارێکـــی وا بکەیـــن کە مەســـەلەی هەڵوەشـــاندنەوەی جـــاش، بکرێتە داخوازیەکی جەماوەریی.

* بە چاکو خراپ بەلای باسی سەدام حوسێندا نەڕۆین.

بەرلەوەی ماڵئاوایی لە مام جەلال بکەین، بەڵێنی ئەوەمان لێوەرگرت، لە دەرفەتێکـــی نزیکـــدا، عەلی نەبی بانگ کاتو هەندێک دڵی بداتەوە... لەســـەر تووڕەبـــوون و زێدە هەڵچوونیشـــی، بۆخۆی باســـی لەوە کـــرد کە ئەم لەو

حاڵەتەی خۆی رازی نییەو دەزانێ زۆریش زەرەری لێداوە، وەک دەشیوت، جار هەبووە کەسێکی بۆ لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە بانگ کردوە، قسەیەک لەم و پاساوێک لەو، کاتێک مام جەلال بەخۆی زانیوە، زۆر لەوە زیاتر تووڕە بووە کە دەبوایە ببێ... بۆیە بە ناچاری لەباتی سزادانی، کەوتۆتە دڵدانەوەی‌و، لە دوایشدا وازی لەو سزایە هێناوە کە دەبوایە بیدا.

## ٧٠

ئێمە دەگەڕێینەوە ڕادیۆ و بەڕێوەچوونی گفتوگۆ بە فەرمی ڕادەگەیەنرێ. ئێدی لەوێوە، دروشــمی ڕووخاندنی ڕژێم و بەرنامەی شەڕی درێژخایەن، وەک دروشــمی ســتراتیژی و ناوەندیی شۆڕشــی نوێ کۆتاییــان پێدێ... ئەمەش بۆخۆی یەک لە ســوودەکانی گفتوگۆ بوو... ئەو ســتراتیژە، لەگەڵ سروشتی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازیی میللەتی کوردا نەدەگونجاو کۆپیەکی ڕاســتەوخۆی ئەو شەڕی درێژخایەنەی گەلی چین بوو کە ماو تسی تۆنگ بنەما و ڕیســاکانی، بەگوێرەی سروشتی سیاســی، کۆمەڵایەتی، ئابوری و جوگرافیی چین داڕشــتبوو. لە بەرامبەر ئەوەشــدا، شــەڕی درێژخایەن، لە ڕوویەکــی ترەوە ســوودی بۆ ژیانی پێشــمەرگایەتی ئێمــە هەبوو، چونکە کە دەبووینە پێشــمەرگە، چاومان نەدەبڕیە ســەرکەوتنی خێرا و بەزوویی گەیشــتن بە ئامانجەکانمان... ئەوەش وایدەکرد کە لەگەڵ ئەو ژیانە ڕۆتینە خاوڕێکــردووەی پێشــمەرگایەتیدا خۆمــان بســازێنین و ورە بەرنەدەیــن. گفتوگۆ بایەخی ئەو سوودەشــی نەهێشــت... لە گفتوگۆدا تێگەیشــتین ئەو دروشــمانەی کە وەک ســتراتیژ بەرزمانکردبوونەوە، لە بنچینەدا تاکتیکن، تەنها بۆ مەبەستی دروستکردنی گوشارن لەسەر ڕژێم. ئێمە دەمانویست لە ڕێی ئەو دروشمانە و ئەو توانا سەربازی و ڕێکخستن و جەماوەرییەی بە پشــتمانەوەیە، گوشــارێکی وا لەســەر ڕژێم درووســتکەین کە ناچاری هاتنە ســەرمێزی گفتوگۆ ببێ، بەو هیوایەی لە ڕێی گفتوگۆوە، بەشــێک لە داخوازێکانمان بەدەست بێنین.

لەماوەی ئەو چەندســاڵەی (شۆڕشــی نوێ)دا، چەندین هەوڵی گفتوگۆ دران، گفتوگۆیەک بەبنبەستدەگەیشــت، بەرەو گفتوگۆیەکی تر، درێژەمان بە خەباتی خۆمان دەدا. دەکرێ، هەڵوێســتە نیشــتمانییە عێراقیەکانی مام جەلال و یەکێتیش چ لە مەسەلە عێراقیەکان و چ لە مەسەلە عەرەبیەکانیشدا، هەر بەهەوڵدان بۆ خزمەتکردنی ئەو ســتراتیژەی گفتوگۆ لێکبدرێتەوە[٢٢٤].

٢٢٤- لە ١٩٧٨/٩/١٧دا، سەرانی عەرەب، لەسەرداوای عێراق کۆنگرەی نۆیەمی لوتکەی عەرەبییان بەست... لەوێدا عێراق، بۆ لێدانی ئیسرائیل و ڕزگارکردنی فەلەستین، هەڕەشەی ناردنی هێزی چەکداری کرد... بۆ پیشاندانی پشتیوانی یەکێتی لەو هەڵوێستە نەتەوەییە عەرەبیەی عێراق، یەکێتی نیشتمانی بەیانێکی بۆ ڕاگەیاندنی هەڵوێستی خۆی لەو هەڕەشەیەی عێراق دەرکرد... لەو بەیانەدا، یەکێتی ئامادەیی خۆی بۆ ڕاگرتنی شەڕو

گفتوگـۆ بـە تەنیـا، هەر سـتراتیژی شۆڕشـی نوێ نەبـوو بەڵکو هەر لەسـەرەتاوە سـتراتیژی شۆڕشـی ئەیلولیش بوو. هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بە ڕابەرایەتی مەلا مسـتەفا و بە پشـت بەستن بە هێزیی چەکداریی ئاغا و دەرەبەگان، هەر بۆ درووستکردنی گوشار و ناچارکردنی حکومەت بوو بە گفتوگۆ. شـۆڕش بۆ گوشارخسـتنە سـەر دەوڵەت هەڵگیرسا، نەک بـۆ ئامانجـی تر.... لای ئاغا و دەرەبەگەکان، بۆ هەڵوەشـانەوەی یاسـای چارەسـەری کشـتوکاڵ و، لای مەلا مسـتەفاش بۆ بەدیهێنانی بەشێک لە داخوازێکانی ئەو کاتەی بوو.

کورد، شۆڕشـی بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ دەسـتپێکردو ڕژێمیش، بە ئاوەڵەیی هێشتنەوەی ئەو دەرگایەی، هەموو جارێ هەر بۆ کات کوشتن بـووە، نەک بۆ چارەسـەری کێشـەکانی نێوان دەوڵەت و کـورد. دەوڵەت، لەسـەرەتایی هەموو گفتوگۆیەکدا، هیوای زۆر دەبەخشێ و لە ئەنجامیشدا، شتێکی وا نادا مایەی ڕازیبوونی ئێمەبێ. لەم هەلەی ئەم جارەی گفتوگۆشدا، لەسەرەتادا هیوایەکی زۆرخرایە سەر موجامەلەکانی سەدام و سەر یەکەم دیـداری وەفـدی هەردوولا. هەر لەسـەر بنەمای ئەو هیوایەش، سـاپیتەی چاوەڕوانـی و داخوازیەکانی خۆمان و خەڵکیشـمان ئەوەندە بەرزکردەوە، حسـابی ئەوەمان نەکردبوو کە ڕەنگە لە شـوێنێکدا، خۆشـمان دەسـتمان نەیگاتێ.

گفتوگۆ، بۆ ئێمەی پیشمەرگە، بۆ ئێمەی چەند ساڵ لە ماڵ و کەسوکار و دۆست و هاوڕێ و لە شار دابڕاو، دەرفەتێکی زۆر خۆشبوو. ئەوکاتەش کە دەمانبینی، خەڵک بە چ باوەشێکی پڕ لە میهر و خۆشەویستیەوە، پێشوازیمان لێدەکەن و، وەک پاڵەوان و هەڵگری بەها مرۆییەکان تەماشـامان دەکەن، لە

دەستپێکردنی گفتوگۆ ڕاگەیاند.

لە ساڵی ١٩٨٠ شدا، دوای هەڵگیرسانی شەڕی نێوان عێراق و ئێران، مام جەلال داوای گفتوگۆ لە سەدام حوسێن دەکات، وەک خۆی دەیوت «تا کورد تاوانبار نەکرێت بەوەی خەنجەر لە پشتەوە لە سوپای عێراق دەدا، لەو کاتەدا سوپای عێراق لە جەنگدایە لە دژی کۆماری ئیسلامی ئێران».

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢ شدا، کۆنگرەی لوتکەی عەرەبی لە فاس دژی پەلاماردانی لوبنان لەلایەن ئیسرائیلەوە بەسترا، مام جەلال، وەک یەکێتی بەیانێکی توندی بۆ پشتیوانی لە هەڵوێستی عەرەب دژ بە ئیسرائیل دەرکردو تێیدا وتی «ئەگەر عێراق بۆ بەهاناوەچوونی فەلەستینیەکان، بیەوێ هێز بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل بنێرێ، ئەوا ئێمە ئامادەین ئاگربەست ڕاگەیەنین و دەست بە گفتوگۆ بکەین بۆ چارەسەری کێشەی کورد».

مەلا مستەفاش لە ساڵی ١٩٦٧ دا، لە کاتی بەرپابوونی جەنگ لەنێوان عەرەب و ئیسرائیل دا هەڵوێستێکی لەو جۆرەی مام جەلالی نواند.

خۆشیاندا قاچمان ئەرزی نەدەگرت... چ هەستێکی خۆشە کە دەبینی خەڵک، بــە زیادەوە ڕێز لــە ماندوبوون‌و ئامادەیــی قوربانیدانی تــۆ دەگریێ! هەر ئەو هەســتەش، بۆ بەردەوامبوون لەســەر ئەو ڕێیــەی گرتوتەبەر، پاڵنەرو پاساوێکی زۆرت دەداتێ.

دوو مانگــی یەکەمــی گفتوگــۆ، دوو مانگــی هەنگوینی بوون بــۆ ئێمە... خۆشــیەکان هــەروان، تەمەنیان لــە تەمەنی پەپوولە دەچــێ، بۆ ماوەیەکی کورت ئەم گوڵوئەوگوڵ دەکەن‌و ئیدی کۆتاییان دێ.

ئــاوا، هەرئەوەندە لەســەرەتای مانگی دوودا، وەفــدی یەکێتی، لە گەڕی دووەمی گفتوگۆدا، بە دەســت بەتاڵی لە بەغــدا گەڕایەوە، ئیدی دڵەڕاوکێی خەڵــک، وردە وردە دەســتیپێکردو درەختــی خەونەکانیــان کەوتــە گــەڵا هەڵوەرین...

هەموو ئەو نیگەرانی و دڵەڕاوکێیانەش، لای خەڵک‌و تەنانەت لای زۆر لە پێشمەرگەش، دەبوونە خەنجەری پرسیارو بەڕووی ئێمەدا هەڵدەکێشران... ئێمــەش نە قەڵغانێکمان بۆ بەرگری لەخۆکردن پێبوو، نە وەڵامەکانیشــمان مایەی قەناعەت پێهێنانی ئەوان و خۆشمان بوون... هەربۆیەش ئەو خۆشیە زۆرەی لەسەرەتای چوونە ناو خەڵکدا دەمانبینی، خەریکبوو وەک شەونمی بەر تیشکی خۆر کەوتوو دەبووە هەڵم.

بەمەبەســتی گوێگرتــن لەســەرەنج و بۆچــوون و پێشــنیارەکان، سەرکردایەتی، کۆمەڵێک کۆبوونەوە لەگەڵ خەڵک و پێشمەرگەدا سازدەکات. بــۆ ڕەوینــەوەی تەمی ئەو نیگەرانــی و دڵە ڕاوکێیانەش، مــام جەلال، بەو ئومێدەی لەوسەرەوە بە مژدەی زۆر خۆشەوە بێتەوە، لە هەفتەی دووەمی مانگی ئازاردا سەفەرێکی خێرای بەغدا دەکات.

## ٧١

دوو ڕۆژ بەر لە نەورۆز، مام جەلال دەگەڕێتەوە سورداش و بەرهەمی سەردانەکەی، لە وتاری ئاهەنگی نەورۆزدا چڕ دەکاتەوە.

جەماوەر و پێشمەرگە، ئومێدێکی زۆریان لەسەر ئەو سەردانە خێرایەی مـام جەلال هەڵچنیـوە... لە هەر نەورۆزێکدا، هـەزاران کەس، ڕوو دەکەنە ناوچـەی قەشـقۆڵی و دوکان، بـەڵام بۆ نـەورۆزی ١٩٨٤، سـەدان هەزار کەس ئامادەی ئاهەنگی نەورۆز بوون... هەم بۆ بیسـتنی تازەترین هەواڵی گفتوگۆ، لە دەمی مام جەلال خۆیەوەو، هەمیش بۆ دەربڕینی هاوسـۆزی و پشـتیوانی، بۆ پێشمەرگە و بۆ یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان. کە ئەمەش بۆ خۆی یەک لە مەبەستەکانی ئەو قەرەباڵغیە زۆرەیە.

مـام جەلال وتارەکـەی لەبـەردەم دەریایەکی ڕەنگاو ڕەنـگ لە خەڵکدا پێشـکەش دەکات... دەریایـەک کە پانەوپان، دەشـتی سـورداش و ناوچەی کۆتەڵی داپۆشـیوە... یەکێتـی و مام جەلالیش بە تایبەتـی، بەو گردبوونەوە جەماوەریە مێژووییە، دنیایەک دڵخۆشـن... دڵخۆشن چونکە دەیانەوێ وەک نمایشێکی جەماوەریی یەکجار گەورە و بێوێنە، پیشانی حکومەت و نەیارەکانی خۆیانی بدەن. بەشی یەکەمی وتارەکەی مام جەلال، بۆ خستنەڕووی نوێترین زانیاریە لەسـەر گفتوگۆ، نوێ لە شـێوەدا و کۆن لە ناوەڕۆکدا.... بەشەکەی تریش، پەیامی ئاشـتبوونەوەی گشتییە، بانگهێشـتنی هەموو لایەنە سیاسیە کوردیەکانە بۆ بەشـداربوون لە پرۆسـەی گفتوگۆدا، هەمان پەیمان کە هەر لەسەرەتای گفتوگۆوە ئاڕاستەی هەموو لایەنە کوردیەکان کراوە و، هیچیان بە دەنگەیەوە نەهاتوون، ئەوە وێڕای ئەوەی پەیامێکیش بوو بۆ حکومەت.

هێشـتا مام جەلال نەگەیشـتۆتە کۆتایی وتارەکەی... هێشتا هەر شەپۆل لەدوای شـەپۆلی خەڵک، بەرەو شانۆی ئاهەنگ دەکشێن... لەپڕ شەپۆلەکان وەک ئەوەی بەر بەربەستێکی بەردینی گەورەی کەنار کەون، دەکشێنەوە... لەگەڵ کشانەوەشیاندا، نیوە زیاتری ئەو خەڵکانەش لەگەڵ خۆیانا ڕادەدەن کـە بە پەرۆشـەوە گوێیان لە ووتـە پڕ جۆش و خرۆشـەکەی مام جەلال گرتووە.

دیمەنێکــی نــاوازەی هەژێنــەر، هێندە هەژێنــەرو هەســتبزوێنە، هەموو ئەوانــەش دەخاتــە جمین کە تا ئەوکاتــە، لە پاڵ بەردێکا، یــان لەپاڵ تەنکە ســێبەری تازە چرۆکردووی درەختێکدا دانیشــتوون‌و خەریکی خواردن و خواردنەوە و سەما و گۆرانی وتنن... هەموو بەرەو ئەو شوێنە دەجمن کە مامە ریشە لە ئۆتۆمبیلەکەی دابەزیوەو، هەزاران کەس هەر بۆ نیگاکردنێکی خێرا، پاڵەپەستۆی چوونە پێشەوەیانە.

خەڵکــی ناهەقیــان نیە ئاوا بۆ مامەڕیشــە دەکەن... ئــەو، بەو چالاکیە لە قودرەت بەدەر و نائاسایی و سەرسوڕهێنەرانەی دژی هێزەکانی حکومەت دەیانکا:

لای خەڵک دەبێتە ئەفســانەو، لای پێشمەرگە پاڵەوان و، لای حکومەتیش پیاوی ئاسنین.

خەڵک وێنەیەکی ئەفسووناوی مامەڕیشەیان لە زیهینی خۆیانا کێشاوە... وێنەی پێشمەرگەیەک کە هەڵگری هەموو بەها باڵاکانی پێشمەرگەیە... وێنەی پێشمەرگەیەک کە لە هەموو کات و شوێنێکی چاوەڕوان نەکراودا، هەڵمەت بــۆ دوژمــن دەبا... زیانــی گەورە لــەدوای خۆیەوە بەجێدێڵێ، بۆخۆیشــی بەخــۆی‌و بە پێشــمەرگەکانی کەرتەکەیــەوە (کەرتی چــواری جەباری) بە ســەلامەتی دەگەڕێنەوە شــوێنی خۆیان... پێشــمەرگەیەک، خاوەن پلان و تاکتیک و شــەڕی پارتیزانی وا کە دێنێ لە ئەکادیمیا سەربازییەکانی دنیادا بخوێندرێن.

ئــەم وێنــە ئەفســانەییەی مامە ڕیشــە، لای خەڵک خۆشەویســتی زیاد دەکاو، لای پێشــمەرگە ڕێز و سەرســامبوون، لای هەندێک لە بەرپرس و فەرماندەش، غیرە و ڕق و کینە! ئەو دەرکەوتنە لەپڕەی ئەمڕۆشی، هەموو ئەو هەستانەی بەرامبەری هەن، زۆرتر دەکا.

چەند مانگێک دواتر، هەر لە ناوچەی ســورداش مامەڕیشــە دەبینمەوە، هێندە گۆڕاوە، هەر بە ڕاستی خەریکە ناینناسمەوە... نە ڕیشەکەی جاران و، نە ١٠ مەخزەنی ســەر پشــتوێنە پانزە مەترییەکەی‌و، نە هیچ کەرەسەیەکی پێشــمەرگایەتی پێــوە نابینم...ئاخــر مامەڕیشــەیەک کە هــەردەم بەورێکی لەسەر هەست‌و ئامادەی هەڵمەت بێ... مامەڕیشەیەک، لە ئازایەتی ئازاترو، لە هەڵبژاردنی ئامانجە پێشمەرگەییەکانیشیدا، لەهەمووان وردتر بێ، عەقڵی کــێ دەیبــڕێ، پەنا بــۆ کارێکی ئاوا گەمژانە و ترســنۆکانە ببــا... ئاخر کێ باوەڕ بەوە دەکات لەســەردەمی گفتوگۆدا، دوو جەیشــی شەعبی بڕفێنێ‌و

دواتر بە دزییەوە بیانکوژێ... هەر بۆ تۆمەتبارکردنی خۆیشی، لاشەکانیان لەناوچەکانی ژێر دەسەلات و چالاکی کەرتەکەی خۆیدا فڕێدات.

ئەوەی مامەڕیشــەی ناسـیبێ، قەت ئەوە بە کاری ئــەو نازانێ... مەگەر هەڵــۆی بەرزەفڕ، لەبرسانیشــا بمرێ، پەنا بۆ خواردنی گۆشــتی گیانداری مردارەوەبوو دەبا!

مامەڕیشــەو ئێمــەش دەزانیــن، دەزگا هەواڵگیرییەکانــی بەعــس، چەند لــە مامەڕیشــە پڕو داخ لــە دڵن... هێمــن گوتەنی، "بەردێک لە ئاســمانەوە بەربێتەوە"، ئەوی لەپشتیەوە دەبینن.

مامەڕیشــە و ئێمــەش دەزانین، لە نــاو ســەرکردە و فەرماندەی ئێمەدا هەن، چاویان بە ئازایەتیو بەو ناوبانگو بەو خۆشەویستییە زۆرە هەڵنایە کە خەڵک بۆ مامەڕیشــەی دەردەبڕن... مامەڕیشــەو ئێمەش دەزانین، لەناو ئەوانەدا هەن، هەر بۆئەوەی مامەڕیشــە بشــکێنن، هەر بــۆ ئەوەی وێنەی مامەڕیشــە بڕوشــێنن، ســڵ لە هیچ تۆمەت و پیلانێکی دژ بەو ناکەنەوە... مامەڕیشــەو ئێمەش دەزانین، رووداوی ئەو دوو جەیشــی شــەعبیەش، لە چوارچێــوەی ئــەو داخ لەدڵیــەی دوژمنانو ئەو غیرە و کینەیەی دۆســتان دەرناچێ.

لەناو هەموو ئەوانەشدا، ئەوەی زۆر کۆمیدییە ئەوەیە:

بۆ لێکۆڵینەوە لەو رووداوە، سەرکردایەتی یەکێتی لیژنەیەکیان پێکهێناوە... بەرلەوەی لیژنەکە بگاتە هیچ دەرئەنجامێک، ئەوان لە پێشەوە بڕیاری خۆیان داوە، بڕیاری سزادانی مامەڕیشە.

ئەوەتا، لە پلە پێشــمەرگایەتیەکەی ســڕ کراوەو لە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی سورداشا دەستبەسەرە.

ئاخر کەنگێ لەناو جوولانەوەکەی ئێمەدا، هیچ کەســێ، تەنانەت لەســەر ئەنجامدانی تاوانیش، لێپرسینەوەی لەگەڵدا کراوە، تا لەسەر تۆمەتێک، تەنها تۆمەتێک، ئەوە دەرهەق بە جوانترین رەمزی پێشمەرگایەتی ئێمە بکرێت!

سەیرە غیرە و کینەی هەندێ خەڵک بگاتە ئەو جێیەی، هەبوونی خۆیان، لــە ئەزیەتدانی ناوبانگ و گەورەیــی خەڵکیتردا ببینن! چ زوڵمێکی گەورەیە، کەســانێک، هــەروا بێباکانە بکرێنــە قوربانی ئازایەتــی و ناوبانگی جوان و سنووربڕی خۆیان!

مـــام جەلال لــە بیرەوەریەکانی خۆیـدا، ئاماژە بە حاڵەتێکــی لەو جۆرە دەدا... ئـــەو پێیوایـــە یەک لـــە هۆکارەکانی ســـاردبوونەوەی پەیوەندی مەلا مســـتەفا لەگەڵیـدا، بـــۆ ئـــەوە دەگەڕێتـــەوە کە لـــە دوای ســـاڵی ١٩٦٣ وە، ئـــەو ناوی دەرکـــردوە و زۆر رادیـــۆ و رۆژنامەش ناوی ئەویـــان هێناوە. "وەختێک رۆژنامەیەکی رووســـی، ناوی منی بە جەنەراڵ تاڵەبانی هێنابوو، بەخۆمم گوت، ئای قوڕ بەســـەرم، دوو جەنەراڵ لە شۆڕشـــی ئێمەدا جێیان نابێتەوە."

ئەگەر دوو جەنەراڵ لەو شۆڕشـــەدا (شۆڕشـــی ئەیلول)، جێیان ببایەوە، رەنگـــە رووداوەکانـــی دوای ســـاڵی ١٩٦٤، ئاراســـتەی دیکەیـــان گرتبان و ڕەنگیشە هەر جەلالی و مەلاییش دروست نەبووبان.

ئەگـــەر لە شۆڕشـــی نوێی ئێمەشـــدا، جێیی چەند جەنەڕاڵێـــک ببوایەوە، ڕەنگە تەمەنی مامەڕیشـــەش بەشـــی دەیان داستانی دیکەی وەک(حەمک)ی بکردای!. ڕەنگە ئەفســـانەی مامە ڕیشـــەش لەو کات و شوێنەدا، بە کۆتایی نەگەیشتایە!

## ٧٢

گفتوگـۆ بەردەوامــە و چاوەڕوانیەکانــی خەڵکیـش لەگەڵیـا... هیـچ لە داخوازیــەکان جێبەجێنەکـراون و، هــەر ڕۆژەش کێشــەیەکی نوێ یەخەی یەکێتی دەگرێ... کیشــەی جاش، کێشــەی ســەربازی هەڵهاتوو، کێشــەی جەیشی شەعبی و، کێشەی خوێندکارانیشی دێتەسەر.

وەفـدەکان بەڕێــی بەغـداوەن... لەگــەڵ هــەر گەشــتێکی تازەشــیاندا، چاوەڕوانیەکان لە هەڵکاشــان و داکشــاندان. پێشــتر کە مام جەلال سەری بەغدای دەدا، خەڵکی بە ئومێدێکی زۆرەوە، چاویان لە ڕێی گەڕانەوەی مام جەلال بوو... کەچی ئەوەتا لەو ماوەیەدا، دووجاران، لە نیسان و ئایاریشدا، چۆتە بەغداو، خەڵک وەک ڕووداوێکی لاوەکی سەیری دەکا.

یەکێتی چاوەڕێی چیە و تا کەی درێژە بەم دۆخی نە شــەڕ نە ئاشــتیە دەدا؟! ئەمــە ئەو پرســیارەیە کە خەریکــە وردە وردە لەناو پێشــمەرگە و خەڵکیشدا، سەرهەڵدەدا...

هەمان پرســیار، لەو ئێوارە خوانەشدا ڕووبەڕووی مام جەلال دەبێتەوە کــە خۆی بۆ ژمارەیــەک نووســەرو هونەرمەندی ئامادە کردوە... بیســت کەس لە نوسەرانو هونەرمەندانی ناو شارەکان، سێ چوارێکیش لە ئێمەی نووسەرانی شاخیش ئامادەی ئەو ئێوارە خوانە دەبین.

لە ژوورێکی گەورەی بارەگای مەکتەبی سیاسیدا لە سورداش، بەدەوری مێزێکی گەورەی لاکێشەییدا دانیشتووین... مام جەلال وەک خاوەن داوەت، لە ســەری ســەرەوەی مێزەکەیــە... خــواردن و خواردنــەوەی هەمەجۆر، مێزەکەی ڕازاندۆتەوە... مام جەلال وەک هەمیشــە، بە قســەی خۆش وا لە میوانەکانی دەکا، خۆیان بەمیوان نەزانن... ئەوەندەی دەســتی دەگا، گۆشت بەسەر میوانەکاندا دابەشدەکا و بە سوعبەتیشەوە، دەڵێ: "شەرمێ مەکەن، بخــۆن، بەڵام دوایــی نەڵێن مام جــەلال بۆخۆی، هەمــوو ڕۆژێ خواردنی ئــاوا خۆش خۆش دەخــوا... هەموو ڕۆژێک ئەوە ڕوونــادات ئەو خواردنە باشانەمان هەبێت... جار جار نەبێ کە لە سایەی میوانی خۆشەویستی وەک ئێوەدا بۆ ئێمەش ڕێکدەکەوێ."

نانخواردن تەواو دەبێ... مام جەلال ڕووی پرسیاری دەکاتە هەمووان:

« ئنجا حەز دەکەم پێش ئەوەی من هیچ قسان بکەم، ڕاو بۆچوونی ئێوە لەسەر ئەم وەزعەی بزانم.»

هەندێک قسە دەکرێن ... هەموو قسەکان بەدەوری یەک پرسیاردا دەخولێنەوە:

پێناچێت حکومەت لە ئاگربەست بەولاوە، شتێکی تری لە مفاوەزات بوێت... نیەتی حکومەت روونە، ئەی ئێوە بەتەمای چین‌و تا کەی لەگەڵ ئەم دۆخە نارووونەدا دەڕۆن؟

مام جەلال، وێنەیەکی گشتی دۆخەکە دەخاتە بەرچاو... دەربارەی دواین دیداری خۆی لەگەڵ لایەنی حکومیدا قسە دەکا... لایەنە چاک‌و خراپەکانی گفتوگۆ دەخاتەڕوو ... گفتو گۆ بە رۆیشتن بەناو تونێلێکدا دەچوێنێ کە ئەوسەری بە تەواوەتی دیار نیە:

- ڕاستە تونێلەکە تاریکە، بەڵام ئێمە ئاگامان لە بەر پێ و لە شۆقاوەکانی خۆمانە، نە هەڵدەنگوێین‌و نە دەشکەوین... بێ هیوا نین، بەڵام دڵنیاش نین... جارێ لەگەڵی دەڕۆین... ئەگەر حکومەت داخوازییەکانی ئێمەی جێبەجێ کرد، زۆر باشە و ئەوە لە قازانجی هەموو لایەکدایە، ئەگەر نەشیکرد، نە ئێمە دەستمان لە تفەنگ بەرداوە و نە پشتی خۆشمان لە شاخی کردوە.

مام جەلال کۆتایی بە قسەکانی خۆی دێنێ... هەندێک دەیانەوێ پرسیاری زیاتری لەسەر دۆخە سیاسییەکە لێبکەن، مام جەلال حەز ناکا لەوە زیاتر وەختەکە بە سیاسەتەوە بکوژرێ:

- سیاسەت بۆتە نان و ئاومان... هەموو رۆژێک لە بەیانی زووەوە تا درەنگانی شەو، هەر باسی سیاسەت دەکەین... خۆ ئەوشۆش تەخسیریمان نەکرد، بەڵام لەوە زیاتر پێویست ناکا... بۆ من هەموو شەوێک ئاوا رێکناکەوێ... هەموو شەوێک ئەو هەموو نووسەرو هونەرمەندە بەمن خڕ ناکرێنەوە... با جارێ واز لە باسی سیاسەت بێنین و هەندێکیش باسی ئەدەب و هونەری بکەین.

روودەکاتە شێرکۆ بێکەس:

- با لە کاک شێرکۆوە دەست پێبکەین، با کاک شێرکۆ هەندێک شیعرمان بۆ بخوێنێتەوە...

شــێركۆ له دەســته چەپی مام جەلال دانیشــتووه... دەســت به گیرفانی دیــوی ناوەوەی چاکەتەکەیــدا دەکات... چەند پارچــه کاغەزێک دەردێنێت: "دووڕیــان... ئەمه تازەترین شــیعری منه" ئەمه دەڵــێو به دەنگه زوڵاڵ و جوڵه ســەما ئامێزەکانیەوە، هەموومان رادەستی خەڵوەتی گوێگرتن دەکا... بۆ چەند خولەکێک، به نمەبارانی وشەکانی گەڵای درەختی روحمان تەڕ تەڕ دەکا. لەگەڵ چەپڵەڕێزانێکی گەرمدا، شــیعرەکەی تەواو دەبێ. مام جەلال و زۆری دیکەش سەرسامی خۆیان، بەرامبەر به جوانی شیعرەکه دەردەبڕن. دووڕیان، باس لەو پرسیاره دەکا که بەسەر دەمی خەڵک و ئێمەشەوەیە... بــاس له بــێ ئومێدی خەڵــک و حاڵەتی چەقبەســتنی مفــاوەزه و، باس له ناڕوونــی بارودۆخەکه و دڵەڕاوکێــی خەڵک و، باس له نەخەوتنی تفەنگ و ئاوەدانکردنەوەی سەنگەری پێشمەگه دەکات.

عەبدولخالق مەعروف، که بەوبەری منەوه دانیشــتووه، سەرنجی خۆی بەمشێوەیه دەردەبڕێ:

- ئەمــن پێموایــه، ئەو شــیعره هەر قســەکانی مام جەلال بــوون و کاک شێرکۆ کردوونی به شیعر.

ئەم کۆمێنته، مووەکانی سەری شێرکۆ بژ دەکاتەوه و دەموچاوی رەش دادەگرێ و، به تۆنێکی پڕ له توڕەییەوە، ڕوو له عەبدولخالق دەکا:

- تۆ کەی له شیعر ئەزانی؟... شیعرو دەڕنەفیز! من رەخنەم قبوڵه، بەڵام قەت ئاماده نیم گوێ له رەخنەی دەڕنەفیزی بگرم.

بۆ چەند چرکەیەک، بێدەنگی باڵ بەسەر دانیشتنەکەدا دەکێشێ... جەوەکه شــتێک له گرژیەکی بێدەنگی تێدەکەوێ... مام جەلال کۆتایی به بێدەنگیەکه دێنێ:

- ئــەوەی کاک عەبدولخالــق دەیڵــێ، ئەســڵەن وانیه... شــیعرەکەی کاک شــێرکۆ قســەکانی من نەبوون، له راستیدا قســەکانی من شیعرەکەی کاک شێرکۆ بوون.

مام جەلال، بۆ پشتیوانی له شیعرەکه و له قسەکانی خۆیشی، بۆ وەختی مەراسیمی بەخاک سپاردنی تۆفیق وەهبی دەگەڕێتەوە:

لەســەرەتای مفاوەزاتــا بــوو، تەرمــی تۆفیق وەهبــی لــه هەندەرانەوه هێنرایەوه کوردســتان، له مەراســیمێکی شایســتەدا، وەک خۆی وەسیەتی

کردبوو له دێی زێوێی ناو باوەشـــی پیرەمەگروونددا بەخاک ســـپێردرا. مام جەلال و ژمارەیەکی زۆر له بەرپرسانیش، ئامادەی مەراسیمەکە دەبن. مام جەلال وتەیەکی هەســـت بزوێن پێشکەش بە ئامادەبووان دەکا... سەبارەت بەو وتە هەست بزوێنەی دەڵێ:

« ئەمن دەمویست لەگەڵ برادەراندا، هەر بەشداری مەراسیمەکە بکەم‌و هیـــچ نەڵێم... دامنابوو ئەگەر زۆریشـــم لێبکەن قســـان بکـــەم، هەر هەندێک شـــتی گشتی بڵێم‌و زیاتر نا... کاک شێرکۆ پەخشانە شیعرێکی زۆر بەهێزو کاریگـــەری خوێنـــدەوە، منی تەواو جوولانـــد... دوای ئەویش کە داوا لە من کرا وتەیەک پێشکەش بکەم، هەموو ئەو شتانەم گووت کە نەدەبوایە لەبەر موراعات کردنی بارودۆخی گفتوگۆ، گووتبامن... ئەوەی ئەمن لەوێ گووتم، هەرهەمووی له ژێر تەئسیری قسەکانی کاک شێرکۆدا بوو.»

قســـەکانی مام جەلال توێژاڵێک لە شـــانازی و رەزامەندیان خستە سەر روخساری گرژبووی کاک شێرکۆ...

چەنـــد شـــاعیرێکی تر شـــیعر دەخوێننـــەوە... هەندێک بابەتـــی ئەدەبی و هونەریش قســـەیان لەســـەر دەکـــرێ... بەر لەوەش کات بگاتە ناوەڕاســـتی شەو، دانیشتنەکە کۆتایی دێ.

## ٧٣

ئێوارەخوانەکەی مام جەلال، چون شنەبایەکی ئێواران توێژە خۆڵەمێشی سـەر پشکۆ شـیعریەکانی ناو خەیاڵدانی منی ڕامالّی. بۆ سێ ساڵ دەچوو، هیـچ شـیعرێکم نەنوسـیبوو. لەوکاتەشـەوە هاتبوومـە رادیـۆ، ئەوەنـدە سەرقالّی نووسینی بابەتی سیاسی و رادیۆیی ببووم، فریای نوسینی شیعر نەدەکەوتم... تەنانەت ئەگەر فریاش کەوتبام، هەموو ئەو خەیاڵ و هەستو موعاتانەی دەمبوون، بەرلەوەی ببنە کاری ئەدەبی، لەڕێی نوسینی سیاسی رۆژانـەوە بەتـاڵ دەبوونەوە. هەڵەی گـەورەی من لەوەدا بـوو، نەمتوانی جۆرە هاوسـەنگیەک لەنێوان نووسینی بابەتی سیاسیو نووسینی شیعردا دروسـتبکەم. تا لە شـار بووم، ئەو هاوسـەنگیەی نێوانیانم بۆ دەپارێزرا، بەڵام لەوێ بەدواوە نا.

من لەڕێی ئەدەبەوە هاتمە ناو سیاسەت... کە هاتیشم دەمزانی چەکی من بۆ بەرەنگاری، زیاتر چەکی ئەدەبە تا کاری سیاسیو رێکخستن. ئەوەندەی لە شـار بووم، وەک نووسـەرێک، نەک کادیرێکی حزبـی، چالاکیم ئەنجام دەدا، ئـەو چالاکیە ئەدەبیانە وایـان کرد، لە ماوەیەکی زەمەنی زۆر کورتدا بناسـرێم. هەر بۆیەش ئەوانەی لە رێکخسـتندا پەیوەندیم پێیانەوە هەبوو، لەترسـی ئاشـکرابوون بووبێ، یان هەرشتێکی تر، چالاکی رێکخستنیان بۆ من بە باش نەدەزانی. لەو سـەردەمەدا، دوو سێ بەرهەمی باشی ئەدەبیت هەبوایـە دەناسـرای. هەمـووی چوار یـان پێنج پارچە شـیعر و یەک دوو بابەتـی ئەدەبیـم بڵاوکرابوونەوە کە بووم بە ئەندامی یەکێتی نووسـەرانی کورد.

لەو ڕۆژگارەدا، ئەندامبوون لە یەکێتیی نووسەرانی کورددا، شەهادەیەکی گرنگی ئەدیبوون بوو. نووسـەر هەبوو چەند کتێبێکی چاپکراویشی هەبوو، کەچـی بە ئەنـدام وەرنەدەگیرا. من بەختم هەبوو، ئەوکاتەی وەک شـاعیر دەرکەوتـم، شـیعر لەوپـەڕی رەواجیـدا بوو، هیـچ رەگەزێک لـە رەگەزە ئەدەبیەکانی تر، ئەوەندەی شـیعر بایەخی نەبوو. ئەوەندەی گوێ لە شاعیر دەگیـرا، گـوێ لە هیچ کەسـێکی دیکە نەدەگیرا. ئەو بۆشـاییە سیاسـیەی لە دوای ئاشـبەتاڵەوە درووسـتببوو، شـیعر بەشێکی باشـی پڕکردبووە. کۆڕەشـیعرییەکان زۆرتریـن قەرەباڵغییـان لە خۆیان کۆدەکـردەوە. هەر

کاتێک شاعیرانی وەک لەتیف هەڵمەت، شێرکۆ بێکەس، رەفیق سابیر، ئەنوەر قادر محەمەد و زۆری تریش، کۆڕی شیعرییان هەبا، بە سەدان کەس ئامادە دەبوون. دەتوانم بڵێم لەو قۆناغەدا، قۆناغی دوای ئاشبەتاڵ و تا ئەو کاتەش من لە شاردابووم، لەتیف هەڵمەت لە دەنگە هەرە بڵندەکانی ئەوکاتەی شیعری بەرەنگاری بوو. لەتیف هەڵمەت، کاریگەریەکی زۆری لەسەر قووڵکردنەوەی گیانی بەرەنگاری لە ناو گەنجاندا هەبوو... شـیعرەکانی ئەو لە شـیعری هەر شـاعیرێکی تر گوێگر و خوێنەریان زۆرتربوو... هەر کاتێک کۆڕی شـیعری هەبا، لە سلێمانی با یان لەبەغدا، هۆڵی شیعرخوێندنەوەکان، ئەوەندە قەرەباڵغ دەبوون، جێگای بە پێوە وەسـتانیش نەدەما. ئەو ڕۆژگارە، وشەگەلی وەک: کوردستان، داربەڕوو، دێ، بەفر و ڕووبار، کانی، چیا و هتد....، وەک ئاماژەی گیانی بەرەنگاری لای ڕژێم یاسـاغ بوون بەڵام ئاسـمانی شـیعرەکانی ئەو پڕپڕبوون لە جریوەی ئەستێرەی ئەو وشانە.

لەتیف هەڵمەت وەک خۆی دەڵێ، شـاعیرێکی نوێخوازی ئەزمونگەرە و حەزدەکا هەر ڕۆژەی بەشێوەیەکی نوێ و جیاواز بنووسێ.

لەتیف، بە زمانێکی سـادە دەنووسـێ هێندە سـادە هەموو کەسـێ، لە هەرچین و توێژێک و لە هەر ئاسـتێکی خوێندەواریی و نەخوێندەواریدا بێ تێیدەگا... زمانێکی سـادە بەڵام قووڵ، هێندە قووڵ کە هەموو کەس توانای خۆ لە قەرەدانی نیە.

شیعرەکانی لەتیف، لە فەرشی دەستکردی کوردەواری دەچوون، پڕبوون لـە ڕەنـگ و وێنـەی جۆراوجـۆر... فەرشـێک تەونگەرێکـی زۆر کارامە و دەسترەنگین و بەهرەمەندنەبا بۆی نەدەچنرا.

لەتیـف هەڵمەت هەر لە کۆمەڵە شـیعری (خوا و شـارە بچکۆلەکەم)ەوە، وەک شـاعیرێکی یاخی و جیاواز دەرکەوت... بە کۆمەڵە شیعرەکانی (پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە، گەردەلوولی سپی و وشەی جوان گوڵە گوڵ)ەش بوو بەو شاعیرەی لە جوگرافیای شیعری کوردیدا، پانتاییەکی دیار و بەپیتی بۆ خۆی داگیرکرد و ئاڵای شاعیریی خۆی لەسەر هەڵکرد.

دەتوانـم بڵێم دەکرێ سـاڵانی حەفتـاکان، بە فەترەی زێڕینی شـیعر و ئەدەبـی کـوردی لەقەڵەمبـدرێ... زێڕین بە مانای باشـترین یان زۆرترین بەرهەم نا، بەڵکو بەو مانایەی کە لەو سـەردەمەدا شیعر زۆرترین گوێگرو خوێنەری هەبوو.

چ لەوە خۆشتر نەبوو، لەسەردەمێکی ئاوادا خەڵک و شاعیرانی دیکەش بە شاعیرت بزانن، بەتایبەتی بۆ کەسێکی ئەوسا گەنجی وەک من.

ئــەو ڕۆژەی یەکەم شــیعرم (لە هەگبەی ڕێبوارێکی تینــوودا) لە ژمارە ٢٢ی شــوباتی ١٩٧٥ی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوکرایەوە، لە خۆشــیاندا قاچم زەویی نەدەگرت[٢٢٥].

ئەو ڕۆژە، هەســتێکی ئێجگار ســەیرم هەبوو، وەک هەستی ئەو بێچووە مەلەی بۆ یەکەم باڵەفڕێی بەهەوا دەکەوێت. ئاخر بڵاوبوونەوەی شیعر، لە گۆڤارێکی ئەدەبی وەک بەیاندا ئاسان نەبوو، تاکە گۆڤاری ئەدەبیی مانگانە... گۆڤارێکــی ئەوەندە پڕخوێنەربوو، هەر ئەو ڕۆژەی لە بەغداوە دەگەیشــتە کتێبخانــەکان، لە بازاڕدا نەدەما. کەســێک چانســی بڵاوبوونــەوەی لەوێدا هەبووایــە وەک ئەوەوابــوو فیزەی چوونە ناو وڵاتی شــیعری وەرگرتبێت. لەدوای بڵاوکردنەوەی دوو سێ پارچە شیعری ترم، شاعیرانی وەک شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت و هیتریش حسابی شاعیریان بۆ دەکردم.

لە هاوینی ١٩٧٨دا، شــیعرێکم بەناوی(ڕێباز) لە ڕۆژنامەی (بیری نوێ) دا بڵاوکرایەوە... هەرهەمان هەفتەش لە ڕۆژنامەی (الفکر الجدید)دا کرابوو بە عەرەبی... هەفتەیەک دواتر، لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا، سەری بارەگای لقی بەغدای (یەکێتی نووســەرانی کوردمان)دا... بەتەمای سەردانی محەممەدی مەلاکەریم و دکتۆر عیزەدین مســتەفا ڕەســوڵ بووین... هەتا ئەوان هاتن، ئێمە لەســەر کورســیەکانی ناو هۆڵی بارەگاکە دانیشتین... چەند خولەکێک دوای ئێمە، ئەحلام مەنسوور و محەممەد موکریش هاتن. ئەحلام، گیتارێکی بەشــانی خۆیدا کردبوو... ســڵاویان کــردو، چەند ڕیزێک لــە پێش ئێمەوە

٢٢٥-ئەم شیعرە دووجار وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەربی و لەدوو ڕۆژنامەدا بڵاوکرایەوە، ڕۆژنامەیەکی عێراقی و ڕۆژنامەیەکی لوبنانیش. من شیعرەکەم بەناوی(لە هەگبەی ڕێبوارێکی تینوودا) نارد، بەڵام بەڕێوەبەرانی گۆڤارەکە، وشەی فەلەستینیان خستبووە بەردەمی... بەم شێوەیە ناونیشانەکە بووبە(فەلەستین لە هەگبەی ڕێبوارێکی تینوودا). ئەوەی جێی سەرسوڕمانی من بوو، حەسیب قەرەداخی، لەژمارە ٢٣ی بەیاندا، بابەتێکی بڵاوکردبووەوە لەوێدا ئاماژە بەم شیعرەی من دەکاو وەک ئەوەی بە حکومەت بڵێ بەکارهێنانی وشەی فەلەستین تەنها بۆ شاردنەوەی ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی شیعرەکە بەکارهاتووە، دەنا لە ڕاستیدا هیچ پەیوەندییەکی بە فەلەستینەوە نیە بەڵکو هەرهەمووی باسی مەسەلەکانی لای خۆمانە.

دانیشتن... دیمەنی بەیەکەوەبوونی ئەوان، لەتیفی تەواو بێتاقەت و نارەحەت کرد... ئاخر ئەو سەردەمە ئەحلام، لەتەیفی تا رادەی ئاشقبوون بە خۆیەوە سەرسام کردبوو... تەنانەت لەتیف(پرچی ئەو کچە رەشمالّی گەرمیان و کوێستانمە)ی بۆ ئەو نووسیبوو... چەند خولەکێک دوای هاتنیان، ئەحلام هەستاو هاتە لای ئێمە، یان راستر بلێم هاتە لای لەتیف... بەدەم پەنجەهێنان بەناو قژی لەتیفدا وتی:

- لەتە گیان، خەریکم خۆم فێری مۆسیقا ئەکەم... هەندێک شیعرم بۆ بنووسە ئاوازیان بۆ دائەنێم.

لەتیف، بێ ئەوەی بە تەواوەتی سەر هەڵبڕێ:

- برۆ ئاواز بۆ چیرۆکەکانی حەمەی موکری دانێ.

هاتنی دکتۆر عیزەدین و محەمەدی مەلا کەریم، دایەلۆگە پلاراویەکەی نێوان ئەحلام و لەتیفی پچڕاند.

لەتیف، لە ژوورەکەی ئەواندا، منی بەوان ناساند:

- ئەم شیعرە سەرەتایەکی بەهێزە بۆ ئایندەیەکی رۆشن، محەممەدی مەلا کەریم وای وت.

- هەر بەراست تۆ هەڤاڵ کوێستانیت؟! دکتۆر عیزەدین بە جۆرێک لە حەپەسانەوە لێی پرسیم.

- بەڵێ من هەڤاڵ کوێستانیم.

- کە ئەو دوو سێ شیعرەی تۆم بینی، هەربەراستی وامزانی رەفیق سابیرە و بووە بە شاعیر.

ئەگەرچی جۆرێک لە غەدر و ناڕەواییم لەکۆمێنتەکەی دکتۆر عیزەدیندا، بەرامبەر بە رەفیق سابیر دەبینی، بە تایبەتیش کە رەفیق سابیر، لە دەنگە زوڵاڵ و بە هەڵویست و بە هێزەکانی ئەو رۆژگارەی شیعری بەرەنگاریی کوردی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کۆمێنتە بۆ من، شاهادەیەکی گرنگ بوو.

ئەوەی لە هەموو بەرهەمە شیعرییەکانی ترم زیاتر منی وەک شاعیر ناساند، شیعری(دوا نامە)بوو کە لە میهرەجانی دووەمی شیعری کوردیدا

خوێندمــەوە. ئەگــەر لیژنــەی بەڕێوەبردنــی میهرەجــان و هەڵاوێردنــی شیعرەکان، شــیعری (ئەمجارە بەفریش گڕدەگرێ)[٢٢٦] یان قبوڵ کردبا، بەو شیعرە بەشداری میهرەجانەکەم دەکرد...

دوو ڕۆژ بەر لە بەڕێوەچوونی میهرەجانەکە، لیژنەکە ئاگاداریان کردم:

ـ ئەگەر بتوانی لەباتی ئەم شیعرە، بەشیعرێکی تر بەشداری میهرەجانەکە بکەیت، ئێمە سوپاست دەکەین.

ـ بۆ شیعرەکە هیچ کەموکوڕییەکی تێدایە؟!

ـ نا، شیعرەکە زۆریش جوانە، بەڵام هێندە توندە، ئێمەش و تۆش، تووشی سەریەشەو گێچەڵ دەکات.

مــن ئەو کاتــە هێندە خوێن گەرم بووم، حســابم بۆ تووشــبوونی خۆم نەدەکــرد، بەڵام بــۆ ئەوەی کێشــە بۆ ئــەوان درووســتنەکەم، داواکەیانم قبوڵکرد.

لەبەرئەوەی شــیعرێکی تری شایســتە بــەو ڕووداوە گەورەیەم نەبوو، دەبوایە لەماوەی دوو ڕۆژدا شیعرێکی تازە بنووسم.

شەو بەدرەنگەوە، دوای ئەوەی هاوژوورەکانی بەشی ناوخۆیی زانکۆم خەوتن، کەوتمە ڕەشکردنەوەی کاغەزان. ئەو شەوە خۆم وەک ئەو خەیاتانە دەهاتە بەرچاو کە جلی جەژنی خەڵکیان بەسەرا دەکەوێتەوە، شەو تا بەیان هەر خەریکن، تا هەموو جلەکان نەدروون ناخەون. ئەو شەوە منیش وەک ئــەو خەیاتانە، تا بەرەبەیان نەخەوتــم. بەرلەوەی مەلای مزگەوتان قوڕگی خۆیان بۆ بانگی بەیانی پاککەنەوە، لە نووســینەوەی شــیعرەکەم بوومەوە. یەکــەم خوێندنەوەی دوای نووســینی، ئەو هەســتەی دامێ کــە ڕەنگە ئەو شیعرە سەرم تێدابەرێ، بۆیە ناومنا (دوا نامە).

ئێوارەی بەر لەدەســتپێکردنی میهرەجان، شــیعرەکەم ڕادەستی لیژنەی بەڕێوبەری میهرەجان کرد. (٣٠) شاعیر لە هەموو باشوری کوردستانەوە، بۆ بەشــداریکردن هەڵبژێردرابوون... (١٠) لە ســلێمانی و (١٠) لە کەرکوک بەغداو (١٠) ش لە دهۆک و هەولێر.

---

٢٢٦- ئەم شیعرەم لەو ئاهەنگەدا خوێندەوە کە قوتابیە کوردەکانی زانکۆی موسڵ لە سەیرانگای (دڵۆپە)ی نزیک هەولێر لە نەورۆزی ١٩٧٩دا سازیانکردبوو.

لـه ڕۆژی ٣/٢٩/ ١٩٧٩دا میهرەجـان دەسـتی پێکـرد... بەدرێژایی دوو ڕۆژ، دانی بەیانی و دانی ئێوارە، بە هەزاران خەڵک گوێیان لە شیعری ئەو شاعیرانە گرت. من بەر دانی سێیەمی شیعر خوێندنەوە کەوتم.

هەمووومان بەڕیز لەسـەر شـانۆ وەسـتابووین... بەرامبەر بە ئێمە و لە ڕیزی پێشەوەشـدا، هەرچی بەرپرسی باڵای بەعس، لە پارێزگای سلێمانیدا هەبوون، بەتەنیشـت یەکەوە دانیشتبوون. دکتۆر عیزەدین بردمیە ئەولاوەو پێی وتم:

"من ترسـم لە شیعرەکەی تۆ هەیە.. دەترسم کێشەمان بۆ درووستکات. بۆیـە، بۆ ئەوەی سـەرنجی بەرپرسـانی بەعس ڕانەکێشـی، ئەگەر خەڵک داوای دووبارەکردنـەوەی هەر کۆپلەیەکیان لێکـردی، تکایە تۆ دووبارەی مەکەرەوە... هەر بۆ خۆ پەڕاندنەوەش، لەشـوێنێکدا وشـەی فەلەسـتینمان تێئاخنیوە، تکایە ئەو وشەیەش بخوێنەرەوە." بەڵێنم پێدا وابکەم.

دوای شێرکۆ بێکەس و محەممەد بەدری، سەرەی شیعر خوێندەوە هاتە سەر من:

**لە هەندێ جێ،**

**ئەگەر مانگ یان خۆر بگیرێ**

**ئەوە دینیی و دەروێشەکان،**

**بۆ بەردانیان دەکەونە تەقە و دەفلێدان**

**بەڵام ئێمە، لەوەتەی هەین**

**دەفی خوێن و ئاگر دەکوتین**

**بۆ ئەو خۆرەی قەت نەماندیوە و نەیدیوین**

ڕەووف بێگــەرد، بەخوێندنــەوەی ئەم کۆپلەیــەی (دوا نامە)، منی وەک شاعیری لاو پێشکەش کرد. من بەڕانکوچۆغەیەکی خاکیەوە، دەچمە بەردەم مایکرۆفۆن:

**لە هەندەران کە خێزانێک،**

**بەگەینەجێی کەژاوەی بوونی منالێکیان شاد دەبن،**

**ئەوا دەچن و دارێ دێنن،**

**لە ئاهەنگی لەدایکبوونی منالا، لەخاکی ولاتا دەیچێنن.**

**بەلام لە ولاتی ئێمەدا،**

**لە پێشوازیی کۆرپەی خۆری ئازادیدا،**

**هەموو ڕۆژێ نەوەک دارێ،**

**بەلکو بالای دەیان شەهید دەبنە ڕەگ و**

**بەقولایی خاکی سووری کوردستانا دەچنە خوارێ.**

هێشــتا دواییــن وشــەکانی یەکەم کۆپلــەی شــیعرەکەم دەرنەبڕیبوون، شەپۆلی چەپڵە ڕێزان، هۆڵەکەی هەژان. هاواری(دووبارە... دووبارە..) منی بۆ چەند دەقیقەیەک وەستاند:

"ئاخر من بەڵێنم داوەو نابێت بەڵێنەکەم بشکێنم" من وابەخۆم دەڵێم.

دکتــۆر عیزەدین، ســەرۆکی ئەو کاتــەی یەکێتیی نووســەرانی کوردو، سەرۆکی لیژنەی بەڕێوەبردنی میهرەجانیش، دێتە پشتی مایکرۆفۆن :

"ئەگــەر ئێوە دەتانەوێت میهرەجانەکە بەردەوام بێت، ئەمە دوا شــیعری میهرەجان نەبێت... ئەگەر ئێوە بۆ گوێگرتن لە شــیعر هاتوون، تکایە چەپڵە لێمەدەن... لێگەڕێن با شیعرەکەی بخوێنێتەوەو با میهرەجانەکەمان بەردەوام بێ."

ئەم قسانەی دکتۆر عیزەدین نەبوونایە، دۆخەکە بۆ من و بۆ بەڕێوەبەرانی میهرەجانەکەش، زۆر سەخت و دژوار دەبوو.

ڕەنگە ئەگەر چەند مانگێک دوای ئەو میهرەجانە، نەبوومایە بە پێشمەرگە، بەرهەمی لەوجۆرەم زیاتر هەبوونایە. لەو ڕۆژەوە بووم بە پێشمەرگە، بەئیرادەی خۆم بووبێت، یان بە هۆی هەلومەرجی شوێنی کارکردندنمەوە، بەخێرایی تووشی نووسینی بابەتی سیاسی هاتم... هەر بەو خێراییەش لە شیعر نووسین دوورکەوتمەوە. ئەگەرچی لە سێ سالّی سەرەتای پێشمەگایەتیمدا، کەم کەمە هەر شیعرم دەنووسی، بەلاّم لەو ڕۆژەوە چوومە ڕادیۆ، بەتەواوەتی لە شیعر نووسین دابڕام. بۆخۆم هۆکاری ئەو دابڕانەم، جیا لەکارکردنم لە ڕادیۆدا، بۆ کوژانەوەی چرای ئەو عەشقە جمکەیە دەگێڕایەوە کە ساڵانێکی زۆر، ناخی منیان تژی کردبوو لە ڕۆشنایی... لەو شوێنەدا هەردوو عیشقم لەدەستدا، عیشقی بیروباوەڕ و عیشقی ئەویش، ماسی شیعرم کەوتنە وشکایی. ئاخر ئەگەر عیشق وەک کۆمەڵە پشکۆیەکی نیوە کوژاوەی ژێر بارستایی خۆڵەمێش، بەمقاش تێوەردانیش کەمە گەرماییەکت نەداتێ، کوا دکارێ هێز و ئیلهامی شیعر نوسینت بداتێ.

سێ ساڵ دەبوو یەک دێڕە شیعرم نە نوسیبوو، بەلاّم لەهەموو ئەو ماوەیەدا هەستێکم هەبوو... هەستی ئەوەی کرمی ئاوریشمی سەر گەلاّتووی کۆمەڵە وشەیەک لە قۆزاخەی خەیاڵدانمدا، سەرگەرمی درووستکردنی ئاوریشمی شیعرێکن... دواجار قۆزاخە دەمی کردەوەو شیعری(بڕیارێکی درەنگ وەخت) لەدایکبوو. چەندجارێک بۆ خۆمم خوێندەوە... من عادەتێکم هەبوو، هەرجارەی شیعرێکم نووسیبێ، لە پێشدا بۆ خۆمم خوێندۆتەوە، بەدڵم نەبوبێت دڕاندومە.... ئەمەیانم بە شایستەی دڕاندن نەزانی... خستمە ناو زەرفێکەوە و هەر هەمان ڕۆژ بۆ گۆڤاری(نووسەری کوردستان)م ڕەوانەکرد. ئەو کاتە(کاتی مفاوەزات) محەممەد موکری و حەمەکەریم عارف و هەندێک نووسەری تر لە سووورداش، ئەرکی دەرکردن و بەڕێوەربردنی گۆڤارەکەیان لە ئەستۆی خۆیان گرتبوو.

"لەو دە ساڵەی ڕابردوودا، زۆر کەم شیعری جوانم بینیوە... بێ هیچ دوودڵیەک دەڵێم کە (بڕیارێکی درەنگ وەخت) یەک لەو شیعرە زۆر کەم و زۆر جوانانەیە".

محەممەد موکری، لەگەڵ گەیشتنی شیعرەکەدا، ئەو چەند دێڕەشی لە دووتوێی نامەیەکدا بۆ نووسیبووم.

دوای لــە چاپــدان وبڵاوبوونــەوەی شــیعرەکەش، کەســانێکی زۆر لــە نووســەرو غەیری نووسەر، ڕای هاوشــێوەی ڕایەکەی محەممەد موکریان لەســەر شــیعرەکە دەربڕی... یەکێــک دەیــووت"دۆم کڵاش بۆخۆی بچنێ، ئاوای دەچنێ".

یەکێکی تر دەیوت"گوناهە شــیعر، ئەوەندەی ئەم شــیعرە جوان نەبێت، بیخوێنیتەوە" و زۆر شتی دیکەش لەو قسانە.

دواجار هەر ئەو وەسف و پیاهەڵدانانە، لەبەردەمی مندا بوونە بەربەست. ئیــدی لەوێ بەدواوە هەرچی شــیعرێکم دەنووســی، دەمدڕاند.. تاوامڵێهات بەتەواوەتی لە شــیعر نووســین دابڕام... دابڕام و نەمزانی، من خیانەتم لە شیعر کرد یان سیاسەت خیانەتی لە من و لە شیعریش کرد.

هەمواركردنـەوەی یاسـای ژمـارە ٩٠ی چارەسـەری كشـتوكاڵ [٢٢٧] . بـەلای ئێمەوە گرنگ و جێـی بایەخ بوو... گرنگ بوو بـەڵام پێداچوونەوە و هەمواركردنـی گـەرەك بوو. لە دیـداری وەفدەكانی یەكێتـی و حكومەتدا، قسـەی لەسەركرابوو... هەر قسە، دەنا هیچ پرۆژەیەكی هەموار كردنەوەی ئەو یاسایەیان بە وەفدی حكومەت نەدابوو.

بەو پێیەی من ئەندازیاری كشتوكاڵ بووم، ئەو بابەتەم بەبواری زانستی خۆم دەزانی. ئەركی ئامادەكردنی ئەو پرۆژیەم خسـتە ئەستۆ. بەگەڕانەوە بۆ دەقی یاسـاكەو بەپشت بەسـتن بە چەند سـەرچاوەیەكی پەیوەندیدار، لەمـاوەی چەند هەفتەیەكـدا، پرۆژەیەكم لەسـەر هەمـوار كردنەوەی ئەو یاسـایە ئامادەكرد. سـەرەتا بە چەند ئەڵقەیەك، لەڕادیۆوە بڵاومانكردەوە، دواتریش لە شـێوەی نامیلكـەدا چاپمانكرد. چەند دانەیەكـم بۆ مام جەلال برد... دوای چاوخشاندنێكی خێرا بە دانەیەكیاندا، گووتی:

- شـتەكی زۆر باشـتكردووە... هەقـە لەمـەودوا بۆ هەر مەسـەلەیەك، پرۆژەیەكی لەو جۆرەمان هەبێت.

نامیلكەكەی خستەسەر ئەوانی دی:

- دوایی بە وردی دەیخوێنمەوە و پێشانی برادەرانیشی دەدەم... حەتمەن ئیستفادەی لێدەكەین.

بەرلەوەی مام جەلال جێبێڵم، بەدەرفەتم زانی لەسـەر دوو بابەتی دیكە، قسانی لەگەڵدا بكەم

یەكێكیـان سـەبارەت بـەو چاوپێكەوتنەیەتـی لەگەڵ گۆڤـاری (الطلیعة العربیـة)دا... چاوپێكەوتنەكـە، چەنـد ڕۆژێـك لەوەوبـەر، لە ژمـارە ٦٥ی مانگـی ئابی ئەو گۆڤارەدا بڵاوكرابۆوە... هەندێك لە وەڵامەكانی مام جەلال نیگەرانی و پرسیاری زۆریان لای خەڵك و پێشمەرگەش درووستكردبوو... بەتایبەتیش لەو شـوێنەدا كە دەڵێت: "سـەدام حەكەمـەو دوژمن نیە." یان

---

٢٢٧- ئەو یاسایە لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ ڕێكخستنی موڵكایەتی كشتوكاڵی دەرچووە كە تایبەت بوو بە ناوچەی كوردستانی ئۆتۆنۆمیدار.

دەڵێ، "بارزانیەکان دووجار خائینن، جارێکیان لەبەرئەوەی لەدژی کوردی ئێران شــەڕدەکەن، جارەکەی کــەش لەبەرئەوەی پێش پاسـدارانی ئێرانی دەکەون و دژ بە سوپای عیراقی شەڕدەکەن."

یــەک لــە کێشــەی دیــدارە ڕۆژنامەوانیەکانــی مــام جــەلال، ئەوەیــە زۆربــەی جارەکان بەدڵــی ڕۆژمەوانەکان وەڵامدەداتــەوە، لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکانی ئەو ماوەیەشیدا، هەر پرسیارێک سەبارەت بە گفتوگۆبا، هەوڵی زۆری دەدا هۆکاری ســەرەکی دەســتپێکرنی گفتوگــۆکان، لەلایەن یەکێتیەوە، بۆ (بەتەنگاوەهاتنی نیشتمانی) بگێڕێتەوە... شتەکانی والێکدەدایەوە کە گوایە مەترســی داگیرکردنی عێــراق، لەلایەن ئێرانەوە لە گوینە، ئەویش مافــی داگیرکردنی وڵاتەکەی بەهیــچ هێز و دەوڵەتێک نادا، وەڵامەکانی ئەو چاوپێکەوتنەشی هەر لە هەمان چوارچێوەدابوون. وەختێک وتم:

- بەتەما نین هیچ ڕوونکردنەوەیەک لەســەر ئەو چاوپێکەوتنەی گۆڤاری (الطلیة العربیة) بدەن.

بەجۆرێک لە تیزۆوە، وتی:

- وەڵامەکانیان شێواندووە... ئەوەی باسی حەکەمی سەدام دەکات، ئەوە قســەی ئــەو کاتەیە کە لەیەکێک لە دانیشــتنەکانماندا لەگــەڵ وەفدی میری کردبووم، لەســەر مەســەلەیەک، ئەوان دەیانویســت ســەدام بکەنە بیانوی هەڵویســتی توونــدی خۆیان، من پێــم گووتن "ئەوە کێشــەی نێوان ئێمەو حکومەتە، سەدام حسێن سەرۆکی عێراقە و ئەو لەو کێشەیەدا دوژمن نیە، حەکەمە..." من لە سیاقی قسەکانی خۆمدا ئەوەم بۆ کابرای ڕۆژنامەنووس گێڕایــەوە، ئەویــش دوایــی هاتــووە کردوویەتی بــە وەڵامی پرســیارێکی خۆی. ســەبارەت بــەوەی بارزانیەکانیش، ئەمن نەمگووتــووە بارزانیەکان، گووتوومە کوڕانی بارزانی... کاکی ڕۆژنامەنووس ئەوەشــی گۆڕیوە... ئەو ڕۆژنامەنووسە شتەکانی هەموو ئاوا شێواندووە.

- ئەی کەواتە بۆ ڕوونکردنەوەیەک بڵاونەکەینەوە؟

- پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات.

- ئەگەر ڕوخسەتتان لەسەر بێت، ئێمە دەتوانین ڕوونکردنەوەیەک بەناوی مەکتەبی ڕاگەیاندنەوە بڵاوکەینەوە.

- شــتی لەوە گرنگتر هەیە بیکەن، خۆتان بەشــتی واوە خەریک مەکەن،

مام جەلال کە نەیدەویست قسەی زیاتر لەسەر ئەو بابەتە بکرێت، ئاوا وەڵامی دایەوە.

بۆ بابەتی دووەمشیان، لەوکاتەدا مام جەلال بەسیمایەکی گرژەوە، سەیری هەندێک کاغەزی بەردەمی خۆی دەکرد، گووتم:

- کە بەرەو ئێرە دەهاتم، لەناو گۆڕەپانەکەدا تووشی ژمارەیەک سەرەک عەشیرەت و کەسایەتی هاتم... دووانیانم دەناسی... یەکێکیان هەر خزمی خۆشمە... ئەوەی لە قسەکانی ئەو دووانەدا تێگەیشتم، ئەوەیە حکومەت فشاری خستۆتە سەریان و داوای چەک هەڵگرتنیان لێدەکات،... ئەوانیش هاتونەتە ئێرەو دووبژاردەیان خستتۆتە بەردەمی ئێوە:

- ئەگەر ئێوە گرەنتی ئەوەیان بدەنێ، ژیان و گوزەرانی ماڵ و منداڵ و هەموو ئەندامانی عەشیرەتەکەیان بۆ مسۆگەردەکەن، ئەوە بەخاوخێزان و عەشیرەتەوە دێنە دەرەوە و دەبنە پێشمەرگە... ئەگەر نا، ناچاردەبن چەک بۆ حکومەت هەڵگرن و ببنە جاش. هەرچەندە دەشڵێن "ئەگەر ببینە جاشیش دوژمنایەتی یەکێتی ناکەین."

کەمێک وەستام و ئینجا درێژەم بە قسەکانم دایەوە:

- من دەزانم ئەو خەڵکانە سوور دەزانن، یەکێتی ئەو توانایەی نیە بژاردەی یەکەمیان بۆ جێبەجێ کات، ئەوەی دەیڵێن هەر بیانووە و بۆ ئەوەیە، بژاردەی دووەم لەبەردەم یەکێتیدا بکەنە دیفاکتۆ.

- ئەوەی گووتت وایە... یەکێتی ڕێگەیان بدا یان نەدا، ئەوانە هەردەبنە جاش. ئەو پرسەی ئەوانە دەیکەن، پرسە خەسوانەیە و هیچیترنا.

- باشە ترسی ئەوە نیە ئەمە بە شەرعیەتدان بە جاشایەتی لێکبدرێتەوە.

- نەخێر شەرعیەتدان نیە... ئەمن دەزانم ئەوانە بۆ ئەوە نەهاتوون ببنە پێشمەرگە، من بشڵێم چەک بۆ حکومەت هەڵمەگرن، هەر هەڵیدەگرن... مادام هەردەبنە جاش با وەک جاشەکانی سەر بە پارتی نەبن، پێشمەرگە بە دوژمنی سەرەکی خۆیان بزانن... با ئەوەشت پێبڵێم، هەر لە سەرەتای گفتوگۆوە، ئێمە لەگەڵ جاشاندا معامەلەیەکی باشمان نەبووە... نەدەبوایە هەر لەسەرەتادا ئەوەندەیان بترسێنین و لەخۆمانیان گورگە کەین [٢٢٨]... با شتەکی کەشت پێبڵێم، هەموو ئەو چەک و تەقەمەنیانەی ئەوانە ئەوڕۆ لە

٢٢٨ـ گورگە بوون: دوورکەوتنەوە، سڵەمینەوە، تەرەبوون

حکومەتی وەردەگرن، لە داهاتوودا دەبنە مڵکی خۆمان.

مـن ئەگەرچـی لاریم لـە لێکدانەوەکانی مام جەلال نەبوو بەڵام ترسـی مـن لـەوە بوو، ئەو ڕێپێدانە بۆ بوون بەجاش، کاری جاشـێتی ئاسـایی و ئاسانترکاو خواستی خەڵکیش لەسەر پێشمەرگایەتی کەمترکاتەوە... وێڕای ئەوەش ڕۆح و ئینتیمای نەتەوەیی و نیشتمانیش لاواز کات. لەوە دەترسام دەنا دەمزانی، وەک مام جەلایش وتی، ئەمانە ڕێ درابان یان نا، هەردەبوونە جاش و حکومەتیش لەسەر چەکدارکردنی ئەو خەڵکانە بەناوی(فەوجەکانی خەفیفە[229])وە بەردەوام دەبوو.

گفتوگۆ بەردەوام بوو، هەروا زیادبوونی ژمارەی فەوجە خەفیفەکانیش. ئەگـەر ئـەم حاڵەتەت لەگەڵ هـەر ئەندامێکی سـەرکردایەتی یەکێتیدا باس کردبا، پاساوی ئەوەی دەدایتێ کە"هێشتا یەکێتی و حکومەت نەگەیشتوونەتە ڕێکەوتن... ئەوەی حکومەت دەیکات دەچێتە خانەی کارتی گوشار و گەمەی مفاوەزاتـەوە ..." هەروەهـا دەیانگووت، "ئەگەر مفاوەزات سـەری نەگرت کێ چەکداردەکەن بابیکەن، ئەگەر سەریشـی گرت، نەک هەرئەمانە، هەموو جاشەکانی تریش چەکیان لێدادەماڵدرێت."

---

٢٢٩ ـ لەئەنجامی ئەو سیاسەتەی حکومەتیشدا، هەر لەسەردەمی مفاوەزاتدا نزیکەی ٢٥٠ فەوجی تری جاش درووستکران کە بە (فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی) ناودەبران و ئێمەش بە (فەوجی خەفیفە)مان دەناساندن... هەرفەوجێک لەو فەوجانە، سێ ئەفسەری حکومی بۆ دامەزرابوو، فەرماندەو یاردەدەرو ئەفسەری ئیداری... سەرۆک جاشیش بە مستەشار ناودەبرا و لە مەیدانی کردەنیشدا هەر ئەو سەرک جاشەکە، فەوجەکەی بەڕێوە دەبرد، ژمارەی چەکدارانی هەر فەوجێک بەگوێرەی بچووکی و گەورەی عەشیرەتەکان، لە نێوان١٠٠٠ بۆ ١٥٠٠جاشدا دەبوو، هەرچەندە زۆرێک لە فەوجەکان، زۆر لەخوار ئەو ژمارانەدابوون... ئەویش بەهۆی بچووکی عەشیرەتەکەیانەوە، یان بەهۆی ئەوە کەسانێک هەبوون عەشیرەتیان بەدواوە نەبوو، دەهاتن ژمارەیەک خەڵکیان لە دەوری خۆیان خڕدەکردەوەو فەوجیان بۆ دەکرایەوە.

وەرزی گفتوگـۆ دەچێتــە پایـزی تەمەنیـــەوە... هیـواو چاوەڕوانیەکانی خەڵکیـش، دەبێتــە پیرەدارێکــی کلۆر و نەک هــەر بەر، خەریکە گەڵاشــی پێوەنامێنێ.

خەڵکــی لــە چاوەڕوانی وەڕس دەبــن و درێژەپێدانی گفتوگـۆ، لەلایەن سەرکردایەتیەوە، دەخەنە ژێر پرسیارەوە. خەڵک دەپرسێ و سەرکردایەتیش پاساو دێنێتەوە. سەرکردایەتی دەڵێ"نامانەوێ ببینە هۆکاری هەرەسپێهێنانی گفتوگۆ... نامانەوێ، لە حاڵەتی شـکانی عێـراق، لە بەرامبەر ئێراندا، عێراق، بەرپرســیارێتی ئــەو شکســتەی بخاتە ئەسـتۆی ئێمە و بیکاتــە بەهانە بۆ پەلاماردانی کوردستان و قەلاچوکردنی گەلەکەمان.

ســێلاوی[٢٣٠] بێ ئومێدی هەمووشـتێک لەگەڵ خۆیــدا ڕادەماڵێ... کەچی ســـەرکردایەتیش هێشتا، دەستیان لە پنچکە گیای گفتوگۆ بەرنادەن... لەگەڵ هەر سەردانێکی وەفدی میریشیدا توندتر دەستی پێوە دەگرن.

وەفــد دێ و وەفــد دەڕوا، تــا دەگاتــە ئــەو جێیــەی، وەفـدی یەکێتی بە سەرۆکایەتی مام جەلال، بۆ دیداری لووتکە و بۆ ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامە و خوێندنەوەی بەیان، لە دواین هەفتەی مانگی ئەیلوولدا دەگاتە بەغدا. وەفدی یەکێتی، لەدواخوولی گفتوگۆدا، هێندە لە گەیشـتنە ڕێکەوتن دڵنیان، تەنانەت ناوی کاندیدەکانی خۆشیان، بۆ وەزارەتەکان و ئەنجوومەنی نیشتمانی لەگەڵ خۆیاندا دەبن.

دوای حـــەوت هەفتە مانەوەو دوای چەندین دیدار و کۆبوونەوە، وەفدی یەکێتی، بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە. گەڕانەوە و دواجار ئەوانیش وەک خەڵک، گەیشـــتنە ئەو قەناعەتەی کە حکومەت، گفتوگۆ بۆ ڕێکەوتن و ســـەلماندنی ماف ناکا... گفتوگۆ دەکا بۆ ئەوەی:

* ناڕەزایــی خەڵــک بەرامبەر بــە یەکێتی فراوان کات و ئەو پشــتیوانیە جەماوەریە زۆرەی یەکێتی لەناو شار و لادیکانیشدا هەیەتی نەیهێڵێ.

---

٢٣٠- سێلاو: لافاو

* پێشـــمەرگە بـــە ژیان و خۆشـــیەکانی شـــار ڕابێنێتـــەوەو ڕووحیەتی شەڕکردنیان تێدا لاوازکات.

* پەیوەندیەکانـــی یەکێتـــی بـــەدەرەوە، بەتایبەتیش بە ســـوریا و لیبیا و ئۆپۆزســـیۆنی عێراقیـــەوە ببچڕێنێ... ئەو کۆمەک و ســـەرچاوە داراییانەش ووشک کات کە لەوانەوە بۆ یەکێتی دەهاتن.

* کنە بکاتە ناو دامودەزگاکانی یەکێتی و ویژدانی هەندێک لە بەرپرس و فەرماندە و پێشمەرگەش بکڕێ.

گوشـــاری هێزی پێشـــمەرگە لەســـەر هێـــز و دامودەزگاکانـــی خۆی لە کوردستاندا کەم کاتەوە.

* سنوری کوردستان بەرامبەر بە هێرشی ئێرانی بە یەکێتی بسپێرێ و، بەشـــێکی زۆری ئەو هێزانەشی کە لە کوردســـتاندا هەیبوون، بۆ بەرەکانی دیکەی شەڕیان بگوازێتەوە.

* یەکێتی لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی پێشمەرگەیی و ڕێکخستن و جەماوەریی و پەیوەندیەکانیشیەوە، ئەوەندە بچووک کاتەوە، تا لە کۆتاییدا ناچاری کات بە مەرجەکانی حکومەت ڕازی بێت، مەرجی گەڕانەوە بۆ(ڕیزی نیشتمانی) نەک سەلماندنی مافەکانی خەڵکی کوردستان.

ســـەرکردایەتی ئـــەوە دەزانێ و دەشـــزانێ ئـــەو هەلومەرجانـــەی پاڵیان بەیەکێتیـــەوە نابـــوو، ڕێی گفتوگۆ بگرێتەبەر، هـــەر هەموویان وەک خۆیان ماون:

* هەمـــوو دەروازەکانـــی پەیوەندی دەرەوەی لێداخرابـــوون و، پچڕانی پەیوەندی سوریاو لیبیا و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیشی هاتبووەسەر.

* هیچ بەرەوپێشەوە چوونێک، بە ئاقاری ئاشتەواییدا، لەگەڵ لایەنەکانی نـــاو بـــەرەی جـــودا، ڕووی نەدابـــوو. هەرچەنـــدە یەکێتـــی هـــەر لـــەدوای دەســـتپێکردنی گفتوگـــۆوە، بانگەوازی ئاشـــتبوونەوەی گشـــتی ڕاگەیاندو، چەندینجاریش بەمەبەستی ئاشتبوونەوە، وەفدەی نارده لایان، بەڵام ئەوان بە دەم دەستپێشخەرییەکانی یەکێتیەوە نەهاتن.

* کێشـــە و دوژمنایەتیەکان لەگەڵ کۆماری ئیســـلامیی ئێراندا، هەروەک پێشوو بەردەوام بوون.

هەلومەرجەكان وەک خۆیان ماون و هیچ شتێک گۆڕانی بەسەردانەهاتووە... ئەوەی گۆڕاوە قەناعەت و دیدی یەکێتیە بەرامبەر بەنیەت و دەستیدەستی پێکردنی حکومەت. یەکێتی، دەگاتە ئەو بڕوایەی کە حکومەت ئامادەی ڕێکەوتنێک نابێ، شتێکی وای بۆ کورد تێدابێ... شتێک کە یەکێتی بتوانێ وەک دەسکەوت شانازی پێوەبکات. هەر بۆیەش، سەرکردایەتی، لە کۆبوونەوەی ناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەردا، بەتێکڕای دەنگ بڕیاری کۆتاییهێنانی گفتوگۆ دەدەن، بەڵام ڕاگەیاندنەکەی بۆ دوو مانگ دواتر هەڵدەگرن.

## ٧٦

کــە مفــاوەزات دەســتپێکرد، (شۆڕشــی نــوێ) لە هەشــتەمین ســاڵی تەمەنیدابوو. زۆر لەوانەی بە گەنجی ببوونە پێشــمەرگە، بەرەو ناوەڕاستی تەمەن و ئەوانەش لەناوەڕاستی تەمەنیاندا هاتبوونە شاخ، بەرەو کامڵبوون هەڵدەکشان. زۆرمان بەرلەوەی ببینە پێشمەرگە، بە ئەزموونێک یان زیاتری دڵداریــدا ڕەتببووین... هەمان بوو، بایی ئەوە بەختەوەربوو، ئەزموونەکەی هێشــتا بەردەوام بێت... هەشمان بوو پێشــمەرگایەتی کۆتایی بەو خۆشییە سروشــتی و خۆرســکەی ژیــان هێنابــوو... بــۆ ئــەو توێــژەی دواییمان، پێشمەرگایەتی و تەنانەت خۆبەکوشتدانیش ئاسانتربوو.

یەکێک دەیەوێت ببێتە پێشمەرگە، فەرماندەکە پێیدەڵێ:

ـ دەبێــت لێــرە بەدواوە، خۆشــییەکانی ژیانی ناو ماڵ و ناو شــار لەبیر خۆت بەریتەوە.

ـ هەوڵدەدەم.

ـ دەبێت بیر لە ژن و ژنهێنان و ئەوشتانەش نەکەیتەوە.

ـ هەوڵدەدەم.

ـ دەبێت بۆ مردنیش ئامادە بیت.

ـ مــن بتوانــم واز لەوانــەی تــر بێنم، ئەمەیــان بۆ من هەر زۆر ئاســان دەبێت.

ژیانی پێشــمەرگایەتی، ئەوەندەی بۆ کەسانی سەڵت دەگونجا، ئەوەندە بــۆ هاوســەردار و منداڵدار نــا. تۆ کە مــردن هەموو ڕۆژێ، لــەو لوولە نەفرەتیــەی تفەنگــەوە، ســەرەتاتکێت لەگەڵــدا بــکات، کــوا بەکەڵکی ئەوە دێــی ژیانــی یەکێکــی تر بەخۆتــەوە گرێدەی. لــە بیرکردنــی هەموو ئەو خۆشــیانەی خوا لە ژیان و لە ئافرەتدا بۆی حەشــارداوین، دەمانکاتە ئەو پێشمەرگە ئازاو چاونەترس و هەردەم ئامادەی خۆبەکوشتدانەی شۆڕش دەیەویست.

ڕەنگــە مفاوەزات پێشــمەرگەی بۆ ناوشــارەکان نەگێڕابایەوە، ئاوا هەر قۆناغە و بە قۆناغێکی هەڵکشاوتری تەمەنی سپاردبایـن.

مفــاوەزە هات و دەرووپەکی بۆ ڕزگارکردنی ئەوانە کردەوە کە وزەی تەنیایی و سەڵتییان لەدەستدابوو. ترسی هەڵنەکەوتنەوەی دەرفەتێکی دیکەی لەو بابەتە، ژمارەیەکی باش لە پێشمەرگەی بەرەوباوەشی مانگی هەنگوینی بــرد... هەڵبژاردنــی هاوســەر، پرۆســەیەکی ئاڵــۆزو درێژخایــەن نەبوو... یەکدوجــار یەکتربینیــن و ڕازی بوونی خۆیان و کەســوکاری هەردوولا و تەواو. پێوەرەکانی هەردوولا سادە و سانابوون:

پێــوەری کــچ: پێشــمەرگەبێ و بــەس... خۆ ئەگــەر ناوێکــی هەبێ و لە ڕووخساریشدا بەدڵی بێ، دووجار بیرکردنەوەی نەدەویست.

پێوەری کەســوکاریش: هەبوون ترســی هەڵگیرسانەوەی شەڕ، تووشی دوودڵی دەکردن... زۆریش، هەبوونی زاوایەکی پێشــمەرگەیان، بەشــانازی دەزانی بۆخۆیان.

پێوەری پێشــمەرگەش: کچێکی نیشــتمانپەروەر و چاونەترس و ئازابێ، گورجوگۆڵ و چالاک و ئامادەی ژیانی سەختی ناو شاخان بێ... ئیتر ئەوە هەموو خواستەکان بوون.

پێوەرەکانــی پێشــمەرگە، زیاتر لە پێــوەری وەرگرتنی ئافرەت دەچوون بــۆ نــاو ڕیزەکانی ڕێکخســتن یان بــۆ ناو هێزی پێشــمەرگە تــا پێوەری هاوسەرگیریی.

ئەوەی لەو پێوەرانەدا بەهەند وەرنەدەگیرا، خۆشەویستی و ڕۆمانس و لێکتێگەیشــتن و قبوڵکردنی جیاوازییەکانی یەکتری و پێکەوە چێژوەرگرتن بوو لەشــتە زۆر بچووکەکانی ژیانی ڕۆژانە... پێکەوە قســەکردن، پێکەوە چاخواردنەوە و نانخواردن، پێکەوە پیاسەکردن، پێکەوە پێکەنین و خۆشی بینین... ئەو شــتە زۆر بچووکانە وەختیان دەوێ و پێشــمەرگەش وەختی نەبــوو... ئەگەر کەمە وەختێکشــی هەبــا، لەبەر ناوبانگی پێشــمەرگایەتی خۆیــی و لەبــەر گوشــاری کۆمەڵگا و لە ترســی تێکچوونــی گفتوگۆش، دەبوایە لەدوای یەک دوو بینین، بڕیاری کۆتایی خۆی بدات. هەر بۆیەش هەموو ئەوشتانەی کەدەبوایە، بەر لە بڕیاری هاوسەرگیری لەسەریەکتری زانیبایــان، بــۆ دوای پرۆســەی هاوســەرگیری هەڵدەگیران...کێشــەکەش لێرەوە دەســتی پێدەکرد.

خەریکبــوو مفاوەزات دەگەیشــتە پایــزی تەمەنی و من هێشــتا بیرم لە هاوسەرگیری نەکردبۆوە. من ئەوەندەی خەیاڵم لای عەشق و خۆشەویستی بوو، ئەوەندە وەختی خۆم بە بیرۆکەی هاوســەرگیرییەوە نەدەکوشت. من تــا ئــەو کاتەش جۆرە نەگونجانێکــم لە نێوان ئەو دووانــەدا دەبینی. من تا ئــەو کاتەش، عەشــقم وەک فڕینی دوو مــەل دەهاتە بەرچــاو... دوو مەل، بەئاسمانی بەریندا بەرز دەفڕن ... هەر دەفڕن و بیر لەنیشتنەوە ناکەنەوە.

مــن، تا ئەو کاتەش هەر دەمویســت لەو جیهانەی نــاو خەیاڵی خۆمدا، لەفڕین و بەرزبوونەوە دابم و هاوســەرگیری دامنەبەزێنێ و پەلکێشی سەر ئەرزی واقیعم نەکا.

مــن بەرلەوەی ببم بە پێشــمەرگە، لە ئەزموونی ســۆزدارییەکی قووڵی هەرزەکارانەدا دەژیام. ئەوم بەقەد ســۆمایی چاوانم خۆشدەویست... هێندە خۆشمدەویســت پێم وابوو، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان، لە شــەڕێکدا چاوێکم لەدەســتدەم، ڕەنگــە لە قۆناغێکی دیکــەی تەمەندا، هەر بیرشــم نەمێنێ کە سەردەمێک بەدوو چاوان تەماشای دنیام کردووە... وام دەزانی لەدەستدانی ئــەو چاوەی خــۆم لەبیردەچێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو لەدەســتدەم، قەت ئەو چاڵــەم پێپڕنابێتــەوە کە ئەو لەناو دڵ و خەیاڵ و هەســتی مندا جێیدەهێڵێ من پێم وابوو، کەچی هەرئەوەندەی من بن تاشــەبەردێکی وڵاتەکەمم کردە ســەنگەری بەرەنگاری، ئەو ســەنگەری دڵمی چۆڵکرد. دەبێ چی لەدەردی هەستی تەنیایی و لە ئازاری لەدەستدانی خۆشەویستی بەسوێتربێ.

مفاوەزە دەکەوێتە ئاویلکەدان[٢٣١] و من هێشــتا ئامادەیی هاوســەرگیریم تێدا نیە. ئەوەندەی من پێویستیم بە خۆشەویستیە، نیو ئەوەندە پێویستیم بە هاوسەرگیری نیە و وێڕای ئەوەش هیچ ئامادەییەکی دەروونی و ڕۆحیشم بۆی نیە.

لەســەردانی هاوڕێیەکمــدا، ڕێکەوتــی کچێــک دەکــەم... مــن بــەدوای خۆشەویســتیدا دەگەڕێم وئەویــش بەدوای هاوســەرگیریدا. من دەمەوێت دەرفەتی تەواومان بۆ یەکترناســین و لەیەکترگەیشتن و خۆڕاهێنان لەگەڵ جیاوازیەکانی یەکتریدا هەبێ، ئەویش لەبەر گوشــاری کۆمەڵ و گوشــاری تــر پەلــەی مارەبڕینیەتی. بەو هێوایەی مارەبڕیــن بکەینە دەروازەی یەکتر ناســین و لەیەکتێگەیشــتنی زیاترو، بۆ ئەوەش پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ زەمەنێکی دوورهەڵگرین، بەو چارەسەرە مامناوەندییە ڕازی دەبم.

---

٢٣١- ئاویلکەدان: سەرەمەرگ، کاتی گیان دەرچوون

مفاوەزە کۆتایی دێت... من دەگەڕێمەوە ناو شێوازی ژیانی پێشووم، بەڵام جیاوازتر لە جاران... ئێستا کچێک هەیە، شەوانە ئاسمانی خەیاڵەکانم پڕ ئەستێرەی درەوشاوە دەکات... ئێستا کچێک هەیە خەمی هەستی سەڵتی و تەنیایم بەبادە دا.

زۆرنابا، گوشاری ڕژێم ژیانی شار بەو بەجێدێڵێ و دێتە لای من. ئیدی لەوێوە، ئەو شتانەی دەبوایە بەر لە هاوسەگیری لەسەر یەکتریمان زانیبان، لەدوای هاوسەرگیرییەوە دەیانزانین.

ئیدی لێرە بەدواوە دەزانم، ئەو هەڵچوون و هەژان و ورووژانەی کە لەسەرەتادا بەڕۆمانس و خۆشەویستیم دەزانین، زۆرتر چەپاندن و دابڕان و موعاناتی تەنیایی و شکستی یەکەمین ئەزموونی دڵداریم بوون.

هەر لە یەکەم مانگدا زانیم، ئێمە دووکەسی تەواو لەیەکتری جیاوازین... جیاوازین بەڵام بڕوا بەخۆبوونی ئەو کاتەم، لە گۆڕینی نەک تەنها کەسێکدا، بەڵکو لە گۆڕینی هەموو کۆمەڵگاشدا، وایلێکردم پێم وابێت، دەیگۆڕم و ئەوەندەش دەیگۆڕم، تا لە کۆتاییدا وامان لێدێ تەواوێک لەیکبچین.

من دەمزانی و ئەویش دەیزانی جیاوازین، بەڵام هەریەکەمان هیوای خۆی لەسەرشتێک هەڵچنیبوو... من لەسەر گۆڕانی ئەو، ئەویش لەسەر نەگۆڕانی من. دواجار ململانێی نێوان ئەو دوو هیوایە، هیوای هەردووکمانی لە گۆڕنا.

هیوا بە گۆڕانی یەکتر نەماو خەڕەندی[٢٣٢] جیاوازییەکانی نێوانشمان لەگەڵیا هەتا دەهات قووڵترو بەرینتر دەینواند... تا لە شوێنێکدا وایلێهات، پردێک نەبێ بتوانێ ئەمسەر و ئەوسەری پێکەوە ببستێ.

ئیدی لەوێوە، ئەوسەدان تاڵە باریکەی بۆ ڕۆمانس و بۆ خۆشەویستیی و بۆ چێژی پێکەوەبوون پێویست بوون، هەڵوەرین و چیکەش زنجیری کۆت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و پێشمەرگەییەکان نەیانتوانی لەوە زیاتر بەیەکتریمانەوە ببەستنەوە.

---

٢٣٢ - خەڕەند: شیوی زۆر قووڵ

## ٧٧

پێمان ناوەتە ســاڵی نوێوە و شاخەکانی دەوروبەرمان، چاویان بڕیوەتە ئــەو پەڵــە هەورە ســپیانەی، با پێش خــۆی داون و بــەرەو لای ئێمەیان ڕادەدا... چاوەڕێــن هــەورەکان داکەن و ڕەشــانگیان پێوە نەهێڵن. شــاخ چاوەڕێــی بەفــرەو، ئەویــش چاوەڕێی بروســکە هەواڵێکــی گەرمە. بەفر دەگاو هەواڵــە گەرمەکــەی ئەو نا. ئەو، چەند ڕۆژێکــە میوانی بارەگاکەی ئێمەیــەو، ئێمــەش بەناوێکەوە دەیناســین کە ناوی خۆی نیــە. ئەو، لەگەڵ هاتنی هەر قاســید و هەواڵێکدا، قووڵاغ دەبــێ و لە دواییدا، دەچێتەوە ناو دۆخــی بێتاقەتــی و مەلوولــی خۆیــەوە.

هەمووومــان دەزانیــن نهێنییەک لەودا هەیە، لەوەش زیاتر نازانین کە ئەو باوکی دوو پێشمەرگەی دەستەکەی عومەر فەتاحە.

کــەڕۆی ئینجــا زانیمــان ئــەو ناوی(محەمــەد میرزا)یــەو کارمەنــدی بانکــی ڕافدەیەنــی عێراقیە... یەکێتی، لەکاتی ســەردانی ئــەم بۆ لای کوڕە پێشــمەرگەکانی، پەیوەندی لەگەڵدا دەبەســتێ. لە وەرزی ســاردبوونەوەی پەیوەنــدی نێوان یەکێتی و حکومەتدا، پەیوەندی نێوان یەکێتی و ئەو هێندە گەرمــدادێ تا دەگاتــە دانانی پلانێک بۆ گواســتنەوەی گوژمە پارەیەک، بۆ بەرژەوەندی یەکێتی، لە بانکی ڕافدەینەوە بۆ بانکێکی بیانی.

وەک عومەر شــێخموس، لە کتێبی (پشــکۆیەک لە خۆڵەمێشــدا) باســی دەکات، پلانەکە بەم شێوەیە دەستپێدەکات:

هێشــتا بەفەرمــی، کۆتایی هاتنــی مفاوەزات ڕانەگەیەنــراوە، مام جەلال لەنامەیەکی سێ چوار دێڕیدا، بۆ عومەر شێخموس دەنووسێ:

"بەزووترین کات کۆمپانیایەک دامەزرێنەو حســابێکی بانکیش بکەرەوە، کۆمپانیــای چیمەنتۆیێ یان شــەکر. پارەیەکت بــۆ تەحویل دەکرێ. هەر کە پارەکە تەحویلکــرا، بەزووترین کات بیگوازەوە و هەڵیگرە. نابێ ئەو بابەتە بەهیچ کەس بڵێی. نابێ لەگەڵ کەسدا باسی بکەی. بۆ ئەو مەسەلەیە تەلەفون بەکارمەهێنە".

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕێنماییانەدا، عومەر شێخموس، کۆمپانیایەک بەناوی (کۆمپانیـــای ئاگوم، بۆ کڕین و ناردنی شـــەکر بۆ عێــراق)، دادەمەزرێنێ و، ژمارەیەکی بانکیشی، لە بانکی (BCCI)[233] لە لەندەن، بۆ دەکاتەوە.

پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی مام جەلال، عومەر شێخموس، بۆ وەرگرتنی ڕا و سەرنجی چەند برادەرێکی خۆی، مەسەلەکە لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر دەبابەدا باســدەکات... لە هەمانکاتیشدا نامەیەکیش بۆ دکتۆر کەمال فوئــاد، لە ئەڵمانیا، دەنێرێ و باســی نامەکەی مام جەلالیشــی تێدادەکات... دەیەوێ ڕای ئەویش لەسەر ئەو مەسەلەیە وەرگرێ...

دکتۆر کەمال فوئاد، بێ ئاگا لەوەی کە تەلەفونەکەی عومەر شــێخموس، وەک بەرپرســی پەیوەندییەکانی دەرەوەی یەکێتی، لە ژێر چاودێری دەزگا هەواڵگرییەکاندایە، تەلەفۆن بۆ عومەر شــێخ موس دەکات و دەربارەی ئەو مەسەلەیە، بەدڵی خۆی، گفتوگۆی لەگەڵدا دەکاو ڕا و سەرنجەکانی خۆیشی بۆ دەردەبڕێ.

دوای ئــەو پەیوەندیە تەلەفۆنیانــە، حکومەتی بەریتانی، حکومەتی عێراق ئاگاداردەکاتــەوە لــەوەی کە کارێکــی گوماناوی لە ئارادایــە، کە پەیوەندی بەتەحویل کردنی پارەوە هەیە، لە عێراقەوە بۆ دەرەوە. ســەدام حوســەین، هەر ئەو کاتەی ئەو زانیارییەی پێدەگات، پەویوەندی بە بەڕێوەبەری گشتی بانکــی ناوەنــدی عێراقیەوە دەکاو، لە هەوڵی کارێک کە پەیوەندی بە دزینی پارەوە هەیە، ووریایان دەکاتەوە... بانک، دەستبەجێ، دەست بەچاودێری و لێکۆڵینەوە دەکات... لەبەرئەوەی زانیاریی هیچ ووردەکاریەکی ئەو هەوڵەیان لەبەردەستدانیەو، لەبەرئەوەش ئەوکەسەی کە ئەو پارەیەی تەحویل کردوە، بەڵگەکانی شــاردۆتەوە، بۆیە بانک ئەو کاتە هیچ سەرەداوێکی وای دەست ناکەوێت.

هــەر دوای ئــەوەی پارەکــە حەواڵە دەکــرێ، هەریەک لــە فەرەیدوون عەبدولقادر و (کافیە ســلێمان)ی هاوســەری عومەر فەتاح، لە ســلێمانیەوە بەتەلەفۆن، عومەر شێخموس لە حەواڵەکردنی پارەکە ئاگادار دەکەنەوە.

سێ ڕۆژ دواتر، بانکی ڕافیدەین تۆماری فاکسی تەحویل کردنی پارەکەیان دەســتدەکەوێ... هەرهەمان کاتیش، ئەو بانکە ئاگاداردەکەنەوە کە پارەکەی بــۆ تەحویلکــراوەو، پێیان دەڵێن کە ئەو بڕەپــارە تەحویل کراوە، پارەیەکی ناشەرعی و دزراوەو، داوایان لێدەکەن، پارەکە سڕکەن.

---

٢٣٣ـ بانکی (BCCI)، بە کوردیەکەی دەکاتە بانکی متمانە و بازرگانیی جیهانی.

بانکــی (BCCI)، پارەکە ڕادەگرێ، کەیســەکە دەچێتــە دادگا.. دوای پێنج ســاڵ لە پرۆســەی دادگایکردن، کەیســەکە بە قازانجــی حکومەتی عێراقی کۆتایی دێ... وەختێکیش پارەکە بۆ عێراق دەگێڕدرێتەوە، ئەو دوانزە ملیۆن دۆلارە تەحویــل کراوە ڕاگیراوە، بەهۆی ئەو قازانجەی لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا چۆتە سەری، دەبێتە ١٩ ملیۆن...

دوای کەشفبوونی ئەو هەواڵەو ڕاگرتنی پارەکە لەلایەن بانکی(BCCI)وە، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە ڕۆژی ١٩٨٥/١/١٥دا بەیانی کۆتایی هاتنی گفتوگــۆی بەفەرمی ڕاگەیاند و لەوێدا ئاماژە بە هۆکارەکانی شکســتهێنانی گفتوگۆ دراو ئۆباڵەکەشی خرایە ئەستۆی حکومەتی بەعس.

سەرکردایەتی یەکێتی، ڕاگەیاندنی بەیانەکەیان بۆ بێ ئومێدبوونی خۆیان لــە پرۆســەی گفتوگۆ و بۆ بێدەنگکردنی دوژمنانــی گفتوگۆ(چ ئەوانەی ناو یەکێتــی و چ ئەوانــەی دەرەوەش) دەگێڕایەوە.. دوورنیە ئەگەر مەســەلەی حەواڵەکردنی پارەکە، لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە پێی نەزانرابا، ڕاگەیاندنی ئەو بەیانە چەند مانگێکی دیکەش دوا کەوتبا.

بەیانەکە ڕاگەیەنرا، بەڵام بۆ ڕاگەیاندنی دەســتپێکردنەوەی شەڕ نەبوو. بەرنامەی یەکێتی ئەوەبوو، تا دوای وەرزی سەرماوسۆڵە، هێزی پێشمەرگە دەست بەشەڕکردن نەکاتەوە.

بەرنامەکــە ئاوابوو، بەڵام شــەهیدبوونی مامە ریشــە بــە ٩ ڕۆژ دوای خوێندنەوەی بەیانەکە، بەرنامە و کات و شــوێنی دەستپێکردنەوەی شەڕی هەڵوەشاندەوە.

پێشــمەرگەکانی کەرتی چواری جەباری و چەنــد کەرتێکی دیکەی تیپی ٥٧ی ســەرگرمەش، لــە تۆڵەی ئەوتاوانەدا، لــە کۆمەڵێ جێگای جیاجیادا، پەلاماری هێزەکانی حکومەتیاندا.

بەوشــێوەیە، پریشــکی ئــەو چالاکیانە، ئاگری شــەڕی نێــوان هێزەکانی پێشــمەرگە و حکومەتیان، چەند مانگێک پیش وادەی خۆی، خستەوە لرفە و بڵیسەدان.

ئــەو بەفرەی بارین ماندووی کردبــوو، خەریکبوو دەکەوتە وەنەوزدان. تا پێشــمەرگەکان، گەیشــتنە بن تەلدڕووی دەوری ڕەبیەکانی سەر شاخی چەرماوەند، بەفریش پێڵووەکانی کەوتنە سەریەک. بەفر خەوت و ئەو هێزە زۆرەی پێشــمەرگەش، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٥/٢/١٥دا، بە فەرماندەیی ملازم عومەر، بەرپرسی ئەوکاتەی دەزگای پێشمەرگایەتی یەکێتی، هێرشی خۆیان دەستپێکرد.

لەمــاوەی چەند ســەعاتێکی کەمــدا، هەر ١٧ ڕەبیەکە، دەکەونە دەســتی پێشــمەرگە. زۆرنابا ســەربازگەی فەوجی شــەدەڵەش دەســتی بەســەردا دەگیرێ.

ئــەو ڕۆژە، بەدرێژایــی جــادەی نێوان خەلەکان و شــەدەڵە، شــەدەڵەو تاســلوجە، شــەڕوپێکدادنی گــەرم ڕوودەدات، زیانی حکومەت، ســەرووی هەزار سەرباز، لە نێوان کوژراو برینداردا، ٩٨ دیل و چەک و تەقەمەنیەکی زۆریش دەکەوێتە دەستی پێشمەرگە. لە بەرامبەردا، پێشمەرگەش، ژمارەیەک شەهید و بریندار دەدا.

ئێمــە لە ڕادیۆوە، بە حەماســەتێکی زۆرەوە، هەواڵ و دەنگوباســەکانی ئەو سەرکەوتنە، بۆ جەماوەر دەگوازینەوە... ناونیشانی هەندێک لەو وتارە هەســتبزوێنانەی ئــەو ڕۆژە نووســیمانن، تــا مودەتێکی زۆر لــە زاکیرەی خەڵکدامابوون:

ئەمجارە بەفریش گڕدەگرێ، لەبێ خەبەران کەشکەک سەلاوات و... هتد.

ئێمــە خەڵک دڵنیا دەکەینەوە لەوەی، پێشــمەرگە بە گوڕوتینی زیاترەوە، چالاکیەکانی دژ بە هێزەکانی حکومەت دەست پێدەکاتەوە.

ڕاگەیاندنەکانــی بەرەی جودیش، بــە تایبەتی ڕادیۆکانی پارتی و حیزبی شــیوعی، نکوڵــی لــە ڕوودانی ئەو شــەڕە دەکەن و دەڵێن ئــەوەی یەکێتی بەداســتانی هــەلاج و دابــان ناوی دەبات، لەســەر ئەرزی واقعدا ئەســڵ و ئەساسی نیە... یەکێتی تازە نە دەیەوێ و نەدەشتوانێ دژی حکومەت شەڕ بەرپاکاتەوە.

شەڕ دەست پێدەکاتەوەو یەکێتی دەبێ:

* چالاکیەکـی گـەورە و خێـرای وا ئەنجامـدات، هــەم حەماســەت و گوڕوتینی بەر لە مفاوەزە بۆ پێشمەرگە بگێڕێتەوە و، هەمیش وەڵامێک بێ بۆ حکومەت و هەموو ئەوانەش کە پێیان وایە هێزەکانی یەکێتی تازە توانای شەڕکردنەوەیان نەماوە.

* شــوێنێکی بەدیـل (جێگـرەوە) بـۆ بارەگاکانـی مەکتەبی سیاســی و دەزگاکانی تریش بدۆزێتەوە.

بەری مەرگە، لە ڕووی جیۆســەربازییەوە، ئەوەندە ئەمین و قایم نیە و لە هێزەکانی حکومەتیشەوە زۆر نزیکە:

بەو دیوی چیای ئاسۆســدا، قەڵادزێ... لەبەردەمیەوە، بنگرد و رانیە و دەشــتی بیتوێن.. لەوبەریشەوە، دوکان و ڕەبیەی زۆری سەر لووتکەکانی چیای قەرەسرد و لووتکەی سارا... هەموو ئەو شوێنانەش بە سەربازگە و فەوجەکانی خەفیفە تەنراون.

ئەم هەڵکەوتە جوگرافیە، وا لەبەری مەرگە دەکات، هەم قەسفی تەیارە و تۆپباران و پەلاماردان و هەمیش بۆ گەمارۆی ســەربازی و ئابوری ئاسان بێت. بەدیلی بەری مەرگە دۆڵی جافەتیە.

ئەو دۆڵە، لەبەری مەرگە عاسی ترەو، هەڵکەوتە جوگرافیەکەشی دەرفەتی بەردەم پەلاماری سەربازی و ئابلۆقەی ئابوریش زۆر کەم دەکاتەوە. ئەوەی لە ئەمینی ئەو دۆڵەدا کێشــەیە، سەربازگەی شەدەڵە و ئەو ڕەبیە زۆرانەن کــە بەدرێژایی چیای چەرماوەندا، بەســەر ئەمدیو و ئەودیوی شــاخەکەدا دەڕوانن.

بۆ بەدیهێنانی ئەو دوو مەبەستە، پاککردنەوەی ئەو ناوچەیە لە وجودی هێزەکانی حکومەت کرایە ئامانج.

ســێ ڕۆژ بەســەر شەڕەکەدا تێناپەڕێ، ســەعدی مەهدی سالح، لە ڕێی بێتەلەوە، پەیوەندی بە مام جەلالەوە دەکاو داوای ڕاگرتنی شــەڕو بەردانی دیلەکانی لێدەکات...

نە شــەڕ وەســتا و نە دیلەکانیــش بەردران. لە زۆربــەی هەرە زۆری ناوچەکانــی گەرمیــان و کەرکــوک و هەولێریشــدا، چالاکــی پێشــمەرگە بەشێوەیەکی بەرفراوان دەستی پێکردەوە. بەشێک لەو چالاکیانە ئاڕاستەی

ئاواییەکانی تەعریبکران حکومەت لەسەر ئەرزو لە جێی جوتیارە کوردەکان، بەتایبەتیش لە ناوچە نەوتیەکاندا، ژمارەیەکی زۆر دێی بۆ عەرەبی هاوردە درووستکردبوو.. هەر هەمووشیانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێشمەرگە چەکدار کردبوو.. لە ئەنجامی پەلاماری پێشمەرگەدا بۆ سەر ئەو ئاواییانە، ژمارەیەکیان چۆلکران و ژمارەیەکیشیان سووتێنران.

ئەو کارە لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە، دەچووە خانەی سەرکەوتنەوە، بەلام لە ڕووی مرۆیی و ئەخلاقییەوە، کارێکی دزێو بوو، بەتایبەتیش کە ژمارەیەک ژن و منداڵ کوژران و کەلوپەلێکی زۆریش بەتالانبرا...

ئەو حاڵەتە، دوای شەڕەکانی قڕناقا و پشتئاشان و شەڕی بێتواتە، سێهەم حاڵەت بوو کە ڕەفتاری نامرۆڤانە و ڕاوڕووت و تالانی تێدا بەڕێوەبچێ. لە هەر سێ حاڵەتەکەشدا، هیچ کەس لەوانەی بەناڕەوا خەڵکیان کوشتبوو، یان تالانی و ڕاوڕووتیان کردبوو، نە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کراو نەسزاش دران.

داستانی هەلاج ـ دابان، بارەگاکانی ئێمەیان تەواوێک لە هێڵەکانی پێشەوەی هێزەکانی حکومەت دوورخستنەوە... هێزەکانی حکومەت دوورکەوتنەوە، بەلام و بۆردومانی فڕۆکەو تۆپبارانی تۆپە دوورهاوێژەکانیان زۆر بە چڕیی دەستیان پێکرد.

پەلامارە هەواییەکان، هەموو ئەو ناوچانەیان گرتەوە کە لە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدا بوون.

لەناو شارەکانیشدا، بەرپرسانی بەعس، لەو کۆڕوکۆبوونەوەدا کە بە خەڵکیان دەکرد، هەڕەشەی قورسیان لە یەکێتی دەکرد... هەڕەشەی ئەوەی «لەمەودوا بەچەکی وا لێیان دەدەین کە لەناو پەناگاکانیشیاندا بیان کوژێ.».

سەدام حوسەینیش، لە پەیامێکیدا کە بۆ مام جەلالی ناردبوو، پێی وتبوو ئەگەر لە پەلاماردانی عێراق و هێزە عێراقیەکاندا، هەر هاوکاریەکی ئێران بکەن، «بەهەموو ئەو جۆرە چەکانە لێتان دەدەین کە پێمان لە ئێران داون.»

ئەو هەڕەشە و پەیامانە، هەڕەشەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوون.. هەڕەشەکان چەند جارێکیش لە حکومەتەوە دووبارە کرانەوە، بەلام سەرکردایەتی یەکێتی، بەهەندیان وەرنەگرتن.

# ٧٩

تا ئـەو کاتــەش درەختەکانی ناو لێـرەواری گفتوگۆ، تاکوتــەرا، گەڵای زەردیــان پێوەمابــوو، خەڵـک و ئەنــدام و دۆســت و لایەنگرانــی یەکێتی، لەســەردانی ســورداش و بنکە و بارەگاکانی دیکەی پێشمەرگە نەکەوتەن. بەدرێژایی کاتی گفتوگۆش، زۆرێک لەو خەڵکانە، لە ژێرچاودێریی دەزگاکانی هەوڵگریــی ڕژێمدابــوون، هەربۆیــەش بەشــێک لەوانە، لەگــەڵ تێکچوونی پەیوەنــدی یەکێتــی و حکومەتدا، بەناچاری شــاریان جێهێشــت و ڕوویان کردە شاخ... یەک لەوانە شێرکۆ بێکەسی شاعیربوو.

شــێرکۆ، بەرلەوەی خۆی بێتە شــاخ و ببێتە پێشمەرگە، بەچەند ساڵێک پێش خۆی، شــیعرەکانی ببوون بە پێشــمەرگە. شێرکۆ، سەردەمی کاژیکی لێدەرکەی، نە حیزبایەتی دەکرد و نە سیاسەتیش، بەڵام بەدرێژایی تەمەنی، خــۆی لەبــەردەم ئەرکێکی گەورەی نیشــتمانی و نەتەوەییــدا بینیوەتەوە... هەمیشــە لەگەڵ ئەوانەدا بووە کە ئــاڵای بەرەنگارییان لە بەرامبەر زوڵم و ستەمی داگیرکەراندا بەرزکردۆتەوە.

شــێرکۆ، بەدرێژایی تەمەنی شیعریی خۆی، لە هەموو قۆناغەکاندا، هەر یەک هەڵویستی هەبووە، هەڵویستی مانەوە لەبەرەی گەلەکەیدا.

لەسەردەمی(شۆڕشــی ئەیلولــدا)، پارتــی نەبــوو، بــەڵام بەخــۆی و بەشــیعرەکانیەوە، بۆ چەند ســاڵێک لەسەنگەری پێشــمەرگایەتیدا جەنگا... لەدوای ئاشبەتاڵیشــەوە کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەڕێی مەفرەزە سەرەتاییەکانیەوە، دەستی بەخەباتی چەکداری کردەوە، شێرکۆ چەکی کردە شانی شیعرەکانی و ڕوانەی شاخی کردن. ئیدی لەوێ بەدواوە، شیعرەکانی شــێرکۆ وەک شــنەبا لە درزی نێوان کەڵەکەبەردی سەنگەرەکانەوە، ناخی پێشــمەرگەیان پڕدەکــرد لە بەرەنگاری... ئیدی ئاوا، هەڵمەت و ســەنگەری بەرەنگاریــی پێشــمەرگە لــە کــوێ بووبــن، شــیعرەکانی جوامێریــش[٢٣٤] لەوێبوون.

---

٢٣٤- شێرکۆ، بەر لەوەی ببێتە پیشمەرگە، بەناوی جوامێرەوە، شیعرەکانی خۆی لە بڵاوکراوەکانی شاخدا بڵاودەکردەوە.

شــێرکۆ کە شــیعری بۆ پێشمەرگەو بۆ شــەهید وتووە، لەوە نەترساوە لەگــەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا، شــیعرەکانی ئەویش زەمەنیان بەســەرچێت... هەموجارێ دەیووت، " باڵای پێشــمەرگە و شــەهید، زۆر لە باڵای شیعری من بەرزترن... کە پێشــمەرگەیەک شــەهید دەبێت، با گوڵی چەند شیعرێکی منیش لەگەڵیدا هەڵوەرن."

مامەڵەو ئاوێتەبوونی شــێرکۆ، لەگەڵ شــەهید و پێشــمەرگەدا، کارێکی سیاســی و حیزبــی و بۆ مەرامی شەخســی خۆی نەبــووە... بەڵکو ئاوێتە بوونێکــی ویژدانــی و مرۆیی و نەتەوەیی بــووە.. ئاوێتە بوون بووە لەگەڵ قەناعەتــە شەخســی و دیدە نەتەوەییەکانــی خۆیدا.. ئەو، بــەو قەناعەتەوە شیعر دەڵێ و گوێشی لەوەنیە کە داخۆ هەموو جارێ، بۆن و بەرامەی گوڵە شیعرەکانی، هەمووان وەکو یەک سەرسام و مەست دەکەن یان نا.

مودەتێکە خەبەری ئەوەمان هەیە، شــێرکۆ بێکەس بۆتە پێشــمەرگەو لە بارەگاکانی سەرکردایەتییە، لەبەری مەرگە.

سەرکردایەتی، بارەگاکانی خۆی بۆ دۆڵی جافەتی دەگوازێتەوەو ئەویش دەزگای ڕاگەیاندن بۆ پێشمەرگایەتی خۆی هەڵدەبژێرێت.

دنیا تەواوێک تاریک داهاتووە... من سەرقاڵی نووسینی ووتاری سبەینێم. غەڵبەغەڵبێــک وبیســتنی نــاوی خــۆم، دەرگای ژوورەکەمــی پێکردمەوە. ولاخدارێک و هێسترســوارێک، لەبەردەم ژوورەکەی مندا وەستاون.."وەک ئەوەی ئەم هێسترە پرۆگرام کرابێت، یەکسەر منی هێنایە بەردەم ژوورەکەی تۆ..."

ئیدی لەو ئێوارەیەوە، ژوورێکی چکۆلەی ٣بە٣، بۆ چەند مانگێک، شێرکۆ بێکەس و من کۆدەکاتەوە.

ژوورێــک تەنها جێی نووســتنی دووکەس و مێزێکــی تەختەی چکۆلەو ڕێکۆردەرێکی ســەر شــیپانەی پەنجەرەو زۆپایەکی نەوت و هەندێ کتێبی تیا دەبێتەوە.

ئەو دەیەوێ، وەک خۆی دەیوت بزانێ لە دوای مافی نیشــتەجێبوون، چ ئەرکێکی دەکەوێتە ئەستۆ.

- بۆ بارەگا، کەسێک هەیە، ئەوەی پەیوەندی بەکاروباری ناندێنەوە هەبێ، ئــەو دەیــکات... ڕۆژانەش یەکێک لە خۆمان دەبێتە خەفــەر و لە چالێنان و

ئەو شتانەدا هاوکاری ئەو کەسە دەکات. سەبارەت بەم ژوورەی خۆشمان، پاکوخاوێنیی ڕاگرتنی ژوورەکەو، جارجارەش ئەگەر خۆمان حەزمان لە چایەک یان خواردنێکی سادەبێت، هەر لەسەر ئەم زۆپایە ئامادەی دەکەین...

- ڕێکەوتین، زۆر ئاسانە...

بەدرێژایی ئەو مانگانەی پێکەوە بووین، نە پاکوخاوێنی ڕاگرت و نە ڕێکوپێکی ژوورەکەش. لە مەسەلەی چالێنان و، جارجارەش خواردن درووست کردن یان گەرمکردنەوەدا، تا بۆی کرابا، خۆی لە قەرەی هیچ نەدەدا. جارێکیان، چەند پیشمەرگەیەکی هاوڕێم بۆ سەردانم هاتبوون، لەو کاتەدا من لەوێنەبووم، ئەویش بۆ ئەوەی خۆی لە خزمەتکردنیان ڕزگارکا، پێیان دەڵێ"ببورن هەڤاڵیش لێرە نیە چایەکتان بۆ لێنێ."

شێرکۆ، چەند لە شیعر نووسیندا ئازابوو، ئەوەندەش لە شتیتردا دەست وپێ سپی و تەمەڵ بوو. ئەوانە بۆ من ئاسایی بوون، ئەوەی لە سەرەتادا کەمێک سەخت بوو، پرخەپرخی بەهێز و زۆریی جگەرەکێشانەکەی بوو... هەر زوو ئەوەشمان چارەسەرکرد.. ئەو هەتا لەخەولێکەوتنی من دڵنیا نەبوایە، خۆی بەخوێندنەوەوە مژووڵدەکرد و نە دەخەوت... بۆ جگەرەکێشانەکەش، مەگەر من لە ژوورەوە نەبومایە، دەنا هەموو جارێ دەچووە بەر هەیوانە بەنایلۆن گیراوەکەی ژوورەکەمان.

ئەو کاتەی سەرقاڵی نووسین یان خوێندنەوە نەباین، یان باسی سیاسەت و ئەدەبمان دەکرد، یان گوێمان لە گۆرانی و مۆسیقا دەگرت.. هەر گۆرانیەک کاری تێکردبا، بەدەم جووڵەی سەر و دەستەکانیەوە، لەگەڵیادەیووتەوە...

جارجارەش، چەند دێرێک لە گۆرانیەکانی، عەلی مەردان، ڕەفیق چالاک، حەمە ساڵح دیلان، خالقی و عومەر دزەیی، لە بەرخۆیەوە دەچڕی.. دەنگی زۆر خۆش نەبوو، بەڵام دەیزانی چۆن گۆرانیەکان بڵێتەوە.. زۆرتر حەزی لە گۆرانی و میلۆدی سۆزداری و ئارام بوو. دەتوانم بڵێم، لەمەسەلەی گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقا، ئەوەی کێشەبێ نەمان بوو.

شەوان دەیخوێندەوە و ئەگەر شتێکیشی نووسیبا، زیاتر دەیخستە ڕۆژەوە. هەرجارەش شیعرێکی تازەی نووسیبا، هەتا بۆی نەخوێندبامەوە، لێنەدەگرا بخەوم.

قەت زەمی کەسی نەدەکرد. تەنانەت زەمی ئەوانەشی نەدەکرد کەشتیان دژی ووتووە یان نووسیووە.

زۆر تاقەتی میوانی نەبوو، تەنانەت ئەگەر میوانەکە هی خۆشیبا. حەزی بەو میوانانە نەدەهات کە سەرسامییان بەرامبەر بە شیعرەکانی دەرنەدەبڕی.. زۆرنەبوو گەیشتبووە لای ئێمە، ئەندامانی مەڵبەندی دوو، بۆ بەخێرهاتنی هاتنە لامان. یەک یەک باوەشیان پێداکرد، ماچیان کردو ستایش و پیاهەڵدانی شایستەشیان بۆی دەربڕی.. لەناو هەموویاندا تەنها یەکێکیان تەوقەیەکی ئاسایی لەگەڵدا کردو خۆشحاڵیەکی وای دەرنەبڕی...

هەر کە ژوورەکەیان بەجێهێشت، بەتۆنێکی پڕ لە ناڕەحەتیەوە ڕوویتێکردم:

- ئەرێ ئەو زل .... کێ بوو؟

هەرچەندە دەمزانی مەبەستی کامیانە، بەڵام ووتم:

- کامیان...

- ئەوەی ئاخیرکەس هاتە ژوورەوە....

- ئەندامی مەڵبەندی دووە...

- بەجدیتە؟!

- بەڵێ... بەڵێ ئەندامی مەڵبەندە.

- تەواومانکرد.. یەکێتی خەڵکی ئاوا تیا بەرپرس بێ، وەجاخی ڕۆشنە...

ئەو دیمەنە دوو چیرۆکی دیکەی لەو جۆرەی بیر خستمەوە.

چیرۆکی یەکەم:

سوارە، یەک لە ئامرکەرتەکانی حیزبی سۆشیالیست بوو... زۆرنەبوو بەخۆیی و چەند پێشمەرگەیەکەوە هاتبوونەوە ناو یەکێتی... کادیرێک کۆبونەوەیان پێدەکات... لەباسی یەکێتیدا دەڵێت "یەکێتی نیمچە بەرەیەو حیزب نییە."

سواره کە گوێی لە وشەی (حیزب نیە) دەبێت، ڕوودەکاتە کادیرەکە:

- تۆ بەڕاستتە کە دەڵێی یەکێتی حیزب نیە؟!

- بەڵێ، یەکێتی حیزب نیەو نیمچە بەرەیە.

- سۆشیالیست بەو پەڕپوتیەی خۆیەوە حیزب بێت، یەکێتی حیزب نیە!... ئەگەر بەقسەی تۆ بێت، یەکێتی هیچ نیەو توڕەهاتە.

چیرۆکی دووەم:

ماوەیەکی زۆر دەبێ دلێر بۆتە پێشمەرگە و کەسو کاری خۆی نەدیوە... جارێکیان باوکی، بۆ دیتنی دلێر دێتە لادێیەک و بەدوای دلێردا دەنێرێ.. دلێر تا درەنگانێک لای باوکی دەمێنێتەوە.. دواتر دەیەوێ ڕوخسەتی ڕۆشتن لە باوکی وەرگرێ.

- کوڕم بۆ کوێ دەڕۆیت، دەمێکە یەکتریمان نەدیوە، با ئەمشەو پێکەوبین...

- باوکە کارم هەیە، ئەبێ بگەڕێمەوە.

- کاری چی؟

- کۆبونەوەم لەگەڵ مام جەلالدا هەیە. دلێر، بۆ ئەوەی قەناعەت بە باوکی بهێنێ لێیگەڕێ بڕوا، وا دەڵێ

باوکی کە دنیایەک بە مام جەلال سەرسامە، ڕوودەکاتە دلێر و بەنیگەرانیەکی زۆرەوە دەڵێ:

- مام جەلال وای لێهاتوە کۆبونەوە لەگەڵ تۆدا بکات... ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێی وابێ، بەڕاستی بەزەییم بە مام جەلال و یەکیەتیشدا دێتەوە.

دوو مانگێک بەسەر هاتنی شیرکۆدا ڕەتبوو... شەوێک پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە من دیداریکی دوورودرێژی لەگەڵدا ساز کەم... دیدارێک کە هەموو ئەزموونی شەخسی و ئەدەبی و سیاسی ئەم لە خۆبگرێ و لەدوایشدا لە شێوەی کتێبێکدا چاپی بکەین.

هەندێک قسەمان لەسەر ئەو بابەتە کرد... لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی دیدارەکە ڕێکەوتین... هێشتا دیدارەکەمان نەگەیشتبووە کۆتایی، بەرگی سێیەمی کەشکۆڵی پێشمەرگەی بۆ چاپ ئامادەکرد.

"هەرچەندە دەزانم هەموو شیعرەکانی ناو ئەم کەشکۆڵەم بۆ خوێندویتەوە، بـەلاّم حــەز ئەکەم جارێکی تریش پییانا بچیتــەوە... ئەمجارەیان بۆ ئەوەی پێشەکیەکیان بۆ بنووسی."

شێرکۆ، حاڵەتێکی ناوەزەی شیعری نوێی کوردی... شێرکۆیەک، بابەتێکی شــیعریی نەماوە، ئالاّی خۆی لەسەر دۆندەکانی هەڵنەکردبێ.. دەربڕینێکی شــیعری نەماوە، بەزمانێکی شــیعریی قووڵ دەری نەبڕیبێ.. شــێرکۆیەک خاوەنــی ئــەو زمانە کوردیــە دەوڵەمەندە، ئــەو پانتاییە بەرینــەی خەیاڵ.. ئــەو موفرەداتــە لە ژمارە نەهاتوانەی ناو شــیعرەکانی... ئــەو هەموو وێنە ڕەنگاوڕەنگانــەی شــیعرەکانیان کردۆتە تابلۆی هونەریــی، بەر لە دەقێکی ئەدەبی.. شێرکۆیەک، بەو هەموو ئەزموون و توانا شیعریە زۆرەی هەیەتی، مــەودا و فەزایەکــی مرۆیــی و جوانکاریی وای لــە عالەمی شــیعرەکانیدا خوڵقانــدوە، مرۆڤ لەبەردەمیدا تووشــی ڕامان و سەرســام بوون دەبێ.. شــێرکۆیەکی ئاوا، ئاخر من نەرەخنەگرم و نە ئەزموونێکی شیعریی واشم هەیــە، دەرەقەتی ئەو کارەبێم... بۆیــە دوای بێدەنگیەکی چەند خولەکی پێی دەڵێم.

- بەڕای من بێدەی بە ڕەخنەگرێکی شــارەزا، یان شــاعیرێکی ناســراوی خاوەن ئەزموون باشترە.

- ئەزانم خەڵک زۆرە، بەلاّم نایدەم بەکەســیتر... خۆم پێم خۆشــە تۆ ئەو پێشەکیەم بۆ بنووسی...

بەجۆرێک لە شەرم ودوودڵیەوە، کەشکۆڵەکەم لێوەرگرت...

دە ڕۆژێــک دوای ئــەوە، بەرگــی ســێیەمی کەشــکۆڵی پێشــمەرگە بــە پێشــەکیەکەی منــەوە، چــاپ و بلاّوکرایــەوە... دوو هەفتەیەکیــش دواتــر، دیدارەکەمان کۆتایی هات.

(ڕووبەڕوو لە سێبەری چیادا) لە چاپخانە بوو، مەلا بەختیار و هاوڕێکانی گیران و هەموو ئەوانەش بە(ئاش) دەناسران، ڕووبەڕووی تەنگپێهەڵچنین و ڕاوەدوونان بوونەوە. ئەوکاتــە لەبەری مەرگەبووم... ئێوارەیەکیان کاوەی بــرای دلێری ســەید مەجید هاتــە لام...بەر لە هاتنــی، وەک خۆی دەیووت،

ســەردانی کاک شــێرکۆی کردبوو.. کە ڕای کاک شــێرکۆی لەسەر بابەتی گیرانی مەلا بەختیار و هاوڕێکانی پێ ووتم، تووشی شۆک بووم.

بەبیرما نەدەهات کاک شــێرکۆ ئــاوا ڕای توونددبێت... بەڕای ئەو، ئەمانە خیانەتیان کردووەو کۆمەڵەش هەرچیەکیان لێبکات هەقیەتی...

ئەو خەبەرە زۆر نارەحەتی کردم، بەجۆرێک لە هەڵچوونەوە ووتم:

مەگەر کاک شێرکۆ شاعیرە یان جەلاد!!

هەر ئەو کاتە نامەیەکم نووســی و بەکاوەدا بــۆ چاپخانەم نارد. لەوێدا، نوســیبووم "ئەگەرچــی ئەو کتێبــە بە بەرهەمی من حســاب دەکرێ، بەڵام دەزانم کاک شێرکۆ زۆر لە من زیاتر پێیەوە ماندووبووە، بۆیە ڕێ بەخۆم نادەم، داوای ڕاگرتنی لە چاپدانی کتێبەکە بکەم، بەڵام بەهەقی خۆمی دەزانم، داوای ئەوە بکەم کە ناوی من و ئەو پێشەکیەش من نووسیوومە، لابرێ.. دوا ئەوە بەناوی هەرکەسێکەوە بڵاودەکرێتەوە، کێشەی من نیە."

لەجیاتــی نــاوی مــن، ناوی بێســتوون چووە ســەر کتێبەکــە و چاپ و بڵاوکرایەوە.

ئــەو پەرچەکــردارەی مــن، شــێرکۆی تەواو تــووڕە و نیگــەران کرد... ناهەقی نەبوو، دەبوایە من ئەوەندە پەلەم نەکردایەو لەپێشــدا لەگەڵ خۆیدا قسەمکردبا و هەردوو دیوی چیرۆکەکەم گوێ لێگرتبا و ئنجا بڕیارم دابا... ئەمە وایکرد، پەیوەندی شــێرکۆ و من بۆ ماوەی نزیکی ساڵێک بپچڕێ ئەو کاتەی خەریکی خۆ ئامادەکردنی سەفەری دەرەوە(ئەوروپا) بوو، نامەیەکی بۆ نووســیم.. لەنامەکەیدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە"بەهیچ شــێوەیەک ڕای وام لەسەر ئەو بابەتە دەرنەبڕیوە... من ئەو کارەی ئەوانم بەخراپ و زیان بەخش زانیوە، بەڵام هەرگیز لەگەڵ ئازاردان و سزادانیاندا نەبووم."، هەروا نوسیبووی کە هەر لە دوای گرتنیانەوە، بۆ ئەم مەسەلەیە، بەتایبەتی سەری لــە مام جــەلال داوەو تکای لێکردوە کە کارێک نەکەن شــتی ناخۆشــتری بەدوادابێت.

## ٨٠

تا دەهات پلەی گەرما بەرەو سەرووتر هەڵدەکشا.. چالاکی پێشمەرگەو، هێرشە هەواییەکانی سەر ئێمەش لەگەڵیدا.

شـــوێنی بارەگاکانمـــان هێنـــدە بەرچاوبـــوون، ئەگەر مشـــوری جێیەکی ئەمینترمان نەخواردبا، فڕۆکە هێڵەی پێدەکردین.. هەر لەسەرەتای نیسانەوە، خانووەکانمان جێهێشتن و چەند سەد مەترێک، بەدۆڵەکەدا هەڵکشاین...

ئەو جێیەی بۆ هەواری ئەو هاوینەمان هەڵبژارد، لە هەموو شـــوێنەکانی دیکەی نـــاو ئەو دۆڵە قایمتربوو... دارگوێزەکانـــی هێندە گەورە و پڕبوون، هەموو خێمەکانی ئێمەیان لەبن ســـێبەرەکانی خۆیاندا حەشـــاردەدان... ئەو دوو چیایـــەی ئەمبەر ئەوبەریش، هێندە لەیەکدی نزیک ببوونەوە، هەر بایی تێپەڕ بوونی چەمێکیان، لە بەینی خۆیاندا هێشتبۆوە...

بەبـــن دارگوێزەکانـــدا بڵاوبووینەوە، مـــن ســـێبەری دارگوێزێکی لاپاڵم تەختکـــردوو کردمـــە شـــوێنی هەڵدانـــی خێمەکـــەی خـــۆم... زۆری نەبـــرد، بارەگاکانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیش، بەری مەرگەیان چۆڵکردو بـــەرەو دۆڵی جافەتی هاتن... تابارەگاکەی لە یاخســـەمەر ســـازدەبوو، مام جەلال بۆ چەند هەفتەیەک، خێمەکەی ئەرســـەلانی کردە ماڵی خۆی... تەنها گاشە بەردێکی گەورە، خێمەکەی ئێمەی لە خێمەکەی ئەو دادەبڕی. ڕۆژێک مـــام جەلالم بۆ نانی نیوەڕۆ داوەتکـــرد... وارێکەوت جەباریش لەوێ بوو... جەبـــار کەبابچیەکـــی زۆرباش بـــوو... خەریکی کەبابخـــواردن بووین، مام جەلال ووتی:

- بەڕاستی کەبابەکی خۆشە... ئەوە کێ درووستی کردووە؟

- جەبار درووستی کردووە

- جەبار کێیە و چ کارەیە؟

- کوڕە پورزای منە و پێشمەرگەیە لە تیپی ٤٣ ئاسۆس.

- ئەو کەبابچیە باشەم بۆ بانگ کە.

جەبار دێتە ژووری.

ـ مـادام کەبابـی واباش دەزانی و خزمی هەڤاڵیشـی، نەقڵت دەکەمە لای خۆم.

ـ ناوەڵا مامە نامەوێ نەقڵبم، من حەزم لە پێشمەرگایەتیە.

ـ بۆ ئەتۆ ئەوەی ئەمە دەیکەین بە پێشمەرگایەتی نازانی؟!

ـ ببورە مەخسەدەم ئەوەنەبوو... دەنا هەمووی هەرپێشمەرگایەتیە، بەڵام من بۆ خۆم پێشمەرگایەتی ناو مقەڕانم پێخۆش نیە...

مام جەلال چەند هەوڵیدا بە نقڵکردنە لای خۆی ڕازیکات، سوودی نەبوو، جەبار هەر پێشمەرگایەتی پێخۆشتربوو...

بەدرێژایی ئـەو ڕۆژانەی مام جەلال لە بارەگەکەی ئێمەدا مایەوە، کاتی نانخـواردن و خەوتنی لێدەرکەی، دەنا زۆربـەی وەختەکان، هەر خەریکی دیدار و کۆبوونەوەبوو... ڕۆژنەبوو ژمارەیەک کادرو بەرپرس و فەرماندە سـەرینەدەن... هەبوون بۆ کاری خۆیان دەهاتن، هەشبوون خۆی بەدوایدا ناردبـوون... لەگەیشـتنی هەندێکیانا، وەک ئـەوەی چاوەڕێی کەس نەکات، بەپێوە دەوەستتا و خۆی بەشتێکەوە مەشغوڵ دەکرد... لەگەیشتنی هەندێکی دیکەدا، هەڵدەسـتایە سـەر پێیان و پێشـوازییەکی گەرمـی لێدەکردن... بۆ هەندێکی دیکەش لە خێمەکەی دەهاتە دەرێ و چەند شەقاوێکیش بەرەوپیریان دەچوو... دەکرا لە شـێوازی پێشوازییەکانیدا، بزانی کام کۆبوونەوە گرژ و کامیان ئارام دەبێ.

یـەک لـەو بەرپرسـانەی لـەو ماوەیـەدا، سـەری مـام جەلالیـدا، مەلا بەختیاربوو...

مـەلا بەختیار، لە دوای کۆنفرانسـی سـێیەمی کۆمەڵـەوە، جگە لەوەی ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەبوو، هیچ پۆستێکی دیکەی، نە لە ناو یەکێتیو نە لەناو کۆمەڵەشدا پێنەسپێردرابوو.

ساڵێک دەبوو، کۆنفرانسی سێ، لە (کانی سێوە)ی مێرگەپان بەسترابوو... لـە کۆنفرانسـی یەک بەدواوە، گرژی و ئاڵۆزییەکانـی ناو هەناوی کۆمەڵە، تادەهـات زیاتـر قـووڵ دەبوونـەوە.... کۆنفرانسـی سـێ هـات و کێشـە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەی تا سەرلێواری جیابوونەوە پاڵپێوەنا...

لەســەردەمی گفتوگـۆدا، پەخشــنامەیەک بەنــاوی (هەڵوێســت)ەوە بڵاودەبێتــەوە و لە کۆنفرانســدا هەرایەکــی گەورە دەنێتــەوە... لایەنگرانی نەوشــیراوان مستەفا، لایەنگرانی ئەو باڵەی کە دواتر ناونرا(ئاڵای شۆڕش) بەخاوەندارێتی ئەو پەخشنامەیە تۆمەتبار دەکەن... هەندێک لەوانە، تەنانەت داوای ئیعدامکردنی ئەوانەدەکەن، کە لە بەبڵاوکردنەوەی هەڵوێستدا پەنجەی تۆمەتبارییان بۆ درێژ دەکرێ..

رووبەڕووبوونەوەی لایەنگرانی ئەو دووباڵە، ئەوەندە زبر و دوژمنکارانە دەبــێ، دەگاتە ئەوەی بەرەی نارازیی، بە پێشــەوایەتی مەلا بەختیار، هۆڵی کۆنفرانس جێبێڵن... لەگەڵ جێهێشتنی هۆڵەکەدا، مەلابەختیار سوێند بە گۆڕی ئارام دەخوا کە تازە جارێکی تر ناچێتەوە ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە.

ئەگەر هەوڵی زۆری ژمارەیەک لە ئەندامانی بەپەرۆشــی ناو کۆنفرانس، بەتایبەتیــش کەســانی وەک ملازم عومەر، ئازاد هەورامــی، بەکری حاجی ســەفەر، دلێری ســەید مەجید و قادری حاجی عەلی و دواتریش دەخالەتی مام جەلال نەبووایە، ڕەنگە هەر لەوێدا لەتبوونی کۆمەڵە ڕوویدایە...

ئەندامانــی نارازی دەگەڕێنەوە ناو دانیشــتنەکان و کارەکانی کۆنفرانس دەســتپێدەکەنەوە، بەڵام لەو ڕووداوە بەدواوە، سنوری نێوان ئەو دووباڵە هێنــدەی دیکە تــۆخ دەبێتەوە. کۆنفرانس بە هەڵبژاردنی دەســتەیەکی نوێی ســەرکردایەتی و دەستەیەکیش لە ئەندامانی یەدەگی سەرکردایەتی کۆمەڵە کۆتایی دێ...

مســۆگەربوونی زۆرینــەی ڕەهــا، بــۆ بــەرەی نەوشــیروان مســتەفا، دەستەیەکی وای سەرکردایەتی لێدەکەوێتەوە کە لەوێ بەدواوە، چیدی مەلا بەختیار، دەنگێکی بیسراوی ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە نامێنێ. دەبوایە مەلا بەختیار، ئەو لاســەنگیەی ببینیایە کە لە نێــوان دەنگەکانی ئەمان و ئەواندا هەبوو... هەروا دەبوایە بە سوێندخواردنەکەی خۆشیی پابەند بووایەو خۆی بۆ ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە کاندید نەکردبایەوە.

کۆنفرانــس، تــەرازوی هێزو دەســەلات لــە ناوەندی بڕیــاری کۆمەڵەدا لاســەنگدەکات. هەر ئەو لاســەنگبوونەش، کێشەکانی ناو کۆمەڵە بە ئاقاری مەترســیدارتردا دەبا. هەر لایەک، هەڵوێســتی لایەکەی تــر دەکاتە بەهانە، بــۆ ئــەو ڕێــکار و پەرچەکردارانەی لە دژی یەکتری دەیگرنــە بەر. ئەمان لەســەرەوە هەوڵدەدەن هەموو ئەوانەی لە کۆنفرانســدا لەســەر بەرەکەیتر ســاغبوونەوە، لەئاڵوگــۆڕی پۆســتەکان و لەدابەشــکردنی پۆســتی تازەدا

پەراوێزخــەن و ئەوەنــدەش بتوانــن تەنگیــان پێهەڵچنــن و لایانــدەن... لە کۆبوونەوە و دانیشــتنەکانی ناو بنکەو تیپەکانیشــدا بــەوە تۆمەتباریانکەن کە:

* دژی کۆمەڵەن ... بەشێوازی موئامەرە کاردەکەن ... دەیانەوێ کۆمەڵە لەناوەوەڕا هەڵتەکێنن.

* ڕێکخســتن لەناو ڕێکخســتندا درووســت دەکەن و دەیانەوەێ دەست بەسەر کۆمەڵەدا بگرن.

* پڕوپاگەنــدە و تۆمــەت بۆ ناشــیرینکردن و ســووککردنی کۆمەڵەو یەکێتی و ســەرکردەکانیان هەڵدەبەســتن.

* ورەی پێشمەرگە دەڕوخێنن و هانیان دەدەن، واز لە پێشمەرگایەتی و خەباتی شاخ بێنن.

* ســالار عەزیز و فازڵ کەریم(مامۆســتا جافر) لە ئێرانن و لە ژێرەوە، لەگەڵ کۆماری ئیســلامی و بەرەی جودا، بە مەبەستی پەلاماردانی یەکێتی، خەریکی پەیوەندی و هەماهەنگین.

* هــەواڵ و زانیــاری و وردەکاریــی بڕیارە نهێنیەکانی ســەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە، بە ئێران و سوریا و لیبیا و بەرەی جود دەدەن.

ئەوانیش لە ژێرەوە، دەســت بە خۆخڕکردنەوە و خۆڕێکخستن دەکەن... بەردەوامبوونی ئەو دۆخەی سەرکردایەتی کۆمەڵە خولقاندویەتی، وا لەوان دەکا، ســەرەتا لــە هەموو ناوچەکاندا ئەڵقەی ڕۆشــنبیری درووســتکەن... کاری ئــەو ئەڵقانــە، کۆکردنــەوە و ڕێکخســتن و پەروەردەکردنــی خەڵک دەبــێ... ئەڵقەیەکی ناوەندیش بــۆ کۆکردنەوە و پێکەوەبەســتنی ئەو ئەڵقە ڕۆشــنبیریانەو، بۆ ئاڕاستەکردنیان درووستدەکەن... دواجار و لە ئایندەدا، هەر ئەو ئەڵقە ڕۆشنبیریانە دەبنە کەرەسەی بیناکردنی ڕێکخستنێکی نوێ، ڕێکخستن لە ناو ڕێکخستندا.

وێڕای هەموو ئەو شــتانەی لەســەریان دەوترا، بە دەرکردنی کۆمەڵێک بڵاوکراوەش تومەتبار دەکران، لەوانە:

(نمانامە)، (چیتر بێدەنگ نابین)، (هەڵوێســت)، (سازشی بۆرژوازییەکان و هەڵوێستی مارکسیەکان)، کە لە هەر هەموویاندا، هێرشی توند کراوەتە سەر سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی بەگشتی، مام جەلال و نەوشیروان مستەفاش

بەتایبەتی... بە سازشکارو نا مارکسی و نا دیموکراتیان تۆمەتبار دەکەن.

ساڵیک بەسەر بەستنی کۆنفرانسدا تێدەپەڕێ و ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵەش لــە درز و شــەقاری بچووکەوە، دەبنــە زەندۆڵی گــەورە و پڕکردنەوەیان کارێکی ئاسان نابێ.

حەتمەن هاتنی مەلا بەختیاریش، خۆی هاتبێ یان مام جەلال داوایکردبێ، هەر پەیوەندی بەو گرژی و ئاڵۆزییانەی ناو کۆمەڵەوە هەیە.

مەلا بەختیار، لەدوای کۆنفراســی (ســێ)وە، چۆتە بــەری قەراخ و هیچ بەرپرســیاریەتیەکی لەنــاو یەکێتیدا نیە... ئەگەر بیــەوێ کاریش بکا، پێگەی لەنــاو ســەرکردایەتی کۆمەڵــەدا ئەوەنــدە لاوازبــووە، نە قســەی دەڕواو نەهیچیشی بۆ دەکرێ.

مام جــەلال، لەزالکی خێمەکەیدا، بەخێرهاتنی مەلا بەختیاری کرد... دوو کاژێــرک لای مــام جــەلال مایەوە... بۆ نانــی ئێوارە و مانەوەی شــەویش هاتەلای من...

ئەوەی ئەو لای من، وەک تەوەری سەرەکی کۆبوونەوەکەی خۆی لەگەڵ مام جەلالدا باسیکرد:

* هاتنەوەی سالار عەزیز و فازیل کەریم، بۆ سەرسنور، جموجووڵەکانیان لەگەڵ ئێران و لەگەڵ بەرەی جودا...

* بەرنامەدانان بۆ چوونی ئەم، بۆ لای ئەوان لە ئێران، بەو مەبەســتەی قەناعەتیــان پــێ بێنێ، بیر لــە جیابوونەوە، لە یەکێتی و پەیوەندی بەســتن لەگەڵ ئێران و بەرەی جودا نەکەنەوە.

* ئەو گومان و ناڕەزاییانەی ســەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە، لەم و لە هاوڕێکانی هەیانە و، ئەو ڕەخنە و ناڕەزاییانەش کە ئەمان لەسەر یەکێتی و کۆمەڵە هەیانە.

* مــام جــەلال داوای لێکــردوە کە بەرپرســیاریەتیەک وەرگرێ و ئیش بکات... ئەمیش ووتوویەتی کە ناتوانێ بەرپرســیاریێتی لەناو ڕێکخســتنێکدا وەرگرێ، کە هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی یەک کەسدا کۆببنەوەو کادرو ئەندام و پێشــمەرگەکانی ســەر بە بەرەکەی ئەمان پەراوێزبخرێن و ســزا بدرێن.

* ئـەو، ئەوەی نەشـاردۆتەوە کە ئەمـان کۆمەڵێک خەڵکـی ناڕازین لە سیاسـەت و هەڵوێستەکانی سـەرکردایەتیو، لە کاڵبوونەوەی ناوەڕۆکە چینایەتیەکـەی کۆمەڵە نیگەرانـن... بەڵام نکۆڵی لە هەبوونی ڕێکخسـتنی نهێنـی و هەمـوو ئـەو تۆمەتانـەش کردووە، کـە ڕووبـەڕووی خۆی و هاوڕێکانـیکراونەتـەوە.

ئەو شـەوە تادرەنگ قسەمانکرد... لە قسەکانیدا دەیویست هێڵکاریەکانی ئەو وێنەیەم بخاتە بەرچاو کە هێشـتا بەردەوامن لە کێشـانی، وێنەیەک کە دەیەوێ منیش لە ڕەنگکردنیدا ڕۆڵێکم هەبێ.

مـن لە کۆنفرانسـی یەکەمـی کۆمەڵەوە، لـە هەموو کارێکـی حیزبی و ڕێکخراوەیـی دوورکەوتوومەتـەوەو، ناشـمەوێ جارێکی تـر لەگەڵ هیچ لایەنێکـدا تێهەڵچمـەوە... ئـەوە ئەگەر باس لـەوە نەکەم کە مـن بڕوام بە (نوێ)دا تەلارێکی نوێ نەماوە کە بە کەرەسـەی کۆن بینابکرێ... من خۆم دەناسـم و سروشت و مێنتاڵەتیم ڕێم پێنادەن چیترلەناو گەمەی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتیـی لای خۆماندا یاری پێکراوبـم. ئەوە جگەلەوەی کە من بۆخۆم لەگەڵ هەندێک لە پرنسـیپەکانی لینینزمدا تووشـی بەریەککەوتن هاتبووم، بەتایبەتیـش ئـەوەی پەیوەنـدی بـە مەسـەلەی دیموکراسـیی ناوەندی و دیکتاتۆریەتـی پرۆلیتاریاوە هەیە... لای من دیموکراسـی ناوەندیی، بکوژی ناوەڕۆکـە دیموکراسـیەکەیەو، دیکتاتۆریەتـی پرۆلیتاریـاش، خنکێنـەری ئازادیـە ... دکتاتۆریەت هەر دیکتاتۆریەتە، جا هـی پرۆلیتاریابێت یان هەر چینێکیتر.

مـن لە کۆنفرانسـی یەکەوە تێگەشـتم، ئەوەی لە ناو سـەرکردەکانی کۆمەڵە و یەکیەتیشدا، بەناوی ململانێی فکری و سیاسیەوە بەڕێوەدەچێ، زیاتر ململانێیە بۆ تێکشـکاندنی ئەوانی دیکەو... بۆ زیاتر خۆ قایمکردن و دەسـەڵاتی زیاتر گرتنەدەسـتە و کەمتر پەیوەندی بە جیاوازیی فیکریەوە هەیـە... هەر لەو کۆنفرانسـەدا تێگەیشـتم، ناکۆکیە شەخسـیەکانی نێوان سـەرکردەکان، زیاتـر لە ناکۆکیـە فکریـەکان، ڕۆڵیان لـە قووڵبوونەوەی کێشـەکانی نـاو کۆمەڵـەدا هەیـە... تێبینـی ئەوەمکـرد، ئەوانەی کێشـەی شەخسـیان لەگەڵ یەکتریدا نییـە، چەندیش لە ڕووی فکریـەوە جیاوازبن، کێشـە لە نێوانیاندا درووسـت نابێ... ئەوانەش کێشـەی شەخسیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە، جیاوزیی فیکریشیان لە نێواندا نەبێ، هەر ناکۆک و ناتەبادەبن... بەڵام بۆ ئەوەی ناکۆکیەکان، لەبەرچاوی ئەندامان و کادیرەکاندا، خەسـڵەتی شەخسیان پێنەدرێ و جۆرێک لە پاساو و ڕەوایەتیان بدرێتێ، چوارچێوەی فیکرییان بۆ دەدۆزرێتەوە... ئەوە بەو مانە نیە بڵێم کێشەو جیاوازی فیکریی

هەرنەبوون، حەتمەن هەبوو، بەڵام پۆلێنەکە، بە نیسبەت سەرکردەکانەوە، ئەوەندە لەسەر بنەمای جیاوازیە فکرییەکان نەبوو، ئەوەندەی لەسەربنەمای جیاوازیە شەخسیەکان بوو...

من کە نە هەڵپەی سیاسی و... نە حەزی پۆست و... نە ناکۆکی شەخسیشم... لەگەڵ کەسدا هەبێ و... نە چێژیشم لە ملشکاندنی خەڵکیدا دیبێ... لەخۆ دوورخستنەوە لە کاری حیزبایەتی بەولاوە، ڕێیەکی تر لەبەردەمی خۆمدا شک نابەم...

ئەو هەوڵدەدا قەناعەتم پێبێنێ و منیش لەسەر ئەو مەسەلەیە تەواو ڕوونم و خۆم یەکلاکردۆتەوەو دەرفەتێکیشم بۆ پاشگەزبوونەوە نەهێشتۆتەوە...

کە مەلا بەختیار لەوە دڵنیادەبێ، ئیتر لەوە زیاتر پێ لەسەر کارکردنی من داناگرێ و دواجار داوام لێدەکات، ئەگەر من نووسینی فکریم هەبوو، لەو گۆڤارەدا بڵاوی بکەمەوە کە ئەمان بەتەمان وەک گۆڤارێکی سەربەخۆی تیۆری دەریکەن.

ئیدی ئاوا، پەیوەندی من و ئەو ڕێکخراوەی لەسەر ڕێی درووستبوونیدابوو، هەر ئەوەندەو زیاتر نەبوو.

## ٨١

زەوی چــاوی بڕیوەتــە ئــەو هەورەتێرانەی کە با پێش خــۆی داون، تا لەگەڵ ڕێژنەبارانێکی بەخوڕدا، هەموو ئەو شــەقارانە، پڕببنەوە کە گەرمیی هاوین، خســتوونیەتە جەستەیەوە. باران بەســەر زەویدا دادەکاو، تەرزەی کۆمەڵە وتارێکی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردســتانیش درەختی چاوەڕوانیی ئەوانەی بەتەمای چارەسەرێکی مامناوەندین، لە گەڵای هیوا دادەماڵێ.

وتــارەکان وتاری ناوەندیــی کۆمەڵەن و، گروپی کۆمیتــەی هەرێمەکانیان کردۆتە ئامانجی کوتانی خۆیان. وتارەکان ئەو گروپە بەگروپێکی بانچەپ و توونــدڕەو لــە قەڵەم دەدەن... گروپێک کە "دەیانــەوێ ئاژاوەیەکی فکری و ڕێکخراوەیی و سیاســی لە ناو کۆمەڵــە و یەکێتیدا بخوڵقێنن و دواجاریش ببنە مەترسیەکی جدی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی."

هەڵمەتەکــە هێنــدە چــڕە و دەنگدانەوەکەشــی لەنــاو پێشــمەرگە و ڕێکخستنەکاندا، ئەوەندەی تر فەزای سایکۆلۆژی و سیاسی بارگاوی دەکات... فەزایەکــی وا کــەس نەوێرێ بیــر لە ڕەخنە و ناڕەزایــی دەربڕین بکاتەوە. ئیدی لەوێ بەدواوە، هەرکەســێ دژی نایەکســانی، نادادپەروەریی و دژی سزادانی خەڵک، لەســەر جیاوازی بیروباوەڕ و لەسەر بەرتەسکبوونەوەی ماف و ئازادییەکانی تاک قسە بکات، یەکسەر مۆری بانچەب بە هەنیەیەوە دەنرێ.[٢٣٥]

من خۆم و ئەوانەی دیکەش دەیانزانی نە بانچەپم و نەشتی دیکەش، بەڵام مادام بەو دۆخە ســایکۆلۆژیە ســەپاوە ڕازی نیم و ڕاشکاوانەش ڕای خۆم دەڵێــم... مادام هەندێک لەوانەی بەبانچەپ ناودەبرێن، هاوڕێمن و ســەردانم دەکەن، دەبێ منیش لەوانبم... لای ئێمە ئاوایە، پەیوەندی سیاسی و کۆمەڵایەتی وا تێکەڵاوی یەکتری دەکرێن، لەگەڵ هەرکەسێکدا هاوڕێ بی، تۆش دەخرێیتە خانەی سیاسی ئەوەوە...

لای ئێمــە، تۆخــۆت نیت... تۆ ئەوە نیت کە خــۆت دەیزانی و هەیت... تۆ ئەوەیت کە ئەوانی تر لە بیر و خەیاڵی خۆیانەوە وێنەیان لێکێشاوی.

---

٢٣٥ـ هەنیە: ناوچەوان، تەوێڵ

ڕەوشــێکی هەتا بڵێی ناتەندرووست و ئاڵۆز... لەولاوە ئەوان، بەیاننامەو بڵاوکــراوە و ناميلکــەی نهێنــی دژ بەمــان دەردەکــەن... ســالار عەزیز و مامۆستا جافر لە ئەورووپاوە، دێنە ئێران و خەریکی هەماهەنگی و پەیوەندی دروستکردنن، لەگەڵ ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستان و ئاڵای شۆڕش بە ئاراستەی لە یەکێتی و لە کۆمەڵە دەرچوون هاندەدەن.

لەملاشەوە ئەمان، بەرنامەی پاکتاوکردنی ئەوان دادەڕێژن.

لێـرەش لە ڕادیـۆ، لەگەڵ هەر وتارێکی تازەی ئەنتــی بانچەپدا، دەنگی تەپڵ و کەڕەنای شــەڕ، خەریکە تەواو کاس و جاڕســم دەکات.

وەک چۆن گلێرە، بە نیشــانەی بارینی بەفــر و، ڕەوینی لەناکاوی ڕەوە ئەسپێک، بە نیشانەی ڕوودانی زەمینلەرزە دەزانرێ، ئاواش بڵاوبوونەوەی ئەو بابەت و نووسینانەی ڕادیۆ، بە ئامادەسازیی شەڕ دەزانم.

بــە ڕەوشــێکی نادڵنیاو ناهەمــواردا ڕەتدەبــم... تەنانــەت وام لێهاتووە نووســینی وتارێــک یــان ئامادەکردنــی بابەتێک یــان هەواڵێــک، بە کاری سوخرەکێشــی دەزانم. من کە نامەوێ لەمبەر یان لەوبەربم، دەبێ تا بڕیار لەدەســت خۆمدایە، خۆم ســاغ کەمەوە و لەم دۆخە ناتەندرووســتە بچمە دەرێ...

دەچمــە لای مام جەلال و بەڕاشــکاوی، هەموو شــتێکی خۆمی پێدەڵێم، پێیدەڵێم:

دان بــەوەدا دەنێــم کەمن لە بەرتەســکبوونەوەی پانتایــی ئازادیی ناو کۆمەڵــەو یەکێتی بێتاقەتم و لە زۆر هەڵویســـت و سیاســەت و ڕەفتاری ســەرکردایەتیش ناڕازیم... ناڕازیم لەوەی لەولاوە خەڵک لەسەر جیاوازی بیــروڕا ســزادەدرێ و لەم لاشــەوە خەڵکێتر، پیاودەکــوژێ، ڕاوڕووت و داوێنپیســی و کەلەگایــی دەکا، کەچــی خەڵاتدەکــرێ. ناڕازیــم لەوەی کە لەوەرگرتنــی پلــە و پۆســتدا، دڵســۆزیی و پاکێتــی و توانــا و لیهاتوویی لەبەرچاو ناگیرێن و وەلائی شەخســی و لارەملی[٢٣٦] و شــتی تر دەکرێتە پێوانــە... ناڕازیــم لەوەی کــە لەدەزگایــەکا کاربکەم، بەحســاب دەزگای یەکێتیو بڵندگۆی هەموانە، کەچی دەبێتە بڵندگۆی لایەنێک دژی لایەنێکی تــری نــاوکۆمەڵــەویەکێتــی.

---

٢٣٦ـ لارەمل: گوێڕایەڵ، موتیع.

دەچمە لای و پێیدەڵێم کە:

هەمــوو ئامــاژەکان بەرەو ئەوەدەچن کــە قەیرانێکی جــدی بەڕێوەیە... قەیرانێک ئەگەر پێشوەخت، من بڕیاری وازهێنان نەدەم، ڕەنگە بمکاتە بەشێک لەو کێشــانەی لە نێوان ئێوە و ئەوانــدا ڕوو دەدەن... ئاماژەکان پێماندەڵێن یان ئەوان لە کۆمەڵە و یەکێتی دەچنە دەرەوە، یان ئێوە پەلاماریان دەدەن. بۆیــە بەرلــەوەی ڕووداوەکان بــەزۆر بمخەنە پاڵ هیچ لایــەک، هاتووم تا داوای دەستلەکارکێشانەوەی خۆمتان پێشکەش کەم.

نامەوێ لێرە بەدواوە، لەســەر هیچ لایەک حساب بکرێم... دەست لە کار دەکێشمەوەو دەچمە شوێنێک، یان ڕوونتر بڵێم دەچمە بەری مەرگە و وەک نووسەرێکی پێشمەرگە، چون هەموو نووسەرە پێشمەرگەکانی تر، درێژە بە خەباتی خۆم دەدەم... هەر پێشمەرگە دەبم، بەڵام لەگەڵ هیچ لایەک و لە دەزگاکانی هیچ هێزیکدا کارناکەم...“

مام جەلال، لێدەگەڕێ من هەموو قسەکانی خۆم تەواوکەم، وەک ئەوەی شتێک لە قسەکانی مندا، نیگەرانییان بۆ درووستکردبێ، دەپرسێت:

- ئــەو قســانەی ئەتۆ لەســەر ئــەو قەیرانــە دەیکەی، زانیاریــە یان هەر هەست؟

ئەو، لەوە دەترســێ من زانیاریم لەســەر ئــەو کۆبوونەوە زۆر نهێنی و بچووکەی ئەمان هەبێ... ئەو کۆبوونەوەیەی لەوێدا بڕیاری کۆتایی خۆیان، لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکرنی ئەو قەیرانەدابوو.

لە ڕاســتیدا من هیــچ زانیارییەکم نەبوو... ئامــاژەکان هێندە ڕوونبوون، بەبێ هەبوونی زانیاریش، دەتتوانی بزانی، دۆخەکە بە چ ئاقارێکدا دەڕوا...

جارێکیکەش لێم دەپرسێت:

- ئەتۆ هیچت بیستووە، یان هەر هەستی شاعیرانەی خۆتە...

- نەزانیاریم هەیەو نە هیچیشم بیستووە، تەنها هەستی خۆم و خوێندنەوەی خۆمە بۆ پەرەسەندنی ڕووداوەکان.

ئەو، قورسایی خۆی لەسەر مێزەکە هەڵدەگرێ و دەیگوازێتەوە بۆ سەر پاڵپشــتی کورســیەکەی... بەدەم و چاوێکی راحەتر و تۆنێکــی ئارامترەوە دەڵێ:

- زۆر باشــه که هەر هەســتە... بەڵام ئەوەش بزانە زۆرجاران، هەسـتی شــاعیرانە ئینســان بە هەڵەدا دەبا... دۆخەکە ئەوەندە تاریک و تەڵخ نیە کە ئەتۆ دەیبینی...

دۆخەکە بۆ من زۆریش تەڵخبوو... لە ئاوێنەیەکی دوو ڕوو دەچوو... من دیوە تەڵخەکەی دەبینم و ئەویش دیوەکەی دی... ڕەنگە من ئەودیوەیشــیم دیبا، هەر بەتەڵخم زانیبا، بەڵام ئەو ڕوون دەیبینی...

ئــەو هەر وابوو، قــەت بێ ئومێد نەدەبوو... لە بێ ئومێدترین دۆخیشــیدا دیبــات، هــەر بە ئومێدەوە قســەی دەکرد... ئــەو، ئومێدی لە بێ ئومدیشــدا درووستدەکرد...ئەگەرچی ئومێدەکەی ئەم جارەی ئەو، وەک دواتر تێگەیشتم، ئەوەنــدەی پەیوەندی بــەو بەرنامەیەوە هەبوو کە بەنهێنــی بۆ لێدانی ئاڵای شۆڕش دایانڕشتبوو، ئەوەندە پەیوەندی بەمەسەلەی ئومێد و بێ ئومێدییەوە نەبوو.

بەدرێژایی دوو کاتژمێران، هەوڵیدا قەناعەتم پێبێنێ کە وەک سیاسیەکی واقیعی بیربکەمەوە، وەک شاعیرنا... بەڵام من نەمتوانی ببمە ئەو سیاسیەی ئەو دەیخواست.

چەند کەســێکی تر لــە پرســگەکەدا چاوەڕێن مام جــەلال بیانبینێ... بۆ بینینی ئەوان و بۆ تەواوکردنی قسەکانیشی لەگەڵ مندا، باقی کۆبوونەوەکە، دەخاتە ڕۆژی دواتر..

کــە لەبەرگەڵــوو دەرچــووم، ڕەشــەبایەکی ئەوەنــدە بەهێــزی دەهات سیرەسیرِی بە پەڵە دارهەنارە ڕووتاوەکەی دامێنی بارەگاکەمان خستبوو. بــا، ئەو پــاش نیوەڕۆیە لــە بەرچاوم، لــە زڕدایکیکی دڵڕەقدەچــوو... تاکە گەڵایەکی بەودارانەوە نەهێشتبوو، کەچی هێشتاش دەستی لەسەروپرچیان بەرنەدەبــوو. تــا گەیشــتمە خوار مــاڵان، با هــەر وژەی هــات و نەکەوتە وەنــەوزدان... با لــە جووڵەدەکەوێ و منیش دەگەمە بارەگاکەی مام جەلال من سڵاودەکەم و ئەویش خەریکە عەلی شامار بەڕێدەکا...

"ئەوە کاک عەلی، برادەری هەردووکمان، بڕیاریداوە، هەرچییەک لە نێوان ئێمەو ئەواندا ڕووبدا، هەر لەگەڵ یەکێتیدا بمێنێتەوە...

عەلی شامار، بەجۆرێک لە حەپەسانەوە، گلێنەی چاوەکانی لە نێوان مام جەلال و مندا دێنێ و دەبا... کەمێک بێدەنگ دەبێ و ئینجا دەڵێ:

«بەخوا مام جەلال، من هەقم بەسەر هیچ لایەکەوە نیە.»

مام جەلال دەستێک دەخاتە سەرشانی عەلی شامار:

- هەقــت هەبــێ یــان نەبــێ، ئەتو هــەر عەلی شــامارەکەی پێشــمەرگە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێی... ئەمە دەڵێ و بۆ بەڕێکردنیشی، تا دەرەوەی خێمەکە، لەگەڵیدا دەڕوا...

هەر کە دەگەڕێتەوە، یەکسەر دەچێتەوە ناوبابەتەکە:

"ئــەم بەیانیــە کاک شــێرکۆ بێکــەس لام بوو، ئەویش بــەو بڕیارەی تۆ ناڕەحەتەو، لەگەڵ مندا هاوڕایە کە بوونی تۆ بۆ ڕادیۆ زۆر پێویستە..." یەک دووشت لە دەفتەرەکەی بەردەمی دەنووسێ، ئینجا دەڵێ:

"ئەتۆ خۆت دەڵێی، حزبایەتی ناکەی و ناتەوێ بەشێک بی لەو ململانێیەی نــاو کۆمەڵــە... مــن ئەوەم زۆر پێ باشــە و بە بیرکردنەوەیەکی ڕاســت و ژیرانەی دەزانم... مادام وایە، تۆ هەقت بەســەر کێشــەی ئێمەوە نەبێ... تا ئێســتا چۆن کارت کردوە، هەروا بــەردەوام بە و، ئەمنیش بەڵێنت دەدەمێ

هەموو پشتیوانی و پشتگیریەکت بکەم."

ئەو بەڵێنم دەداتێ و منیش لەســەر ڕاکەی ڕۆژی پیشــووم بەردەوامم. ئەو کە دەزانێ من لەســەر ئەو بڕیارەم ســوورم، بە تۆنێکی ئارامی نزیک لە چپەوە دەڵێ:

"با زانیاریەکت پێ بڵێم و لەدوایەشدا پێشنیارێکت بۆ دەکەم... زانیاریەکە ئەوەیە، ئێمە لە مەکتەبی سیاسی، بە کاکە نەوەشەوە، لەگەڵ ئەوەداین ئەو کێشــەیە، بەشــێوەیەکی برایانە و ئاشتیانە چارەســەربکرێن. لەو ڕۆژانەدا مەلا بەختیار دێتە لام و منیش ڕای مەکتەبی سیاسی پێڕادەگەیەنم... ئەگەر ئــەوان ڕێکخــراون، هەر چەندە تا ئێســتاش نکوڵی لەوەدەکــەن، با خۆیان ڕاگەیەنــن و بەرنامــەی خۆیان تەڕحکــەن. ئەگەر ئێمە بەرنامــەی وانمان بەدڵبــوو، ئەوانیش قبوڵیان بوو، هــەر لەگەڵ یەکێتیدا بمێننەوە، ئەوا باوەک باڵێکیکــە، لەپاڵ کۆمەڵە و شۆڕشــگێڕاندا، لەناو یەکێتیــدا بمێننەوە... ئەگەر ئەوەشیان قبووڵ نەبوو، ئازادن، با لە یەکێتی جیاببنەوە، بەڵام قبوڵمان نیە هێزی پێشمەرگەی کوردســتان دوولەتکەن. ناهێڵین جارێکی تر ئەزموونی ڕەسوڵ مامەند و حسک دووبارە ببێتەوە."

ئەوە زانیاریەکەبوو... پێشنیارەکەشم بۆت ئەوەیە:

دەزانم ئەم وەزعە نیگەران و ماندووی کردووی و پێویستیت بە ئیسراحەتە. ئیجازەیەکی یەک مانگی وەرگرەو، لەو مانگەشدا شتەکان یەکلادەبنەوە... ئەو دەمی وەرە و بە گوێرەی وەزعەکە قســەی لەسەردەکەین... باشتەکیکەشت پــێ بڵێــم... ئەگەر مەلا و ئەوانیــش بڕیاریاندا خۆیان جیاکەنەوە و شــتێک بۆ خۆیان درووســت کەن، شــوێنە بە تاڵەکانی ئەوان لەناو سەرکردایەتیدا بەخەڵکی وەک ئێوە پڕدەکەینەوە...

بەرلەوەی ماڵئاوایی لێبکەم، لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە:

من مادوونیەکی[٢٣٧] سێ مانگی وەرگرم... ئەگەر لەو ماوەیەدا کێشەکان بــەو جۆرە چارەســەرکران، وەک ئــەو دەڵێ، ئەوا کۆتایــی بە مۆڵەتەکەم دەهێنم و دێمەوە ســەر کارەکەی خۆم... ئەگەر وەک ئەوەش شــکایەوە، کــە من پێشــبینی دەکەم، ئەوا مۆڵەتەکــەم دەبێتە دەستلەکارکێشــانەوە... دەست لە کاردەکێشــمەوە، بەڵام هەر پێشمەرگە دەبم... پێشمەرگەی هیچ حیزب و لایەنێک نا... دەمەوێ لەدەرەوەی تاوڵی حیزب وەک نووسەرێکی پێشــمەرگە، درێژە بەخەباتی خۆم بدەم.

٢٣٧ـ مادوونی: ئیجازە

## ٨٣

بەدرێژایــی ڕێــگای نێــوان یاخســەمەر و بەرگەڵــوو، تەتەڵەمیرانەی[٢٣٨] قسەکانی مام جەلال، تەونی ئاڵۆزکاوی خەیاڵم دەچنن... بیر لەیەک بەیەکی قســەکانی دەکەمەوە و، مێشــکی مانــدووی خۆم دەجەڕێنــم، بەڵکو بتوانم هەندێک جفرەی ناو وشەکانی هەڵبێنم... هەر چەندە چاوی زیهنم هەڵدەگلۆفم، لەتراویلکەیەک[٢٣٩] بەولاوە، شتێکی دیکە نابینم... لە مێشکی خۆمدا، قسەکان یــەک یەک دەبــەم و دێنم، لە گومان دوودڵی بەولاوە، شــتێکی دیکەیان لێ هەڵناکرێنم:

"ئــەو کاتەی جەماعەتەکەی ڕەســوڵ مامەند، لە بزووتنەوە و لە یەکێتی جیابوونــەوە، برادەرانــی کۆمەڵــە ڕایان وابــوو، بچنە ســەریان و هەر لە کولانەکانــی زەڵێدا، پەڕوباڵیان هەڵکێشــین و مەجالی بســتە فڕینێکیشــیان نەدەینــێ. ئەمن ڕام وانەبوو... بەو برادەرانەم گووت، لێیانگەڕێن، دەڕۆن با بڕۆن و ئەو هێزە شــڕ و زۆر و بۆرەی ئەوانمان لە کۆڵ بێتەوە باشــترە. تاقیکردنــەوەکان دەریانخســت، برادەرانــی کۆمەڵە ڕاســتبوون و ئەمنیش هەڵە."

ئەگــەر ئەمجارە، ئالای شــۆڕش، بیر لــە جیابوونەوە بکەنــەوە، نە مام جــەلال ئەو(هەڵە)یە دووبارە دەکاتــەوە و نە"برادەرانی کۆمەڵە"ش ڕێ بە لەتبوونی کۆمەڵە دەدەن.

ئــەوان لەســەر جیابوونەوەی باڵێکی ناو یەکێتــی ئەوەندە توند و ڕژد بووبن، لەسەر کەرتبوونی کۆمەڵە، سەد ئەوەندە.

ناکۆکیــە سیاســیەکانی نێــوان لایەنە بیروبــاوەڕ جیــاوازەکان، زۆر لە ناکۆکیە عەقائیدیەکانی ناویەک ڕێکخستن ئەهوەنترن.

لای ئێمە، کە بیروباوەڕێک لەتدەبێ، کێشەکان پلەی ناکۆکی تێدەپەڕێنن و دەگەیەنرێنە ئاستی خیانەت...

---

٢٣٨ ـ تەتەڵە میرانە: جۆرێکە لەکرم، کە تەونێک لە شێوەی ڕەشماڵ بەسەر سەری خۆیانەوە درووستدەکەن.

٢٣٩- تراویلکە: سەراب

"لــه هیچ کەســێکی قبووڵناکەین بەناوی ئازادیەوە، یەکێتیی نیشــتمانیی کوردستان تێکبدات، یان تەنانەت هەوڵی لاوازکردنیشی بدات."

ئەمان وادەڵێن و ئەوانیش دەڵێن: "لە هیچ کەســی قبووڵناکەین، بەناوی پاراستنی یەکێتیەوە، ئازادیمان لێزەوتکات."

دوو دیــدی تــەواو دژبەیــەک، دەرفەتــی هێشــتنەوەی پێتنێــک نادەن، هاوکێشــەیەکی وای تێدا چێبێ، هەم یەکێتی بپارێزێ و هەم ئازادیشــی تیا فەراهەم بێ.

مام جەلال، باســی چارەســەری ئاشــتیانە و برایانە دەکا، بەلام هۆکارە ســەرەکیەکانی ئەو قەیرانە دەستنیشــان ناکا... هۆکار دەستنیشان نەکردن، بەلام قســەکردن لە سەر چارەسەر کردنی، درزێک ناخاتە دەرگای بەسەر هیــوادا داخــراو. ئەمان وا دەڵێن و ئاماژەکان شــتی دیکە دەڵێن. ئاماژەکان دەڵێــن! قەیرانەکە خەریکە دەگاتــە خاڵی کۆتایی... کۆتاییەک کە بەهێز تێیدا بالادەست و بێ هێزیش دەبێتە قوربانی...

## ٨٤

لەبـــەردەم خاڵـــی کۆتاییـــدا وەســـتاوین. بەدڵەڕاوکـــێ و نیگەرانیەکـــی زۆرەوە، دەڕوانینـــە تێکەوە هاویشـــتن و جووڵەی ئـــەو هەورە تارانەی کە چاوەڕێی(بارانـــی ڕەحمەت) یان لێناکرێ. کەلوپەلەکانی خۆم پێچاوەتەوە و سازو ئامادەی سەفەرم. ها ئیمرۆ ها سبەی، ملی ڕێی بەرەو مەرگە دەگرم. مەلا بەختیار و شـــێخ عەلی بۆ دوایین دیداری خۆیان، لەگەڵ مام جەلال و مەکتەبی سیاسیدا، دەگەنە یاخسەمەر.

بـــۆ زانینی دوایین هەواڵ و پێشـــهاتەکان و بۆ دەربڕینی نیگەرانیەکانی خۆشـــمان، لەگەڵ دکتۆر ســـەردار (سەردار رەشـــید)دا، سەریان دەدەین. مـــن و دکتـــۆر ســـەردار، لەو کاتـــەوەی وەک یەکەم پزیشـــکی ددان، بۆتە پیشمەرگە هاوڕێین. بە حوکمی لەیەکەوە نزیکیی بارەگاکانیشمان، ڕۆژانە یەکتری دەبینین. لە زۆربەی شـــتەکاندا، دیدو بۆچوون و هەڵوێستەکانمان وەک یەکن، یان زۆر لە یەکتریەوە نزیکن. ئەو ئەگەرچی سەر بەهیچ کام لەبەرە ناکۆکەکانی ناو یەکێتی و کۆمەڵەش نیە، بەڵام مادام، ڕاوبۆچوونی خۆی هەیە و ڕەخنەشـــی لە هەندێ لە سیاســـەت و دیاردە و هەڵویســـت هەیە و، بەشـــێک لە برادەرەکانیشـــی لە بەرەی ناڕازیدان، لەســـەر بەرەی ناڕازی حســـاب دەکرێ.

ئێمـــە دەگەینە (مالومە)و ئـــەوان، مەلا بەختیار و شـــێخ عەلی، هەمووی چەند کاژێرێکی کەمە، جڤینیان لەگەڵ مام جەلالدا کردووە.

ئەوان، تا بەر لەو جڤینەشیان لەگەڵ مام جەلالدا، نەچووبوونە ژێرباری ئەوەی کە ڕێکخراوی جیاوازی خۆیان هەیە. ئەوان، نکۆڵیان دەکرد و بەڵام دەرچوونـــی ئەو هەموو بڵاوکـــراوە نهێنیانە و گیرانی ئەو نامانەی دواییش کە لە سالار عەزیزەوە بۆیان هاتبوو، ناچاری کردن، بە مام جەلال بڵێن:

"بەڵێ ئێمە ئاڵای شۆڕشین... جیاوازی فیکری و سیاسی قووڵمان لەگەڵ نەوشـــیروان مســـتەفا و ســـەرکردایەتی کۆمەڵـــەدا هەیە و گەیشـــتووینەتە ئەو شـــوێنەی کە چیتر توانـــای پێکەوە هەڵکردنمان نەماوە..." کە ســـەرەتا بینیمانن، ڕاگەیاندنی خۆیانیان، وەک ئاڵای شۆڕش، بەو چەشنە پێگووتین... هـــەروا گووتیان، بە مام جەلالیشـــمان وتووە: "ئێمـــە دەچین کۆبوونەوە و

کۆنفرانسی خۆمان دەکەین و هەوڵی جدیش دەدەین، قەناعەت بەبرادەرانی خۆمان بێنین، وەک باڵێکی جیا، لە پاڵ کۆمەڵە و شۆڕشــگێڕاندا، هەر لەناو یەکێتیدا بمێنینەوە."

ئــەوان، بەرامبەر بەو بەرخوردەی مام جــەلال لەگەڵیاندا هەیبووە، بەو بەڵێنانەش سەبارەت بە چارەسەری ئاشتیانەی کێشەکان پێیداون، تەواوێک دڵنیا و دڵخۆش دیاربوون. کە ئێمە، ترس و دڵە ڕاوکێی خۆمان، لە قسەکانی ئــەو ڕۆژەی مــام جەلال و لــە نیەتی ســەرکردایەتی کۆمەڵــە و لە ئاماژە مەترســیدارەکان دەخســتە ڕوو، ئەوان پێیان وابوو، ئێمە زیاد لە پیویست هەســتیارین... ئەگەر لە ناخیشیاندا شتێک گومانیان هەبووبێ، لە سیمایاندا دەرنەدەکــەوت. هێندە پشــتیان بە گفت و بەڵێنەکانی ئەوان ئەســتووربوو، حســابیان بــۆ قــەوارەی ئەو مەترســیانە نەدەکرد کە خۆیان بۆ لە بۆســە نابوون... تەنانەت شێخ عەلی پێی گووتین کە "مام جەلال وەعدی ئێزگەیەکی ڕادیۆشی پێداوین." ئەوان، خەیاڵی چارەسەری ئاشتیانە، ئەگەرەکانی دیکەی لا کاڵ کاڵ کردبوونەوە.

تــۆ، هەتــا ئێوارە بڵــێ ئەگەر ئێوە جیاببنــەوە، یەکێتی بــە هەموو هێز و توانای خۆیەوە لێتان دەدا، باوەڕناکەن. باوەڕیشــکەن وەک ئەگەرێکی دوور تەماشــای دەکەن... ئەوان، پشت ئەستوور بەو بەڵێنانەو، بەو ژمارە زۆرەی ئەنــدام و کادرو پێشــمەرگە و فەرماندەیــەی، بە حســاب لەگەڵیاندان،... بەو خەبات و ماندووبوونەش کە بۆ یەکێتی و بۆ کۆمەڵە کردوویانە، باوەڕناکەن هاوخەبات و هاوسەنگەرەکانی خۆیان، پەنا بۆ پەلاماردانیان بەرن.

ئەوان، پێیان وایە ئەوەی کردوویانە، نەگەیشــتۆتە ئەو ئاستەی، پاساوی هێرشکردنە سەریان، بداتە دەستی بڕیاربەدەستانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی.

پەلاماردان لە شوێنێکدا، یاسا و ڕێساو، تەنانەت نەریتێکیش ڕێی لێ نەگرێ، بەدوای پاساودا ناگەڕێ. تۆ لە ناو ئەم شاخ وداخانەدا، هێزی تێکشکاندنی ئەوانەت هەبێ، کە لە ڕێی چوونە پێشــەوەتدا، بە ڕێگرو لەمپەریان دەزانی، کــوا بەدوای پاســاودا دەگەڕێی. لەناو ئەم شــاخ وداخانەدا، چ کێشــەیەک لەوەدایــە، هەموو هێزو تواناکانی خۆت، بۆ لێدانی ئەوانە بخەیتەگەڕ کە بە دەســتی بێگانــە و بەخیانەتکار تۆمەتباریان دەکەی. تــۆ، مادام لە بەرامبەر نەیارەکانتدا، میکافیلی گووتەنی:

زرنگی ڕێوی و هێزو بێ بەزەیی شــێرت هەبێ، چ لە مپەرێک دەتوانێ، ڕێی بەکارهێنانی زەبروزەنگت لێبگرێ.

## ٨٥

لوورەی دووری گەلەگورگێک، لەباوەشی خەیاڵەکانم دەردێنێ... ئەوەتا گورگــەکان بــە دوو گوێیی قوت و بە کلک و لمۆزی درێژیانەوە دەرکەوتن ها ئێستا، ها تۆزێکیکە، ئامبازم دەبن... بەچڕنووک و کەڵبەتیژەکانیان، زیواڵ زیواڵم دەکەن...

ئــەوان لە هەڵمەتدان و مــن هەتا تینم تێدایە ڕادەکــەم... ڕادەکەم و قاچم لەدوام نایا... پڕ بە گەرووم هاواردەکەم و نووزەیەک لە قوڕگمەوە دەرنایا... لەوەدایــە هەناســـەم لەبەر ببڕێ و ڕادەپــەڕم... ڕادەپــەڕم و لێوەکانم وەک گەڵای چرچ و لولبوو، وشــک وشــک و، ئازاری جەستەم شەلاڵی ئارەقەیە... بەتانیەکەم توورڕ دەدەم... بۆ دوورکەوتنەوە لە شانۆی ئەو خەونە ترسناک و بێزارکەرەو، بۆ هەڵمژینی هەواو هەناسەیەکی قووڵ، دەچمە دەرێ.

زۆرنیە من و جەبار، ئەو خانوەمان کردۆتە ماڵی خۆمان کە پێشتر جێگای مامۆســتایانی تاکە قوتابخانەکەی مەرگەبوو.. جەبار، پێشــتر لە ڕێکخســتنە نهێنیەکانی ناو شار و، دواتر یەک لە پێشمەرگە ئازاکانی تیپی ٤٣ی ئاسۆس و تا یەک هەفتەش پێش ئێستا، ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی (ئاسۆس)ی ناوچەی قەڵادزێ بوو... لەســـەر کێشــە و ململانێکانی ناو یەکێتی و کۆمەڵە، ئەویش هەمان هەڵوێستی منی وەرگرتووە.

دێمە بەر هەیوانی ماڵەکەو، دەرێش لە ژووری ناخۆشتر... گێژەڵووکەیەکی زۆر قایــم، گەڕی لە تاکە دار زەیتونەکەی بــەردەم ماڵەکەمان ئاڵاندووە و ئەوەندە بەتوندی ڕایدەوەشێنێ، هێندەی نەماوە لە ڕەگەوە دەریبێنێ.

لەو بەیانیە زۆر زووەدا، یەکێک دێت و پێم دەڵێ "زانیوتە، ئەوشەو، چەند ســـەعاتێک بەر لە ئێســـتا، هێزێکی گەورەی یەکێتی، لە قــەرەداغ، پەلاماری گونــدی تەکیەیان داوە و مــەلا بەختیاریان، بێ بەرگری، لە ماڵەکەی خۆیدا گرتووە؟!..."

هــەر ئەو بەیانیەش، هێزێکی دیکەی یەکێتی، لــە گوندی مالومەی نزیک سەرکردایەتی، شێخ عەلی(خولە کەشکۆڵ)یان قۆڵبەستکردووە. دواتر زانیم کە مامۆستا پشکۆش هەر لەگەڵ مەلا بەختیاردا گیراوە...

گرتیانــن، بەرلەوەی فریای بەســتنی کۆنفرانســی خۆیان یــان تەنانەت دەرکردنی تاقە بەیانێکیش بکەون... گرتیانن.

ئــەوان گیــران و هەڵمەتێکــی فراوانی تــرس و تۆقانــدن، ڕاوەدونان و پەلکێــش کردن، لە هەمــوو ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی دەســەڵاتی یەکێتیدا دەســتپێکرد... دەیــان پێشــمەرگە و ئەندام وکادرو بەرپــرس و فەرماندە، کرانە ئامانجی ئەو هەڵمەتە. "ببە بەجاش، مەبە بە ئاش." بوو بە درووشمی ئەو ڕۆژانەی ناوهێزی پێشمەرگە.

ئەو ڕۆژانە فەزای سیاســی ئەوەندە بارگاوی بوو، تەنانەت یەکێک هەر بــە گاڵتەش، بە ئاشــبوون تۆمەتبارکرابا، بانگهێشــت دەکرا و لێکۆڵینەوەی جدیشــی لەگەڵدا دەکرا... فەرید ئەسەســەرد، کادری ئەو کاتەی ڕاگەیاندن، زۆرکەیفــی بەگاڵتــە و کلاوکردنەســەر خەڵــک دەهــات.. جــا ئەو کەســە پێشــمەرگەیەکی ئاســایی با، یان بەرپــرس و فەرماندە... فەریــد، نامەیەک ئاڕاستەی ڕێکخستنەکانی ئەو ناوەی کۆمەڵە دەکا.. لە نامەکەیدا دەڵێ:

"من گومانی زۆرم لە مامۆســتا عەبدوڵا (عەبدوڵا کەریم مەحمود) هەیە کە ئاش بێت، بۆ ئەو گومانەشم، بەڵگەی زۆرم پێیە.

- مامۆســتا عەبدوڵا هاوڕێی هەڤاڵ کوێســتانی یــە، چەند جارێک دیومە سەریداوە.

- مامۆستا عەبدوڵا، کچێکی هەیە، بەخۆشی (هەڵوێست)ی ئاڵای شۆرش، ناوی لێناوە، هەڵوێست.

- بــەو دووچاوانــەی خــۆم دیتومــە، هەر کاتێــک تیپی فتبۆڵــی عێراقی، بەرامبــەر بە تیپــی فتبۆڵی هەر ووڵاتێک یاریکردبێ، ئەم بە حەماســەتێکی زۆرەوە پشتیوانی لە تیپی فتبوڵی عێراقی کردووە.

- چەند جارێکیش، بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێی بووە، گۆرانیی عەرەبیی عێراقی ووتووە...

مامۆســتا عەبدوڵا، لەســەر ئەو نامەیەی فەرید، بانگ دەکرێتە بارەگای ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی ووردی لەگەڵدا دەکرێ... خۆ ئەگەر فەرید، دواتر نەیگووتبا"هەر بۆ گاڵتە ئەو شــتانەم لەسەر مامۆستا عەبدوڵا نووسیووە." حەتمەن بێ سزادان ڕزگاری نەدەبوو.

بەوشـــکڵە، تۆمەتی ئاش بوون، ببووە چەکێکی کاریگەر بەدەســتی هەر کەسێکەوە، بیویستایە دژی کەسێکی تر بەکاری بێنێ، یان پلەوپایەی خۆی پێ بەرزکاتەوە.

ڕۆژ نەبـوو، نەبیســتی فـلان، بۆ لێکۆڵینەوە و ســزادان، پەلکێشــی لای سکرتێرانی یەکێتی و کۆمەڵە کراوە ... هەر لەو سەروبەندەدابوو، مام جەلال بەدوای منیشیدا نارد... من خۆم سەبارەت بە تۆمەتی (ئالای شۆرش) بوون، هیچم لە خۆمدا شک نەدەبرد... بەڵام ئەوان تۆ وەک ئەوە نابینن کە هەیت. ئـەوان تۆ وەک ئەو وێنەیە دەبینن کە لە تۆیان کێشـاوە و لە چوارچێوەی ئەو وێنەیەشدا. ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەن.

زۆرینــەی ئـەو وێنانــەی لەو ماوەیــەدا، مــام جــەلال داوای کردوون، بەرووشـاوی و چرژاوییـەوە، بارەگای مام جەلالیان جێهێشــتووە... لەناو ئەوانەشــدا کەمیــان هەبـوون، مــام جــەلال فەرمانــی بە پێشــمەرگەکانی نەدابێ"چەکی کەن".

دەبێ بۆ پێشــمەرگە، لە چەککردن بەولاوە ســووکایەتیەکی زیاتر هەبێ کورد گووتوویەتی، "جام دەڵێ بمشکێنە بەڵام مەم زرنگێنە."... نەوا ئەوەش لەگــەڵ منــدا بکرێ و لە ترســی ئــەو زرنگاندنە، چەکەکــەم لای جەبار، لە چایخانەکەی خوار ماڵەکانی یاخســـەمەر بەجێدێڵم و... بە هەنگاوی قورس قورس، بەرەو بارەگاکەی مام جەلال هەڵدەکشێم...

گرمەگرمی هەوران و شەقەشــەقی باڵی پۆلە مەلێ، ســەرنجم بۆ ســەر لووتکەی چیاکەی پشــتی بــارەگاکان دەگوازنەوە... هەورەکان، شــێتانە بە یەکدادێــن و، مەلەکانیش باڵەکانیان لە دامێنی هەورەکان دەخشــێنن، وەک ئەوەی بیانەوێ بەشــاباڵە ســپیەکانیان، شــتێک لەو هــەورە تارانە ڕامالن کە خەریکن ئەو شــەبەقە چکۆلانە داپۆشــن کە هیشــتا، پنتێک لە شــینایی ئاسمانم نیشان دەدەن. بە نیگەرانی و دوودڵیەکی زۆرەوە دەگەمە بەردەم بارەگاکەی مام جەلال...

جووڵە و سیمای پێشمەرگەکانی بارەگاکە پێم دەڵێن:

"تۆزێکی تر، تۆش بەمەرەدی[٢٤٠]، هاوڕێ ئاشەکانی ترت دەچی."

پێشمەرگەیەک، لەژوورەکەی مام جەلال دێتە دەرێ:

---

٢٤٠-تۆش بە مەرەدی: تۆش بەدەردی.

"مام جەلال چاوەڕێتە!"

سـڵاودەکەم و مـام جـەلال هەر لە پشـتی مێزەکەی خۆیەوە، دەسـت درێـژدەکاو تۆقەیەکم لەگەڵـدا دەکا... تۆقەیەک نە زۆر گەرم و نە زۆریش سارد...

ئـەو، لەبەرچاوی مندا گۆڕاوە... ڕەنگە کەمێکی تر لەوەش زیاتر گۆڕانی بەسەردابێ.

لەو چەند چرکە کەمەی بێدەنگیی ناو ژوورەکەدا، بەخۆم دەڵێم:

"نا...نـا... تۆ هەڵەی... مام جەلال نەگۆڕاوە... مام جەلال هەر مام جەلالی جارانـە... ئەوەی گـۆڕاوە تۆی... ئـەوە وێنەی تۆیە لە دیـدی مام جەلالدا گۆڕاوە، نەک ئەو."

ئەو جاران لەگەڵ وێنە کۆنەکەی مندا بەرخوردی دەکرد، هەر جارێکیش هاتبامـە لای، یـان لـە هەر جێیەک دیبامـی، بە لوتف و خۆشەویسـتیەوە، دەیدواندم... منی بە شـاعیری شـیعرە ئاگرینەکە ناو دەبردو، زۆرجارانیش پێی دەووتم"من حسابی برازای خۆمت بۆ دەکەم."

نازانم ئەوسـا وابووم یان نا، بەڵام دەزانم ئیمـڕۆ وا نیم... ئەوە دەزانم بەڵام نازانم بە گوێرەی ئەو وێنە تازەیەم، لای مام جەلال چیم و کێم.

یەکـەم جـارە مـام جـەلال بەو کـەم لوتفیـەوە دەبینـم... لە ڕاسـتیدا، بەلەبەرچاوگرتنـی ئەو دۆخـەی تێیدا بووین، دەبوایـە چاوەڕێی زۆرلەوە کەمتریش بم... بێئەوەی سـەرهەڵبڕێ، داوای دوو قاوە دەکات. تا قاوەکان دێن، خۆی بەئەمدیوئەودیوکردنی کاغەزەکانی بەردەمیەوە سەرقاڵ دەکات، سەر هەڵدەبڕێ و بە تۆنێکی نیمچە ئارامەوە دەڵێ:

"کاک ئـازاد هەورامیـش گەڕایـەوە... گەڕایەوە و بڕیارشـیداوە، وەک جـاران و زیاتریش، درێژە بە خەبـات و چالاکیەکانـی خـۆی بداتـەوە."

ئازاد هەورامی، یەک لە هاوڕێ نزیکەکانی منە، ئەندامی سـەرکردایەتی یەکێتـی و کۆمەڵـە و بەرپرسـی دەزگای ناوەنـدی ڕۆشـنبیری کۆمەڵە بوو... لەسـەر ئەوەی، ئەو سـەرکردایەتیەی ئەو خۆی تێیدا ئەندام بوو... بەدزییـەوە و لەپشـتی ئەمەوە، بڕیـاری یەکلاکردنەوەی کێشـەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتیاندا، هەڵوێسـتی خۆی بەوازهێنان لە کۆمەڵە و لە یەکێتی ڕاگەیانـد و ملـی ڕێـگای هەندەرانی گرتەبـەر. ئەوەتا، ئێسـتاکەش چەند

ڕۆژێکە لە تارانەوە، گەڕاوەتەوە... هەر لەگەڵ گەیشتنەوەشیدا، نامەیەک بۆ من دەنێرێ، لە نامەکەیدا، بێ هیچ ڕتوشکردنێک پێم دەڵێ کە:

ئەو هەڵوێستی لەسەر ئەوان وەرگرتووە و ئەوانیش لە هەموو ئەو شتانەی دەرهەق بە یەکێتی و بە کۆمەڵە کردویانە پەشیمانن... پەشیمان بوونەوەی ئەوان، ئەویش لەو هەڵوێستەی پەشیمان دەکاتەوە. هەر بۆیەش واز لە بەرنامەی چوونە دەرەوە (ئەوروپا) دێنێ و بڕیاری گەڕانەوە دەدا... دەگەڕێتەوە و خەڵکیش سەبارەت بەم هەڵوێستەی چیدەڵێن بابڵێن... هەر چیەک بڵێن، ئەو ئامادە نیە گوێ لەکەس بگرێ.

بەمام جەلال ناڵێم نامەی بۆ منیش ناردووە و ئەوشتانەشی بۆ نووسیوم، هەر ئەوەندە دەڵێم:

- بەڵێ منیش بیستوومە.

- زۆرباشە، ئەدی ئەتو سەبارەت بە هەڵوێستی خۆت چی دەڵێی؟!

بەر لەوەی من ڕای خۆم دەرببڕم، ئەو دەڵێ:

- بەقسەی مامی خۆت دەکەی، ئەتووش دەچیەوە سەر کارەکەی خۆت و بەڵێنیشت دەدەمێ، شتی بەدڵی خۆتت بۆ دەکەم.

هەر ئەوەندە من دەڵێم:

"داوای لێبوردن دەکەم، من ناتوانم لەناو هێزێکدا ئیش بکەم کە لەسەر جیاوازی بیروباوەڕ، ئاوا بە ئەندامەکانی خۆی بکات." ڕووخسار و جووڵەی دەست و چاوی وا دەگۆڕێن دەڵێی هەر ئێستا لافاوی تووڕەیی، بەنداوی تەحەمولی هەرەس پێدینێ و هەرچیەکی بیتەڕێ، لەگەڵ خۆیدا ڕایدەماڵێ. خەریکە هەستێ و دادەنیشێتەوە... یەک دوو جار کڵاوکەی دادەگرێ و دەیکاتەوە سەری... سەرنجێکی ئەو کاغەزانەی بەردەمی دەدا کە تیایانا وێنە تازەکەی من دەبینێ... برۆکانی لێکدەنێ و بە تۆنێکی یەکجار هەڵچووەوە دەڵێ:

- تۆ پێت وایە، بەبێ تۆ ڕادیۆ ڕادەوەستێ... لەو ڕۆوە ئەتۆ یەکێتی نەمای... لە یەکێتی دەرکرای... یەکێتی جێی خەڵکی ئاشی تێدا نابێتەوە...

- بەڵام من ئاش نیم...

- نەخێر ئاشی و لە ئاشیش ئاشتری...

"ئەگــەر منیش بە گەڕانــەوە و درێژەدان بەکارەکەی خۆم ڕازیبام، ئاش نەدەبــووم... بەڵام مادام واناکەم، لە ئاشــیش ئاشــترم،" لــە دڵی خۆمدا وا بەخۆم دەڵێم.

کاغەزێک لە کاغەزەکانی بەردەمی هەڵدەگرێ و هەر لە جێی خۆشــیەوە نیشانم دەدا...

- ئەوەی ئەتوو لەو نامەیەیدا نووسیووتە، ئاشەکانیش شتی وایان لەسەر یەکێتی نەگوتووە...

ســەرنجێکی خێرای نامەکەی دەســتی دەدەم... دەیناســمەوە. کۆپی ئەو نامەیەی منە کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر بۆ ئازاد چالاکم نووســیووە. ئازاد یەک لە برادەرە زۆرنزیکەکانی منە... هەم بێژەر و هەم نووســەری بەشــی عەرەبی ڕادیۆشە...من نامەکەم بە برادەرێکی خۆمدا ناردبوو... دوای ئەوەی ئازاد نامەکە دەیخوێنێتەوە، دەیخاتە ژێر ئەو بەتانیەی کە لەبری دۆشــەک لەســەری دەخەوت... (ش) بەنامەکــە دەزانێ... و کۆپیەکــی لێهەڵدەگرێ و نامەکــەش دەخاتەوە جێگای خۆی. دوای ئەوە، ئازاد بەهۆی ئەو نامەیەوە، بەســووکە گومانی (ئاشبوون)، تووشی هەندێ سەریەشە دێ... کۆپیەکەش دەستا و دەست دەکا و ئەوەتا ئێستا بەدەستی مام جەلالەوەیە... وشەکانم بۆ ناخوێنرێنەوە بەڵام دەقەکەیم وەک خۆی لەبیرە.

" ئــەوەی من چاوەڕێم دەکــرد، لەوەش خراپتر ڕوویــدا، بۆیە من نەدە گەڕێمەوە ڕادیۆ و نە لە هیچ دەزگایەکی دیکەشدا ئیش بۆ یەکێتی دەکەم... مــن ئامادەنیــم لەگەڵ هێزێکدابــم، نەبڕوای بە ئــازادی و نەبڕوای بە مافی مرۆڤ هەبێ و، نەدیموکرات و نە شۆڕشگێڕیش بێ... وام لێهاتووە تەنانەت گومان لە بانگەشە نیشتمانیەکەشی دەکەم..."

لەســەر ئەو نامەیە هیچ ناڵێم... نەجەختی لەسەردەکەمەوەو نەپاکانەش. بۆ چەند چرکەیــەک، بێدەنگی لە نێوانماندا، دەبێتە کێڵگەیەکی مینڕێژکراو... لەگــەڵ هەڵێنانــەوەی هەنگاوی هەر ووشــەیەکمدا، ڕەنگە مینی تووڕەیی و غەزەبی مام جەلالم پێدا بتەقێتەوە...

نــە من هیچم گووت و نە ئەویش... نامەکە پێویســتی بە هیچ ووتنی من نەبــوو. نامەکــە دەخاتە ئەولاوەو بە هەڵچوونێکــی زۆرەوە دوونامەی ترم نیشان دەدا... هەردووکیان نامەی منن بۆ مەلا بەختیار... مام جەلال دەیەوێ

لە ڕێی ئەو دوو نامەیەوە، (ئاشـبوون)ی من بسـەلمێنێ... بەڵام خۆیشـی دەزانێ، وەک لەسـەری سـەرەوەی نامەکانیش، مێـژووی هەردوو نامەکە نووسـراوە، هی دوو سـاڵ لەوەوبەرن... دوو سـاڵ پێش درووسـتبوونی ئاش...

نامەکان لەسـەر مێزەکـەی بەردەمی دادەنێتەوەو ئـەوەی بەدەمیدادێ، لـە جوێنی سـووک، بە مەلا بەختیار و سـالار عەزیز و مامۆسـتا جافری دەڵێ...

"ئەو مەلا بەختیارەی ئەتۆ لە نامەکانتدا، بە هاوڕێ و برای خۆشەویستی خۆتی دەزانی، کۆتایی هات... بە جەستەش کۆتایی نەیات، ئەوە لە سیاسەتدا کۆتایـی هـات... ئەم قسـەیەی مام جـەلال ئاماژەبوو بۆ بڕیـاری پلینۆمی کۆمەڵە...

ماوەیەک لەوەوبەر کۆمەڵە، بەبەشداری شەست و چوار کەس لە کادر و بەرپرس و فەرماندەکانی کۆمەڵە، پلینۆمێک سـازدەکا. پلینۆم، دوو بژاردە، بۆ دەنگ لە سەردان، دەخاتە بەردەم ئەندامەکانی خۆی.

بژاردەی یەکەم:

مـەلا بەختیار و شـێخ عەلی و پشـکۆ نەجمەدین، بەتاوانـی خیانەت لە کۆمەڵە و لە یەکێتی ئیعدام بکرێن.

بژاردەی دووەم:

لەبری ئیعدامی جەستەیی، ئیعدامی سیاسی بکرێن.

لە کۆی ئەو شەست و چوار ئەندامەی پلینۆم، عەبدوڵا تۆفیقی لێدەرکەی، کە دەنگی بەهیچکام لەو دوو بژاردەیە نەداوە، ئەوانی دی هەرهەموو، دەنگ بە بژاردەی دووەم دەدەن.

ئاوا بڕیاری کوشتنی سیاسی، لەبری کوشتنی جەستەیی، کرایە بڕیاری پلینۆم، کەچی برایم جەلال کە، هەواڵەکە بە مەلا بەختیار و ئەوان ڕادەگەیەنێ، بژاردەی یەکەمیان وەک بڕیاری پلینۆم پێ دەڵێ...

ئیدی ئاوا، ئەو بڕیارە، کرایە ئەڵقەی پەتی سـێدارەو بەسەرسـەری مەلا بەختیار و شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆوە شۆڕکرایەوە... ئەگەر ئەو نامەیەی بەناوی ئەوانەوە نووسراوە، بە خەتی خۆیان کۆپی و لە ژێرەوەش ئیمزای

نەکەن، پەتی سێدارە لە ملیان دەچەڕێ.

مام جەلال، جگەرەیەک دادەگیرسێنێ و لەگەڵ مژێکی قووڵدا، نامەیەک لە چەکمەجەی مێزەکەی دەردێنێ و دەیداتە من.

"بۆ کۆمیتەی سەرپەرشتی (ئاڵای شۆڕش)ی بەڕێز.

پاش سڵاو

پاش ئەو هەموو ململانێ و ناکۆکی و دژایەتیەی پێشوومان لەناو کۆمەڵەدا، دواتریش تاوانی خۆ ئیعلانکردنمان وەک ئاڵای شۆڕش، بەرامبەر بە کۆمەڵە و یەکێتی وەک جیابوونەوە لێیان، گەیشتینە ئەو قەناعەتەی هەموو ئەو کارە ناراستانەی پێشووی ناو کۆمەڵەمان و کردەوەکانی ئەم دواییەشمان ئیدانە بکەین و بە تاوانیان بزانین... "

لە بەشێکی تری نامەکەدا دەڵێن:

"تەنانەت ئەگەر قەناعەتی فکری تایبەتی و جیاوازیشمان هەبووبێ، ڕاستتر وابوو لە ڕێگەی ئسوڵی حیزبایەتیەوە وەک شەخس، خۆمان دوورخستبایەتەوە لە کۆمەڵە و لە یەکێتی..."

هەروەها دەڵێن:

"ئەرکی سەرشانی هەموو کەس و لایەنێکی شۆڕشگێڕو دیموکراسی و چەپێکە، ئەمڕۆ دریێغی نەکات لە پشتیوانی و دۆستایەتی کردنیان..."

لە بەشێکی کەی نامەکەشدا دەڵێن:

"هیوامان وایە هەر کەسێکیش بەهۆی کێشەکانی ئەم دواییەوە، لە ژێر تەئسیری ئەو وەزعە سیاسیەدا، تووشی دوورەپەرێزی و لادان و دوورکەوتنەوە بووە لە یەکێتی و لە هێزی پێشمەرگە و کۆمەڵە، وەک پێویست دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن و بگەڕێنەوە ناو هێزی پێشمەرگە و براکانیان لە یەکێتیدا..."

له كۆتايشدا دەڵێن:

"ئەوەی لەســەرەوە نووســیومانە، پوختەی هەڵوێست و ڕا و قەناعەتی ئێمەیە سەبارەت بە ئالاّی شۆڕش و سەرجەم مەسەلە سیاسیەکان، بەبڕوای تەواوەوە، دوور لە هەموو تەئسیرێکی ئەم یان ئەو، لەکاتی گرتنماندا لەلایەن یەکێتــی و کۆمەڵــەوە، لە جەوێکی زۆر هێمن و ئارام و دیموکراســییانەدا، بێ هیچ زۆری و فشــارێ. بۆیە دیســان دووپاتی ئەکەینەوە، ئیتر ئێمە کە لە خــوارەوە ئیمزامان کردووە، هیچ جــۆرە ئیلتیزامێکمان پێکەوە نەماوەو نامێنــێ، وە ئیتــر وەکــو کوردێکی بێ لایــەن و دڵســۆز و دوور لە ژیانی سیاسی، دوور لە کوردستانی عێراق، ژیان دەبەینە سەر..."

تــا نامەکەم تەواوکرد، ئاگام لێبوو، مام جەلال چەند جارێک بە ســیلەی چاو تەماشای دەکردم... دەیویست بە تۆڕی جارجارە لاچاو سەیرکردنێکی، هەستە ماسیە سەر ڕووخسار کەوتووەکانی من ڕاوکا.

نازانم ئەو چی لە ڕووخســارمدا دەدی، بــەلاّم من هەتا لە خوێندنەوەی نامەکــە دەبمــەوە، وەک ئەوەی هەژکێکــی[٢٤١] دڕکاوی بــە هەناومدا بێنن.. چەقــۆی ئازارێکــی تیژ، لە ناوەوە دەمگوری. هەم زبری ڕفتار و ناڕاســتی گفتاری ئەمان و، هەم خۆسفرکردنەوەی ئەوانیش، هێڵنجم پیدەدا.

خودایــە، تۆ ئەو سیاســیانەت بــۆ وا خەڵقکردووە کــە درۆ بە هونەر و زیرەکی بزانن... ڕاستە سیاسەت گەمەیەکی زبرە، بەلاّم هەموو گەمەیەکیش، چەندیش زبربێ، هەر یاسا و ڕێسای خۆی هەیە...

کەنامەکــەم دەخوێنــدەوە، وام هەســتدەکرد میکافیلــی کتێبی(میری) بۆ ئامۆژگاری کردنی سەرکردە سیاسیەکانی ئێمە نووسیبێ:

" ئــەو شــتانە بڵــێ کە خەڵــک دەیــەوێ، بەلاّم ئــەو شــتانە بکە خۆت دەتەوێ.

* خراپە بکەو وانیشاندە چاکە دەکەی.

* تا ئەو کاتەی فرســەتت دەســت دەکەوێ، خەریکی فریودان و فێڵ و تەڵەکەبە.

---

٢٤١- هەژک: چیلکەو چاڵی وشک.

* دوژمنەکانت لەناوبەرەو لە کاتی پێویستیشدا، ڕەحم بە دۆستەکانیشت مەکە.

* هەرکەسێ هاتە ڕێت، تەنانەت دۆست و هاوڕێشت بێ، لەگەڵیدا ڕەق و بێ بەزەیی بە، ئەگەر نەشتویست بیکوژی، کەسایەتیەکەی تێک بشکێنە..."

چ کارەساتێکی گەورەیە، کوشتنی مرۆڤێک، کوشتنی کەسایەتی مرۆڤێک، لای هاوڕێ و هاوسەنگەران، لە ئاوخواردنەوە ساناتر بێ. من ئەگەرچی دژی هەمووجۆرە کوشتنێکی مرۆڤم و بەدەست من با، لوولەی هەرچی تفەنگە، گرێمدەدا و نەمدەهێشت تەقەیان لێهەستێ... بەڵام هێشتا کوشتنی جەستەییم لە کوشتنی کەسایەتی مرۆڤ لا ئەهەوەنترە... ئەهەوەنترە، چونکە دەزانم ئەوانەی کەسایەتیان دەکوژری قەت جارێکیتر نابنەوە بەو مرۆڤەی کە هەبوون.

نامەکە دەخەمەوە سەر مێزەکە و بە بێدەنگی دەگەڕێمەوە شوێنەکەی خۆم... هەتا خوا حەزبکا، تووڕەوبێزارم... تووڕە لە هەمووشتێک... تووڕە لە مان و لەوانیش... تووڕە لە شۆڕش و لە سیاسەت... تووڕە لە ئایدلۆژیا و لە دیانەت... تووڕە لە هەموو ئەو دوورشمانەی لە خەونی بەدیهێنانیادا، خۆمان بە کوشت دەدا...

مام جەلال، دەست بۆ نامەکە دەبا و دوایین لاپەڕە بەڕووی مندا هەڵدەبڕێ، وەک ئەوەی سەری بیری نهێنیەکی گەورەی هەڵدابیتەوە، پەنجە دەخاتە سەر هەر سێ ئیمزاکان:

- ئەوەتا بەدەست و خەت و بە ئیمزای خۆیان دەڵێن (بەرامبەر بە هەموو ئەو کارانەی دژ بە کۆمەڵە و یەکێتی کردوومانن، خۆمان بە خائن دەزانین و پەشیمانین...)

دەیەوێ بە نیشاندانی ئەو ئیمزایانە چیم پێبڵێ... دەیەوێ پێمبڵێ ئەگەر تۆش وەک ئەوان، بۆ ڕزگارکردنی کەوڵی خۆت، نەیەیتە سەرچۆکان، چمان بەوان کرد، بەتۆشی دەکەین.

«چدەکەن با بیکەن، لەوێ نەترسابم، بۆ دەبێ لێرە بترسم.»، وام بەخۆم وت

ڕیزی پێشەوەی هۆڵەکە، بەعسیە گەورەکانی پارێزگای سلێمانین و، من بێ ئەوەی حسابێک بۆ ئەوان و بۆ مردن بکەم شیعر دەخوێنمەوە،

شـــيعر بۆ شۆڕش و بۆ پێشمەرگەو بۆ خەونە ڕەنگاوڕەنگەکانی گەلەکەم... شــيعر دەخوێنمەوەو چاوەڕێشم لەســـەر ئەو شيعرە بکوژرێم... ئەگەر ئەو چاوەڕوانیــەم نەبا، شــيعرەکەم ناونەدەنا دوا نامە... شــيعر دەخوێنمەوەو ناترسم... ئەگەر من حسابێک بۆ مردن نەکەم، بۆ بترسم.

لەوێ، لەبەردەمی ئەواندا لە مردن نەترسابم، ئێستا بۆ دەبێ لەبەردەمی مام جەلالدا بترسم.

مــن ئەگەرچی لــە ناخمدا، دنیایەک لە هەڵوێســتی پاکانەی مەلا بەختیار تووڕەم... تووڕەم لەوەی ئەو هەموو ئەندام و کادیر و پێشمەرگە دڵسۆزەی ئەم بەناوی فکر و پرانسیپەوە، سەرگەردانی کردوون، ئێستا بۆ ڕزگارکردنی کەوڵی خۆی داوایان لێدەکا:

«دان بــە هەڵەکانــی خۆیاندا بنێن و بگەڕێنەوە ناو ڕیزی پیشــمەرگە و براکانیان لە یەکێتیدا.»

تووڕەم بەڵام دژی ئەو ڕێکارەنەشم کە سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە، دەرهەق بەوان دەیکەن. بە مام جەلال دەڵێم:

تەنانەت ئەگەر خەت و ئیمزاش هی ئەوان بێ، مادام لە ژێر ئەشکەنجەو هەڕەشـــەی کوشـــتندا پێیانکراوە، هەم ئیعتباری یاسایی نیەو هەمیش دژی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤە.

مام جەلال، هەر ئەوەندە گوێی لە وشەی یاسا و ئازادی و مافی مرۆڤ دەبێ، دەبێتە گەواڵە هەورێک لە هەڵچوون و تووڕەیی، تووڕەتر لە هەموو جارەکان:

ئەتو یاسا و مافی مرۆڤ فێری من دەکەی؟! ئەتو لەوەتەی هەی ئاشی... هەموو ئەو شــتانەش تا ئێســتا نووســیووتن، هەر هەمووی دژی یەکێتیی نیشــتمانی و کۆمەڵــە بــوون، بەوتــاری (ئاشــبەتاڵمان بە ئاشــبەتاڵ کرد) یشەوە.

من هیچ ناڵێم... هەر شــتێکی دیکە بڵێم، قوڕەکە لە خۆم خەستتر دەکەم. مام جەلال دیسان بەدەنگێکی زۆر بەرز دەڵێ:

ـ هەقی ئەوەت هەیە، هەر ئێســتا بە قۆڵبەوســتراوی بتنێرمە کن هاوڕێ خائینەکانت... شوێنی تۆ لای ئەوانە نەک بەری مەرگە.

"ئەمن پێمخۆشە گوێ لە ڕەخنەی ئەوانە بگرم کە ماستاو نازانن...."

ئای کە لەو شەوەی ساواندا، مام جەلال ئەمەی وت، چەند پێی دڵخۆش بووم... بەخۆمم دەگووت خودایە شـوکر، هێشـتا سیاسیەک ماوە ڕەخنەی پێ لەماسـتاو خۆشـتربێ... کەچی ئەوەتا ئێستا لەسـەر دەربڕینی هەستی تووڕەیـی و نارەزایـی خـۆم، خەریکـە بەزیندوویی کەوڵدەکرێـم. کە ئەو قسـانە دەبیسـتم، خۆمانی پێشـمەرگەم وەک ئەو کرمانە دێتە بەرچاو کە هەمـوو تەمەنی خۆیان لەسـەر بەرهەمهێنانی ئـەو قوزاخەیە دادەنێن، بۆ خاوەنەکانیان دەبێتە ئاوریشم و بۆ خۆشیان تابووتی مەرگ.

من بێدەنگم و مام جەلال بەدەنگێکی کەمێک نزمترەوە دەڵێ:

بەڵام ئەمن ئەوەت لەگەڵ ناکەم... هەر کاتێک شـتێکی خراپشـت کردبێ، هەڵوێسـتت هـەر چیەک بووبێ و ببـێ، کە ئەو شـیعرەتم بیردەکەوێتەوە، بۆ پێشـمەرگە و شۆڕشـت نووسـیوە، ناتوانم هیچت بەرامبەر بکەم... ئەو شیعرەت، پاکانە بۆ هەموو شتەکانی ترت دەکات.

مام جەلال باسـی پاکانە دەکا.. ئاخـر پاکانە لەچی!! پاکانە لەوەی لەژێر ترس و تۆقاندن و جەبەروتی بەعسدا، کارم بۆ کۆمەڵە و بۆ یەکێتی کردووە... پاکانـە لەوەی، من تەمەنی خۆم لـە هەرڕەتی لاویەتیمدا، نەزری کۆمەڵە و یەکێتی و پێشـمەرگایەتی کردووە... ئەو هەموو ساڵانەی پڕ لە زەحمەت و مەترسـی ژیانی پێشـمەرگایەتی و ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەو گیران و دەربەدەریەش کە باوک و دایک و کەسـوکارم، لەسـەر من چەشـتوویانە، پاکانەم بۆ ناکەن!! ئەمانە پاکانەم بۆ ناکەن، پارچە شیعرێک پاکانەم بۆ دەکا لە نووسینیدا، لە سێ کاژێران زیاتر، لەگەڵیدا ماندوونەبووم!

مام جەلال کە باسـی پاکانە دەکات، هێندە بەزەییم بە خۆمدا دێتەوە، دڵم پڕدەبێ لە حەسرەت و قوڕگم پڕدەبێ لە گریان... ئەگەر بەلاوازی بۆم حساب نەکـرێ، هەر لێرەدا، کۆڵێک بۆ خۆم دەگریەم... قەسـت دەکەم، بچمە دەرێ و بـەدوای زەندۆڵێکدا بگەڕێـم، قووڵتر لە قووڵ... هەتا هەرچی ئایدۆلۆژیا و هەرچی دروشـم و بەرنامە و پەیڕەوی حیزبی و هەرچی درۆ و دەلەسـەی سیاسیان هەیە، فڕیان دەمە بنی بنەوەی ئەو زەندۆڵە...

خەریکە هەوای ژوورەکە قانگم دەدا... هەناسـەدانم قورس و قورسـتر دەبـێ و دڵم خێراتر لێدەدا... دەمەوێ شـتێک بڵێم و هیچـم بۆ ناووترێ... وشـە لە قوڕگمدا دەبێتـە کلیلی ناو قوفڵێکی ژەنـگاوی و چەندیش بایدەم، جیڕەیەکی لێوە نایا.

کــە مــام جەلال لەو ڕەوشـــە دەروونیـــەدا دەمبینێ، وەک ئـــەوەی پەتی ڕزگاربوونـــم بۆ هەڵدات، بە تۆنێک کە زیاتر غروری تێدایە تا هەرشـــتێکی تر:

- دەتەوێ چت بۆ بکەم؟

دەمـــەوێ بڵێم هیـــچ... دەمەوێ بڵیـــم... بەڵام هیچیش بـــەزۆر دەزانم بۆ وتن...

ئـــەو چاوەڕێیـــە من شـــتێک بڵێم... بەڵام مـــن هیچم ناڵێم یـــان هیچم بۆ ناوترێ...

نامـــە و کاغەزەکانی بەردەمی کۆدەکاتەوەو دەیانخاتەوە ناوچەکمەجەی مێزەکەیـــەوە. چەند مژێکی تر لە چروتەکـــەی دەداو ژوورەکە پڕتردەکا لە دووکەڵ. بەدەم سەیرکردنی شتێکی بەردەمیەوە، دەڵێ:

- ئەمـــن هیچـــم بۆ گووتنێ نەماوە... ئەگەر ئەتوو شـــتەکت هەیە پێمبڵێ، دەنا دەتوانی بڕۆی.

ماڵئاوایـــی دەکەم و چەنـــدی دەتوانم زوو، ئەو ژووره جێدێڵم کە بۆ من بەدرێژایی ئەو وەختە، لە ژووری لێکۆڵینەوەی ناو زیندان دەچوو.

لـــە ژوورەکـــە دێمـــە دەرێ و هەمووشـــتەکان، دەڵێـــی کەڕەشـــانەی[٢٤٢] هەنگوینن، یەک لەیکدی بەتاڵتر دەنوێنن...

هەموو شتەکان بەتاڵ و ناخی منیش لە هەمووان بەتاڵتر...

بەتاڵ... بەتاڵ،

بەتـــاڵ لە هەموو ئەو خەونـــە ڕەنگاوڕەنگانەی (١٠) ســـاڵیک لەوەوبەر، منیـــان بـــە ژێر زەمینـــی ڕێکخســـتنە نهێنیەکانی کۆمەڵەدا کـــرد و، ملی ئەو بارێکە ڕێیانەیان پێگرتم کە بەم تونیلە بێ کۆتاییەیان گەیاندم.

٦ نیسانی ٢٠١٧

---

٢٤٢- کەڕە شانە: بەو شانە ووشەکە دەڵێن کە هەنگوینی تێدا نیە.

## پشکۆ نەجمەدین:

ئەو ڕۆژانەی نیشـــتمان هیی هەمووان بوو، ئێمەش هەموومان لە خەمی نیشتماندابووین!

ماڵی گێڕانەوەکانی هەڤاڵ کوێستانی، وا بزانم بەشی یەکەمی ئەم تێکستە، لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو.

لە مێژە گوتوومە و نووســیومە، ناونیشــانی تێکست یاخود کتێب، ڕێک ئەو ڕێناسەیە، کە پەلمان دەگرێ و هەموو ژوور و هەیوان، ساپیتە و میچ، دەرە و دەریچەی تێکستمان نیشان دەدات.

هەڤاڵ کوێســتانیی شــاعیر و نووســەر، کە ئازارەکانی خەڵک و نیشتما کردیــان بــە پێشــمەرگە، بەزمانێکی باڵا و لــە وێنەی شــیعریدا، وردینەی ڕووداوەکانی نیشــتمان و خەڵکی کوردستانمان لەسەردەمێکی تاریکدا، بۆ دەگێڕێتەوە... هەڤاڵ، ورد لە وردینەی ڕووداوەکان قســەدەکا، تا ڕادەیەکی باش، مەوزووعیانەو بێلایەن، شــەنوکەویان دەکات... بە زمانی شیعر، باس لە مێژوو، سروشت، جوگرافیا، شەڕ، سیاسەت، ململانێی سیاسی، ئەوین و خۆشەویستی دەکات.

ئــەم گێڕانەوەیە ئەگەر نووســینەوەی یــادەوەری بێت، ئەوە یادەوەری سەرپاکی نەوەی ئێمەیە.

## سەردار عەبدوڵڵا:

ئەم کتێبە، هەر بەتەنها یادداشتی پێشمەرگەیەکی شاعیر نیە، دەتوانم بڵێم مەلحەمەیەکی شیعرییە، ڕۆمانێکی دەگمەنە کە بە زمانی شیعر نووسراوە.

## عەدنان عوسمان:

راستە کاک هەڤاڵ لە باسی سروشت و شاخ و شوێن و کاتدا، شاعیرێکی کارامەو وشەسازێکی بەهرەمەندو خاوەنی خەیاڵدانیکی گەورەیە، کە بیرەوەریەکانی دەبەنە ئاستێکی باڵای نووسینەوەو نزیکی ئەکەنەوە لە رۆمانێکی پڕ لە چێژ، بەڵام لە باسە سیاسیەکاندا، لە قسەکردن لەسەر وردەکاریەکانی شۆڕش و خەباتی چەکداری، کاک هەڤاڵ بە زمانی ڕۆمانسیانەی شاعیرێک قسە ناکات، بەڵکو وەک کەسێکی سیاسی خاوەن دیدگا، خەون، هیواو ئامانج سەیری کۆی پرۆسەی گەشەسەندنی شۆڕش دەکات. زەحمەتە بۆ کەسانێک کە بەشێکی ئەو واقیعەیان بینیبێت، بە جۆرێک لە جۆرەکان وێنەی خۆیان و کارەکتەری خۆیان نەبیننەوە. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەمە سفری هەموومانە، هەموو ئەوانەی لە ساتە وەختێکی مێژووی گەلەکەماندا خاوەنی ئەو خەونە گەورەیەبوون.

لەگەڵ دەستخۆشیەکی زۆرم بۆ ئەم نووسینە پڕ و بە پیزە، بەراستی خوێندنەوەی چێژێکی زۆر گەورەی هەیە بە ڕادەیەک مرۆڤ حەز بە تەواوبوونی ناکات... بە کورتی ئەتوانم بڵێم لەم ساڵانەدا کەم کتێب، ئاوا تام و چێژی پێ بەخشیوم.

## ڕێزان عەبدوڵڵا:

هەر کە بەشێکی کتێبەکەی تەواودەکرد، یەکسەر بۆی ئەخوێندمەوە. لەگەڵ هەندێ بەشدا ئەکەوتمە گریان و لەگەڵ هەندێ بەشی تردا ئەمدایە قاقای پێکەنین، ئەو ڕۆژەش کە دوابەشی بۆ خوێندمەوە، بێتاقەت بووم، هەم بە کۆتاییەکەی و هەم لەبەرئەوەش کەچیتر بەشی تری کتێبەکەیم بۆ ناخوێنێتەوە، مەگەر چاوەڕێی بەشی دووەمی بم.

## کامەران سوبحان:

ئەو ساتانەی نیشتمان، هی کەسمان نەبوو.!

هەڤاڵ کوێستانی شاعیر و پێشمەرگە، بیرەوەریی ئەو ڕۆژانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە گوایە نیشتمان هی هەمووان بوو.! ئەو ڕۆژانەی، ئەو کوڕێکی گەنج، تازە زانکۆ تەواو دەکات. بەخۆی و سەرێکی پڕ لە خەون و خولیای ئازادیی، بە خۆیو خەیاڵەکانییەوە، خۆی و تەنهایی خۆی، لە شارەوە دەچێتە شاخ و دەبێتە پێشمەرگە!

ئەو ڕۆژانەن ئەوی شاعیر و ئەوی پێشمەرگە، بە خولیایەکەوە دەژیا، کە نیشتمان هی هەموان بێ، هەر بۆیە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی ئەو ڕۆژانەشدان نیشتمان بە یەکسانی بەسەر هەمووان دابەش دەکات.! بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دابەشکردنەی هەڤاڵ کوێستانی، پیچەوانەکەی ڕاست بوو، ئەگەر هی هەمووان بوایە، دەبوو لە قوربانی دان و خێر و بێرەکەشیدا، وەک یەک بوینایە! لەم بیرەوەرییانەی(هەڤاڵ کوێستانی)دا پیچەوانەی زۆر لە بیرەوەرییەکانی تری شۆڕشی کوردیی، دیوە تاریک و ناشیرینەکانی شۆڕش(نادادپەروەریی، ملشکاندنی یەکتر، دیل کووشتن، هاوسەنگەر کووشتن) و زۆر سیمای ناشیرینی تری ئەو ڕۆژانە، بە زمانێکی نەرمی بێ لایەنانە، بۆ خوێنەران دەگێڕێتەوە! خوێندنەوەی ئەم بیرەوەرییانە، ئەو هەست و بیروباوەڕە نوستالیژییانە لای تاکی کورد تێکدەشکێنێ، کە هەمیشە بە شان و باڵی ڕابردوودا هەڵ دەدات، بە پیچەوانەوە لەم بیرەوەرییانەدا خوێنەر دەچێتە دونیایەک هێندە تاریکە، نەک ئەو ڕۆژگارە، بەڵکو ئێستای خۆشی بە ئەستەم بۆ دەخوێنرێتەوە! پێش بڵاوبوونەوە، چەند جارێک ئەم بیرەوەرییانەم خوێندەوە، هەر جارەی دیوێکی تایبەت و هەرجارەی ڕوخسارێکی جیاوازی شۆڕشم بینی، لە هەمو ئەو بینیانەشدا پڕی کردم لە نائومێدیی، پڕی کردم لە بیرکردنەوەو تێڕامان... ئەرێ بەڕاست ئەم ڕووداوانە، دیو ڕاستییەکەی شۆڕشە، یان ئەمە زەلکاوی شۆڕشە؟!

ســاڵێک زیاتره به نووسینی ئه‌م کتێبه‌وه خه‌ریکبووم. جارهه‌بووه، چه‌ند به‌شیکم له‌یه‌ک هه‌فته‌دا ده‌نووسی... جاریش هه‌بووه، به چه‌ند هه‌فته‌یه‌کیش، به‌شیکم نه‌نووسیوه.

له دوای ته‌واوکردنی هه‌ر به‌شـێک، وه‌ک خوێنه‌ر، خویندومه‌ته‌وه... هه‌ر به‌شـێکم به دڵ نه‌بووبێ، لامبـردووه، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر، هه‌موو به‌شـه‌که‌ش بووبێ.

پێوه‌ری من، بۆ هێشتنه‌وه‌ی هه‌ر به‌شێک، ئه‌وه‌بووه:

چه‌نـد چێژ و زانیاری به خوێنه‌ر ده‌به‌خشـێ... ئه‌ی دوای خوێندنه‌وه‌ی چه‌ند کاریگه‌ریی له‌ســه‌ر به‌جێده‌هێڵێ... هـه‌روا چه‌ندیش یارمه‌تی خوێنه‌ر ده‌دا، باشـتر له‌و دیارده و حاڵاتانه حاڵی بێ که له ئێسـتادا ڕووده‌ده‌ن و ره‌گ و ڕیشه‌ی قووڵیان، به خاکی ڕابردوودا ڕۆچووه.

ئه‌وه‌نـده‌ی بۆم کرابێ، هه‌وڵمداوه لـه ڕێی کۆمه‌ڵێ وێنه‌ی جیاجیاوه، به شێوه‌یه‌کی ڕاستگۆیانه و بابه‌تیانه، به تێگه‌یشتن و به چاوی ئه‌وساوه، ئه‌و ڕابردووه بخه‌مه‌ڕوو...

له خســتنه‌ڕووی ئه‌و وێنانه‌شــدا، ئاماژه به هه‌ر ناوێک یان ڕووداوێک کرابـێ، په‌یوه‌نـدی به‌و زه‌مه‌نــه‌وه هه‌یه کـه وێنه‌که‌ی لێکێشــراوه و هیچ په‌یوه‌ندیه‌کی به ئێستایانه‌وه نیه.

هه‌تا بۆشم کرابێ، خۆم له گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و شتانه به‌دوورگرتووه که به‌ر له‌من که‌سانی تر به‌سه‌ریان کردوونه‌ته‌وه.

دوای ته‌واوبوونــی کتێبه‌کـه، هاوڕێیانـم، (حاکـم شـێخ له‌تیف، پشـکۆ نه‌جمه‌دیـن، ســه‌ردار عه‌بدوڵـڵا، عه‌دنان عوسـمان، کامه‌ران سـوبحان و که‌مـال غه‌ریب) هه‌ریه‌که‌و چه‌ند ڕۆژێک له‌وه‌ختی خۆیان، بۆ خوێندنه‌وه‌ی پێبه‌خشـیم... کۆمه‌ڵێ ســه‌رنج و بۆچوون و پێشنیاری به که‌ڵکیان داومه‌تێ که له دوا پێداچوونه‌وه‌دا به هه‌ندم وه‌رگرتوون.

**هه‌ڤاڵ**

ئێمە و ئەوان، لەناو قووڵایی دۆڵەکاندا و لە لاپاڵ و
لە بەرزایی شاخەکاندا، ملمان بەبەر ملی یەکتریەوە
نابوو...کەپکێک بەدەستی هەر لایەکمانەوە با، لایەکەی
دی وایدەزانی، خوا لەو تاکە بەرزاییە بەولاوە،
شوێنێکی کەی، بۆ هەڵکردنی ئاڵای سەربەخۆیی و
دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ڕۆ نەناوە ؛

